# ئەو دیوی کوێستان
# ئەستوندەک

**یاشار کەمال**

**و: رەسووڵ سوڵتانی**

**بەرگی یەکەم**

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی


**• ئەو دیوی کوێستان (ئەستوندەك)**


• نووسینی: یاشار کەمال

• وەرگێڕانی لە تورکییەوە بۆ فارسی: رەزا سەید حوسێنی و جەلال خوسرەوشاهی

• وەرگێڕانی لە فارسییەوە: رەسووڵ سوڵتانی

• نەخشەسازی ناوەوە: (باران)

• بەرگ: جێگر عەبدولجەبار

• چاپی یەکەم: ٢٠١١

• تیراژ: ١٠٠٠

• نرخ: سێ بەرگ ١٥٠٠٠

• چاپخانە: وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

• لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٩٩٤)ی ساڵی (٢٠١١)ی پێدراوە.

**زنجیرەی کتێب (٦٠٦)**

ئەو کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی
رۆشنبیری لەسەر ئەو ماڵپەڕە بخوێنەوە
www .Kurdchap.com

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

پێشکەشە

بە دەستە ماندووەکانی هەر سێ برا ئازیزەکەم (برایم، عەولا، رەحیم)

# ١

لەبەرخۆیەوە گوتی:

ئیزگیل هاتۆتە بەردەرکێ.. هەڵیگرە و بیبە... نا... نا.. ئەو ئیزگیلە سەری لێ شێواوە، هێشتا بۆ پشکووتنی لۆکە لە چوکووراوا زۆری ماوە... دیارە ئەمساڵ پەتا و ئافەت لە رەگـەی ئیزگیلـی داوە... نەکا رەگی ئەو بەلا لێدراوە کرمۆڵ بووبێ؟ نەکا مشك کرتاندبێتی؟ هەر وا هەڵدەکەندرێ و دێ.

لە بەربەرۆچکەی ماڵەکەیان دانیشتبوو، لاقی لێ درێژکردبوون و پاڵی بـە دیـوارەوە دابـوو. یەکی کەوتبوو. لە کەنەفتییان سەری لێ تێك دەچوو. لەڕ و لاواز ببوو. پیری پرزەی لێ بڕیبوو. خەمێکی قووڵ بە روخسارە بزرکاو و چرچ و لۆچەکەیەوە بەدی دەکرا. ردێنە درێژ و سپی و بۆز و چـلکنەکەی کـەوتبووە سـەر سـینگی و بـەر ببـۆوە. بـرۆ کـولکن و ئالۆزکـاو و مـاش و برینجییەکەی کەوتبووە سەر چاوە وردە سەوزەکانی کە پێڵووەکانیان سوور هەڵگـەڕابوون. زاری لە نێوان ردێن و سمێڵەکەیەوە بەحاڵ دیار بوو. سەری تەواو رووتـابۆوە و مـووی بـۆ دەرمـانیش پێوە نەمابوو. پێیەکانی زل و رەقەڵە و رەش و قەڵـشیو بـوون و نینۆکەکانیـشی زەرد و درێـژ. پانتۆڵە جاوەکەی کە بە دەست دوورابوو، لەبەر پینە دیار نەبوو. کراسەکەشی هەروەتر.

کاریلەیەك لە دەوروپشتی مڵومۆی بوو. بڕێك لـەو لاتـرەوە مریـشکێك هەڵلایـەکی نـابۆوە هەر مەپرسە. چەند جووجەڵەیەکی نەرمۆڵە، هەر دەتگوت گلۆڵە بەنێکی زەردن و دەستیان لێ بدەی هەڵدەوەرن، لە دوای مریشکەکەوە لەنێو زبڵ و زاڵەکەدا راکەڕاکیان بوو.

مام خەلیل لـەو دنیایـەدا لـە هـەموو شـتێ پـتر حـەزی لـە سـەیری ئـەو جووجەڵـە زەرد و نەرمۆڵانە بوو کە تازە هێلکەیان ترووکاندبوو و هەوڵیان دەدا هەتاو و خاك بناسن. جار و بـارە بە گارەگاری مریشکەکە سەرێکی هەڵدێنا و دەیبۆڵاند:

ـ دەك ماڵت کاول بێ هەی، چەند دەقیڕێنی.

سەری بەردەدایەوە و چەناگەی بە سینگییەوە دەنووساندەوە:

"ئەگەر ئیزگیل بێ و بەردەرکە بگرێ، ئەگەر لە چوکووراواش لۆکە بپشکوێ و هەموو دەرودەشتیش سپی داگەڕێ، ئەمسالێ ئەژنۆکانم لە دووم نایەن. ئەمن ئەمسالێ بەو حالەوە ناتوانم بچمە چوکووراوا، ناتوانم خەلیل، ناتوانم...

بڕێك لە دوانیوەڕۆ لای دابوو کە هەستا، بەڵام بە زەحمەت. بانگی بووکەکەی کرد:

ـ هۆی کچێ، قومێك ئاو... بەملی شکاوت...

بانگی هێشت، بانگی هێشت، بەڵام هیچ وەڵامێك لە ژوورەوە نەبوو.

ـ کەس نییە چۆڕە ئاوێك بە پیاوی بدا.... پیاو بمرێ باشترە و پیر نەبێ.

چووە ژوورەوە و جامولکەکەی پڕ کرد، کە دەیخواردەوە دەستەکانی دەلەرزین و ئاوەکە بە لا دەم و ریشیدا دەچۆڕایەوە. هەروا کە خۆی دەدایە سەر تێلاکەی، دەڕۆیشت و رادەوەستا، بەرەو گردەکەی رووبەڕوو کەوتە رێ. کە دەمەدەمی ئێوارێ گەیشتە سەر تەپۆلکەکە، لە دوورەوە مژێك خەریك بوو پێدەشتەکەی دادەپۆشی. پێدەشتە کاکی بە کاکییەکە رەنگی خۆڵەمێشیی دەگرت. وای هاتە پێش چاو کە پۆلە ئیزگیلێکی بە ئاسمانەوە دیتووە.

"ئیزگیل هات و بەردەرکەی گرت. ناکرێ هەڵی نەگری و نەیبەی. هەر بە پێی عادەتی ساڵان ئەگەر بە گوندییەکان نەڵێی لە چوکوور لۆکە پشکووتووە، خۆ گوندییەکان کەوڵت دەکەن خەلیل... ئەگەر درەنگ بگەنە لۆکە رنینەوە و دوای پشکووتنی لۆکە، سەپان و پاڵەی گوندەکانی دیکە چی لۆکەیە کۆی بکەنەوە و خەڵکی گوندەکەی تۆ درەنگ بگەنێ و کێڵگەیەکیان دەست نەکەوێ بۆ لۆکەچنینەوە.... خەلیل، جا چییان پێ دەڵێی؟ دەڵێی بە سەهوو چووم؟...

ئیزگیل لە پێدەشتی کاکی بە کاکیدا دەخولایەوە و ئەوەش بەلای مام خەلیلەوە یانی ئەوەی لە چوکووراوا لۆکە خەریکە دەپشکوێ. هەموو ساڵێ ئەو دەمانە، لەوانەیە بڕێکیش زووتر، مام خەلیل ئیزگیلێکی کە لە پێدەشتەوە هەلکەنرابوو و هاتبوو، هەڵدەگرت و لە لق بە لق و گەڵا بە گەڵا و دڕك بە دڕکی ورد دەبۆوە و راستەڕێ و بە هەڵەداوان خۆی دەگەیاندە کوێخا و دەیگوت:

"هەتیوەکەی کوێخا خدر، ئیزگیل هات. ریزێکیشیم بەچاوی خۆم بینی کە وەك قەتاری قاز و قورینگان بە دوای یەکدا بەرەو چیای تەکەچ دەڕۆیشتن. بە گوندییەکان بڵێ، هەتا سێ رۆژی دیکە خۆ ئامادە بکەن بچین بۆ لۆکە رنینەوە.

گوندییەکانیش بە سێ رۆژان خۆیان تەیار دەکرد و بەرەو چوکووراوا وەڕێ بکەون. " ئەو شەوە خەو لە چاوی مام خەلیل میوان نەبوو. نوقمی خەیاڵان بوو: زۆری نەماوە کزە بای ساردی پاییزان هەڵ بکا و تەزوو بخاتە جەستەی خاکی پێدەشتەکەوە. باڵندەکان سەریان بردووەتە بن باڵیان و لە گوشە و

قوژنـان هـەلکورماون. سـەرمایانە. ئـیتر قاسـپەی کـەویش نایـە. ئـیتر لـە بـن پنـچکان شـوێن پـێ خەنەلیدراوەکانیان دیار نییە. ئەوە چییە ڕۆژ بە ڕۆژ کێویتر دەبێ؟ گژە بای کۆتایی هاوینە. ئـەوە چییە کە گژەبا هەڵیدەقەنێ و لەو تەپۆڵکەوە دەیباتە ئەو تەپۆڵك؟ ئیزگیلـە. ئـاخۆ ئیزگیلـەکان هەرکامـەیان هێندەی زەمبیلێك لە بن میچی ئاسمانی سپیدا و بەسـەر گـردە رووتەکانـەوە دەسـووڕێنەوە. ئـەمڕۆش نەبێ، سبەی دەسووڕێنەوە. ئاخۆ بایەکان کە بە هەزاران گژەگژ و گڤـەگڤیان بـەو پێدەشـتەدا تێدەپـەڕن، هێشتا ڕێگە و قەڵشت و شـیو و دۆڵـەکانیان پـڕ نـەکردووە لـە ئیزگیـل؟ زۆر نابـا، ڕۆژێکـی دی، پـڕی دەکەن. ئیزگیل بە شێوو دۆڵ و ڕووباران وەردەبێ... ئەو گوندییانە عەقڵیان نییە؟ هـیچ کامـەیان چـاو و گوێچکە و هەستیان نییە؟ لەو سی ساڵەی ڕابردوودا باشە ئەگەر مام خـەلیل نەبوایـە چـییان دەکـرد؟ ئەوە هات و مام خەلیل مرد! ئێستاش هەر وای دانێن مردووە. یانی ئەو نەبێ ئێوە ناچـنە چـوکوور بـۆ لۆکە چنینەوە؟ هەی بێناموسینە. لەو هەمووە ساڵەدا تاقە یەك ڕۆژ، هەر یەك کەستان نەهات بڵـێ" دەستەکانت خۆش بن مام خەلیل، سپاست دەکەین کە هەموو ساڵێ لە کاتی خۆیدا ڕێـك ئـەو دەمـەی لۆکە دەپشکوێ دەمانبەیتە کێڵگە." دەی باشە، ئەوە ئەمساڵ ئەمنیش لاقم لە دوو نایـەن. ئـەمن لـە کوێ بزانم لە چوکووراوا لۆکە پشکووتووە یان نا؟ ئەمن نازانم... ئیتر نازانم هەی بێناموسینە.

هەتا بەیانی هەر پیشی خواردەوە.

بۆ بەیانی کاتێ لە خەو هەسـتا، چـاوەکانی وا دەبرژانـەوە دەتگـوت بیبـارت تـێ کـردوون. چاوی بڕیە دوور دوور. سەیری ئەو کزە بایەی کرد وا هەڵی کردبوو. سەیری کرد و گوتی:

ـ خەڵکی ئەو گوندە گەمژەن. هەر هەموویان کەرن.

کوڕەکەی لە پشت سەری ڕاوەستابوو. پرسیی:

ـ ئەوە دەڵێی چی بابە؟...

ـ مام خەلیل جوابی نەدایەوە و بڕێك دوور کەوتەوە.

کوڕەکەی بە خدوایدا ڕۆیی و گوتی:

ـ بابە، هێشتا زۆرمان ماوە بۆ پشکووتنی لۆکە؟

مام خەلیل جوابی نەدایەوە.

کوڕەکەی گوتی:

ـ تۆ خوداکەی بابە. ئەرێ ئەوە بۆ وات لێ هاتووە؟ هەر وستەت لێوە نایە؟

کوڕەکەشی مووی ڕەشی لە ڕیشیدا نەمابوو و تەمەنی لە سەرووی پـەنجا دیـاربوو. خـەلیل برۆی هەڵتەکاندن و لە تۆقی سەریەوە تا بەری پێی سەیرێکی کوڕەکەی کردو گوتی:

ـ ئەتۆ دەڵێی چی هەتیوە؟ ئەوە هاتووی دەمبەدمەم لەگەڵ دەکەی؟

لە تووڕەیی‌یان بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە و هەرچی لە زاری دەهاتە دەرێ حەوالەی کوێخا و کوڕەکەی، "تاشباش ئۆغلۆ" و هەموو گوندییەکانی دەکرد.

کاتێك رقەکەی نیشتەوە، بەبێ تاقەتییەوە قوونی دایە سەر بەردەکە. ردێنەکەی لە قولی دەستی گرت و چەنەشی لەسەر دەستی دانا. کوڕەکەی لە تەنیشتییەوە راوەستابوو و نەیدەزانی بابی لە چی تووڕەیە.

ـ ئەگەر ئەتۆش وەك منداڵی خەڵکی بوایەی، کوا ئەمن ئاوا دەبووم؟

هەر وا دەیبۆڵاند. کوڕەکەی بۆ ئەوەی لەوە پتر گوێی لەو قسە رەق و تاڵانەی نەبێ، بەجێی هێشت. مام خەلیل بە خۆی و رقەکەیەوە بەتەنێ مایەوە:

"ئیزگیل هاتۆتە بەر دەرکێ، ناکرێ هەڵیەنەگری نەیبەی."

هەستا. باوێشکێکی دا، هەموو گیانی دەیزیڕاند. هەر وا کە خۆی دەدایە سەر تێڵاکەی، بەرەو نێو گوند وەڕێ کەوت.

نەیدەتوانی بە بەر دەرگای کوڕی مەلادا رابرێ. هەر مانگی تەمووز تەواو بوایە و رۆژەکانی مانگی ئاب گەیشتبایەن، هەموو رۆژێ کە مام خەلیلی دەدی لێی دەپرسی:

ـ ئەرێ مام خەلیل، چەند رۆژی دیکەی ماوە قورینگە بابردەڵەکانی تۆ بێن؟ بۆ ئەو رۆژەی دەبێ بچینە چوکووری خواروو؟ کوڕە مام خەلیل، گیانی خەڵکی ئەو گوندە بە دەست تۆوەیە، مام خەلیل، تۆ حەزت لێ بێ، سێ مانگی دیکە لە نێوەڕاستی زستانیدا دەمانبەیتە لۆکەچنینەوە.

توتکە سەگ! ئەوە کوڕی مەلای ئاوەدانی نییە. هەر لە خۆوە دەتریقێتەوە. رۆژ هەتا ئێوارێ زاری داپچڕیوە. ئاخر سەی کوڕی سەی، ئەگەر پیاوی، ئەتۆشساڵێك لە ساڵان کاتی پشکووتنی لۆکە رابگەیێنە... دەی بەبێ ئیزگیل، هەر لە خۆتەوە بیڵێ!"

لای دا و بە رێگەیەکی دیکەدا کە دوورتریش بوو، بای دایەوە. هەر بەراستیش ئەژنۆکانی هێزیان دەبەردا نەمابوو. چەند هەنگاو دەڕۆیشت و دەوێستا. زۆر لە مێژ بوو لە خۆی دەپرسی:" نەکا تەواو پیر بووبم. دیارە لە هەشتام تێپەڕاندووە. چووزانم خوا دەزانێ. بەڵام لە پیری‌یان دانەهێزاوم. قەت تێر زگی خۆم نان نەخواردووە. چما ئەو بووکە قەحپەیەم پاروو نانێکم دەداتێ؟ هەموو خواردنەکان وا تاقەت دەکا ئەمن نەیاندۆزمەوە. ئاخە بڕیە دەست و ئەژنۆم دەلەرزن. بەڵام با بگەینە چوکوور، شووتی... تەماتە... لەوێ پیاو گیانێکی وەبەر دێتەوە. بەڵام ئاخۆ چۆن دەکرێ بەرەو خوار بیتەوە و بگەیتە چوکوور؟ ئەمڕۆ و سبەی لۆکە دەپشکوێ. هۆی کوڕە، کوڕەکەی برایم، ئەتۆ کوڕێکی باشی! لە بابیشت باشتری، بەڵام ئەو دایکەت... ئەو مالۆسە پیرە کە بابتی بە خەفەتان کوشت... بەخودای بابت لە داخی ئەو وەزگی دا... لە دەستی ئەو ژنەتیوە زۆردارە..."

چوو و لەبەر دەرگای "عەلی"یە درێژ راوەستا. تێلاکەی زرم و کوت لە عـەرزی راکێشا. ماڵەکـەی عەلی، کە لە بابییەوە بە میرات بۆی مابۆوە، نەوی بوو، سواغ نەکرابوو و بە کەرسـەك و بـەردی زل زل و نارێك هەڵچنرابوو. دیاربوو لەو کاتـەدا عـەلی بـە تـەنێ لـە مـاڵ نـەبوو. ئەگـەر ئـەو دایکـەی ئـەو مرێمۆکە بە نەفرەتبووە، ئەو پیرە مـەکربازە بـە دەهۆیـە لـە ماڵـەوە بوایـە، دیـسانیش کارەکـە راسـت نەدەهات. دوودڵ بوو. ئاخۆ دەکرا بگەڕێتەوە و رۆژێکی دیکە کـە مرێمـۆك لـە مـاڵێ نـەبێ بـچێتەوە؟ لەوانە بوو مرێمۆکیش لە مـاڵێ نـەبێ، و لەوانـەش بـوو ئـەو دەمـەی ئـەوان قـسان دەکـەن، مرێمـۆك نەهاتبایەتە لایان. بە دەنگێکی نەرم و باوکانە هەرای کرد:

ــ عەلی، رۆڵە، عەلی...

عەلی هاتە دەرێ و گوتی:

فەرموو مام خەلیل... فەرموو وەرە ژووورێ!...

هاتە لای. مام خەلیل هەر لەوێ لەسەر کۆتەرەدارێك هەڵتووتەکا و گوتی:

ـ ئەتۆش دانیشە، لێرە لە کن خۆم...

"عەلی"یش لە تەنیشتی دانیشت. ئەو پیرەمێردە، بێ و نەبێ قسەیەکی پێیە.

دە رۆژ بوو پەیتا پەیتا دەهاتە لای و منگەمنگێکی دەکرد و دەرۆیشت. عەلی هەستی کردبوو چیی دەوێ، بەڵام چ دەسەڵاتی نەبوو. مام خەلیل دەستی پێ کرد:

ــ هێشتا زۆری ماوە بۆ لۆکەچنینەوە. ئەمساڵ هەواکـەی سـارد بـوو. لۆکـە لـە چـوکوور درەنـگ دەپشکوێ. چ درەنگ بپشکوێ و چ زوو، ئەمن بەو قوونە خاوێنەمەوە ناتوانم بچمە چوکووری خـواروو، عەلی، دەست و ئەژنۆم هێزیان نییە. هەر هەنگاوێکی هەڵێ دەگرم وەختە تیغەرەی پشتم بشکێ. ماڵی ئەو پیرییە خەرا بێ. بەڵایە بەڵا. پیری بەڵای لابەڵایـە. ئـەورۆ و سـبەینێیەك لۆکـە دەپـشکوێ. جـا چ ئیزگیل بێ یان نەیە، ئەمن بە کوێخا بڵێم لۆکە گوڵی داوە یان نا، لە چوکوور لۆکە هەر دەپشکوێ. بەڵام مام خەلیلی تۆ ئەمساڵ هێزی چوون بۆ چوکووری خواروی نییە. هەتا گەیشتمە ئێرە، دە جاران راوەستام بۆوەی پشوویەکم بێتەوە بەرخۆ. عەلی گیان، بەو حاڵ و باڵەوە چۆن دەتـوانم بـچمە چـوکووری خـواروو؟ مانگێکە بیر لەوە دەکەمەوە. ئەژنۆکانم وەك بیی نێو ئاو دەلەرزن. بێ لەوە ژانیش دەکەن... لـە گیـانی خۆم وەڕەز بوومە. خۆزگە پیاو پیری نەبینێ، کوڕم... جا وەرە بەو قوونە خاوێنەوە بچۆ چوکوور.

لە ناکاو بێ دەنگ بوو. بێ دەنگییەك وڵاتی داگرت. مـام خـەلیل سـەری بـەردابۆوە. ئـەو بایەی هەڵیکردبوو لەدوورەوە ئیزگیلێکی هێناو لە بەر پێیان لە عەرزی دا. مام خـەلیل هـەڵی گرتەوە و بە لاوەی نا و بایەکە دیسان رایماڵییەوە.

کە سەری هەڵێنا، عەلی چاوە تەڕەکانی ئەوی بینی. خەلیل لە بن لێوانەوە گوتی:

ـ ئاخ، بۆ بابە خوالێخۆشبووەکەت، یاخوا گۆڕەکەی پڕ بێ لە نوور...

پچڕپچڕ قسەکەی کردبوو:

ـ ئاخ، برایمی بابت، ئەگەر ئەو زیندوو بوایە، کوا ئەمن ئاوا شڕ دەبووم؟ بریا لەبری ئەو ئەمن مردبایەم. بریا پێکەوە مردبایەین. ئەمن نەدەبوو دوای ئەو بژیێم. برایم پیاوێکی زۆر نازدار بوو.

چاوی بڕییە چاوی عەلی:

ـ هەم نازدار بوو، هەمیش جوامێر! لەگەڵ ئەوەشدا دزێك بوو رۆڵەی لەبەر دایك هەڵدەگرت. تەنانەت جووت دەڵەکی سەرۆکی جەردە و رێگرەکانیش لێی تۆقیبوو. ئەمن لەگەڵ ئەو دەچوومە دزی. ئەمنیشی فێرە دزیی دەکرد. بۆیەش ئەمن بەبێ ئەوەی چاوم لەدەستی کەسێك بێ ئاوا خۆش ژیام. بەڵام کە پیر بووم... و برایمیش مرد... خوا ئەو پیرییە بەرێتەوە.... پیاو کە پیر بوو بۆ کوشتنێ باشە.

مام خەلیل لەو دەمەدا کە ئەو قسانەی بە عەلی دەگوتن، خۆی بڕوای بە قسەکانی خۆی هەبوو. و ئەو بڕوایەش لە روخسارە پێدا گرەکەیدا بەدی دەکرا:

ـ جا وەرە بەو پشتە کۆم و لەرزۆکەتەوە بچۆ چوکووری خوارەوو. ناچاریشی بڕۆی! دنیا ئاوایە... خوا بیبڕێ... ئەگەر بمرێ لە گوندێ بمێنمەوە عەلی!... بە تاقی تەنێ... دەڵێ مام خەلیل شێت بووە و لەسەری داوە... بە تاقی تەنێ و بێکەس و بێدەر لە برسان دەمرم. بۆ پیاو دەتوانێ بە تاقی تەنێ لە گوندێکی چۆڵدا بژیێ؟ هەر لە تەنیایی دیق دەکا. پێنج رۆژ و دە رۆژ نییە. مانگ و ساڵە. جڕ و جانەوەر دەیخۆن، مێروو گەرا لە چاویدا دەکەن. چاوی دەکۆڵن. کوا قەت هەبووە لە وەرزی لۆکەچنینەوەدا یەکێك لە ئاواییدا مابێتەوە؟ ئەمن لەوەتا خۆم ناسیوە شتی ئاوام نەبینیوە. ئەتۆ بڵێ، دیوتە؟

چاوی بڕیبووە نێو چاوەکانی "عەلی"یەوە:

ـ نا، نەمدیوە.

مام خەلیل کە زانیبووی "عەلی"ی دڵگران کردووە، بە لەبزێکی سەرکەوتووانەوە دەنگی هەڵێنا و گوتی:

ـ بریا ئەمنیش لەگەڵ برایم مردبایەم. بۆخۆم دەمردم ئەو رۆژەم نەدەدی. دیسان خۆ ئەگەر کوڕێکی وەك تۆشم هەبوایە، ئاییی.... خودا حەسەنێکی چڵمنی ملشکاوی داومەتێ، هەر

نەیدابا باشتر بوو. تەنانەت ئەسپێك گوێدرێژێکیشی نەدامێ. ئەرێ وەڵڵا، خۆزگە کوڕێکی وەك تۆم هەبوایە، سواری دەکردم. لەو ڕۆژەوە ئەو ئەسپە ڕەسەنە پێی لەو ماڵە نا... برایم لە ئۆزون یایلا (گەورە کوێستان) لە ئاغایەکی چەرکەزانی دزیبوو و هێنابووی.... خۆ ڕاستە دزێتییە، بەڵام بە حەڵاڵ دەرچوو. ئەوە چەند ساڵە لە ماڵی ئێوە دایە نەمردووە، بزر نەبووە... ئەدی کوڕم، عەلی، ئاوایە... حەسەنی من لانیکەم وەك تۆ ئەسپێکیشی نییە. گوێدرێژێکیش چییە نییەتی. ئەمن هەتیوە چڵمنێکی ئاوام پێ کوڕ نییە....

ئەوجار بە تووڕەیی‌یەوە بۆڵاندی:

ـ دەك، خوا پێستی سەری هەزار کوڕی وەك حەسەنە چڵمنی من بە لەعنەت بکا.

گورج لە جێی خۆی هەستا. بێ هیوا ببوو. بە پشتی چەماوە و بەلارەلار، ئێستا نا ئێستا بکەوێ و نەکەوێ، ئەوێی بەجێ هێشت:

"جا بۆ هەتیوی مرێمۆکێ قۆڵتڕ هیچی لێ هەڵدەوەرێ. ئەو هەتیوە لە برایم نییە. خوا دەزانێ مرێمۆك لە کێی گرتووە... ئەو پیرە قەحپەیە... هەتیوە، دەزانی کێ ئەو ئەسپە عارەبییەی هێناو لە بەر دەرکەتان بەستییەوە؟ کەس بەو شتە نازانێ. هیچ کەس... یانی ئەو مرێمۆکەش نازانێ؟ بۆ نازانێ مێردەکەی مێشی پێ لە دەمی خۆی دەرنەدەکرا؟ ئاخخخخخ دنیای هیچ و پووچ... وەرگەڕێی چەپ گەردی گەردوون. چت بەسەر مام خەلیل هێنا.

هەر بۆ تۆزە ئەسپ سواربوونێك... هەر بۆ ئەوەی تا چوکوور بە پێیان نەڕوا، دەبێ ماڵە و ماڵ بکا. دەبێ لە لای چاك و خراپ ئابڕووی بڕوا... بڕۆ هەی دنیای سۆزانی، ئەوێکی کەیف خۆشە گوێز بە تڕ دەشکێنێ. ئاخ خ خ خ خ خ خ خ خ سەرم لە گێژەوە دێ. پشتم خەریکە دەشکێ.

لە تووڕەیی‌یان دەمی وەك تەڵەی تەقیو پێکدا دابوو و دەیبۆڵاند.

عەلی هەر لەوێ بوو، ماوەیەك سەری داخست. دوایی سەری بەرز کردەوە و بە دوای مام "خەلیل"دا کە لاقەکانی تێك دەئالآن و دوور دەکەوتەوە لەبەرخۆیەوە گوتی:

ـ وەڵڵا بەو حاڵەوە ئەو قەت ناگاتە چوکووراوا.

هەر وا بە چیلکەیەك خەریك بوو عەرزەکەی شوێن شوێن دەکرد، دایکی لە پشتیەوە بەو تووڕەیی‌یەوە کە لە ناخیدا پەنگی خواردبۆوە هاواری کرد:

ـ عەلی، ئەوە ئەو پیرەسەیە چیی پێ‌گوتی؟

عەلی بە ترسەوە وەڵامی دایەوە:

ـ جا دەتەوێ چ بڵێ... پیرەمێردی لیقەوماو نەیدرکاند، بەڵام دەیویست بڵێ... چووزانم هەر وەك جاران...

مریمۆك:

ـ ئەو قسەیە تا مردن بکە ئالقەی گوێت عەلی... هەتا مریم* لەسەر دنیایە مابێ، هەتا پشووی لەبەرا مابێ، ئەو پیرە سەیە، ئەو بەرازە بۆگەنە پێ دەرکێفی ئەسپی من نانێ. پار سوارم کرد. لەبەر دڵی تۆ. برایم لە خەوێ هات و گوتی:" پیرە مریم، ئەوە تۆ چۆن دڵت بەرایی دەدا ئەو کابرایە سواری ئەسپی من بکەی؟ هەر ئەوە بوو وەفادارییەکەت؟ ئەو دەمەی ئەو لەسەر پشتی ئەسپەکەی من بەرەو چوکوور دەڕۆیشت، ئەمن گۆڕم هەڵدەتەکاند." پێم گوت:" برایم، لە دووی چووان مەچۆ... دڵم نەهات دڵی کوڕەکەت بشکێنم. لێم ببوورە!" ئەوە دیسان؟... خوا بەو ڕۆژە نەکا... ئەوجار خۆ ئەگەر ئیمامزادە "دێلیك تاش"یش لە قەبرەکەی زیندوو بێتەوە و پێم بڵێ:" مام خەلیلم بۆ سوار بکە." سواری ناکەم. پێی دەڵێم بڕۆ ئیمام زادە، تۆ وەدووی ئیمام زادەیی خۆت بکەوە و کارت بە سەر ئەسپی خەڵکەوە نەبێ." بێ لەوەش، ئەسپەکە نەخۆشە. خوا دەزانێ لە سەرێ خۆی پێ ناگیرێ. ئەو ئەسپە لە مام خەلیلیش پیرترە. گوێچکەی لێ شۆڕ بوونەتەوە و لیکاوی بە دەم و لووتیدا دێتە خوارێ. چاوم لێ کە عەلی، تۆ دەبێ لە پێشدا لە بن ئەو دیوارە درێژم بکەیت و گۆشاوگۆش سەرم ببڕی جا ئەو سواری ئەسپی منی بکەی. تێگەیشتی؟

عەلی هەستا و تەپوتۆزی پانتۆڵەکەی تەکاند و گوتی:

ـ خۆ ئەو داماوە نەیگوت:"سواری ئەسپەکەتم بکە".

ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و لەسەری ڕۆیشت:

ـ هەر ئەوەندەی گوت:"تاقەتم نەماوە. ئەژنۆکانم هێزیان دەبەردا نییە." بەزەییم زۆر پییدا دێتەوە.

مریمۆك چاوی لە ژێڵڵا هاتن. چی نەمابوو لەداخان قژە سەری خۆی هەموو بڕنێتەوە.

ـ ئەگەر ئەمڕۆش داوا نەکا، سبەی دەیکا. ئەوە بێ شەرمە. ئەمن دادەبەزێنێ و بۆخۆی سوار دەبێ. هەر ئەمن دەزانم ئەوە لە ڕەگەزی چ کافرێکە، چ شەیتانێکە.... ئەمن دەزانم و ئەو خودایەش کە لە ژوور سەرمانە. ئەو داوای دەکا، داوا دەکا...

دوایی لەسەر ئەو کۆتەرەی ئەوانی لەسەر دانیشتبوون دانیشت و گوتی:

---

* مریم دەربڕینێکی ناوچەییانەی مەریەمە.

داخی به جەرگم... داخەکەم بۆ ئەسپە رەسەنەکەم پڕ بووە. پشووی لێ بڕاوە... بەڵام خۆ ئەگەر جوانووش بوایە، ئەگەر سەت ئەسپی دیکەشم هەبوایە، دیسانیش سوارم نەدەکرد... ئەمن سواری ناکەم... ناتوانم سواری بکەم. ئەتۆ ئەوە ناناسی. بەسە دەمت لێک نێ. هەرکەسێك زگی پێی بسووتێ... بەسە قسەم پێ مەکە... ئۆی خوایە، یارەبی گوللەی گەرم وەگۆی مەمکی مام خەلیل بکەوێ...

ــ کچێ دایە وا مەڵێ... ماڵی پیری کاول بێ. کە ئاوام دی، ئاورم بۆی تیبەربوو. خوا ئەو زیندووبوونە بەزیاد نەکا... ئەو داماوە بەو لاق و لەتەرانەوە وا تێك دەناڵێن، ناگاتە چوکوور؟ پێت وا نییە لە ڕێگە دەمرێ؟...

ــ چش با بمرێ. چاوی دەرێ ئەو پیرە سەیە با بمرێ... با سواری ئەسپی من نەبێ و چۆنی دەمرێ با بمرێ...

عەلی ئەو لقە دارەی پێی بوو، فڕێی دا و گوتی:

ــ خۆ ئەگەر زانیبام هەردووکتانی پێ هەڵدەگیرێ، ئەویشم لە تەرکی ئەسپەکە و لە پشتەوەی تۆم سوار دەکرد دایە...

هێشتا قسەکە بە تەواوی لە زاری عەلی نەهاتبوە دەرەوە، مرێمۆك هەڵچوو و دەستی کرد بە هات و هاوار و جوێندان. کەس نەیدەزانی دەڵێ چی. وەك شێتانی لێ هاتبوو. عەلی ترسا. چوو پیلی گرت:

ــ نا، بە خودای، نا... سواری ناکەم. سواری ناکەم.

مرێمۆك برێك ئەهوەن بۆوە. ئەوجار دەتزانی دەڵێ چی:

ــ کوڕە ئەگەر سواری بکەی، ئەمن سەری خۆم هەڵدەگرم و وەکێوان دەکەوم و ئەوەندە دەڕۆم قەت نەمبینییەوە. دەڕۆم و ژەك و شیری ئەو مەمکانەمت لێ حەرام دەکەم...

مرێمۆك ژنێکی بەخۆوە و پشت کۆماوە بوو. چەناگەیەکی نووك تیژ و دەموچاوێکی درێژووکەی هەبوو کە ئێسقانەکانی کولمەی دەرپەڕیبوون. بە چاوە گەورە و جوانەکانیڕا دیار بوو بە گەنجی ژنێکی جوان و چاوڕەش بووە. ددانی لە زاردا نەمابوو و کولمەکانی تێك قوپیبوون. دەموچاوی، دەوروپشتی چاو و نێو چاوان و لێوەکانی پڕ ببوون لە چرچ و لۆچ. لە بن دەسماڵە لاپێچەکەیەوە برێك لە قژە سپی و تەنکە خەنە لێدراوەکەی کەوتبووە سەر تەوێڵی. لەسەری رۆیشت:

ــ ئیدی باسی ئەسپەکە نەکەیەوە. لێی گەڕێ با ئەو پیرە بەرازە هێندە بێ و بڕوا تا ئاوی ئەژنۆی وشك دەبێ...

و بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتەوە.

❊❊❊

"ئیزگیل هات و بەر دەرکەی گرت. ناکرێ هەڵی نەگری و نەیبەی."

"مام خەلیل" چەند جارێکی دیکەش بەربینگی بە عەلی گرتەوە. هەر جارێکی دەچوو زیاتر لە پێشوو سکالای لە وەزعەکەی خۆی بوو و برێك تاریفی بابی عەلیی دەکرد و دوایی بە هیوابڕاوی و تووڕەیی دەگەڕایەوە.

گوندەکە چوار ئەسپی تێدا بوو. چووە بەر دەرکی خاوەن ئەسپەکانی دیکەش. لای ئەوانیش لالایەوە و پێی گوتن، هێزی دەست و ئەژنۆی نییە. بەلام هیچ کامەیان بێ پێچ و پەنا پێیان نەگوت سواری دەکەن.

ـ کوڕە با بۆخۆیان تێ بگەن ئەو تووتکە سەیانە. با بلێن وەرە سوار بە! بەلام هیچیان نەیان گوت:" کوڕە سەرت سلامەت بێ مام خەلیل! ئەگەر ئەژنۆت دەلەرزن وەرە سواری ئەسپی مە بە!" گوێیان ڕاگرت، گوێیان ڕاگرت، بەلام بەرووی خۆیان نەهێناو ڕوویان وەرگێڕاو ڕۆیشتن:"ئێوە نازانن هەی تووتکە سەگینە، زۆر لە مێژە لۆکە لە چوکوور پشکووتووە، زۆر دەمێکە ئیزگیل لە پێدەشت هەلکەنراوە و هاتووە بەر دەرکەی گرتووە. ئەمن دەلێم بەو قوونە خاوێنەمەوە ناگەمە چوکوور. ناشتوانم هەوالی لۆکە پشکووتنتان بدەمێ. یانی هیچتان لە دەست نایە؟ کوڕە ئەمن ناتوانم بەرێدا بڕۆم."

ڕۆژ هاتن و ڕابردن. مام خەلیل وەك سەرخۆشان لە نێو دێدا دەخولایەوە و خەو نەدەچووە چاوانییەوە. لەبەر خۆیەوە دەیگوت:"خۆزگە مردبام. مەرگ زۆر باشترە. با بگەنە چوکوور، جا دەزانن هەموو خەلکی، هەموو گوندییەکانی دەوروپشت، زۆر لەمێژە سەرەوخوار چوون. تەنانەت نیوە لۆکەشیان ڕنیوە. یانی ئەو دەم نالێن مام خەلیل، ئەمسال مالوێرانت کردین؟ ژن و منداڵت برسی کردین؟ نالێن "عادیل ئەفەنیت تێ بەردایین"؟ کام لە پێستی سەری داخنن. دەمبرژێنن و دەمخۆن. ئەو دەم دەلێم، هاوڕێیان، ئەمن ئیتر پیر بوومە، خەرەفاوم، لەمن ڕابردووە. لەمەودوا دەبێ یەکێکی دیکە هەوالی پشکووتنی لۆکەتان بۆ بێنێ. ئەوە سێ سالی ڕەبەقە، قەت وابووە ئێوە ڕۆژێك درەنگتر یان زووتر بەرمە لۆکەڕنینێ؟ دەلێم: هەر لەگەل تەقینی قۆزاخەی لۆکە و دەرکەوتنی هێشووە سپییەکەی ئێوە گەیشتوونەتە ئەوێ. بەسە، بەس. ئیتر ئەرکی من تەواو بووە. لە کۆلم بنەوە. بەلام کەس گوێی لێ نییە. گوندی گوێ بەو قسانە نادەن. ئەدی خۆ ئەمن بەو لاقانە ناگەمە چوکووری خوارێ. ئەگەر یەکێك سواری ئەسپەکەیم نەکا، ناتوانم وەرێ کەوم. ناشتوانم هەوالی پشکووتنی لۆکە بە گوندییەکان بدەم."

پێی نەدەگوتن. وەك بڵێی هەموو ئاوایی‌یەکەی چاویان لە زاری ئەو بڕیوە:

ــ درەنگ نەبووە مام خەلیل؟ چەندی ماوە؟...

ــ پار ئەو دەمانە؟... ئەی بابەڕۆ، پار ئەو دەمانە، لە مێژبوو گەیبووینە چوکوور.

ــ لەوانەیە ئەمساڵ لەبەر ئەوەی هەواکەی سارد بووە و، لۆکە درەنگ پشکووتبێ؟... ئەڵڵاهو ئەکبەر!

ــ مام خەلیل، ئیزگیل هاتووە و هەموو وڵاتی داگرتووە؟ ئاخۆ هێشتا ریزی قەتاری قاز و قورینگ بەرەو تەکەچ هەڵنەفڕیوە؟

ــ کوڕە مام خەلیل ئاگات لێ بێ لێت تێك نەچێ...

ــ ئەوەی بەسەهوو ناچێ یەکەم خوایە و دوایی مام خەلیل.

ــ دەست هەڵگرن. ئەوەندە سەر مەخەنە سەر ئەو کابرایە. مام خەلیل کەی بە هەڵەی بردوون کە ئەمجارەش بتانبا؟ دیارە شتێك دەزانێ.

ــ ئەمن دەترسم نەکا شتێکی لە بن سەریدا بێ!

ــ ئەمساڵ مام خەلیل زۆر سەیرە.

ــ مام خەلیل بە سەهوو ناچێ.

ــ بابە، مام خەلیل هەرنەبێ بڵێ، چەند رۆژی دیکەی ماوە؟...

جار و بارە راست یان درۆ جوابی هەندێکیانی دەدایەوە. جوێنی بە هەندێکیان دەدا و گوێی بە قسەی هەندێکیش هەر نەدەدا.

"ئیزگیل هات و بەردەرکەی گرت. ناکرێ هەڵی‌نەگری و نەیبەی."

بەڵام ئاخری غیرەتی نایە بەرخۆی و وەك ساڵی ساڵان چڵە ئیزگیلی هەڵگرتەوە. ساڵی ساڵان، هەر پڕی بە ئیزگلیلدا دەکرد، لە خۆشی‌یان باڵی دەگرت و پێدەکەنی و هەڵدەپەڕی. ئەمساڵێش چەندی توانیی هەوڵی دا قەڵافەتێکی شادی هەبێ.

ئەو کات بە هەڵەداوان خۆی دەگەیاندە ماڵی کوێخا. ئەمساڵێش بڕێك بە هەشتاو رۆیشت. ئەوانەی لە ئاواییدا دیتبوویان، چڵە ئیزگیلێك بە دەستەوە و هەوڵ دەدا غار بدا بەڵام دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە گوتیان:

ــ لۆکە لە چوکوور پشکووتووە. پشکووتووە بەڵام مام خەلیل ئیدی ئەمساڵ تەواو پەکی کەوتووەو. هەڵاتنی چی، لێقەوماوە ناتوانێ راست بەڕێیەشدا بڕوا.

کوێخا بەپیریەوە هاتە بەردەرگا و لێی پرسی:

ـ ئەمساڵ لۆکە چ درەنگ پشکووت؟

و لەسەر رۆیشت:

ـ لە تۆم رانەدەدیت کلکت لە کلکی گوندییەکانی دیکە ئالێنی و بەرم لێ بگری. لە تۆ ناوەشێتەوە. شەرمت لەو ریشە سپییەت نەکرد؟

مام خەلیل وەڵامی دایەوە:

ـ ئاگات لە دەمت بێ کوێخا. بابیشت رێی نەدەکەوت* ئاوا قسە لەگەڵ من بکا.

جاری جاران، ئەگەر یەکێك ئاوای دواندبایە، دنیای خراپ دەکرد. بەڵام ئیتر ئێستا بەوەندە وازی هێنابوو کە بڵێ:"ئاگات لە دەمت بێ. بەکێم لێ تێگەیوی؟"

هەموو ساڵێ کە ئیزگیلی دەهێنا دەیگوت:

ـ ئیزگیل هات و لە دەرگای دا. قەتارە ئیزگیلێکیشم بینی کە وەك قەتاری قولینگان بەرەو چیای تەکەچ هەڵدەکشان.

جا ئەوەندە بە کەفوکوڵەوە ئەوەی دەگوت هەر مەپرسە.

کەچی ئێستا بە حاڵەحاڵ قسەی پێ دەکرا. کوێخا لە جوابیدا هەمیشە دەیگوت:

ـ بەڵام درۆی چاکیش دەکەی ها!

ئەو گوندییانەش کە بە دەوریانەوە بوون دەیانداپە قاقای پێکەنین.

دوایی فەرمانی دەدا، جارِ بکێشن با هەمووان بۆ چوونی چوکووری خوارووو ئامادە بن.

بەڵام ئەمساڵ کوێخا نەیگوت:"درۆی چاك دەکەی مامە!." و ئەو گوندییانەی لەوێش بوون پێ نەکەنین. بەساڵاچووەکان گوتیان:" ئەمساڵ شتێکی خراپ دەقەومێ".

جارچی جارِی هێشت. هەموو ساڵێ دەنگەکەی زایەڵەی هەبوو.

هەمووان گوتیان:"چ قەوماوە. ئەو خەفەتبارییە هۆی چییە؟ خوا وەخێری گێرێ."

مام خەلیل ئیزگیلەکەی دایە کوێخا و گەڕایەوە ماڵێ و دەرگای لەسەر خۆی پێوە دا و هەتا رۆژی کۆبوونەوە گەورەکەی دێ نەهاتە دەر.

---

* رێی نەدەکەوت: لەو ئاستەدا نەبوو. رێی ناکەوێ واتە لەو ئاستەدا نییە. ئەوەندە شیاو نییە.

# ٢

ئیزگیل بە درێژایی مانگی خەرمانان (دوایین مانگی هاوین*) هەتا پاییزێ ڕەنگەکەی سوورە. وەك هەورێکی سوور، وەك مژێکی سوور، بەژ و پێدەشت دادەپۆشێ. وەك ڕێگەیەکی سوور، وەك کەژوویەکی پێچەڵاوپێچ کە هەتاوی لە پشتەوە بێت، یان قەتارێکی قاز و قولینگان و پۆلە باڵندەیەك کە بە قاسپە قاسپ و قریوە و جریوە بە ئاسمانیدا تێپەڕن، دەکرێتەوە و وێك دێتەوە، دەکەوێ و هەڵدەستێتەوە، وێك دێ و بڵاو دەبێتەوە و لەگەڵ گژەباکان، پێدەشتەکە دەتەنێتەوە و رایدەماڵێ و لە هیچ کوێ ناحەوێتەوە و هەر ناسرەوێ.

ئیزگیل شای گیاکان و دڕکی پێدەشتە. هاوینان، کە ڕەنگەکەی سەوز و بلاوێنە، هەم ڕەگەکانی و هەمیش دڕکەکانی توند و پتەون. دیمەنەکەی گیان وەبەر پێدەشتەکە دێنێ و ژیانی پێ دەبەخشێ. کە وشك بۆوە، ڕەگەکەی ناسك دەبێ بەڵام دڕکەکانی جار بە جار توندتر دەبن و دوایی ئەو بایەی هەڵدەکات، لەگەڵ خۆ رایدەدا و دەیبا.

---

* خەرمانان: مانگە کوردییەکان بە پێی گەڕانی وەرزەکان دابەش کراون. بەڵام لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان تۆزە جیاوازییەك هەیە. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان مانگەکانی هاوین بەو شێوەیەن. پووشپەڕ، گەلاوێژ، خەرمانان. لە باشوور گەلاوێژ پێش خەرمانان دەکەوێ. ئەودندەی بیستوومە لە بەساڵاچووانی موکریان، لەوێندەر خەلەو خەرمان کەوتووەتە دوایین مانگی هاوین و جار هەبووە بارانی پەڵەی پاییز لێی داوە. دیارە درەنگ هەڵگرتنەوەی خەلەوخەرمان هۆی بێ ئیمکاناتی بووە. ئەگینا ئێستا بەر لە هاتنی مانگی گەلاوێژ کۆی دەکەنەوە و کا دەبەنەوە کادێن. بەڵام مانگی گەلاوێژ بەپێی سووڕانی ئەستێرەکانیش بێ دووەم مانگی هاوینە و لە نیوەی دووەمی ئەو مانگەدا خەڵك دەڵێن گەلاوێژ ئەنگووت، یان گەلاوێژ کەوت. لەوێوە ئیتر ڕۆژەکان لەکورتیی دەدەن و شەو درێژ دەبن.

لە نێوەڕاستی پاییزەوە، گژە باکان تووڕەتر دەبن و ئیزگیلیش هەر وەتر. ڕەنگی ئیزگیل زەرد هەڵدەگەڕێ. چنگی لە خاك گیر کردووە و لاساری دەکا و هەڵناکەنرێ. بەڵام وردە وردە ڕەگەکانی باریکتر دەبنەوە. گژەبای نیوەی دووەمی سەرماوەز وا هەڵدەکا، هیچ ئیزگیلێك خۆ لەبەر پەلامارەکەی ناگرێ. گڤەگڤی بە هەموو پێدەشتەکەی تەنیوەتەوە. سەدان و هەزاران ئیزگیل بە پێدەشتەکە وەردەبن. پێدەشتەکە لە بریقەی زەرد و زێڕینی ئیزگیلدا نوقم دەبێ. وەك بڵێی تیرۆژی خۆرەتاوە تێدا شەپۆل ئەدا و لە نێو ئەو درەوشانەوەیەدا خۆی وێك دێنێ و لەبەر یەك دەکشێتەوە. بەبێ ئیزگیل، پێدەشتی چی؟.

مام خەلیل دەڵێ: لەگەڵ هاتنی ئیزگیل خۆشی و کامەرانی روو لەو دەشتە کاکی بە کاکی و بێ گیانە دەکات. ئەو خاکە چۆڵ و بێ گیانە بەبێ ئیزگیل بۆ چی دەبێ؟

لە پێدەشتەوە قرچە قرچ و دەنگەدەنگی شکان دێ. مام خەلیل گوێی بە زەوییەوە دەنێ و گوێ دەداتە ئەو دەنگەدەنگەی لە ناخی زەوییەوە دێ. خاکی پێدەشت دەنگبەرێکی باشە: دەنگی مێرووەکان لە زەویدا... هێلانەی باڵندان... باڵندەیەك هەیە ڕەنگێکی شینی تۆخی هەیە، شینێکی درەوشاوە. لە دەم چۆم و رووباران، کەندان دەکۆڵێ و کونی تێ دەکا و دەچێتە ناخی زەوییەوە و هێلانەکەی لەوێدا ساز دەکا. دەنگی هەڵکۆڵینی هێلانەکەی دێ. دەنگی جووجەڵەکانی دەبیستریّ و، هەر وەها دەنگی گۆرانییەکی زۆر دووریش... و دەکرێ بە قرچەی شکانی ڕەگی ئیزگیلیشدا بزانین گەنگێ هەڵدەکەنرێت و دێ. لە تەلەگراف باشترە. گوێچکەتی پێوە بنێ و گوێت لەو دەنگانە بێ وا قەت نەتبیستوونە. دەنگی شمشاڵی شوانێك دەبیستی کە لەو سەری دنیاوە دێ. گوێت لە هەوایەك دەبێ هەر مەپرسە: سەیر و پڕ لە زایەڵە. هەوایەکی پڕ لە گوڵ. گوێی پێوە بنێ و زرمەی ناڵی ئەو ئەسپانەت گوێ لێ بێ کە لە مەودای ڕۆژە ڕێیەکەوە دەڕۆن. هەموو کەس ئەو دەنگانە نابیستێ. دەبێ گوێچکەی وەك گوێی مام خەلیلت هەبێ کە هەموو دەنگێك لێك هەڵداوێرێ..."

مام خەلیل بەر لە هەموو شتێ حەزی لێیە بە چەند سەعاتان گوێ بە عەرزییەوە بنێ و دەنگەکانی زەویی گوێ لێ بێ. هەر لە تافی لاوێتییەوە هەر وا بووە.

لەگەڵ بۆنی پاییز دێ، خەڵکی گوندەکانی داوێنی چیاکانی تۆرووس بە پانەوە بۆ کارکردنی بەرەو چوکووراوای خواروو دەکەونە رێ. وای لێ دێ تەنانەت مێشێکیش چییە بەجێ نامێنێ. ئەو گوندانە لەسەر زەوییەکی شۆرەکات دامەزراون و لە بێ ئاوییان هەڵبزرکاون و هیچ درەختێکیان تیا نییە و شەپۆل شەپۆل لە لاپاڵی چیاکەوە بەرەو پێدەشتەکە کشاون.

رۆحلەبەرێك لە ئاواییدا نامێنێتەوە. نەخۆش و پیرو پەککەوتە و تەنانەت مەلۆتکەکانیش دەبەن. تەنانەت چاودێرێکیش لە گوندە چۆڵەکاندا ناهێڵنەوە. ئەوە دەغڵ و دانیشیان هەروا لە چاڵ دایە و نوێن و بانیان لەسەر هەرزاڵ و جلوبەرگیان لە یەغداناندا و تەنانەت گرانبایترین شت و مەك و جیازەکانیشیان بەجێ دێڵن. کەس سەر بەو گوندە چۆڵ و هۆڵانەدا ناکات بۆ ئەوەی تەنانەت پەڕە کایەك دەست بداتێ. ئاخۆ ئەو گوندانە دزییان لێ ناکرێ؟ بۆچی دەش- کرێ. بەڵام کاتێك دێ چۆڵ و بەتاڵە و کەسی تێدا نییە، شتی وا نابێ. هیچ کەس ناتوانێ بێتە دەرێ و بچێتە نێو دێ. ئاخری رۆژێ دادێ گوندییەکان لە چوکووراوا دەگەڕێنەوە، ئەو کاتە تیهەڵدان و کچ هەڵگرتن و دزی و فزییش دەست پێ دەکا.

لە کۆندا، جووت دەڵەك ناوێك لەو ناوچەیە بوو کە سەردەستەی دز و رێگرەکان بوو. چەتەیەکی ئەوەندە لەزەبر بوو چی حەزی لێی بوایە دەیکرد. چەتەیەکی زاڵم و زۆردار و دڵڕەق و بێ بەزەیی بوو. لە هەر شوێنێ بۆنی پارەی بۆ هاتبا، هەر چۆنێك با، تەنانەت ئەگەر کوشتن و برین و خنکاندنی ژن و منداڵیشی پێوە با، ئەو پارەیەی هەر دەهێنا. رۆژێك لە رۆژان سەرباز، ئەو جووت دەڵەکە، ئەو سەردەستەی زۆڵانەیان راو نا، سەربازەکان چەتە ناودارەکەیان هەتا ئەودیوی چیاکانی تۆرووس راو نا و لەوێ شوێنیان بزر کرد. جووت دەڵەك گەیشتە بەر ئاواییەکە. ماندوو و شەکەت و برسی و تینوو و شلەژاو بوو. دەستی خستە بەر چەناگەی و فکر هەڵیگرت. هەستا و رووی کردە داروودەستەکەی و گوتی:" برادەرینە، من ناتوانم بەسەر ئەو گوندە چۆڵەی دا بدەم و زگم تێر بکەم. شتی وا نابێ." نەیتوانی بچێتە نێو دێ و تەنانەت شەقاوێکیشی ناویشت. داروودەستەکەی پێیان گوت:"کاکی جووت دەڵەك، خۆ ئێمە ناتوانین لەبەر جوامێرییەکەی تۆ لەبرسانا بمرین. برسیمانە، برستمان لێ براوە. پڕ پڕە لە نوێن، نوێنیش چی! لە لۆکەی چوکووراوا. دوو مانگە خەو لە چاومان نەگەڕاوە. با بچین تێر لێی بنووین."

جووت دەڵەك دیسانیش دەستی نایە بن چەناگەی و خەیاڵ هەڵیگرتەوە. نوقمی خەیاڵ بوو... دوایی سەری هەڵێنا. ئاخ، لەو تووڕەییەی! چاوی بڵێسەی لێ دەبۆوە. گوتی:"ناکرێ براینە، من هەموو شتێ دەکەم، لە هیچ ناپرینگێمەوە، بەڵام ئەوەیانم پێ ناکرێ. تەنانەت ئەلێرە لە برسانا رەقی هەڵێم و گیانم دەرچێ، ناتوانم بچمە نێو دێیەکی چۆڵ و شتێك بخۆم. دیارە برسیم، خەریکە لە پێ دەکەوم. لە بێ خەوییان وەختە بمرم و لەسەر پێ خۆم پێ ناگیرێ. ئەگەر نوێنێکی لە لۆکەی چوکووراوام دەست بکەوێ، دەچمە ناوی و حەوتوویەك لێ دەنووم. هێندە لەسەر ئەو زەوییە رەق و تەقە نووستوومە، هەموو پەراسووم شین هەڵگەڕاون. دەمبینن چۆنم. ماندووم. بەڵام ناتوانم بچم و لەو نوینانەدا بنووم.

قەت ناتوانم. ئەمن ناتوانم یەکەم کەس بم کە ئەو نەریتە دەشکێنێ. ئەوانەی سەت دووسەت، سێ سەت ساڵی دیکە دێن، چم پێ دەڵێن؟ دەڵێن، ئەو گوندییانە وا و وا دەژیان. لە مانگی لۆکە چنینەوەدا لە چوکووراوا لەو گوندانەدا گورگ و مەڕ پێکەوەیان ئاو دەخواردەوە. بەڵام بێ‌ئاموسێکی گوو بەگۆڕ بە ناوی جووت دەڵەك پەیدا بوو و بۆ یەکەمین جار ئەو نەریتەی شکاند. گوندە چۆڵەکانی تالان کرد. تالانکردنی گوندی چۆڵ میراتی ئەوە. نا برادەرینە، ئەمن ناتوانم لێگەڕێم قسەی ناوام لە پشتە سەر بکەن. ناتوانم لێگەڕێم هەتا رۆژەکەی پەسلانێ، حەوت پشتم و ژن و منداڵ و ئێسقانەکانیشم گۆڕ هەڵتەکێنن. ئەگەر ئەلێرە و لەبەر ئەم دێیە لە برسێتی و تینوێتیا بمرین، دەزانن چیمان پێ دەڵێن؟ دەڵێن: مام جووت دەڵەکێك هەبوو، خوێنمژ بوو، سەردەستەی لاپرەسەن و هەتیومەتیوان بوو، بەڵام لێرە، لەبەردەم ئەو دێیە، لە برسانا مرد. گوندە چۆڵەکە پڕ بوو لە نان و رۆن و هەنگوین و، نوێنی لێ بوو هەمووی لە لۆکەی چوکوور، جا ئەو کە چاوەکانی لەبەر شەوخوونی هەڵنەدەهاتن، نەیویست بچێتە نێو دێ و دەست لە زەنگیانەیەکیش بدا. هەی بژی هەزار جار بژی پیاو، بژی! هەزار جاران، دوو هەزار جاران، رەحمەت لەو پیاوەی کە لەگەڵ برادەرە جوامێرەکانیا لە پێناوی حەقیقەتدا گیانی دا. یاخوا گۆڕیان پڕ بێ لە نوور.”

برادەرەکانی بە پاڕانەوە لە وەڵامیدا گوتیان:” با بچین، هەرچییەکمان هەڵگرت، پارەی لە جێ دابنێین. دەرگای ماڵەکە بکەینە شایەت و سەودا لەگەڵ کولانەکەی بکەین. یان ئەگەر دەڵێی سەودا لەگەڵ گاسن و ئامووڕەکە بکەین. وایە گاسن ناخوا و نانوێ، بەڵام وەك بنیادەم وایە. بۆ! کێیە زەوی دەکێڵێ و وەردی دەداتەوە؟ جووت دەڵەك هەڵچوو و گوتی:” ئەوە پێم گوتن، برادەرینە! شتی وا نابێ و ناکرێ. خۆشتان ماندوو مەکەن. ئەمن ناتوانم کاری وا نامرۆڤانە بکەم. ئەگەر دەتانەوێ لە جێی دوورتر، بەسەر گوندی پڕ لە خەڵکدا بدەین، با بچین و وایان رووت بکەین تەنانەت پەڕە کایەکیش چییە بۆیان بەجێ نەهێڵین. ئەگەر حەز دەکەن با هەرچی خەڵکی ئەو گوندانەن وەك بەرخ سەریان ببڕین. دەی باشە دەڵێن چی؟ ئەگەر ناشتانەوێ و ناگەنە ئەوێ، ناچارین راوەستین و چاوەڕێ بین تا ئەو خەڵکە لە چوکووراوا دەگەڕێنەوە. با ئەو کات گوندەکە تالان بکەین و کچەکانیشان بەرین. رۆن و هەنگوینەکانیشان رامالین. هیچ رێگە چارەیەکی دیکە نییە، چووە گوێتانەوە براینە؟...

مام خەلیل لەو رۆژانەدا چیی جنێوە بۆ هێسك و پرووسکەکانی جووت دەڵەکی دەنێرێ:” ئەگەر ئەو گووی لەو نەریتە کردبایە و دەست کردبا بە تالانی گوندە چۆڵەکان، ئیتر هەموو گوندییەکان نەدەچوونە چوکوور و لانیکەم پیر و پەککەوتەکانیان لە دیدا دەهێشتەوە و دەڕۆیشتن. گوو بە گۆڕەکەی ئەو جووت دەڵەکە سەگبابە گۆڕبەگۆڕە....”

کاروباری گوندییەکان لە چوکووراوا مانگێك هەتا مانگ و نیوێك دەخایەنێ. کاتێ لە کاریش بوونەوە، دیسانیش وەك هاتوون، ئاواش بە کۆمەڵ بەرەو گوندەکەیان دەگەڕێنەوە. هەر وا بووە و هەر وا چووە. واتە زۆربەی هەرە زۆری داهاتی ئەو بەرەی "ئۆزون یایلا" لە چوکووراوایە. بۆ وێنە دەڵێن:"چیی داهاتی لە زەوی و مانگا و بزن و مەڕەکانمە ئەوەندەیە و داهاتی چوکووراواشم ئەوەندە..."

"عادیل ئەفەنی" کە دووکانێکی لە ئاواییەکەدا کردۆتەوە و شت و مەك بە خەڵکی گوندی دەفرۆشێ، دەپرسێ"

ـ چەند سەر خیزانن؟

ـ دە کەسین.

ـ هەر دە کەسەکەتان لۆکە دەچننەوە؟

ـ یەکێکیان هێشتا مەلۆتکەیە "کاکە"، تازە پێنج ڕۆژە لە دایك بووە. منداڵێکی چاو ڕەش...

عادیل ئەفەنی لە پێشدا لە مێشکی خۆیدا لێکی دەداتەوە، ئەگەر بڕوا نەکا، دەپرسێ، دوایی بەپێی هەر سەرە خیزانێك شتێکیان بە قەرز دەداتێ و لە دەفتەرە زەردەکەیدا دەینووسێتەوە. دەزانێ دوای گەڕانەوە لە چوکووراوا، ئەگەر مردنێ لە گۆڕێ نەبێ و ئەگەر یەکێك لە داخانا سەری خۆی هەڵنەگرتبێ و نەیدابێتە چیا و بیابانان، چیی قەرزی لە دەفتەرەکەیا نووسیوێتی، بێ کەم و زۆر وەریدەگرێتەوە. هەر بۆیەش داهاتەکەی چوکووراوا هێندە جێی دڵنیایییە.

*** 

گوند خەریك بوو ئامادە دەبوو. هاتوچۆیەکان، بانگکردنی یەکتری لەو ماڵ بۆ ئەو ماڵ....لە لایەکەوە دەنگی شین و گریان دەهات و لە لایەکی دیکەوە تریقەی پێکەنین... هەرای جارچی هەموو گوندی دەتەنییەوە و جار و بارە ڕادەوەستا و بانگی دەهێشت:"هۆی ی ی خەڵکینە، دوایی نەڵێن گوێمان لێ نەبووە. هەر دوو ڕۆژی دیکە ماوە وەڕێ کەوین. دەی گورج بن! خەڵکی گوندەکانی دیکە زۆر دەمێکە گەیشتوونەتە چوکوور. دەی خێرا کەن. هەرکەس ئامادە نەبێ غەرامە دەکرێ. کوێخا و ئەنجوومەنی گوندی فەرمانی داوە." ناڵە و نووزەی نەخۆشان و بۆڵەبۆڵی بەساڵاچووان.... هەوڵی ئەوانەی نەخۆشیان هەبوو بۆ هەڵگرتنی نەخۆشەکەیان بەرەو چوکوور... یارمەتیدانی یەکتری... قسەی پاشەملێ و جنێو و ناو و ناتۆرە.

لە نێو ئەو هات و هاوارەدا، ئەمساڵ دەتگوت لـە ئاوایـیدا شـتێك بـە شـاراوەیی خەریکـە دەقەومێ و بۆنی کۆمەڵێك بڕیاری تایبەت دێ. ئەو بڕیارە لە روخساری هەمووان‌دا هەر لـە ژن و منداڵەوە بگرە هەتا کچۆڵە و لاو و پیرەژنەکان و پیرەمێردان، بەدی دەکرا. بەبێ ئەوەی کەس وستەی بێ، هەر بە نیگا یـەکتریان تـێ دەگەیانـد:"ئامـان، نەکـەن، نەکـەن، بیـدرکێنن. نـەکا بگاتەوە گوێی، هەر سۆسەی بکا، ناهێڵێ!"

خەڵکی ئاوایی پێنج ساڵ بوو بیریان لەوە دەکردەوە بـەڵام نەیانـدەتوانی سـاغ ببنـەوە. هـەر کەسـە و لە ئاشێکی لێ دەکرد. بەڵام ئەمساڵ ""عەلی"یە درێژ" "تاشباش ئۆغلو" و "ئۆکـسوز ئۆغلان" هەرسێکیان کلکیان تێـك ئاڵانـدبوو و هـەوڵیان دابـوو و زۆرینـەی خـەڵکی گونـدی و ئەوانەی فیزماڵکیان دابوویە، قایل کردبوو. واتە خەڵکیان تەواو تـێ گەیانـدبوو. گونـدی هـەر ئەوەندەی شتێك چووە مێشکییەوە و بڵێ:"ئاوا"! ئیتر لێی گەڕێ.

لە کەرەی بەیانییەوە، تاشباش ئۆغلو و "عەلی"یە درێژ وەگونـد کـەوتبوون و بـەبێ ئـەوەی سەرنجی کەس راکێشن، سەری ئەو ماڵانەیان دەدا کە متمانەیان پێیـان هـەبوو و بـە سـرتە بـە پیاوی ماڵەکەیانیان دەگوت:"ماڵی ئۆکسوز دۆران" و، بەپەلە وەدەر دەکەوتن.

ماڵی ئۆکسوز دۆران لە دەرەوەی دێ بوو. دوانیوەڕۆ خەڵکێکی زۆر لەوێ کۆ بوونەوە. هەتا "عەلی"یە درێژ و تاشباش ئۆغلو نەهاتبوون، هەر کەسە و جۆرێکی دەڕست.

تاشباش ئۆغلو هات و لە لاشیپانەی دەرگاکەدا دانیشت. تەزبێحە زەردەکـەی لـە گیرفـانی دەرهێنا. سەری بەردایەوە و دوای ئەوەی ماوەیەك چاوی لە تەزبێحەکەی بڕی، سـەری هـەڵێنا. دەتگوت ئارەقەی کردووە. قەڵافەتێکی زۆر شێلگیرانەی هەبوو و ئەوەندە توندوتۆڵ بـوو باڵـدار بەسەریدا فڕیبا باڵی دەوەرین. دەموچاوێکی وەك هی ئەسپ لاواز و درێژووکە ببوو.

دوای ئەوەی چاوێکی بە خەڵکەکەدا گێڕا گوتی:

ـ برادەرینە، ئاخۆ هەمووماں سوورین لەسەر قسەی خۆمان؟

لەو سەری ژوورەکەوە دەنگێك هەستا. دەنگی گوموش ئۆغلو بوو:

ـ بەڵێ، سوورین. تاشباش ئۆغلو! گوتوومانە:" یان مەرگ یان ژیان."

یەکێکی تر:

ـ ئیتر ناهێڵین مافمان بخۆن. کوڕە خۆ نانیان لە خوێنمان کوشی*.

---

*نان تێ‌کوشین: تێکوشین. تلیتکردن(تێ‌کوشی بە هیوای جیران وشکە). نان لە خوێن کوشین: واتە خوێنمانیان مژی.

پیره پیاوێك بە منگەمنگ گوتی:

ــ تێیدەکوشن.

پێنج کەس لە نێو ئاپۆراکەدا جگەرەیان بەبا دەکرد. تاشباش ئۆغلۆ گوتی:

ــ دەبێ هەموومان لە رووی کوێخا راوەستین. بەڵام هەمووومان پێکەوە. ئەگەر دووانمان بکشێینەوە، ئەوانیترمان دەهاڕن. با نەهێڵین کەلێن بخەنە بەرەکەمانەوە.

گوتیان:"ناهێڵین."

ــ قەبوولتانە، هەرکەس لای دا سێ تەلاقەی بکەوێ؟

هەمووان کەفوکوڵ گرتبوونی و هاواریان کرد:

ــ قەبوولمانە.

ماوەیەك هەمووان پێکەوە قسەیان دەکرد و کەس لێیان تێنەدەگەیشت.

لەو جەنگەیەدا، ئۆکسوز دۆران دەستی کرد بە قسەکردن. متمانەبەخۆیی و غرووری خانەخوێبوونەکە بە سەر و روویەوە دیار بوو.

ـ دەبێ لە نێو خۆماندا دوو کەس هەڵبژێرین. ئەوان دەبێ بچن و بە کوێخا بڵێن:"کوێخا یانی باوکی راستەقینەی ئاوایی. کوێخا خدری باوکیشت وا بوو. بەڵام تۆ کلکت لە کلکی بەکرە شێتی گەوواد هاڵاندووە و بەرتیلێ وەردەگری و وەك زەروو خوێنی گوندییەکان دەمژی... لەگەڵ ئەو بوویەتە یەك و بەرتیلێ وەردەگری کامە کێڵگە بێ رسق و بەرهەمە و تەنانەت قۆزاغەلۆکەیەکیش چییە لێی دەست ناکەوێ، دەمانێریە ئەوێ. ئاخر کاتێك خەڵکی گوندەکانی دیکە ئەو مەزرا و کێڵگەیەیان بە کەیفێ نییە و نایانەوێ بچنە ئەوێ و توخنی ناکەون و لە کێڵگەی بەپیت و بەرەکەتی دیکە رۆژێ سەت کیلۆ لۆکە کۆدەکەنەوە، گوندییەکانی ئێمە تەنانەت رۆژێ بیست و پێنج کیلۆشیان پێ کۆ ناکرێتەوە. ئاخر بۆیە خەڵکی گوندەکانی دیکە بە باخەڵێك پڕ پڕ لە دراوەوە دەگەڕێنەوە کەچی هی ئێمەش ئەوەندەیان پێ نابڕێ قەرز و قۆڵەی عادیل ئەفەنیی پێ بدەنەوە. باشە ئەوە تۆ دڵ و ویژدانت نییە. ئەوە تۆ ئینسان نی؟ راستە بوویەتە کوێخا، بەڵام بۆ خەڵکی ئەو گوندە نی؟ وەرە بابە، با بزانین چەند بەرتیل وەردەگری بۆخۆمان دەتدەینێ و رەگەڵ ئێمە کەوە. لێگەڕێ بچینە ئەو مەزرا و کێڵگەیەی خۆمان حەزمان لێیەتی و هەڵمانبژاردووە. باشە ئەگەر ناشتەوێ هاوڕێ و هاومالمان بی، کەیفی خۆتە بەڵام لەمەودوا ئێمە کوێمان حەز لێ بێ دەچینە ئەوێ. هەر مەزرا و کێڵگەیەکی بەکرە شێت دەستی لەسەر دابنێ توخنی نابین. " ئێمە دەبێ پشتی نوێنەرەکانمان بگرین بۆ ئەوەی چاویان نەترسێ و بەهێز بن.

تاشباش ئۆغلو گوتی:

ــ دۆران راست دەکا:" دەبێ دوو کەس هەڵبژێرین. بەڵام کێ؟ دەبێ دووی چاونەترس و ئازا بن.

ئۆکسوز دۆران قسەکەی لە زار قۆزتەوە. لە خۆشیانا دەست و لاقی دەلەرزین:

ــ دەبێ "عەلی"یە درێژ هەڵبژێرین. عەلی زۆر جوان قسە دەکا. قسەکانی کار لە دڵی بنیادەم دەکەن. چاونەترسیشە. هەر ئەویش بوو بەرتیل وەرگرتنەکەی کوێخای لە قاو داوە. هەر "عەلی"یە درێژیشە ئەوە پێنج ساڵە سووری کردووەتەوە و لەقاوی دەدا و بەردەوام دەیەوێ بیخاتە مێشکمانەوە کە کوێخا کلکی لە کلکی بەکرە شێتە هاڵاندووە و بەرتیلان وەردەگرن و کام زەوی وشك و قاقڕ و بێ بەرهەم و بێ دار و درەختە دەماننێرنە ئەوێ. بۆ ئەو کارە کەس لەو باشتر نییە.

چەند دەنگێك وێکڕا گوتیان:

ــ نا، نییە.

تاشباش ئۆغلو گوتی:

ــ دووەم کەسیش با ئۆکسوز دۆران بێ. "دێموکراتانە*" قسەی کرد.

گوتیان:

- دەی باشە.

"عەلی"یە درێژ لەو لاترەوە دانیشتبوو و دەتگوت خەونووچکە دەیباتەوە. قوت بۆوە و گوتی:

ــ ئەگەر کاتی گەیشت، کەس نابێ فیزماڵکی بداتێ. نابێ پشتمان بەردەن و بۆی دەرچن...

"کۆستو ئۆغلو" بە قەڵافەتە زل و نابارەکەیەوە هەستاو دانیشتەوە و گوتی:

ــ ئەوە گوتمان تەڵاقمان کەوتبێ و بێ خوێن بین... مەحاڵە کاکە... ئاوا باشترە...

هەمووان پێی پێکەنین.

تاشباش ئۆغلو گوتی:

ــ هەتا ئێستا، شەیتانێکی مەلعوونی وەك ئەو کوێخایەی ئێمە، وەك ئەو کوڕەی کوێخا خدر خوا خەڵقی نەکردووە. خۆ هەمووتان لە رەگی قوونێی دەگەن. زمانی وەك بلوێری شەیتانێ وایە. هەرچەشەی

جۆراوجۆر دەکاتن. لە هەر قوژنەو نانێك دەخوا. هەر ساتە و دەمامکێکی لە رووە. دەمێ دیموکراتە*، دەبێتە هەواداری عیسمەت پاشا**. ئەسکوێی ناو هەموو دیزەیەکە***. ئەستەمە باشاری بکرێ. دەبێ سەرەتا دەراوەکە باش تاقی بکەینەوە دوایی بچین دەبەرەوە. ئێستا پێتان دەڵێم پێش هەموو شتێ چ دەکا. دەچێتە لای ئاغاکانی چوکووراوا و لە لای ئەوان خراپەمان دەڵێ:" ئەو گوندییانە فێری مل بادانێ بوونە. دەبێ ساڵێکی رەبەق کاریان نەدرێتێ، تا ئاقڵ دەبن. دەبێ ئەو گوندییانەی دژی حوکمەت و میللەت و ئاغا باشەکانمان راوەستاون، سەریان وەك سەری مارێ پان بکرێتەوە و ...." و ماڵوێرانمان دەکا. ئەمساڵ ناهێڵێ کێڵگەی لۆکەمان پێ بدەن. لە چوکوورەوە دەست لە گونان درێژتر دەگەڕێینەوە. ئەو کابرایە چیی بێ شەرەفیی دنیایە لە دەستی دێ بیکا. برادەرینە، ئاخۆ دەتوانن خۆ لە بەر هەموو ئەو شتانە راگرن؟ ئەگەر خۆراگر بین، سەردەکەوین. ساڵی داهاتوو کوێمان پێ خۆش بوو لەوێ کێڵگە دەگرین. کاتێك پیاوێکی وەك مام خەلیلمان لە پشتە، لە هەموو گوندەکانی دیکە باشتر دەزانین لۆکە کەنگێ دەپشکوێ. جا پێش ئەوەی گوندەکانی دیکە پێیبزانن ئێمە دەگەینە سەر کێڵگە.

مام خەلیل قوڕگی خاوێن کردەوە و خۆی بۆ قسەکردنێکی دووروودرێژ ئامادە کرد. گوتی:

ـ هۆوو... ئحححمممم....ئحۆئەحۆۆ..

بەر لەوەی بتوانێ قسە بکا "عەلی"یە درێژ قسەی پێ بڕی و پرسی"

ـ خۆتان پێ رادەگیرێ؟

کۆستو ئۆغلۆ دیسان لە جێ هەستا و دانیشتەوە و گوتی:

ـ ژنەکانمان لێمان حەرام بن. ناچارین خۆ راگرین....

خەڵکەکە دەستیان خستبووە باخەڵیانەوە وەك بڵێی خەریکی رێوڕەسمێکی ئایینی بن، هەموو چووبوونە فکرەوە و مات و بێ دەنگ بوون. مام خەلیل هێشتا خەریك بوو قوڕگی خاوێن دەکردەوە و چاوەڕێی دەرفەتێك بوو. بە پەلەپەل دەستی بە قسەکرد:

---

* ئاماژەیە بە حیزبی دیموکراتی "عەدنان مزندەریس" کە ئەودەم لە نێو گوندییەکاندا باوی بوو.

** مەبەست عیسمەت ئینۆنۆ، دووەمین سەرکۆماری تورکیا و سکرتێری کۆماریخوازانی خەڵکی ئەو دەمە، کە خەنیمی حیزبی دیموکرات بوو.

*** ئەسکوێ: کەوچی قووڵ بۆ تێکردنی شلە و شۆرباو. واتە خۆی لە هەموو شتێ هەڵدەقورتێنێ.

پیرەمێردی شاعیر دەڵێ: __ئەوەی لە دیزەی خەڵکا ئەسکوێیە هیچ کەس نازانێ ئەسڵی لە کوێیە__

ـ بەڵێ.... وایە.... ئەو هەتیوە هیچ و پووچە قەشمەریی پێ کردم... ئەو هەتیوە گرویێەی خدری... ئەو سەفەرە خواروخێچەمان لیبووەتە کوێخا و پیاو بەخۆی نییە دەبێ بە سەفەرەفەندی بانگی بکا. پێم گوت:"ئاخر هەتیوە، ئەو حیزەی باوکی تۆ بوو، وەڵلاهی راست ئاوام پێ گوت، وەڵا نەیدەوێرا تەنانەت ئاویش چییە بەدەستی مام خەلیلیدا بکا. ئەو لە بن سیبەری مندا کوێخایەتیی دەکرد. ئێستا دەور و دووکانێکی دیکەیە... ئەوانەی ئاشیان دەگەڕێ، با بەخۆیان بنازن." پێم گوت:"هەتیوە، ئەوە بەمن پێ دەکەنی؟... بەمن دەڵێن مام خەلیل.... تەنانەت خوداش نازانێ دڵی مام خەلیل چیی تێدایە." پێم گوت:"هەتیووە، شەرم ناتگرێ؟"... ئاخر دەکرێ حەقی گوندێکی ئاوا گەورە و گران بخۆی؟ ئاخر خودا هەڵدەگرێ دەست بەسەر داهاتی لۆکە چنینەوەی گوندێکی گەورەدا بگری؟ خودا هەڵیدەگرێ؟... شەرم بتگرێ رۆڵە! شەرمێ بکە... ئەوەش بوو بە کار. ئەوە تۆ چۆن لەگەڵ ژن قەحپەیەك دەبیتە یەك و کاری وا دەکەی؟" گوتم: رۆڵە، ئەتۆ دەبێ پشتی ئێمە بگری یان لای ئاغاکان؟ ئاگات لە خۆت بێ دەنا ئەو خەڵکە چارت دەکەن. خۆ ئێمە ئەو ردێنەمان لە ئاشی سپی نەکردووە. ئەگەر بەقسەم بکەی، دوایی دوعای بەخێرم بۆ دەکەی.

بەجێی برادەرایەتیی کابرایەکی بێ دایك و بابی وەك بەکرە شێت، وەرە دۆستایەتیی خەڵکی گوندەکەی خۆت، دۆستایەتیی برا و خزم و کەسی خۆت بکە... چما دنیا خەرا دەبێ؟..."

مام خەلیل تازە کەوتبووە چەنەی گەرم داهاتبوو و خەریك بوو قسەی باشی بۆ دەهات کە تاشباش ئۆغڵو قسەکەی لە زاری قۆزتەوە:

ـ نا، ناکرێ!... هەتا عەلی ئەو مەتەڵەی لای کوێخا هەڵنەهێناوە، نابێ کەس بچێ پێی بڵێ. چون ئەگەر گوێبیست بێتەوە، سەگ و سەگبابێتی دەکا. عەلی دەبێ لە رێیە، لە رێی چوکووراوا پێی بڵێ... وا باشترە. قەبووڵتانە؟

ـ زۆر باشە...

مام خەلیل چونکە چەنەی لێ گەرم داهاتبوو، هەر جینگڵی دەدا و خەریك بوو فججە بکا و جنێو بە ژن و منداڵی تاشباش ئۆغڵو بدا. قسەکەی لێ وەرگرتەوە:

ـ ئەمساڵیش ئیزگیلم هەڵگرت بەخۆمم گوت:"هیچ نەبێ بنیادەمە، دەمراستی گوندە" و بردمە لای. گوتم:" قەتارێکم لەو ئیزگیلە دیوە کە بە چیای تەکەچ هەڵدەگەڕا." گوتی:" بەراستتە؟... و پێم پێکەنی. پێم گوت:" قوڕت بەسەری هەتیوە زۆڵە، سەی کوڕێ سەی"، ژنەکەم بمرێ، بەدەستی خۆم کفن و دفنی بکەم ئەگەر...

لە پێشدا تاشباش و دوایی ئەوانیتر دایانە پێکەنین. مام خەلیل تووڕە بوو، برۆکانی هەڵتەکاندن و چاوەکانی زەق کردن و گوتی:

ـ ئەوە بەچی پێدەکەنن هەی تووتکە سەگینە؟ پێتان وایە خوا خوامـە ژنەکـەم بمـرێ؟ شـتی وام ناوێ. وایە، تێی هەڵدەدەم، بەڵام قایل نـیم مـەرگی ببیـنم. ئـەو هـەمووە ساڵە سـەرمان بەسـەری یەکەوە ناوە هەی کوڕی سەی... ژنەکەمم بە دەستی خۆم کفن کردبێ ئەگەر... قەتارە ئیزگیلێك بـە بەر تیشکی هەتاودا بە چیاکەی تەکەچ هەڵدەگەڕا. خوا ئاگادارە قەتارێك بـوو. ئـەوە بـڕوات نـەکرد قورمساخ؟ جا ئەگەر راست دەکەی مەچۆ چوکوور. ئەگەر بڕوا ناکەن مەچنە چـوکووری خـوارووی، بـا خەڵکی دی، هەموو لۆکەکان بڕننەوە و ئێوەش دەستتان لە گونی بارگینم...

ورده ورده تووڕەتر دەبوو و دەمارەکانی لاملی هێندەی قامکێك هەستابوون:

ـ ئەوە پێتان دەڵێم. ئێوەش بزانن، ئەمن ئـەمڕۆم ئیزگیـل نەبردۆتـە لای کوێخـا. هـەر وا پازدە، بیست رۆژێك دەبێ بردوومە. گـوێ راگـرن و لـێم ببیـستن. دەرەنـگ بـووە... پـازدە رۆژ لەمەوبەر بردم. ئەو دڕکەی دوێنێ بردم دوا دڕك بوو. گوێتـان لـێ بـوو؟... ئـەمن ئـەو وەباڵـە ناخەمە ئەستۆی خۆم. کەس بۆی نییە بەمن بڵێ پشتی چاوت برۆیە. ئەمن پازدە رۆژ لەوەپێش بەو، واتە بە ئێوەم گوت، لە چوکووراوا لۆکە پـشکوتووە و گوڵـووکی سـپی دنیـای داپۆشـیوە. گوتم: کوڕی کوێخا خدری، کڵاوم لەسەر مەنێ. کڵاو لەسـەر گوندییـەکان مـەنێ. لـە چـوکوور لۆکە خەریکە دەپشکوێ، بە گوندییەکان رابگەیێنە، ماڵوێرانیان مەکە." گوتی:" ئەمن ناکرێ بە قسەی تۆ ئاگاداریان بکەمەوە. تۆ خەرەفاوی، پیر بووی."

خەڵکەکە، پێکەوە مشتومڕێکی توندیان بوو. ئیتر مام خەلیل قسەی بۆخۆی دەکرد:

ـ پێم گوت:" دەی باشە، من پیر بوومە. وایە، زۆریش راستە و پیر بوومە. ئـەوەش راسـتە کە ئەمساڵ رێگە دەرنابەم و ناگەمە چوکووری خواروو. بەڵام قەت قەتم کاتی لۆکە چنینەوە لێ تێك ناچێ. دیارە هەتا ئەو دەمەی ئەو پێدەشتە ئیزگیلی پێوە بێ.

سەیرێکی عەلیی کرد. عەلی هیچ گوێی لە قسەی ئەو نەبوو. هەر دەتگوت لـەو کۆڕەشـدا نییە و دوور دوور رۆیبوو. فکر و خەیاڵێکی دیکە هەڵیانگرتبوو. لە دواوە، گودوك مورتـەزای لەڕ و بنێس و شڕۆڵ گوتی:

ـ خراپە..

جا بێ دەنگ بوو.

پرسیان:

ـ چ خراپە؟...

ئاخێکی هەڵکێشا و دیسانەوە گوتییەوە:

ــ زۆر خراپە... بیرم لیٚکردەوە، زۆرم بیر لیٚکردەوە کە سەفەرەفەندی بە ئاغاکان دەڵیٚ و ئاغاکانی چوکووراواش ڕێمان نادەن بچینە مەزرا و کێڵگەکانیانەوە. ئەو کات چمان بەسەر دیٚ؟ ئەگەر بە دەستی بەتاڵ بگەڕێینەوە، ئەو زستانە لە برسێتی و رووتی و نەداریدا... دەمرین. عادل ئەفەنیش ئاور لە گوندەکەمان بەردەدا.

چەند کەسێك بە رقەوە گوتیان:

ــ دەی با ئاوری بدا چییە؟

ــ ئەگەر ئەمساڵ قەرزەکانی پاك نەکەین، ساڵی داهاتوو بە سوودەوە دەیدەینەوە.

مام خەلیلیش کە قسەکانی نیوەچڵ مابوونەوە چەند جاریٚ، بە ژن و منداڵی هەمووانداهات*. کەس گوێی نەدایە جوێنەکانی ئەو و لە شوێنەکەی خۆی، بیٚ ئۆقرەییانە جینگڵی دەدا. لە دەرفەتێك دەگەڕا بیقۆزێتەوە و ئیتر بیٚ دەنگ نەبێتەوە.

چەند جارێك هاواری لیٚ بڵند بوو:

ــ هەر کاتێکی من ئیزگیل بە ئاسمانەوە ببینم، نیشانەی ئەوەی دە رۆژی دی، لە، چوکووراوا لۆکە دەپشکویٚ. واتە قۆزاخەکەی دەپشکویٚ و بۆن و بەرامەی وەك گوڵی هەڵاڵە چوکووراوا دەتەنیٚ.

دیسان دەنگی لیٚ بڵندتر کرد:

ــ ئاخر قورمساغینە، لەو سی ساڵەدا قەت قسەم بەدرۆ دەرچووە. خەڵکی گوندەکانی دیکە هەمیشە سەهوو دەکەن و دە رۆژ یان پازدە رۆژ دوای پشکووتنی لۆکە دەگەنە کێڵگە و مەزرایان. ئەوە سی ساڵە ئێوە یەك رۆژ چییەن بەهەڵە نەچوونە هەی قورمساغینە. ئەوە نییە هەر جارێکی گەیشتوینەتە چوکوور، لەبەر دەممان، کێڵگەکانی لۆکەمان دیوە سەر لەبەر سپی داگەڕاون و گوڵیان کردووە؟ ئەمن بەوم، بەو کابرایەی بە خوێنتان تینووە، بەو توتکە سەگەی خدریم گوت:"رۆڵە، کوڕی خدر، ئاخر تۆش بنیادەمی کە خەڵك پێت دەڵێن سەفەرەفەندی؟ دەی با بیڵێن چییە، بەڵام ئەمن هەر بە سەگیشت نازانم."

گوتم:" باوکیشت کاتی خۆی وا بوو."

بەو، بەو سەفەرەفەندیە، بەو خوێرییەم گوت. نابیٚ لێی بترسن. ترسنۆکی، خوێرێتییە. گوتم:" کاتێك ئیزگیل هات و لە دەرگای دام، کاتیٚ قەتارێکیش لەو ئیزگیلە وەك قەتاری قاز و

---

*پێیاندا هات: وەبەرجنێوانی دان. بە ژن و منداڵی هەمووان‌دا هات: جوێنی بە ژن و منداڵی هەمووان دا. کورد دەڵیٚ: بە باب و باپیرمدا هات کەسی نەهێشتم....

قولینگـان بـه ئاسمانـا سـووڕایەوه و بـەرەو چیای تەکـەچ وەڕێ کـەوت، بزانـه لـه چـوکووراوا کێلگەکانی لۆکه وەك بەفر سپی داگەڕاون. کێلگەکان چاوەڕێی لۆکه چنن. خاوەن کێلگه دەست ڕەدەستان دەخشێنن و چاوەڕوانی کرێکارن. ئەمن کەی تا ئێستا به هەڵە چوومه که تۆ گاڵتەم پێ دەکەی و هەواڵی پشکووتنی لۆکه به گوندییەکان نادەی؟ هـەتیو تـۆ خەریکـه چارەڕەشیان دەکەی و ژن و منداڵەکەیان برسی و رووت و ڕەجاڵ دەکەی. هەی سەبەبکار، چاوت کـوێر بـێ. ماڵت کاول بێ." گوتی:" تۆ خەرەفاوی." ئێستا ئـەوه ئاگادارتـان دەکەمـەوه و پێتـان دەڵـێم، پازده رۆژی لێ لاداوه و دەمێك له چوکووراوا لۆکه گوڵی پشکووتووه. لەوانەیه بیست رۆژیـش بێ. برادەرینه چارێکی بکەن. سووچی من نییه، خەتای ئـەو گەووادەیـه. ئـەوه پێتـان دەڵـێم. هات بەرۆکمی گرت و گوتی: بێت و ئـەو هەواڵـه بـه گوندییـەکان بـدەی، سـکاڵایەکت لەسـەر دەنووسم و دەڵێم تۆ سیحربازی، شـەو و رۆژان لەگـەڵ شـەیتان و جنـدۆکان قـسان دەکـەی، تـۆ مەترسیت هەیه بۆ نیشتمانه ئازیزەکەمان، ڕاکـردووی شـەڕی یەمـەنی و لـه تـاقمی جـەردە و ڕێگرەکانی ئەسلان ئاغا بووی. ئیتر ئەو کـات، دەتنێرمـه گرتووخانەکـەی "ئەدەنـه" کـه بـرایم لەوێ توند کرابوو و لەوێش پای سیداره و ...

که کۆڕەکه برێك ئەهۆن بۆوه و دەنگەدەنگەکه دامرکا، دەنگی مام خەلیل دەرکەوت.

نۆکسوز دۆران گوتی:

ـ مام خەلیل تۆ خوا، بیبڕەوه با برێك قسان بکەین. خەڵك هاتوونه ئێـره لێـك حـاڵی بـن. هەرکەسەو له فکری گونی دایه، ئاش له بیرێك و ئاشەوان له بیرێك...

مام خەلیل تووڕە بوو و گوڕاندی:

ـ توتکه سەگی چڵمن، بۆ ئـەوه قـسه نییـه دەیکـەم؟ قـسەی خـۆڕایین؟ بـه جێـی ئـەوەی بڵێـی بێدەنگ به، وا باشتره ئەو گوێچکه درێژانەت بکەیتەوه و جوان گوێ بدەیەی بزانی ئەو مـام خەلیلـه پیر و دێنا دیتەیه دەڵێ چی. جا باشه، گوێ له قسەی من مەگرن، خۆتان دەبیننەوه. پێت وایه چـون چەند کەسێك هاتوونەته ماڵەکەت، بوویەته پیاو؟ هەتیوه بارگینه...

ئەوانی دیکەش له دووی نۆکسوزیان دا و گوتیان:

ـ دەی بابه مام خەلیل، بیبڕێنەوه با دوو قسه بکەین. مەسەلەیەکی گرنگه.

مام خەلیل سەرسووڕماو و تووڕە گوتی:

ـ دەی باشه، ئەوه بێدەنگ بووم. چـەندی دڵتـان دەخـوازێ چەقـچەق بکـەن. گـوێ مەدەنـه قسەی من با بزانین کێ زەرەر دەکا؟ باشه گوێ مەدەنێ.

وەك منداڵێك نێوچەوانی تێكنا و لە گۆشەیەك هەڵكورما:
ـ باشە!... گوێم مەدەنێ....

"كۆمیت ئۆغلو" زۆر دەمێك بوو مات دانیشتبوو و خۆی لە باسەكە نەدەدا. كێ لەوێ بوو قسەیەكی كردبوو. پێی وا بوو ئەویش دەبێ شتێكی بڵێ. گوتی:

ـ ئەگەر ئاغاكان كاری وا بكەن، دەی ئێمەش دەچینە لای تۆفیق بەگی سەرۆكی حیزب و تێیدەگەیەنین و دەڵێین، باشە ئێمە دەنگمان بەتۆ نەدا؟ دەی وەرە و سەیر بكە بزانە چۆن خەڵك لە ساجی عەلی دادەنێین. ئاغاكانی چوكووراوا لەگەڵ كوێخا رێككەوتوون و لەبەر ئەو مەزرای لۆكەمان نادەنێ بۆ لۆكە چنینەوە و ناهێڵن ئێمە كار بكەین.

بوو بە مشتومڕێكی توند لەسەر ئەوەی ئاخۆ تۆفیق بەگ لای گوندییەكان دەگرێ یان كوێخا. ئاخری هاتنە سەر ئەوەی ئەگەر تۆفیق بەگ تۆزە ئەقڵێكی لە مێشكیدا هەبێ، و هیچ گومانیش لەوەدا نەبوو كە پیاوێكی ژیرە ئەگینا چۆن دەیتوانی ببێتە سەرۆكی "دمیر قیرات*"؟ كەوابوو پشتی گوندییەكانی دەگرت.

مام خەلیل هەر جینگڵی دەدا و خۆی پێ نەدەگیرا. قسە لە دڵیدا پەنگیان خواردبۆوە و خەریك بوو فججە بكا. هەر لەگەڵ ئەوەی دەرفەتی هێنا گوتی:

ـ كوڕە هەی كافرینە، ئەمن هیچ باش نیم. گوێ بدەنێ دەی! وەڵڵا هەركەس قسەم پێ بڕێ چاوی دەردێنم. تاقەتم نەماوە.

جا هەرجارێكی دیگوت:"تاقەتم نەماوە" لەبیری نەدەچوو چاو لە چاوی عەلی بڕێ:

ـ ئەمن یەكسەر بیر لەوە دەكەمەوە ئاخۆ چۆن دەگەمە چوكووری خواروو، وەڵڵا خەوم لێ ناكەوێ. ئەژنۆم شل بوون و دەلەرزن. ناتوانم دوو شەقاو بنێم. بەو حاڵ و باڵەوە چۆن بچمە چوكوور. كوڕە كوێخا گاڵتەم پێ مەكە. گاڵتە بە گوندییەكان مەكە. ئەمن لەوانە نیم تۆ بیریان لێ دەكەیتەوە. خەڵكی ئەو دێیە ئەوانە نین تۆ پێت وایە. ناهێڵن كەس حەقیان بخوا. كوڕە! كوێخا! هەتیوە خوێڕییەكەی كوێخا "خلە"، تۆ بەستۆی شكاوت كوێخای، سەرۆكی و، پیاوی دەوڵەتی، ناشتوانی ئەسپێك بۆ من پەیدا بكەی. بەڵام ئەو گوندیانە حەزیان لێ بێ، ئەسپێك

---

*پێویستە ئاماژە بكرێ بەوەی كە گوندییەكانی توركیا وشەی دیموكراتیان بە شێوەی دمیرقیرات هێناوەتە سەر زار و ئەوەی ئەوانیش لە سێ كەرتی "دمیر ـ قیر ـ ئات" پێك هاتووە بە واتای ئەسپی رەشی ئاسنین. بۆیە زۆر جارانیش گوتوویانە سواری ئەسپی دمیرقیرات بووە.

ــەهلە، دەتـوانن شـەمەندەفەرێکی زەبـەلاح پەیـدا بکـەن. هـەر ئەوەنـدە کـەیفیان بـێنێ. شەمەندەفەرێکی رەش دێننە بەر دەرکێ و دەڵێن:"فەرموو مام خەلیل سوار بە..."

تاشباش ئۆغڵو گوتی:

ــ کوڕە ئاخە ماڵ کاول، یا خوا ئەو درۆیانەت بەریتە بن گڵ، ئـاخر گونـدی چـۆن دەتـوانن شەمەندەفەر بەسەر ئەو هەموو کەژ و چیایەدا بێننـە ئێـرە و بڵـێن:" فـەرموو سـەرکەوە مـام خەلیل!"

مام خەلیل ردێنی وەلەرزین کەوت، لە لایەکیشەوە دیـتی گوێیـان داوەتـە قـسەکەی، دڵـی خۆش بوو و هاواری کرد:

ــ دەیهێنن. بە مەرجێك بیانەوێ. رۆڵە، چما ئەو گوندییانە باشاریان دەکرێ؟ سەیر کە رۆڵـە، دەم-بەدەمەم لەگەڵ مەکە. کوڕی تاشباشی پیاوکوژ. کەلاکی باوکت وەك کەلاکی چەقەڵ بـە دەم سـەگەلەوە بوو. قسەم پێ مەکە. خوا ماڵت کاول بکا، سەگباب، بە کوێخام گوت: تۆ کاڵەك خۆری یان بێستان رن؟ گوتم، ئەو باوکە گۆڕبەگۆڕەت، قەت قسەی لە قسەی گوندییەکاندا نەدەکردەوە. چیی لە دەستی هاتبا بۆ گوندییەکانی دەکرد، بە پیر و نەخۆشیان رادەگەیشت, بە منیشی دەگوت: خەلیل، تۆ پیاوچاکی، کێ بێ و دزیێی نەکردبێ، بەڵام تۆ قەت قەت پشتت لە مـسوڵمانێتییەکـەت نـەکرد." خـدر دەیگـوت:"ئـەتۆ گەورەی ئەو گوندەی، ئەتۆ شەرەفی ئەو ئاواییەی." ئەگەر تۆ نەبی لێت سوور بێ ئەو گوندەش نامێنێ." رۆژێك لە رۆژەکان چەتە بەسەر گوندەکەیاندا دا، چیی نەمابوو خدر بکوژن. پـێم گـوت:"خـدر، را کـە و خۆت لە ماڵی ئێمە باوێ، هیچ چەتەیەك ناوێرێ بە سێرەی چاویش سەیری ماڵی من بکا. کـێ سـەیری بکا، چاوی لە پشتەسەرییەوە دێنمە دەرێ." ئەو هات و لە ماڵەکەی مندا خـۆی حەشـار دا و نـەجاتی بوو. دوایی پێی گوتم:"ئەتۆ گیانی منت رزگار کـرد. ئـەمن قـەرزباری تـۆم خـەلیل، زۆر زۆر قـەرزبارتم خەلیل گیان." پێم گوت:" چ نییە خدر. ئەو خزمەتە بۆ تۆ کە گەورەی گوندەکەمانی شتێك نییە." ئەنگۆ ئەو کات لە زگی دایکتاندا بوون. کوێخاش نەببوو. لـەو دنیایـەدا هـەر عیـسمەت پاشـای تێدا بـوو و عەبدولعەزیز پاشا. ئەو کات رەوەیەکم ئەسپ هەبوو: دە سەر. ئەو کات ئێمە نەدەچووینە چـوکوور بـۆ لۆکە چنینەوە. ئەمن گەنجێکی ئازا و نەترس بووم. کوا وەك ئێستا بووم؟

برێك بێ دەنگ بوو و پشوویەکی کێشا. هەمووان گوێیان دابوویە. هەندێکیان پێدەکەنین و هەندێکیشیان چاویان لێك دادەگرت، بەڵام گوێیان هەر دەدایێ.

ــ بە کوێخام گوت:" جوان گوێ بدەیە. گووم بە گۆڕی بابت، بە ئێـسك و پرووسـکەکانی... کـارت بە سەر گوندییەکانەوە نەبێ. وریا بە، ئاخری ئەو گوندییانە دەتکەنە تۆزی بانان. تێـتدا دەبـەن. ئـەمن مام خەلیلی ئەو گوندەم. پەکم کەوتووە. لە باپیری هەمووتان پیرترم. ئەگەر تـۆ کوێخـای و بنیـادەمی،

دەی یەك سمێك بۆ من پەیدا بکە.... ئەگەر تۆ پەیدای نەکەی گوندییەکان پەیدای دەکەن و حەیات دەچێ. ئەگەر ناتوانی پەیدای بکەی، لانیکەم دەست لە بەرۆکی ئەو گوندییانە بکەوە و لە کۆڵیان بەوە. هەر ئەو گوندییانە لە دەستیان دێ شەمەندەفەرێکی رەش بێننە بەر دەروازەی دێ و بڵێن:" سوار بە مام خەلیل، سوار بە و برۆ بۆ چوکووراوا، چونکە ئەژنۆت لە دوو نایەن. زۆرت زەحمەت بۆ ئەو گوندە کێشاوە." ئەگەر ڤیتاریش نەهێنن، لانیکەم گوێدرێژێك پەیدا دەکەن.

تاشباش ئۆغلو خۆی پێ رەوگیر نەکرا و گوتی:

ـ کوڕە ئەگەر کەرێکیشیان گیر نەکەوت، جاشکێك. ئەگەر جاشکیش نەبوو، تاژییەك... ئەگەر تاژیش نەبوو، ئەدی ئەودەم چی مام خەلیل؟

مام خەلیل وەك شێتانی لیهات و رەش داگەڕا:

ــ قسەم پێ مەبڕە... گووم بە زاری بابت... ئەرێ وەڵڵا رێك بە نێو زاری.... بە کوێخام گوت:" ئەگەر کەریش نەدۆزنەوە، بە خودای گەنجەکانی دێ، بە نۆرە بە قەلانۆشان هەڵمدەگرن..." تاشباشی باوکت... دەزانی بۆچی ئەو گەوادەیان ناو نا تاشباش؟ هەر من دەزانم. بە کوێخام گوت:"باشاری ئەو گوندییانە ناکەی... حەقیان مەخۆ!" کوڕم تاشباش، مام خەلیل دایکیشت باش دەناسێ. بە کوێخام گوت:" ئەگەر کەسیش دەستم نەگرێ، "عەلی"یەدرێژ ئەفەنی هەیە! کوێخا، تۆ بۆوەی نابی پێت بڵێن ئەفەندی. ئەفەندی ئەو کەسەیە لە سەربازیدا پلەی ئۆنباشی سحییەی وەرگرتبێ."بە عەلی دەڵێن ئەفەندی! خۆت پێ چییە؟ عەلی برادەری گیانی بە گیانیمە. هەر ئەو "عەلی"یە درێژە ئەفەندییەم بەسە. خۆ ئەو مامە خەلیلی خۆی بێکەس و بیدەر لە بیاباناندا بەجێناهێڵێ. شتی وا نەبووە و هەر ناشبێ." کوڕە ئەمن باو و باپیرە گۆڕ بەگۆڕەکەی تاشباش وا دەناسم کەردار کەری خۆی وا نەناسیبێ... جارێ وەختی نییە... ئەوە چون خەلکت زۆر بە دەورەوەیە فیزم بەسەردا لێ دەدەی... ئەگەر نیوەی دێ لە پشت من بن... ئەمنیش.... ئەگەر پیاوی بۆم تاق بەوە.

تاشباش بە پێکەنینەوە گوتی:

ــ نای لەو درۆیانە، ئەو درۆیانە لەو ریشەت دەکاڵێنەوە. هەر ئەوەت لێ سووربێ، ئەو قسانەی لێرە کردمانن، یەك قسەیان بەو کوێخایە بڵێی، چڵە شقارەتەیەکت بەو ریشەوە دەنێم. ئەگەر نەشسووتێ، نەوتی پێدا دەکەم و دەتکەمە کۆڵوو...

مام خەلیل وەك بزووت دەرپەڕی و تێلاکەی لێ راست کردەوە، کە ویستی لە سەری راکێشێ، دەستیان گرت.

هەمووان لەبەر پێکەنین لەسەر گازەرای پشت کەوتن.

مام خەلیل سەرەڕای ئەو تووڕەییەشی تا چاوێکی خەفەتباری لە چاوەکانی عەلی نەبڕی نەیتوانی لە جێی خۆی ببزوێ. دواییش هەر وا بە تووڕەییەوە وەدەر کەوت و ڕۆییشت.

بڕیاری خۆیانیان دابوو. توند و پتەو. مردن هەبوو بەڵام گەڕانەوە نا. بیریان لە هەموو پێشهاتێك کردبۆوە.

سەرەڕای هەموو ئەوانەش، عەلی و تاشباش دڕدۆنگ بوون. چونکە سێ ساڵ بوو ئەوە دووپاتە دەبۆوە، بەڵام دوایی کوێخا دەرکاودەرکی دەکرد و ئاخرییەکەی گوندییەکانی ڕەگەڵ خۆی دەخست و عەلی و تاشباش بەتەنێ دەمانەوە. بەڵام ئەمساڵ وەك ساڵی ساڵان نەبوو. گوندییەکان لەسەر قسەی خۆیان سوورتر بوون. وەئامان هاتبوون. بە ڕواڵەت وا دیار بوو. ئەگەر چەتی تێ نەکەوتبایە، ئەستەم بوو کوێخا بتوانێ جارێکی دیکە فریویان بدا و بە دەهۆیان بەرێ*.

عەلی:

ـ پێت وایە پاشگەز ببنەوە؟

تاشباش:

ـ تەڵاقیان خواردووە.

ـ جا پێت وایە کوێخا ببیستێتەوە؟

ـ دەبیستێتەوە. ئەگەر کەسیش قسەی بۆ نەبا، ئەو پیرە سەیە هەر دەیبا.

عەلی بە دڵنیایییەوە گوتی:

ـ مام خەلیل نایدرکێنێ. لێم سوورە.

ـ کێ بانگی کردبوو؟ ئەتۆ؟...

ـ نەوەڵڵا، هەر خۆی بۆنی کردبوو و هاتبوو.

ـ بەڵام خەریك بوو وەك جوو لەبەر گوندییەکان دەپاڕاوە. دەتگوت شتێکی لە بن زمانی دایە.

عەلی سەرێکی لەقاند و ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا:

ـ دەرکی پیری دەرێ. خوا بە نەسیبی کەسی نەکا.

تاشباش نەیزانی عەلی خەمی چییەتی.

---

* چەت تێ کەوتن: واتە کۆسپ و تەگەرە کەوتنەبەر کارێك.

بەدەهۆبردن: بەفرت و فێڵ و کڵاولەسەرنان یەکێك بەری بۆ جێگەیەك.

## ٣

هێشتا بەیان نەئەنگوتبوو*، مریەمۆك عەلیی لە خەوێ هەستاند. بووکەکە دەمێك بوو هەستابوو. ئەویش منداڵەکانی راست کردنەوە.

عەلی بەدەم پانتۆڵ هەڵکێشانەوە، بەرەو لای ئەسپەکە رۆیی. ماڵەکە تاریك بوو. بە ژنەکەی گوت، چراکەی بداتێ. دایگیرساند و بەسەر ئاخورەکەیدا راداشت. ئەسپەکە شتێکی وای لەو کا و وێنجەیەی دوێنێ ئێوارێ بۆیان تێکردبوو، نەخواردبوو. عەلی بیری کردەوە ئاخۆ تیماری بکا یان نا؟ ئەسپەکە وا پیر و زورهان ببوو، بۆوەی نەدەبوو رنەکێکی لە پشتی دەی. رێك نێوەراستی پشتی برینێکی هەڵگرتبوو سارێژ نەدەبۆوە. توورەکەی ئەسپەکەی هەڵگرت و کا و وێنجەی نێو ئاخورەکەی تێکرد و دایە دەست ژنەکەی. ئەسپەکەی کردەوە و هێنایە دەرەوە.

زگی ئەسپەکەی بە پشتییەوە نووسابوو و لە نێو بوولێڵی بەیانیدا دەتگوت: تارمایییە. چوزە ژووریێ و زینەکەی هێنا و لەسەر پشتی داینا. زینێکی "چەرکەزییانە" بوو و لەگەڵ ئەسپەکە هێنابوویان. هەژدە نۆزدە ساڵ دەبوو ئەو ئەسپەیان هێنابووە ئەو ماڵە و لەو کاتەوە هەموو ساڵێ دەچووە چوکووری خواروو. تەنانەت ئەو کاتەی ئەسپێکی زەلامیش بوو و بە پێچەوانەی قسەی عەلی "جوانوو" نەبوو و کەحێلێکی تەواو بوو، یاڵەکانی دەتگوت زیون تیف تیفە دراون. ئەسپێکی ئاوا جوان لە ماڵێکی ئاوا هەژاردا چیی دەکرد؟ مریەمۆك و مام خەلیل نەبێ کەس بەو مەتەڵەی نەدەزانی. مام خەلیل تا چاوی پێیی دەکەوت، ئاخێکی هەڵدەکێشا و دەیگوت:"خۆڵ بەسەر ئەو کەللە کەرەی من."

زینە چەرکەزییەکەش زۆر لە ئەسپەکە سازتر نەبوو. توێژکاڵێکی بەناو چەرم بەسەرییەوە مابۆوە. تان و پۆی لەبەر یەك چووبوون و چوارچێوەکەی دەرکەوتبوو. لبادەکەی بنی دابێژ دابێژ

---

*بەیان ئەنگوتن: رۆژبوونەوە: هێمن دەڵێ: بەیان ئەنگووت و شەو رابرد و من هێشتا خەوم نایە....

ببوو و لەت و پەتی کەوتبووە دەرێ. عەلی زینەکەی لەسەر پشتی ئەسپەکە دابەست و بە گوریسێکی خوری توندی کرد و دۆشەگەڵەکانیشی لەسەر زینەکە دانا. کۆستونۆغلۆ لە ماڵێکی دوورەوە هەر دەنگی جنێوانی دەهات. زەنازەنای کوێخا بەسەر دەنگی هەمواندا زاڵ بوو. هەر لەو نزیکانەش مەلۆتکەیەك دەیزیقاند، نەخۆشێك دەینالاند و منداڵێك دەگریا. سەگەل دەوەڕین. دوایی ئەسپێك حیلاندی و دوو کەریش زەڕاندیان.

عەلی بارەکەی بەست و لێ بۆوە. دەستی دایکی گرت و هێنایە تەنیشت ئەسپەکە. دوایی هەڵیگرت و لەسەر ئەسپەکەی دانا. لاقی ئەسپەکە نوشتانەوە. عەلی گوێی نەدایێ. هەموو ساڵێ وابوو، بەڵام ئەسپەکەی چیی لێ نەدەهات و وەك شێر هەتا چوکووری خواروو دەچوو.

مرێمۆك گوتی:

ـ عەلی گیان، ئەو کوڕەم لەسەر کۆشی دانێ.

عەلی سەیرێکی ئەسپەکەی و دایکی کرد. وردە وردە، وڵات روون دەبۆوە. ئیتر چیی وای نەمابوو لووتکەی شاخەکان روون ببنەوە. تاریکییەکە روونتر دەبۆوە. عەلی گوتی:

ـ دایە، ئەسپەکە ئەمساڵ حاڵی باش نییە. واز بێنە با کوڕەکە بە پێیان بێ. تازە گەورە بووە.

مرێمۆك لیچی هەڵقرچاند و گوتی:

ـ جا منداڵێك چەندەیە؟

عەلی لە ژنەکەی پرسی:

ـ لێ بوویەوە؟ دەرگات داخست؟

ئەلیف گوتی:

ـ تەواو بووە. دەرگاشم داخستووە.

و وەڕێ کەوت.

تەقەتەقی تەنەکە دەنگی حیلەی ئەسپ و زەڕەزەڕی کەر و هۆڕەی مانگا و هاتوهاوارەکانی داپۆشی. ئەوەش یانی، گوند وەڕێ کەوتووە.

گوند هەرچی هەیبوو بەپانەوە پێچابوویەوە و کۆچی دەکرد و لە دوای خۆی جگە لە پشیلە و چوارپێ و بایەقۆش و قالاو و مێرووی زەرد و ریشۆڵە و ئەو بۆقانەی لە قوژبنی تاریك و تنۆکی ماڵەکاندا هەڵکورمابوون و بە چاوە زەقەکانیانەوە دەیانڕوانی، و جگە لە "ئەحە شێت"

که وێڵی دەشت و کێوان بوو و کەس بە سەرو سۆراغی نەدەزانی، بوونەوەرێکیان بەجێ-نەدەهێشت.

خەریك بوو تاو دەکەوت. کاتێ لووتکەی شاخان روون بوونەوە، لە ناکاو دەنگەدەنگەکە دامرکا و بوو بە غەڵبەغەڵب. رێك لەو دەمەدا کلکەی کاروانەکە لە گوندی چووە دەرێ. لەگەڵ دوورکەوتنەوەیان لە گوندەکە، دەنگەدەنگەکەش نەما. کاروانەکە نوقمی بێ دەنگی لە گوند وەدەر کەوت. هەموو کپ و بێدەنگ بوون. جار وبارە دەنگی باڵندەکان یان زرمەی پێی ریبواران و تەقەتەقی تەنەکە بەتاڵەکان و زرینگەی قاپ و قاچاغە مسینەکانی سەر پشتی ئەسپ و گوێدرێژان دەبیستران.

هەموو ساڵێ، ئۆکسوز دۆران دوایین کەسی کاروان بوو کە لە گوندێ دەهاتە دەر. ئەمساڵیش هەر وا بوو.

دۆران هەموو ساڵێ لە دوا دواوەی کاروانەکەوە دەهات، دوایین کەسێك بوو کە دەچووە نێو چوکوور و لە گەڕانەوەشدا، یەکەم کەس بوو دەچۆوە نێو دێ.

تاو کەوت و خۆر هێندەی رمبێك هەڵکشا. بای شەماڵ هەڵیکردبوو.

ئەو تەپوتۆزە سپی‌یەی لە بن سمی ئەسپ و گوێدرێژ و مانگا و بزنەگەل و بنیادەمەکانەوە هەڵدەستا، بایەکە گێژی دەدا و پێدەشتە خۆڵەمێشینەکەی دادەپۆشی. کاروان وەك گورگ سەری لەدوو نابێ، بە پەلە بەرەو چوکووری خواروو دەکشا. ئۆکسوز دۆران، کۆڵبار بەکۆڵ، لە چەقی رێگەکە راوەستا و رووی لە گوندەکەیان کردەوە و هاواری کرد:

ــ هۆی میللەت، ئیتر گوندەکە دیار نییە.

هەموو ساڵێ ئۆکسوز دۆران بەو جۆرە هەواڵی دیارنەمانی گوندەکەی رادەگەیاند.

چەند ساتێك کەس سریوەی نەهات. دوایی غەڵبەغەڵبێك لە کاروانەکە هەستا و رێگە گیانێکی تێ‌گەڕا.

"عەلی"یە درێژ شمشاڵەکەی لە بەر پشتێندێ دەرهێنا و بینی پێوە نا و هەوایەکی وای لێدل پیرەژنی بەقوون هەڵدەپەڕاند. هەر وەك چۆن هێنانی ئیزگیل کاری مام خەلیل بوو، هەواڵی لەبەرچاو ونبوونی گوندیش کاری ئۆکسوزدۆران بوو و کوێخایەتیش کاری کوڕەکەی خلە و شمشاڵ لێدانیش کاری "عەلی"یە درێژ بوو.

هەم لێی دەدا و هەمیش هەڵدەپەڕی.

عەلی درێژ و رەقەڵە بوو، پێستێکی ئەسمەری هەبوو و برۆی رەش و پڕ بوون. دەموچاوێکی درێژووکەشی هەبوو. کە سەیریت دەکرد پتر لە هەموو جێیەکی برۆیت دەدی. چەناگەی وەك

چەناگەی ژنان تیژ بوو. پانتۆڵەکەشی کۆنە و پڕ لە پینە بوو. کراسەکەشی ئەوەندە کۆن بوو نەتدەزانی چ رەنگە.

لە شانی راستی ئەسپەکەیەوە دەڕۆیی و شمشاڵی لێ دەدا. برێك بەرەو پێشەوە کوورِ ببۆوە. ئەو چوار ئەسپەی لە کاروانەکەدا بوون، یەکێکیان ئەسپەکەی ئەو بوو. چیها ساڵ بنەماڵەکەیان بەو ئەسپە نازیبوون. کە ئەسپەکە پیر ببوو، عەلیش وەك گوندییەکان، هەر بۆ گاڵتە ناوی نابوو کەحێل. کەحێل لە کاتی رۆیشتندا لاقەکانی تێکدەئالان. ئەسپێکی زۆر بەرز و درشت بوو، دەتگوت وشترە. مرێمۆك لە سەر پشتی

هەر دەتگوت لەسەر وشتر دانیشووە، بە پاش و پێشدا کوورِ دەبۆوە. عەلی لە بارکردنێدا بەزەیی بە ئەسپەکەدا نەهاتبوو. لە رۆیشتنیدا ئەسپەکە ئەژنۆی دەنووشتانەوە و سەرسمی دەدا. ئەوانەی کەحێلیان ئاوا دەبینی، پێی پێدەکەنین. عەلیش هەر دەیدایە باری گاڵتە و جەفەنگ و دەیگوت:

ــ هەی ها، ئەسپە رەشەی خۆم، حدوودەکەم، کوێرئۆغلێش ئەسپی وای نەبوو... هەی ها... هەی ها... هەی..

دوایی سەری دەبرد بن گوێچکەی ئەسپەکە و بە سترە شتێکی پێ دەگوت:

ــ هەی ها، خێر و بەرەکەتەکەی ماڵم، شادی و دڵخۆشییەکەی ماڵەکەم، کەروێشکە گوێ تیژەکەم، چاوەکانت دەڵێی چاوی کیژۆڵانن، پاڵەکانت دەبریسکێنەوە، سینگت پڕ لە نەخش و نیگارە...

ئەو پیرەژنەی لە پێشییەوە بە شەلەشەل دەرۆیشت، گەڕایەوە و دەستی کردە سیبەری چاوەکانی و سەرتاپێ لە ئەسپەکەی مرێمۆکێی روانی:

ــ ئا ئا... دیارە پێ بەخێر دەبێ، هەر ئەوەندە بەسە سەیرێکی قەڵافەتی و بارەکەی سەر پشتی بکەی! کوڕێ مرێمۆکێ، وات بار کردووە، رۆح دەرنابا و دەمرێ. پەلەی مەکە شادی و خێر و بەرەکەت دەبینی. سەرێك هەڵێنە و سەیرێکی ئەو ئاژەڵە داماوە بکە.

"عەلی"یە درێژ لە وەڵامی ئەو قسانەدا دەستی برد و شمشاڵەکەی لە بەرپشتوێندێ دەرهێنایەوە و گوتی:"ئەوەش بۆ تۆ "یای زەڵەجە" و تێیتووڕاند و لەگەڵی هەڵپەڕی و درێژەی دا:

ــ بەڵێ خێر و بەرەکەتی پێوە بێ.... با پێوەی بێ... گیانی سلامەت بێ. هەم گیانی من سلامەت بێ و هەمیش گیانی شیرن و جوان و دلڕفێنی تۆ کە پیرە لە خەون و خولیا. وەرە ئەوەش بۆ تۆ... نەکا هاتبێتە خەونت. خۆ کەحێلە کورە گەنج نییە بێتە خەونت. پیرە ئەسپە زەڵەجە ژیکەڵە. ئەو هەوایەش پێشکەش بە تۆ.

کچە پێ پەتییەکان بە مەمکە قیتەکانیانەوە لە بنەوە تریقانەوە.

دەمەدەمی زەردەپەڕ کاروانەکە لە زەوییە سپییەکان پەڕیبوونەوە و گەیبوونە داوێنی تۆروس.

تاق و لۆق دار و درەختی سەوز دەردەکەوتن. دوایی کاتێ خۆر ئاوا دەبوو، گەیشتنە شێوێکی چڕ و پڕ لە دار و دەوەن. ڕێگەکە بە چەقی دۆڵەکەدا تێدەپەڕی. لە سەرووی ڕێگەکەوە و لە بن سیبەری دارە گوێزە گەورەکانەوە کانییەکی لێ بوو کە پنگەی بۆنخۆش هەر چوار دەوری تەنیبۆوە. ئەوە کانی "چاغیل ئۆلووک"ـیان پێدەگوت.

ئێرە یەکەم هەوار بوو. کاروان لە سەر کانییەکە خستی. لێرە و لەوێ ئاگر هەڵاییسان. مەنجەڵە ساواریان وەسەر کوچکاور نا.

مانگ لە پشت گەڵا و لقی دارە گوێزە بەرزەکانەوە بوو. بەرەو خۆرنیشین خلۆر ببۆوە و خەریك بوو ئاوا دەبوو.

قریوەقریوی دارستان و لێڕەوار بوو و دەنگی تەقە و قرچە قرچی ئەو چرپی و دارە تەڕانەی دەسووتان. جگە لە بەرامەی خۆشی پنگە، بۆنە تاڵەکەی سووتانی دارە تەڕەکانیش وڵاتیان ئاخنی بوو.

عەلی بار و بنەی خۆی لە بن دار چنارێك خستبوو. لە بن دارەکە ئاگرێکی گەورەی کردبۆوە. مندالەکان کە سەرمایان بوو لە دەوری ئاگرەکە کۆزیلکەیان کردبوو و خۆیان گەرم دەکردەوە.

ئەسپەکە لەو لاترەوە، توورەکە بە لمبۆزەوە ڕاوەستابوو و جووڵەی نەدەکرد. هەر دەمیشی لەو یۆنجەیە نەدابوو کە بۆیان لە توورەکەکەی کربوو، هیچ کاوێژی نەدەکرد. مریەمۆك لە تەنیشت ئەسپەکەوە ڕاوەستابوو و بەردەوام دەستی بەسەر و یاڵیدا دێنا.

ئەلیف سێ کوچکەی پێکەوە نابوو و مەنجەڵەکەی لەسەر دانابوو و خەریکی ساوار لێنانێ بوو.

لە دوورەوە، لەو لای ڕووناکایی ئاگرەکەوە تارماییەك ڕاوەستابوو. هەر کاتێك بایەکە بڵێسەکانی بەرەو ئەوێ خوار دەکردنەوە، تارماییەکە دەردەکەوت بەڵام نەدەناسرایەوە. "عەلی"یە درێژ گوێ قوڵاغ بوو و ئاخری خۆی پێ نەگیرا و بانگی کرد:

ـ کێی لەوێ ڕاوەستاوی؟ ئەگەر حەزدەکەی وەرە بەر ئاگرەکە...

تارماییەکە نەبزووت و متەقیشی نەکرد. بێدەنگییەك وڵاتی داگرت. "عەلی"یە درێژ ملی بەرەو ئەوێ وەرسووڕاندبوو و دەیڕوانی و چاوەڕوان بوو. ئاخرییەکەی جارێکی دیکەش گازی کرد:

ـ کێی لەوێ ڕاوەستاوی؟

تارمـایییەکـە دیـسانیش وەڵامـی نەدایـەوە. عـەلی هـەر ئەوەنـدەی بـینی لەسـەر زەوی هەڵتووتەکا.

مرێمۆك لە کوڕەکەی گوت:

ـ کوڕە بە تۆ چی؟ حەز دەکا لەوێ ڕاوەستێ. ئەگەر قسەیەکی پێتە با بێتە لات.

عەلی نیگەران ببوو. هەستا و چووە لای تارمایییەکە. کە لێی نزیك بۆوە ناسی.

ـ ئای مام خەلیل، ئەوە تۆی؟ چ بووە. بۆ نایەیە کن ئاگرەکە؟...

ام خەلیل دەستە زلەکانی لەسەر عەرزە شیدارەکەی لێڕەوار دادا و بە نقەنق هەستـایە پـێ. لەسەرەخۆ و لە حالێکدا خـۆی دەدایـە سـەر تێلاکـەی، هاتـە بـەر ئاگرەکـە و لـەوێ بـە پێـوە ڕاوەستا. عەلیش لە تەنیشتی ڕاوەستا.

دوایی عەلی بە دەنگێکی نەرم و میهرەبانانە گوتی:

ـ بۆ دانانیشی مامە؟و لەتە لبادێکی بۆ ڕاکێشا.

مام خەلیل بە سەرسووڕماوییەوە سەیری عـەلیی کرد و پرسی:

ـ ڕۆڵە دانیشم؟

و دانیشت.

ئەژنۆی لە ئامێز گرتن و دەستی لە بن ردێنی نا. سوورایی بڵێسەکان کەوتنە سەر ریشی و ڕەنگێکی مسییان پێ دا.

مرێمۆك کە دیتبـووی هـاتووە دەسـتی لـە لاواندنـەوەی ئەسـپەکەی هـەڵگرت و هاتـە بـەر ئاگرەکەو لەسەر لبادێکی دیکە و بەرەورووی مام خەلیل دانیشت.

ئێـستا ئاگرەکـە تـەواو خـۆش ببـوو، دارسـتانەکەی وەك ڕۆژ ڕوونـاك کردبـۆوە. ئـاگرە ڕووناکەکان هاتوچۆکانی نێو دارستانەکەیان وەك هێلانەی زەردەواڵە لێ کردبـوو. دەنگـەدەنگی کاروان گیانێکی بە بەر دارستانەکەدا کردبوو.

مام خەلیل دەستی لە بن ردێنەکەیدا لێـك هـەڵپێکابوو و مـات ببـوو و سـەیری دەور وبەری دەکرد و جووڵەی لە خۆی بڕیبوو. بڵێـسە گـەورەکان، لەسـەر تاڵـە مـووە باریـك و درێژەکانی ریشی سەمایان دەکرد. برێـك بێـدەنگ مانـەوە و چـاویان لـە ئاگرەکـە بـڕی و چاوەڕێ بوون. مرێمۆك ڕقی هەستابوو و ئاخری خـۆی پـێ نـەگیرا. ئارەقـەی کردبـوو. بـە دەنگێکی گڕ و تووڕەوە گوتی:

ـ کوڕم، ئاگادار بە، ئەسپەکەمان خەریکە دەمرێ.

عەلی سەیرێکی دایکی کرد. مام خەلیلیش کە ردێنی دەلەرییەوە، وردە وردە سەری بەرەو مریەمۆك وەرسووڕاند. لەرزەلەرزی ردێنەکەی پتر ببوو.

بۆ ساتێك نیگای بەسەر مریەمۆکەوە گیرسایەوە. مریەمۆك هەستی بە قورسایی نیگای مام خەلیل کرد. سەری داخست:

ـ حەیوانە داماوەکەم زۆر بێتاقەتە. سێ رۆژە دەم لە هیچ نادا.

عەلیش سەری بەردایەوە و چیلکەیەکی هەلگرت و دەستی کرد بە خەت خەتیکردنی خۆلەکەی بەردەمی. ئەلیف لە دوورەوە سەیری ئەو ململانێ بێدەنگییەی دەکرد وا کەوتبۆ نێوانیانەوە و ئازاری دەکێشا. دەیزانی مریەمۆك لەو ململانێیەدا ئەگەر بەنرخی تێداچوونی ژیانیشی بێ، سەر دانانوێنێ. مریەمۆك بە لەسەرخۆییەوە گوتی:

ـ رۆلە عەلی گیان، کوڕم، بە قوربانی دەست و مەچەکت بم، بڕێك بیر بکەوە، ئەگەر ئەسپەکەمان مندارەوە* بێ، ئەمن کوا دەتوانم بەڕێیەدا بڕۆم؟ دلم دەتۆقێ.

دەنگی بەحالێ دەبیسترا.

لە پێشدا مام خەلیل جوولا. دەستی راستی دەرهێنا و هێورهێور دەستی کرد بە داهێنانی ریشی. بە دەنگێکی هێمن و نووساوەوە گوتی:

ـ مام خەلیل ئەو ئەسپە لەو دەمەوە دەناسێ کە تۆ نوێ بووك بووی و ئەو جوانوو بوو. دە بلێ وا نییە؟

ئەو قسەیە وەك شیر لە دلی مریەمۆك کاری کرد. چونکە مام خەلیل باش دەیزانی مریەمۆك چۆن ببووە بووك و ئەو ئەسپەش چۆن هاتبووە مالی ئەوان. زۆر باشیش دەیزانی. بە لەبزیەوە دیار بوو بۆی گرنگ نییە.

مریەمۆك وەلامی نەدایەوە و بێ دەنگ بوو. وەلامێکیشی نەبوو بیداتەوە. عەلی سەری بەردابۆوە و بەو چیلەکەیەی بەدەستییەوە بوو، خۆلەکەی تێکوەردەدا. دیسان بێدەنگییەکی قوولێ زالێ بۆوە. دارستانەکە جۆش و خرشی تێکەوتبوو و لە هەموو لاوە دەنگ دەهات.

---

* مندار: دەربڕینێکی گوندیانەی مردار. مردار بۆ مردنی ئاژەلێ دێ. مردارەوەبوون ، مندارەوە بوون: مردنی ئاژەلێ. بۆ مرۆڤ دەگوترێ: مرد، وەفاتی کرد، عەمری/ئەمری خوای بەجێهێنا... بە سەگ و تاژ و مشك دەگوترێ: تۆپی....

عەلی چێوەکەی فڕێ دا و بڕێك خۆی سووڕاند. بیری کردەوە:"باشە ئەو ژنە رقی چیی لەو کابرایەیە؟" دوژمنایەتی‌یەکەی لەسەر چی‌یە؟ بۆخۆشی بڕێك دەیزانی لەسەر چی‌یە. شتێك لە نێوانیاندا هەبووە، شتێکی زۆر کۆن. مرێمۆك تووڕە و سوور لەسەر قسەی خۆی، وەك بەردێك لە جێی خۆی چەقیبوو. بەڵام مام خەلیل هەر دەهات و نەرمتر دەبوو. وەك بڵێی دەستت لێ دابایە دەشکا یان ئەگەر قسەیەکت کردبایە دەیدایە پڕمەی گریان. وەك منداڵان، عەلی ویستی شتێك بڵێ، بەڵام لەوێی کردەوە. دیسانیش چێوەکەی هەڵگرتەوە و خۆی پێوە خافڵاندەوە.

مام خەلیل چەندی بێهیواتر دەبوو، تا مرێمۆك بێدەنگتر دەبوو و عەلیی کوڕیشی هیچی نەدەگوت، پتر تووڕە دەبوو. تا تووڕەتریش بوایە، دەمارەکانی لاملی پتر هەڵدەستان. ردێنی لەبەر یەك دەکێشا و پەنجەکانی خۆی دەجوی. لە پڕ وەك منداڵێکی گورج دەرپەڕی و خۆی بەرەو مرێمۆك خوار کردەوە و بە دەنگێکی تووڕە و توند گوتی:

ـ ئەوی ئەسپی هەیە و هەرچی کێڵگەی هەیە، مێرووی زەوی و باڵندەی ئاسمانێ، ئەوی لە نوێنی ئاوریشمدا دەنوێ و ئەوی لەسەر زەوی جینگڵ دەدا و ئەوی شیری مریشك دەخوا... تۆش و ئەمنیش... و تەنانەت ئەوێکی کوڕێکی وەك "عەلی"یە درێژیشی هەیە، هەر هەموومان دەچینە بن گڵ، مرێمۆك

رووی وەرسووڕاند و بەپەلە دوور کەوتەوە.

عەلی لە پشتەوە سەیری دەکرد. مام خەلیل کە هەوڵی دەدا خێرا بڕوات، دەشەلی.

لە دڵی خۆیدا گوتی:" کێ دەزانێ ئەو داماوە چەندە ماندووشەکەت دەبێ. کێ دەزانێ پێی چۆن بلۆقی کردووە؟ ئەژنۆکانی چۆن دەبریسکێنن. لێقەوماوە. ئاخ دەرکت دەرێ پیری." ساڵی رابردوو هەتا رۆژەڕێیەك بۆ چوکوور بەپێیان رۆیبوو. بەڵام لەوێوە نەیتوانیبوو تەنانەت هەنگاوێکیش هەڵگرێ و عەلی هەڵیگرتبوو و سواری کەحێلی کردبوو. بەستەزمانە زۆری پێ خۆش ببوو. لەسەر ئەسپەکەوە چاوێکی لێ‌کردبوو و چاوەکانی پڕ ببوون لە ئاو. بەڵام مرێمۆك کردبوویە رۆژی قیامەت و عەلیی بە کێوی رەشدا کردبوو.

عەلی قسەکانی مام خەلیلی وەبیر هاتنەوە:

"عەلی، ئەو رۆژانەت دێتەوە بیر؟ خوا پیری بەرێتەوە. ئەمن و بابت کە دەچووینە چوکووری خواروو، کۆڵ کۆڵ شووتیمان لە قوجابوجاقەوە دێنا. هەم بۆخۆمان دەمانخوارد و هەمیش گوندییەکان. ئەو رۆژانەت دێتەوە یاد عەلی؟ دەك خوا پیری بەرێتەوە. شەوێکیان ئەمن و بابت هەرکامەمان جەواڵێك لۆکەمان خستبووە سەر شان و دەهاتینەوە. لە ناکاو دیمان خاوەن زەوی

بە ئەسپ کەوتووەتە سەرمان. بە ئەسپیش نەمانگەیشتێ. عەلی، حوکمەت دەبێ ئەو پیرانە کۆ بکاتەوە و بیاننێرێتە یەمەنێ. پیاو لە جێی ئەوەی پیر پیر بێ، باشترە بچێ لە یەمەنێ سەر بنێتەوە. وا نییە عەلی؟ ئەو شەوە باران وەك گۆزەی سەرەوبن دەهاتە خوار. لافاو کێڵگەی رامالێبوو عەلی. شەوێکی بوو چاو چاوی نەدەدی. لەبیرتە؟ لافا و تەنەکە و نوێنی رادەدا و کەپر و خێوەتی... ئەوە کێ بوو گوندییەکانی لەو بەڵایە رزگار کرد؟ چما من و بابت نەبووین، عەلی؟ تۆ پاڵت بە پیرەدارێکەوە دابوو. کروشمەت کردبوو و هەڵدەلەرزیی. ئاو گەیشتبووە نێوکت. لە سەر دار تووەکەشەوە ئاو وەك لافاو بەسەرتدا دەهات خوارێ. زارت وەك تەڵەی تەقیوی لێ هاتبوو و هەڵنەدەپچڕدرا. بەرەبەری بەیانی بوو، کە تۆم دۆزییەوە ئاوا بووی. هەموو شمەکەکانتم داڕنی و بۆ ئەوەی گیانت گەرم بێتەوە، بە خۆمەوە نووساندی، عەلی؟ لە بیرتە؟ دوایی هەر وا کە خۆت بە جەستەی گەرمی منەوە نووساندبوو، هەتا ئاوایی هەڵاتم، عەلی! لە گوندەکە، ئەتۆم لە تەنیشت ئاگرەکەوە، دیارە برێك لەولاتریەوە، وردە وردە گەرم کردەوە. دوایی چایەکی گەرمم دایەی. لەبیرتە عەلی، تۆ منداڵ بووی، پێنج یا شەش ساڵانە بووی. ئەمن ئەودەمیش ریشم سپی ببوو بەڵام بە پیریان نەدەزانیم. دە رۆژی رەبەق باران خۆشی نەکردەوە و هەموو چوکووراوا کەوتە بن ئاو. لەبیرتە؟... ئەوی ئەسپ یا خانوو و کێڵگەی هەیە، ئەوی شیری مریشکیش دەخواتە هەر دەچێتە بن گڵ و دەبتەوە گڵ... ئەتۆش و ئەمنیش... عەلی، لەبیرتە ئەو دەمە بابت زیندوو بوو، لە باغە دوور دوورەکانەوە کۆخی گەورەگەورە و پڕئاوت بۆ دەدزیم؟ لە بیرتە عەلی؟"

ئاگرەکان وردە وردە دامرکانەوە، بڵێسەکان نیشتنەوە. تەنیا پزیسکەکان مانەوە و نێو دارەکان بووە ئەستێرەباران. دوایی، پزیسکەکانیش بوونە خۆڵەمێش و هەموو وڵات لە بێدەنگی‌یەکی کپ رۆچوو. جار و بارە لە دارێکەوە دەنگی خرپە خرپێك بەرز دەبۆوە، منداڵێك دەگریا یان دەکۆخی.

خەو نەدەچووە چاوی عەلی. دەمێك گوێی دایە دەنگی دارستان. چاوی بڕیە دامرکانەوە و بەخۆڵەمێشبوونی وردە وردەی پزیسکەکان و تەواوبوونی رووناکایی. بەردەوام تەنیشتاوتەنیشتی دەکرد. ژانێکی نەناسراوی لە لەشدا بوو.

شەوگار شەق بوو، کەڵەشێر خوێندی. لەگەڵ دەنگی کەڵەشێرەکە عەلیش هەستا و چووە لای ئەسپەکە. ئەسپەکە سەری شۆڕکردبۆوە و گەیبووە زەوی و تەرکی ئەو توورەکەیەی بەسەرییەوە بوو و بۆی پڕکرابوو لە کا و یۆنجە وەعەرزەکە دەکەوت. بیری کردەوە لەوانەیە ئیتر

حەزی لە کا و یۆنجە نەبێ. دەستی لەسەر سمتی ئەسپەکە دانا. بە حاستەم گۆشتی پێوە نەمابوو. کەحێل ببووە ئێسک و پێستێکی رووت لە تاریکاییدا، بە دەستەکوتە رۆیشت و بوەشێك گیا و گژی تازەی لە دارستانەکە بۆ هێنا و لە پێشی کرد. ئەسپەکە هیچ گوێی لێ نەبوو. عەلی توورە بوو و سەری ئەسپەکەی گرت و لە گیا و گژەکەی رۆکرد. سەری لە نێو گیا و نالیکەکەدا راگرت بەڵام بێ سەمەر بوو. ئەوجار زاری ئەسپەکەی داپچڕی و قولە گیایەکی تێتاخنی. ئەسپەکە دیسانیش شەویلکەی نەبزواند و هەروا بێ هەست و خوست مایەوە. عەلی توورەتر بوو. بە قەڵسییەوە پاڵێکی بە ئەسپەکەوە ناو گوتی:

ـ قوزەڵقۆرت بخۆ.

ئەسپەکە بەلادا هات.

ـ قوزەڵقۆرت بخۆ یاخوا بتۆپی. ئەمنیش لە چنگت رزگارم دەبێ.

لە سەرەتای شەوێوە هەر دەهات و توورەتر دەبوو. نەیدەزانی توورەیییەکەی بەکێ هەڵڕێژێ و هەر جینگڵی دەدا. هەوا سارد بوو بەڵام سەرمای نەبوو. چووە نێو جێوبانەکەیەوە. دەمێك بوو مانگ لەکەل ئاوا ببوو.

لەوەتا عەلی بوو، ئەوە سێهەمین جاری بوو خەو نەدەچوە چاوەکانی. یەکەمین جار ئەو شەوەی لافاوەکە لە ترسان و لە سەرمان خەوی لێ نەکەوت و دووەمین جاریش ئەو شەوەی باوکی مردبوو.

# ٤

بەر لەوەی رۆژ بێتەوە، ئەو دەمەی وڵات کپ و خامۆش بوو و تەنیا دەنگی خوڕەی ئاوی کانی‌یەکە تێکەڵاوی قریوەی دارستان دەبوو، عەلی لە جێوبانەکەی هاتە دەرێ و چووە لای ئەسپەکەو زاری داپچڕی و سەیری کرد. ئەو قولە گیایەی ئەدی کە شەوی پێشوو لەزاری ئەسپەکەی ئاخنیبوو، سەیرێکی دەوربەری کرد، کە ئەیدۆزییەوە دڵی خۆش بوو. بەڵام ئەو باوەشە گیا تازەیەی نیوەشەوێ لە پێشی کردبوو، شەقڵی نەشکابوو. بە نووکە شەقێك لای دا، گیا و گژەکان بەسەر کۆتەرە دارێکا پەرش و بڵاو بوون و چڵ چڵ پییدا شۆڕ بوونەوە.

هەوساری ئەسپەکەی گرت و وردە وردە کێشای. ئاونگ دارستانەکەی تەڕ کردبوو. دارکونکەرەیەك لە دارەکەی رووبەڕۆوە هاتە دەرێ و لە شەقەی باڵی دا. لە دوورەوە چەند باڵندەیەك جیکە جیکیان بوو. بۆنی بەیانیانی درا کاژ بەرلووتی کەوت و دوایی لەگەڵ شنەی بەیانیدا بۆن و بەرامەی پنگەی بەسەردا هات. لاقەکانی لە پنچك و دارە کەوتووەکانی دارستاکەنە دەئاڵقان.

دایکی و ژن و منداڵەکەشی بەخەبەر هاتبوونز ژنەکەی خەریك بوو دەستەنوێن و قاپ و قاچاغەکانی تێك دەنان. عەلی دوای ئەوەی ساتێك راوەستا و چاوێکی بە سەر و گوێلاکی ئەسپەکەدا گێڕا، دەستی کرد بە بارکردنی. گۆنی‌یەك ساواری لە لایەکی و جەواڵەیە ئاردەکەشی لە لا تەنیشتەکەی دیکەی توند کرد. گۆنی‌یە ئاردەکە وەك نێو ئاش تۆزی ئاردی لێ هەستا. دوایی دۆشەگەڵەیەکی لەسەر زینە چەرکەزییەکە راخست. لێفەکان و بەشێك لە قاپ و قاچاغەکانیشی لە ئەسپەکە بار کرد.

لەو جەنگەیەدا گوندییەکانیش بەخەبەر هاتن، دارستانەکە ئیتر دارستانەکەی ساتێك لەوەپێش نەبوو. نە خوڕەی کانی مابوو و نە قریوەی دارستان. لە گەڵ کازیوەدا، دەنگی کاروان دارستانی

تەنییەوە. پۆلە باڵندەیەك كە لە ڕۆژھەڵاتەوە دەھاتن، بە قاو و قیژ و جیك و فیك بەسەر دارستانەكەدا تێپەڕین. مژێكی خەست سەر دارستانەكەی داپۆشیبوو و لە دوورەوە كەسك دەچۆوە.

بۆنی تەلاش و توێكڵە رزیوی داری بۆ ھات. دایكی گوتی:

ــ عەلی، لەبەر ئەو دەست و مەچەكەت مرم... كورە پشت و ئەژنۆم زۆر ژان دەكەن. زووتر سواری ئەسپەكەم بكە. ناتوانم وەك جاری جاران بۆخۆم سوار بم، تین و گوڕی ساڵی ساڵانم نەماوە.

عەلی ئەسپەكەی كێشایە تەنیشت كۆتەرە دارێكی بڕێك گەورە. دایكی لەسەر كۆتەرەدارەكە دانا و خۆشی كۆمەگی كرد و سواری ئەسپەكەی كرد. مرێمۆك جڵەوی ئەسپەكەی بە دەستەوە گرت. خۆی قیت كردەوە. ئەوی دەیبینی، دەیگوت: ئەوە مرێمە كوور نییە. قەمچییەكی لە ئەسپەكە راكێشا. كاتێ ئەسپەكەی بە نێو دارەكاندا دەڕۆیی، تووشی گوێدرێژێك بوون كورتانی خوار كردبوو و بارەكەی خستبوو. خاوەنەكەی لە لایەكەوە لە كەرەكەی دەدا و لە لایەكیشەوە ھەوڵی دەدا دیسان بارەكەی بخاتەوە سەر پشتی. مرێمۆك بە بزنەڕێیەكدا بایدایەوە نێو دارستانەكە. بە تەنیشت گوێدرێژەكەدا تێپەڕی. رێگەكە ئاوەڵا بوو، لە پێشیانەوە، دوور دوور كێوێكی مژ داگرتوو، رەش دەچۆوە.

بە شوێن ئەسپەكەدا، منداڵەكان و دوایی بووكەكە و لە دوای ھەمووشیانەوە عەلی وەڕێ كەوتن. عەلی لە بن بارستایی ئەو بارە قورسەی بە كۆڵیەوە بوو، پشتی كۆمابۆوە. چاوی لە لاقەكانی ئەسپەكە بڕیبوو. ھەر كاتێ لاقەكانی ئەسپەكە تێكدەئاڵان و سەرسمی دەدان، نێوچاوانی گرژ دەبوو، بەڵام كە دەیدی ئەسپەكە راست و راست بەڕێیەدا دەڕوا دڵی خۆش دەبوو. لە دوورەوە بۆنی گوڵەگەنمێكی بۆ ھات. لە بن تیشكی ھەتاوی كێڵگە گەنمەكاندا كە بە تەنیشت یەكترەوە بوون، چاوی بە گیشە گەنمەكان كەوت كە ھەڵ-چنرابوون. لە پێدەشتە كاكی بە كاكییەكەدا تیشك و تیرێژی زێڕینی ھەتاو لەگەڵ گوڵە گەنمەكاندا كەروێشكەی دەكرد. ئاوڕێكی دایەوە و "وەلی"یە رەش"ـی بینی كە لە تەنیشتییەوە دەڕوا و بزەی دێتێ. "وەلی" گوتی:

ــ زۆر لە فكر دای... ئەوە نیو سەعاتە شان بە شانت دێم، ھەر ئاگاشت لێ نییە. چ بووە؟....

عەلی گوتی:

ــ ھیچ نییە. پوورە فاتێ چۆنە؟

ـ هەر باسیشی مەکە. لەوەتی لە گوندێ وەدەرکەوتووین، چاوی هەڵنەبڕیوە. ئەوە دەڵێی چی برایە؟ خۆ تۆ ئەو دەمەی سەرباز بووی نەخۆشت دیون. رات چییە؟

عەلی ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ــ جا بڵێم چی.

"بەکرە شێت" بەبێ ئەوەی سەیری ئەولا و ئەملی بکا، گورج بە تەنیشتیاندا تێپەڕی.

عەلی گوتی:

ــ چاو، چاو ئەو سەگبابە!... را کە پیرە سە، راکە و کێلگەیەکمان بۆ بدۆزەوە کە هێشتا لۆکەی نەپشکووتبێ.

"وەلی"ش لەسەری رۆیشت:

ــ هەڵێ قورمساغ، غار دە. دیارە نازانی گوندییەکان چ بڕیارێکیان داوە.

عەلی:

ــ جا دەکرێ نەیزانیبێ؟ ئەو لەگەڵ کوێخا کلکیان تێك هاڵاندووە و گوندییەکان هەر بە بنیادەمیش نازانن.

ــ با نەیزانن.

ئیتر گەڕایەوە و کە دوور دەبۆوە گوتی:

ــ پوورە فاتێ بەجێ ما. نەکا شتێکی بەسەرهاتبێ. گوتم با بچم دوو سێ قسە لەگەڵ عەلی بکەم. جارێ خوا حافیز.

کاروان هەڵقەنرابوو. پیرەژنە پیخاوسەکان بە کراسە شینە درێژەکانیانەوە و ژنە گەڕاوە*کان بە لەچکی سپییەوە و نویبووکەکانیش بە بسك و کەزیی هۆنراوە و کراسی زێڕکفت و کچۆلانیش هەوری لەکۆڵ و بازن لە قۆڵ کەوتبوونە رێ و شوێن پێی بێ پێڵاویان بەسەر خاك و خۆڵە سپییەکەوە دەمایەوە. پیاوەکان پۆل پۆل لە تەنیشت یەکترەوە و بە قسەکردن رێیان دەبڕی. منداڵەکان لە قەراغ رێگەکە یاری و حەقلی مەقۆیان دەکرد.

هەتاو کەوت. سیبەرە تێکالاو و ئالۆزەکان لەسەر جادەکە بڵاو بوونەوە.

کوڕەکەی عەلی، دەستەکانی کە سەرما سووری هەڵگێڕابوون پێشانی باوکی دا. گەیشتبوونە ناوچە فێنکاییەکەی کوێستان. گوتی:

---

* گەڕاوە: بە ژن و پیاوی هەراش و بەتەمەن دەگوترێ کە هێشتا پیر نەبووبێ و گەنجیش نەمابێ.

ــ ئەلحەمیلا تاو هەلأت**.
کوڕەکەی عەلی تازە تەمەنی ببووە حەوت ساڵ.
عەلی گوێی نەدایێ. کوڕەکە گوتی:
ـ لەو تاوە خۆشەی.
عەلی نەیبیست.
کوڕەکە لە کەحێلەکە پێش کەوت. گوێدرێژێکی بارکراو لە پێشییەوە دەڕۆیی و شۆرکەی*** کورتانەکەی لە لاقەکانی هالأبوو. ژنێك هەوساری کەرەکەی بە دەستەوە بوو، کوڕەکە قۆڵی ژنەی راکێشا و گوتی:
ــ پوورە زەڵە، شۆرکەکە لە قاچی کەرەکەت هالأوە.
چاوێکیشی لە دایەگەورەی کە قیت و قنج لەسەر ئەسپەکە دانیشتبوو داگرت. زەڵە زۆر شێوا بوو. کە داهاتەوە شۆرکەکە لە لاقی کەرەکەی بکاتەوە، مرێمۆك بە تەنیشتیدا تێپەڕی. کوڕە بە دایەگەورەی پێکەنی و گوتی:
ــ ئای ئای، نەنە!
مرێمۆك هەستی بەو بزۆزییە کردبوو کە لە راوێژ و لەبزی کوڕەکەدا بوو. بە توورەییەوە گوتی:
قوزەلقۆرت! ژەقنەمووت. هەر دەزانێ تەوی و پلاران بهاوێ. جا ئەگەر من بە بابتم نەگوت... هەتیو بستە منداڵێکە ئەو قسانە لە کوێ دێنێ...
عەلی ماندوو بوو هێندەی سەیری لاقەکانی ئەسپەکەی کرد. سێ سمی ئەسپەکە بێ ناڵ بوو و ناڵی چوارەمیشی شکابوو. لەو هەمووە ساڵەدا عەلی لەدەستی نەهاتبوو ئەسپەکە ناڵ بکا. بۆیە چاوی لێ هەڵبڕی و خێرا وەپێشی کەوت. کە لە دارستانەکە وەدەرکەوتن، کەوتنە لێژاییەك، کە دەچووە نێو دۆڵێکی وشك و برینگی بێ داروبارەوە. لە ناکاو برێك ئەولاترەوە چاوی بە مام خەلیل کەوت کە خۆی دەدایە سەر تێلاکەی و بە لاکەلاك دەڕۆیی و جارجار دەوێستا و سەرێکی هەڵدێنا و پشوویەکی قوولی هەڵدەکێشا.
عەلی کە مام خەلیلی ئاوا بینی، بۆ ئەوەی ئەو نەیبینێ، هەنگاوەکانی شل کردەوە. مام خەلیل هەر دەهات و شلتر دەڕۆیشت و عەلیش بەپێی ئەو خۆ شلتر دەکردەوە. ژنەکان تێ-

** ئەلحەمیلا: گوندییەکان ئەلحەمدولیللا بەو شێوەیە دەڵێنەوە. تاو هەلأت: واتە خۆر هاتە دەر. هەتاو کەوت.
*** شۆرکە: ئەو گوریسە پانەی کورتانی پێ لەکەر توند دەکەن.

پەڕین، منداڵ و بەساڵاچووەکانیش تێیپەڕین، نەخۆشەکان و سوارەکان و کەرسوارەکانیش ڕابردن. مام خەلیل لە هەمووان دوا کەوتبوو و چەندی ئەو بەجێدەما، عەلیش ئەوەندە دوا دەکەوت.

یەکێ گوتی:

ــ چ بووە عەلی، بۆ دواکەوتووی؟چتە؟

عەلی رووی گرژ کرد و بەلای چەپێدا نووشتایەوەو گوتی:"کەلەکەم دێشێ." ئەوجار دایکی هات رابرد و دوای ئەو ژنەکەشی...

تا لێژاییەکە تەواو بوو، هەموو گوندییەکان وەپێشی کەوتن.

عەلی بە تووڕەیی‌یەوە بەخۆی گوت:

ــ بریا توانیبام خۆم بخەمە پشت یەکێکەوە و بەلایدا تێپەڕم. یان جامانەکەم بخەمە سەر چاوم و وا بنوێنم هەر نەمدیوە و تێپەڕم.

بەڵام هیچ کام لەو رێگەچارانەی پێ نەدەکرا. ئەی چی پێ دەکرا؟ هیچی لە دەست نەدەهات. لە دڵی خۆیدا گوتی:"هەی دیهاتی‌یە کافرەکان، هەی بێ دین و ئیمانینە، تۆخوا وەرە سەیری ئەو کابرایە کە. دەك بەزیاد نەبێ ئەو ژیانە..."

ددانی چیڕ کردنەوە. کە گەیشتنە نێو شیوەکەوە، دیتیان کاروانەکە هەورازەکەشی بڕیوە و لە گردەکەش ئاوا بووە.

مام خەلیل گەیبووە نێومالّی شیوەکە و عەلی هێشتا لە لێژایی‌یەکە بوو. دانیشبوو و لەبەرخۆیەوە بیری دەکردەوە. لە ناکاو هەستایە پێ و گوتی:" نەخێر، چارم نییە، چ بکەم. ئەسپەکە نەخۆشە و ئەگەر دایکم بگەیێنێتە چوکوور، دەبێ کلاوەکەم هەلاوێم و نەیگرمەوە. خۆ بێت و ئەو کابرایەشی سوار بکەم، هەر قەباحەتە. لەوەش گەڕێ کە دایکم دەیکاتە چ حەشرێك...

چ بکەم. بۆ ئەمن زامنی هەموو ئەو خەڵکەم؟

بە خێرایی لە لێژایی‌یەکە هاتە خوار. شەلاڵی ئارەقە بوو. گورجتر بە تەنیشت مام خەلیلدا تێپەڕی. هەستی کرد پیرەمێردە راوەستاوە و بە لۆمەوە سەیری دەکا. ورد بوو. هەنگاوەکانی خێراتر کردن. کە هەورازەکە سەر دەکەوت ئیتر خۆی پێ نەگیرا و ئاوڕێکی دایەوە. مام خەلیلی دی کە راوەستاوە و خۆی داوەتە سەر تێلاکەی و سەیری ئەو دەکا. لەسەر پشت ملی خۆی هەستی بە قورسایی نیگای چاوە ئاگراوی و وردیلە و وێکهاتووەکانی کرد. هەورازەکەی بە یەك دوو شەقاوان بڕی و وەکو شێتان پاڵی بەم و بەوەوە دەنا و بە هەڵەداوان خۆی گەیاندە دایکی.

سەری ئەسپەکەی گرت و گێڕایەوە. دەموچاوی وا رەشداگەڕابوو دەتگوت وەختە لە تووڕەییان بتەقێ. نە دایکی هیچی لێ پرسی ونە کەسی تر.

کە گەڕانەوە، مام خەلیل گەیبووە نیوەی هەورازەکە. عەلی ئەسپەکەی لەسەر هەورازەکە راگرت. مرێمۆك هەر پێی سەیر بوو و عەلی کە هەموو گیانی دەلەرزی، رێشمەی ئەسپەکەی گرتبوو. بە راکردن چووە خوارێ. بن پیلی مام خەلیلی گرت و پیرەمێردەی بە راکردن بەدووی خۆیدا کێشایە سەرێ. کە گەیشتنێ، مام خەلیل دەهات پشووی راوەستێ. عەلی رێشمەی ئەسپەکەی کێشایە قولکەیەکەوە و مام خەلیلیشی هێنایە تەنیشت قولکەکە. ئیتر پڕیدایە و لەسەر تەرکی* ئەسپەکەی و لە پشت دایکیی دانا. مرێمۆك پێی تووڕە بوو و دەست و قاچی کەوتنە لەرزین. رێشمەی لەدەست بەربۆوە. عەلی هەڵیگرتەوە و بە تووڕەییەوە دایەوە دەستی دایکی. دواییش سەری ئەسپەکەی گرت و رایکێشا و کەوتە رێ. ئەوەندە خێرا دەڕۆیی چیی نەمابوو ئەسپەکە لە دواوە سەرەنگرێ** بێ.

عەلی کە گەیشتەوە کاروان، سەری ئەسپەکەی بەردا. گوندییەکان گوتیان:

ــ کوا کوڕی وەك عەلی. یاخوا دەست بۆ هەرشتێ بەری ببێتە زێڕ، و سەیری ئەسپەکەیان کرد و پێکەنین.

کوڕەکەی لێی چووە پێشێ و گوتی:

ــ قسەی خۆمان بێ چاك لە ئارەقەیدا خووساوی ها! ئەوە مام خەلیلیشت سوار کرد. ئەگەر ئەسپەکەمان بمرێ ئەنکم چ دەکا؟

عەلی جوابی نەداوە. کوڕە لەسەری رۆیشتەوە:

ــ ئەگەر بمرێ...

عەلی:

ــ با بتۆپێ...

بە دوای ئەو قسەیدا تفێکی زلی لە عەرزەکە کرد.

کوێخا کە مام خەلیل و مرێمۆکی بەسەر کەحێلەوە دەبینی، گوتی:

---

* تەرکی ئەسپ: پشتەوەی زینەکە. زین جێی دوو کەسی نابێتەوە.

** سەرەنگرێ بێ: بە سەر بەعەرزیدا بکەوێ. هەڵەنگوێ.

ـ کوێخا فیکەی خۆی دەناسێتەوە. ئاخری حیزبایەتیتان خستە نێو ئـەو گوندۆکەیەشـەوە و دژی من و بەکرە شێت، دژی من حوکمەتەکەمان و... هەموو دەستتان داوەتە دەستی یـەکتری و ... ئاوا...

مرێمۆك لەو کاتەوە مام خەلیل سواری ئەسپەکە ببوو، دەیبۆڵاند، بە تایبەتی هـەر کاتێـك ئەسپەکە سەرسمێکی دەدا، بۆڵەبۆڵەکەی ئەو خەستتر دەبۆوە.

لـە "تاکـە قـەڵا" تـێپـەڕین و گەیـشتنە "سێرچـەلیك". لێـرەوە رێگـەی کوێـستان دەسـتی پێدەکرد. رژد و تەلان و ناخۆشترین رێگەکان بوو. بۆوەی نەدەبوو پێی بلێی رێکا. رێچکەیەکی باریك و پڕ لە وردکەبەرد، بەردی تیژ تیژ. تەنیا دەبوو پێ بنێیتە نێوان کوچك و بەردەکانەوە.

ئەسـپەکە کـاتێ گەیـشتە ئـەو رێگەیـە، ئـیتر مرێمـۆك ئـاگری گـرت. ئـیتر قـسەی دڵـی نەدەشاردەوە و مام خەلیلیش دەیبیستن و خۆی لێ گێل دەکردن:

ـ مەیە برالە مەیە، ئەگەر تین و هێزت تێدا نییە مەیە. ئەگەر هێزی ئەژنۆت نییە مەیـە. هەموو ساڵی لێی سواری ئەسپەکەی ئێمە دەبی. خۆ ئەسـپی خـەڵك ئەسـپی بابـت نییـە. خـۆ بەوچاوە شینانەتەوە لۆکە بۆ من ناچنیتەوە. تۆ کۆی دەکەیەوە و ئەو حەسەنە چـڵمنەی کـوڕت لە سمت و قوونی ژنەکەی دەدا بۆ ئەوەی ئەوەندەی دیکەش گەورەتر بێ و لاوەکانی دێ کەیفیان پێی بێ... مەیە برالە، مەیە گوو بە ردێن، برایمی مـن چـی بەدەسـت تـۆوە نەکێـشا... مەیـە کوندەبووی شووم... مەیە بۆقی چاوشینی زەلکاوان... مەیە شەیتانۆکەی وشك هـەڵاتوو. ئـەو تولەسەیەت لێ بوو و گەورەت کرد تەنانەت کەرێکیشی بۆ نەکڕیی. کـاتێ سوورسـوور دەبـینی ئەو لۆکەیەی کۆی دەکەیەوە، ئەو لۆکەیەی بەو چاوەشـینانەتەوە دەیـچنیتەوە، ئـەو لـە قـوونی ژنەکەی دەدا، تۆش مەیە. خۆ بە زۆر دەستیان نەگرتووی بەرەو چوکوور راتکێشن؟ مەیـە پـیرە بەراز. دێ و دوایی بەو بیانووەی ئەژنۆکانت هێزیـان نییـە، سـواری ئەسـپە داماوەکـەی خـەڵك دەبی. ئەو ئەسپە لاوازە کە لاقەکانی تێکدەئاڵێن و خەریکـە دەمـرێ. ئـاخر هـیچ نـالێی ئـەو ئەسپە دوو کەسی پێ هەڵناگیرێ و دەمرێ و ئەو مرێمۆکە سەربەهەش و مل بە کوێنە دەبێ بە پێیان بڕوا و ناشتوانێ بڕوا و لە نێوەڕێیە دەمرێ. کوڕە بۆ ناچی سـواری قەڵاندۆشـی ئـەو ژنـە رشکن و قەحپە و بۆگەنیوەی کوڕەکەت بی. یاخوا عەمرت نەمێنێ و سـەردەر نەبـەی خەلیلـە پیر، بۆو بەڵایانەی بەسەر برایمەکـەی منـت هێنـان... نـاوە پاکەکـەیت زڕانـد. ئـەوە پیـاو بـیر ناکاتەوە؟ پیاو سەر بە ماڵی ویژدانی خۆیدا ناکاتەوە؟ ئاخر ناڵێ ئەگەر ئەو ئەسپە بمرێ دایك و ژن و منداڵی ئەو هەتیوە لێقەوماوە لەو کێو و کەژەدا سەرگەردان دەمێننەوە؟ ئای ئـای ئـای،

کوڕه هەی ماڵ کاولی بێ ویژدان. ئەو بەلایانەی بەسەر برایەکەی منت هێنا. عومرێک دەربەدەرت کردین... خەڵك چووزانن. هەر خۆم دەزانم.

مام خەلیل چلۆوکی ردێنی خستبووه نێو زاری و بە پووکە بێ ددانەکانی دەیجووین و خۆی لێ کەڕ دەکرد. جاری وابوو وەخت بوو لە داخان بتەقێ. لەبەرخۆیەوە دەیگوت:"شەیتان دەڵێ چەپۆکێکی پێدا دەی و فڕێیدەیە بەرپێی ئەسپەکە. با بمرێ، بەڵام ئەی ئەگەر هات و نەمرد و گوتی مام خەلیل خستوومیەتە خوارێ؟... کوڕه زیندان زۆر قوڕ و ناخۆشه.."

سەری بەرەو لای راست وەرسووڕاند و روانییە کوێستانەکەی رووبەڕوویان. کێوە دوورەکان شین دەچوونەوە. هەوری سەر لووتکەکانیان بەرەو رۆژهەڵات دەخزین. شێدار و درەوشاوە و تار. هەموو شتێکی دەکرد بۆ ئەوەی گوێی لە قسەی مرێمۆك نەبێ. بیری لە رۆژانی رابردووی دەکردەوە و کیهەیان لە هەمووان خۆشتر بوو ئەوی وەبیر خۆی دێناوە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت:"رەشیی چیاکان، هەورە سپییەکان، ئەو هەمووە ساڵە لەو رێیەدا..." جارێکی دیکەش ئاسمانی ساوی "گیسیك گیدیك" و داوێن و لاپاڵە پرتەقاڵییەکانی بیر خۆی هێنانەوە. بەڵام نەدەکرا. نەیدەتوانی خۆی لێ کەڕ کا. هەر وا ریشی دەجوی. ژنه لە بن گوێی وزەوزی بوو و چیی بەسەر زاری دا دەهات نەیدەگێڕاوە. دەیگوت:"ئەوە هەمووی بە من دەڵێ؟ باشە بۆ؟... مەگەر کوڕەکەی سواری نەکردم؟ بۆ لەبەر کوڕەکەی پاڕابوومەوە کە سواری تەرکی ئەو کۆنە ماکەرەم بکا؟ ئەدی بۆ هەر بۆڵەی دێ؟ پیرێتی مێشکی تێك داوە. کاتێ مرۆڤ پیر دەبێ چەنەی ناسرەوێ و هەر دەوەڕێ. ئاخە چ خراپەیەکم بۆی بووە؟

لووتکەی کێو رەوەزە. خەڵکی "ئیسیرگان" بۆ راوە ئاسك و بزنەکێوی دەچوونە ئەوێ. زۆریان هەر نەدەگەڕانەوە. راوی بزنە کێوی و گاکێوی کارێکی خۆڕاییە. خوا بە نەسیب کەسی نەکا. لە لووتکەی کێوەکە رەوەزێکی بەرز، زۆر زۆر بەرز سێ هێندەی منارەکەی بازاڕی "عەدنە" وەك مەڕمەڕ لووسە و وەك مەڕمەڕیش سپی. رەوەزە سپییەکە هەموو بەهاران گوڵ دایدەپۆشێ. وەکو باغێك و هەڵۆ لەسەری لەنگەر دەگرن. کێشانی جەنجەڕ کارێکی قوڕە و دروێنەی گەنمیش لەو قوڕتر. لۆکە چنینەوەش بەڵایە. مرۆڤ کە پیر بوو پشتی دەشکێ... لەو دوورانەوە لە ئاسمانێ، برێك دوورتر لەو کێوە شین باوانە هەڵۆ لەنگەر دەگرن و دەسووڕێنەوە. هەر بەراست ئەو رۆژە دەنکە گەنمێك پەڕییە قوڕگمەوە، دوو رۆژان هەر دەکۆخیم...

ئەسپەکە جارێکی دیش سەر سمی دا. پیرەمێردە پشتیشی دابوویە ژان. هەر جارێکی ئەسپەکە لەتری دەدا، مرێمۆك دەنگی زیاتر لێ هەڵدێنا.

“خوایە گیان، من دەیبیستم، با کەسیتر گوێی لێ نەبێ. وا دەزانن جوێن بە من دەدا. ئەوان چووزانن چەنەی ناسرەوێ. ئەو پیرەژنە زمانشڕانە. خەڵك لە دەستی ئەوانە وەئامان هاتوون. خوا بیانباتەوە. هەتا ئەوانە نەمرن دنیا نابێتە دنیا. بەڵام ئەوانە بە چنگ و ددان بە دنیاوە نووساون. نە دەمرن کە بحەسێنەوە و نە دەشهێڵن خەڵك بحەسێتەوە. ئەو خوارە دارستانە. دوانیوەڕۆ سەری کاروان دەگاتە ئەوێ. دووەمین هەوارگەمان نێو دارستانەکەیە. دارستان هەر دێ و نزیکتر دەبێتەوە، بەڵام تا نزیکتر دەبێتەوە، دڵێ شوێن دەگۆڕێ. دارستان هیچ کات بێ گوڵ نییە. هەموو رۆژێ بۆ خۆڕازاندنەوە هەزاران گوڵ پەیدا دەکا. دارستان وەك بنیادەم وایە. شیری خاوی خواردووە. چیها چاکەم لەگەڵ ئەم مرێمۆکەی کرد. دارستان دەخزێ و دوورتر دەکەوێتەوە. بۆن و بەرامەیەکی ئاشنا لە هەوا گەڕاوە. برێك تاڵ دەچێ. لە کۆنەوە هەر دێ. لە ناخی خەونێکەوە، وەك عەتری پنگە. عەتری کاژ، بۆنی سێوە رزیو، ئەوە چەندین سەدەیە دێ، بە شەپۆل. هەی پێستی سەرت بە لەعنەت بێ مرێمۆك. بێ دەنگ بە، لێگەڕێ پیاو پشوویەك بدا. هێندەت لێ رست ژانی پشتمم لەبیر چۆوە. ئای بۆ جگەرەیەك، بریا یەکێك جگەرەیەکی دابامێ، بە خوای حەوت پشتی دەچووە بەهەشت. خۆزگە مرێمۆك هێندەی نەڕستبا.”

دەنگی تەنەکە و قاپ و قاچاغی کاروان دەهات. کەرێك زەڕاندی. ئەسپەکە سەرسمێکی دیکەشی دا. مرێمۆك جنوێکی بە ئەسپەکە دا و خێرا جڵەوی لێ توند کرد. ئەگەر رەشمەکەی نەکێشابا، بە سەر وەعەرزی دەکەوت.

عەلی لێیان نزیك بۆوە، دەموچاوی رەش داگەڕابوو و شەلاڵی ئارەقە بوو. لەسەرەخۆی لێی پرسین:

ــ چۆنن؟ جێتان خۆشە؟

مرێمۆك متەقی نەهات. مام خەلیل بە شیرنترین لەبزێکەوە جوابی داوە و گوتی:

ــ خوا تەمەنت درێژ بکا رۆڵە، عەلی گیان. یاخوا بەردی سارد و گەرمت نەیەتە رێ.

عەلی دیسان دوا کەوتەوە.

# ٥

لە لای سەرەدای* کاروانەکەوە، کوێخا بە سواری جاشکێکی سێ ساڵانەی زیت و گوێ-قوت،لە خۆباییانە درۆیشت. لاقە زل و زبرەکانی بە هەر دوو لای کەرەکەدا شۆڕ کردبوونەوە و پێچ و کڵاوی بە تیلاگی سەریەوە نابوو. هەر دوو ژنەکەشی بە دواوەی، بە ریزەوە چاویان بڕیبووە نێوشانە پانەکەی و بەبێ ئەوەی سەیری یەکتری بکەن، ددانیان چیڕ کردبوونەوە و دەرۆیشتن.

کۆستوئۆغلۆ بە لۆقە درێژەکانییەوە چەند هەنگاوێکی خێرای نا و خۆی گەیاندە کوێخا و شان بە شانی کەرەکە رۆیشت. دوایی ئۆکسوز دۆران گەیشتێ و بە شوێن ئەودا "وەلی"یە رەش و عوسمان جا و تاشباش ئۆغلۆ و هەروەها "عەلی"یە درێژ و دوای ئەوانی دیکەش هاتن. حەشیمەتێکی سی چل کەسی دەوری کوێخایان گرت.

کوێخا هیچ پێی سەیر نەبوو ئەو خەلکە دەورەیان دا. بزەیەکی گاڵتەجارانەی وەك ئەو پیاوانەی متمانەیان زۆر بەخۆیانە، لە روخساریدا دەرکەوت. دەستی لەسەر شانی کۆستوئۆغلۆ کە شان بە شانی کەرەکە دەڕۆیی دانا:

ـ دەنگ و باس کۆستوئۆغلۆ؟

ـ سەلامەتیی سەرت... جەنابی کوێخا...

تاشباش ئۆغلۆ لە دڵێ خۆیدا گوتی:

ـ هەی دایك و خوشکی خۆت و کوێخاشت...

عەلی خۆی رەپێش خست. شەلاڵی ئارەقە بوو. بەو چاوانەیەوە کە پیاوانە دەبریسکانەوە گوتی:

---

*سەرەدا: یەکەم سەری کاروان. پێش پێشەوەی کاروان

ـ جەنابی کوێخا... با ئەمن بۆت لەبنی کوولەکەی بدەم. ئەمن قبوولْم کردووە. ئەمساڵ ئێمە ناچینە ئەو کێلگەیەی بەکرە شێت هەڵیدەبـژێرێ. هەموو خەڵکی ئاوایی کۆبووینەوە و بڕیارمان دا و سوێندمان خوارد.

هێشتا ئەو بزە گەپجاڕانەیە هەر بە لێوی کوێخاوە بوو. دوای ئەوەی ئەو قسە توندانەی لە زاری عەلی بیست، ڕەنگێکی هێنا و برد، بەڵام بەسەر خۆیدا زاڵ بـۆوە. دەبوو شتێك بڵێ. دیسان ئاوڕی لە کۆستوئۆغلۆ دایەوە کە لێی نزیك بوو و گوتی:

ـ هەتیوە، تۆش سوێندت خواردووە؟.... تۆ دەڵێی چی؟

کۆستوئۆغلۆ دەست و پێی تێکەڵ هاتن:

ـ عەرزم بە حوزووری ئاغای خۆم بکەم، هەرچی کوێخام بفەرموێ لە قسەی دەرناچم، جا چ بڵێم.

کابرایەکی بەخۆوە و مل درێژ بوو. لە ژیانیدا پێڵاوی لە پێ نەکردبوو. لە سەربازی ویستبوویان پێڵاوی بکەنە پێی، بەڵام پۆستاڵیان بۆ پێی ئەو دەست نەکەوتبوو. دوایی ئەندازەی لاقیان گرتبوو و پێڵاوێکیان بۆ پێیەکانی ساز کردبوو و بە زۆر پێیان لەپێ کردبوو، کەچی ئەو نەیتوانیبوو و تەنانەت شەقاوێکیشان پێوە بڕوا. لاقەکانی بەدووی خۆیدا دەکێشا و هاواری دەکرد:" بۆ خاتری خوای فریام کەون". لە جێی خۆی چەقیبوو. چیی حەولیان دابوو نەیانتوانیبوو بە پێڵاوەوە هەنگاویشکیش چییە پێی هەڵگرن. هەر بە پێی پیخاوسی سەربازییەکەی تەواو کردبوو.

کوێخا لە پڕ بە تووڕەییەوە هاواری کرد:

ـ سەردەستەی ئەو فرت و فێڵە تۆی عەلی! ئەوە پێنج ساڵە ئەو قسانە دەکەی. ئاخری گوندیت هەموو قایل کردن. پێت وایە ئەمن نازانم چیت لەبن سەر دایە؟ و دەشزانم ئۆکسوزیش ئەو مەسەلەیەی لەبیر نەکردووە کە سێ ساڵ لەوە پێش بەبەرچاوی خۆی و خیزانەکەیەوە و لە مەزراکەیدا بەسەری هات. ئاگام لەویشە. هەر وەها برادەرینە، بەڕێوەبردنی گوندێك گاڵتە نییە. هەروەها ئەوەی کە ساغ بوونەتەوە مەزرا و کێڵگەی پڕ دار وبار و پڕ پیت و بەرهەم بگرن، دەبێ شەرم بتانگرێ. ئەوجار لەبەر چاوی ژن و منداڵ دروست نییە. و هەروەها...

عەلی:

ـ چیت پێ خۆشە بیڵێ. ئێمە ئەو مەزرایەی کاری تێدا دەکەین، خۆمان دەبێ هەڵیبـژێرین. مام خەلیل و عوسمانۆك لەڕێوە لە چوکوور پەیدای دەکەن. خەڵکی دێ بەپانەوە ئەوەیان دەوێ.

کوێخا بەو قسانە ئاوری گرت. قەت پێی وا نەبوو ئاوا لەرووی رادەوەستن.

عەلی:

ـ وای دانێین هیچ خۆمان نەشۆین. جۆگە و رووبار و دار و دەرختیشمان نەویست. ئـەوجار ئێمە هیچ ئەوانەمان ناوێ... بەڵام ئەگەر پێویستمان پێی بێ...

کوێخا خۆی پێ نەگیرا:

ـ دیارە هەتانە... ئێوە دەتانەوێ خاوەن کێڵگە لەو مەزرا کـاکی بـە کاکییـەی چـوکووردا دارستانتان بۆ بروێنێ؟ کێو و شیو و دۆڵ ساز بکا و لووزەوی ئاوتان بۆ وەرێ بخا؟ کانیتـان بـۆ هەڵقولێنێ؟ چڵە لۆکەی تایبەتیتان بۆ ئامادە بکا و هەر چڵەی هەزار گـوڵ و قۆزاخـەی پێـوەی بێ؟ چون هاورێیان گەرەکیانە دەوڵەمەند بن... و هەروەها...

وا هەڵچووبوو، خەریك بوو بخنکێ. عەلی دەمودەست وەڵامی دایەوە:

ـ بەکرە شێت کابرایەکی هیچ و پووچە. گوێچکەی دراوی نیشان بدەی پیـاوەتیی نـامێنێ. کێڵگەیەك دەگرێ هەر لقەی تاقە گوڵێکیشی پێوە نەبێ. هەر بای خەیاڵیشی نییە گوندی بمرێ یان ماڵوێران بێ گونیشی پێ نابزوێ، گرنگ ئەوەیە گیرفانی خۆی پڕ بێ.

کوێخا دایـنواند*... برێك قسەی نەرمتر بوونەوە و تووڕەییەکەی پێشووی پێوە نەما:

ـ ئەمن دەزانم ئێوە بۆچی ئەو کێڵگەیەتان ناوێ کە بەکرە شـێت دەیگـرێ. مەسـەلە گونـە گون. بەڵێنیشتان دەدەمێ ئەگەر کێڵگەکە لە زەوییـەکی تەختیـشدا نـەبێ و هـەمووی گـرد و بەرزی ونەوی بێ، تەنانەت قۆزاخەیەکیشتان پێ کۆوە نەکرێ و ژن ومنداڵیشتان لە برسان بمرن، هێشتا دەچن و تەواو...

"مۆستوك" بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ هیچ ناچاریش نین لە زەوییەکی رێکدا و بە بەرچاوی عالەم و ئادەمەوە وەك سەگەل تێکبنالێین.

ـ کوێخا گوڕاندی:

ـ ناچارن... باشە ژن و منداڵەکەتان بەلاوە گرنگترە یان گونتان؟

عەلی برێك نەرمتر هاتە جواب و لەسەرەخۆ گوتی:

ـ جەنابی کوێخا، لەبەر ئەوەی ئێمە ریز لە ژن و منداڵی خۆمان دەگرین، چـونکە خـەڵکی دیکە هەموو ساڵێ بە کۆشێك پارە و دراوەوە لە چـوکوور دەگەڕێنـەوە و چـون بـەکرە شـێتیش

---

* دانواندن: قبوولکردنی قسەیەك لەبەر بێدەسەڵاتی یان لاوازی. لەبەر کەس دانانوێنێ: واتە قسە لە کەس قبووڵ ناکا.

دەماننێرێتە کێڵگەی وەها کەر لێی بکەوێ کەلپەی دەشکێ، بۆیە بڕیارمـان داوە ئەمـساڵ بـۆ خۆمان ئەو مەزرایە هەڵبژێرین کە دەبێ کاری تێـدا بکـەین. وەرە تـۆ ئەمـساڵەکە لای بـەکرە شێت مەگرە. ڕەگەڵ ئێمە بکەوە. کوێخای ئاوەدانی دەبێ لەگەڵ گوندییەکانی بێ.

کوێخا کە لە کەرەکەی دابەزیبوو و گوێدرێژەکەی بەدوای خۆیدا دەکێشا. گوتی:

ــ گوندییەکانیش لەگەڵ کوێخای خۆیان...

و لێی سوار بۆوە و سـەیرێکی ئـەملا و ئـەولای خـۆی کـرد و قـوڕگێکی خـاوێن کـردەوە و دەستی پێ کرد:

ــ برادەرینە....

دیسانیش قوڕگی خاوێن کردەوە و لەسەری ڕۆیشت...

ــ برادەرینـە، بـرا بـەڕێزەکانم و هـەروەها هـاوڕێ نیـشتمانپەروەرەکانی مـن و هاوولاتییـە ئازیزەکانم کە دمیرقیراسی (دموکراسی) ستان پێ خۆشە، ئەمن ئەمڕۆ هاتوومە خزمـەتی ئێـوە چەند مەسەلەیەکتان پێ بلێم...

تاشباش ئۆغلو خۆی وەدوا دا. خەریك بوو پێ دەکەنی و دەیگوت:

ــ کابرای ماڵ کاول... دیسان دەستی پـێکردەوە وەك "تۆفیـق بەگـە" قـسان بکـا. هـەی خۆڵت وەسەری هەی پیاو.... دیسان گووت تێکردەوە...

عوسانجا گوتی:

ــ... هاوڕێیان، هەر کوێ دمیرقیراسیی لـێ نـەبێ، لـە هەرکوێیـەك هاوڕێـت نـەبێ، دەبـێ بەقوڕی بگری. هەروەها میللەت قەت ناتوانێ ڕاست بێتەوە. هەموو کارێك دەبێ دمیرقیراسیی تێدا بێ بۆ ئەوەی پشتمان نەشکێ. با پێتان بلێم و هەر وەها بە گەورەی خۆشم بلێم کە کـلاوی ئەو "عەلی"یە درێژەتان نەچێتە سەری. ئەو دوژمنی قەستەسەری دمیرقیراسییە. هەمووتان لی حوکمەت بە تاوانبار دەردەچن و ئەمنییش یەکێکیشتانم بـۆ ڕزگـار نـابێ. دژایـەتیی کوێخـا و دەمڕاستی گوند و هەروەها ئەنجوومەنی گوند... کاکە بەکر کابرایەکی ژیر و زیرەکەو هەروەها تەمەنێکی ڕابوردووە. لە لە پەلاماردا هاوڕێیـانی ئـەلمانی پێیـان گوتـووە:" بـەکرە گیـان، خـۆ ئەگەر هەموو سەربازەکانمان وەك تۆ بوایەن، ئەو میللەتە دەستی بەسەر هەموو دنیادا دەگرت. نە ئەلمانێك دەمایەوە و نە ئینگلیزێك... هەروەها گوتبوویان:" کاکە بەکر، فـەرموو ئـەوە دوو سندووق بە دیاری و خەلات بۆتۆ، بیبەوە گوندەکەی خۆت. بیبەوە با لە پەتا و نەخۆشی بەدوور بن,." کیهەمان لە کاك بەکر باشتر بە زمانی ئاغاکانی چوکووراوا دەزانین؟ و ئاوا دەرەقەتیان

دێین؟ ئەگەر خەڵکی گوندەکانی دیکە بە دە قرۆش لۆکە دەچننەوە، ئێمە بە یازدەی دەچنینەوە و قازانجیش دەکەین... هەر لە سای سەری بەکراغاشەوەیە... و هاونیشتمانییەکانی من و ئەهلی گوندییە ئازیزەکانی من، ئێوە هەر لە سەرەتاوە شێت و شەیدای دمیرقیراسی بوون. کاکە بەکریش لەوەتا هەیە کێڵگەتان بۆ دەدۆزێتەوە، مەزرای پڕ پیت و بەرەکەت و پڕ بەرهەم دەدۆزێتەوە. ئەگەر ئەوانیتر لە دە دۆنم زەوی پەنجا کیلۆ لۆکە دەڕنن، ئێمە سەت کیلۆ دەڕنینەوە. جگە لەوەش لە سایەی سەری وەکیل باشی بەکرەوە، خوا دەزانێ دژایەتیکردنی دمیرقیراسی و هەڵسوکەوتی دژ بەو چەندە گوناح و تاوانە. هەر وەها پیاو دەچێتە جەحەندەم و لە کڵەکەیدا دەسووتێ. ئەوجار لەوانەیە کەس تاقەتی کڵی جەحەندەمی نەبێ...

تاشباش سەری بردە بن گوێی عوسمانۆك و بە سرتە گوتی:

ـ چاو... چاو.. سەیری کە ئەو گووخواردنەش لە مەلا کارتۆپاکلی فێر بووە. ئاییی بەرازی ماڵ کاول. یاخوا بەو درۆیانەتەوە بکەویتە سەرکڵەکەی جەحەندەمێ.

،... ئەوجار برا باشەکانی من....

کوێخا تووڕە بوو، هەڵچوو و لە کەرێ دابەزی. لە پڕ قاچی راستی بە عەرزیدا کێشا.

تاشباش گوتی:

ـ ئەوجار لاسایی یوزباشی عەلیی دەکاتەوە. یاخوا کوێراییت دایە کوێخا... سەیری ئەو راوەستانەی کە.

عوسمانۆك گوتی:

ـ سەیری کە چۆن راوەستاوە؟ ئاخری قسەی خۆی دەباتە سەر. ئەوە دەیبینی. تاشباش نێوچاوانی تێکنا.

کوێخا دەستی پێکردەوە:

ـ...ئەنگۆ خەڵکێکی گەمژە و نەفامن. مێشکتان پەینی تێدایە. کای تێدایە. بچنە ئاسمان و بێنەوە خوارێ، هەر ئەو کەرەن کە هەن و هەر لە فکری گونتان دان. کێرتان لەسەر بەری دەستتان داناوە و وەڕێ کەوتوون. ئێوە بەشوێن کاردا دەگەڕێن یان...؟ کوڕە یەك دوو مانگ بەسەر خۆتاندا زاڵ بن. دوایی بگەڕێنەوە گوند و هەموو رۆژێ هەر گوویەکی دەیخۆن بیخۆن. بەکری داماوی لیقەوماو زەویی پڕ دار و بار و خەرەندتان لە کوێ بۆ پەیدا بکا. پێشی خۆتان بگرن.

روخسار و لامل و گوێ و نێوچەوانی کوێخا بڵێسەی لێ دەبۆوە. دەماری لاملی وەك کاریتەی لێ هاتبوو.

پەنجەی بەرەو عەلی راداشت. ئەنجەی راست بەرەو چاوی عەلی راگرتبوو:

ــ ئەوجار کاکی مــن، ئـیتر تـۆ نـاتوانی لـەو گونـدەدا بـژیی. پیلـی ژن و منـداڵت بگـرە و جەحەندەم پڕ کە و بچۆ سەر بەحرێ. ئەگەر نەشرۆی بۆخۆم دەتنێرم.

تا هێزی بوو دەنگی هەڵێنا. ئیتر کاروان لە دوور و نزیکیەوە کەس وستەی نەدەهات.

ــ لەوێ هەم ئاو زۆرە و هەمیش قامیشەڵانەکەی وەك جەنگەڵ چڕە... بەڵام خاکەکـەی بـە دە دۆنمیش دە کیلۆی لۆکە لێ هەڵناوەرێ. مەزرایەکی وشك وشـك... بـڕۆ و لـەوێ لـە برسـان بمرە. یاڵڵا برۆ ملت بشکێنە. "گزیر*" ئەمرت پێ دەکەم. ئەنجوومەنی گوند بڕیار دەدا. لەگـەڵ گەیشتینە چوکووراوا، ئەو "عەلی"یەدرێژەی کوڕی برایم و مرێمۆك ــ لـە دایکبـووی ١٣٣٨ــ نابێ لەو دێیە بمێننەوە. دەی باشە، کەیفی بە گوندەکـەی ئێمـە نایـە، ملـی بـشکێنێ و بـڕوا. ئەوانەی گوندەکەی ئێمەیان پێ خۆش نییە، دەبێ بڕۆن.

وەرسووڕایەوە و پەنجەی بەرەو چاوی ئەوانە راداشت کە لە پشت سەریەوە راوەستابوون:

ــ ئەگەر کەسانێك هەن و کەیفیان بە گوندەکەی ئێمـە نایـە، دەبـێ لـەو گونـدە نـازدارەی ئێمـە بچنە دەرێ. وەڵڵا ددانەکانیان دەکێشم. ئەوجار ئەوی یەکێتییەکەی گوندەکەمان تێك دەدا و ئـەوەی کاکە بەکری بە دڵ نییە و ئەوێکی ئەومەزرایەی قبووڵ نییـە کـە کـاك بـەکر دیـاریی دەکـا و ئـەوی خەیانەت و ناپاکی لەو گوندە دەکا و حوکمەتی ئێمەشی قبووڵ نییـە هـەروەها ئـەوی دمیرقیراسـیش لەناو دەبا. ئاخر لە سایەی سەری خەڵکێکی وەك ئـەو "عـەلی"یـە درێژەوەیـە دمیرقیراسـی پوولێـك ناژی... ئەوانە لایەنگری دکتاتۆرییەکی عیسمەت پاشان.

عەلی لە تووڕەییان دەلەرزی. تاشباش لێی چووە پێشێ و پیلی گرت و هێوری کردەوە:

ــ سەیری کە عەلی! هەی دایك قەحپەی... عەلی، بێ دەنگ بە. ئەو سەگبابانە دەیانـەوێ شەڕ هەڵبیسێنن. قەڵافەتی گوندییەکانت دی؟ بزانە کەس پشتی تۆ دەگرێ؟ دیتت هەر بـە دوو قسەی ئەو کابرایە چۆن هەڵفریوان؟...

کوێخا کە بینی عەلی خۆی وەدوایە داوە، زانیـی سـەرکەوتووە. لاقـی راسـتی بـە عـەرزدا کێـشا و لـە جێـی خـۆی راوەسـتا و گوندییـەکانیش راوەسـتان. کوێخـا دوای ئـەوەی سـەیری روخساری یەك بە یەکی گوندییەکانی کرد، بە دەنگێکی هێمنتر گوتی:

---

*گزیر: کاربەدەستی ئاغا.

ـ سەیر کەن برادەرینە، سەیر کەن هاوولاتییە ئازیزەکانم، ئێوە لە سایەی سەری من و ئەو کاکە بەکرە و لە سایەی ئەو زمان چەورییەی ئەوەوەیە ئەو کێلگەی پڕپیت و بەرەکەت و باشتان گیر دەکەوێ و کۆشێك پارە کۆ دەکەنەوە.

دیسانیش لاقی بەرز کردەوە و وای بەر عەرزەکە دادایەوە کە تاشباش ئۆغلۆ بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ دەك ماڵت شێوێ.ئەوە لاقی بۆ نەشکا. چ گورە گورێتی، ماڵ کاول...

کوێخا گوێی لە قسەکانی تاشباش ئۆغلۆ بوو، بەڵام خۆی لێ گێل کرد. ئەو نەیدەویست خۆی لەقەرەی تاشباش ئۆغلۆ بدا. چون تاشباش ئۆغلۆ لە ئاواییدا لایەنگری زۆر بوون. لەسەری رۆیشت:

ـ هەی سپڵە و پێنەزانینە... سپڵە.... لەبەر گونیان! دەستیان بە گونیانەوە و ئەدی... دەشڵێن کوێخا لەگەڵ بەکر رێككەوتووە و بەرتیل لە ئاغاکان وەردەگرێ. بەرتیلم بۆچییە؟... ئەوجار هاوولاتییە سپڵە و پێ نەزانەکانی من! هەر کەس ئەو مەزرایەی بەدڵ نەبێ کە کاك بەکر دەیگرێ، ئەمن دێ بەدەری دەکەم، ئەوجا پیاوی وەك کاکە بەکر... پیاوی ئاوا لە هیچ کوێی دنیایە پەیدا نابێ... و خوای تەعالا! خوای گەورە ئەو کاك بەکرەی وەك باڵندەی شانس و بەخت لە ئاسمانەوە بۆ ناردووین.

عەلی خۆی پێ رانەگیرا و هاواری کرد:

ـ خوای تەعالا بەلایەکی بۆ ئێمە....

تاشباش زاری عەلیی گرت و گوتی:

ـ بێ دەنگ بە... ئاوا نابێ.

کوێخا نەڕڕاندی:

ـ گەورەگزیر!!!!

گەورەی گزیرەکان هات و وەك سەربازان سلاوی کرد.

کلکەی کاروان گەیشتبووە ئەو شوێنەی پیاوەکان لە نێوەڕاستی جادەکەوە لێی راوەستابوون و خەریك بوو لێیان تێدەپەڕی.

ـ گەورە گزیر، هەرگەیشتینە چوکوور، نابێ بێڵی "عەلی"یەدرێژی لە دایکبووی ١٣٣٨بێتە نێو ئەو مەزرا و کێلگەیەی کاك بەکر پەیدای کردووە، ئەگینا خۆت دەیزانی و من. جا ئەمن کوێخای بیست ساڵەی ئەو گوندە نیم ئەگەر ئێوەی سپڵە و گون برسی لە چوکووردا

وێڵ و سەرگەردان نەکەم. بەخوا تووڕەم کەن هەر ناهێڵم لەو چوکوورە بستە زەوییەکیشتان پێ بدەن. ئەوجا هەی داهێزراوینە، هەی پیس و چەپەڵینە، هەی کاڵفامینە و هەی خەیانەتکارینە، لێم دوور کەونەوە دەی یاڵڵا دەی...

تاشباش ئۆغلچو گوتی:

ـ چاو ئەو تووڕەبوونەی. وا تووڕە بووە... برەدەوان دەڵێ "ئەوجا"... هەر دەڵێی مەلی مزگەوتی گەورەیە... ئەو ناپیاوە هەموو خراپە و ناپیاوەتییەکی پێ دەکرێ عەلی، ئەوە دەبینی دەچێ لەگەڵ ئاغاکان رێك دەکەوێ و ناهێڵێ مەزرامان پێ بدەن. بۆ خاتری خوا بێدەنگ بە.

لە دوورەوە یەکێ گوتی:

ـ ناهێڵێ...

ـ ناهێڵێ...

هەمووان لەو وشەی "ناهێڵێ"ـیە تۆقین.

کوێخا لێی سواری کەرەکەی ببۆوە و وەپێش کاروان کەوتبوو.

مام خەلیل نقورچێکی لە کەلەکەی مرێمۆك سرەواند. مرێمۆك بە تووڕەییەوە لای کردەوە. مام خەلیل بە دەنگێکی شپرز و تۆراوەوە گوتی:

ـ خەمت نەبێ خوشکە مرێم. ئەو سەیە، هەتا من هەم، ناوێرێ دەست بۆ عەلی بەرێ. بە خوای دەزانێ لەستۆی سەی دەخەم.

ئەو پێی وابوو بەو قسەیە دڵی مرێمۆك نەرم دەکا. بەڵام مرێمۆك هەروا بە تووڕەییەوە سەری وەرسووڕاندەوە و گوتی:

ـ گەندووگووانە... خوا بتانباتەوە... پیرەمێردی مەنگن.... کەللەکەرینە... هەر ناڵێن ئاخر...

جا بە دەنگێکی بەرز لەسەری رۆیشت:

ـ ئەسپە نازدارەکەم... کەحێلە لێقەوماوەکەم. لەگەڵ تۆمە... گوێم لێ راگرە و جوان ببیستە... لەگەڵ کەسم نییە، هەر بە تۆی دەڵێم.

ئەگەر لەو قسانەم تێنەگەی، قەت قەتت پێ ناڵێم کەحێل. دەڵێم تۆ ریشت لە ئاشی سپی کردووە... دەڵێم تۆ گەمژەی... گوێدرێژی.... ئەسپەکەی من تۆ زۆر پیر بووی، ئەسپە چارەڕەشەکەی من.

ئەسپەکە سەرەنگرێ دەبوو و مرێمۆک رێشمەکەی دەکێشا..

ـ هەیها، ئەسپە پیرەکەی خۆم کە بەرازێکی کافری ناحاڵی سوارت بووە. ئیتر تۆ زۆر پیر بووی... وەکو سەی گرویێت لێ هاتووە... ئەگەر لەو قسانەم تێ نەگەی یاخوا هەر دوو چاوت دەرپەڕن...

مام خەلیل سەیری ئەو دوو منداڵەی دەکرد کە بە حیندرحۆ و حەقلی مەقۆ بە تەنیشتیاندا تێدەپەڕین. ژنێک مەمکی هێنابووە دەرێ و لە زاری منداڵەکەی نابوو. هەم شیری بە منداڵەکەی دەدا و هەمیش لەبەرە خۆیەوە لایە لایەی بۆ دەکرد و هەم خۆش دڕۆیشت*. گەندەمووی دەوری مەمکە زلەکانی لە بەر تیشکی تاوەکە دەبریسکانەوە. مام خەلیل لە بن لێوانەوە گوتی:

ـ مەمك بەوە دەڵێن...

ئەوجار لەسەری رۆیی..

ـ تف لە رووت پیرە سە.

ـ ئەسپەکەی من، جوان گوێت بکەوە. ئەگەر تۆ بمری، کورەکەم، یانی "عەلی"یە درێژی کورم، خاوەنەکەی تۆ تێدا دەچێ. جا حەیف نییە؟ ئەتۆ دوو کەست پێ هەڵناگیرێ، سەکەت دەبی. وا نییە ئەسپەکەی خۆم؟ ئەتۆ ئاوا ناگەییە چوکوور، دەبێ یەکێك لەو دووانە لێت دابەزن، وەرە ئەسپەکەی خۆم، وەرە با بپارێینەوە، دەست و پێیان ماچ بکەین با یەکێکیان دابەزن. بەڵام ئەسپە گیان، تۆ ئەسپێکی رەسەنی، یەکێك لەو دووانە پیرەژنێکە، بەڵام گەنجێکی بیست ساڵانەیە. راستە ردێنی سپی بووە و پڕە لە چرچ و لۆچ، بەڵام لێرەوە نەك تا چوکوور بگرە هەتا ناقچادنیزیش دەتوانێ بە پێ بڕوا. بەڵام خۆ ئەو پیرەژنە ناتوانێ شەقاوێکیش باوێ. ئەژنۆکانی لە دووی نایەن. ئەگەر هێزی لەبەردا بوایە لێت دادەبەزی و هەتا چوکوور بە پێی خۆی دەڕۆیی.

مام خەلیل لە دڵە خۆیدا گوتی:

ـ ئەوەندە قسە بکە تا دەدڕێی. بشدڕێی دانابەزم. نەك بە ئەسپەکە رێك و راست بە خۆشی بلێی هەر دانابەزم. مەگەر خاوەنی ئەو ئەسپە سواری نەکردووم؟ دیارە سواری کردووم.

---

* خۆش رۆیشتن: رۆیشتنی خێرا. دەی خۆش برۆن: واتە خێرا برۆن. زیاتر ئەو کەسانەی وەپێشەوە کەوتوون بەوانەی دواوەی خۆیانی دەڵێن.

دەزام ئەسپەکە حاڵی باش نییە. بەڵام بەخوای خوایەتی دەکا ئەمنیش باش نیم، ئەگینا بۆ دووهەنگاو رێگەبڕین چۆن دانم بە جەرگمدا دەگرت و فلتەفلت و بۆگەنی ئەو زارە پیسەتم قبووڵ دەکرد؟ خوا ئەو ژیانە بەزیاد نەکا. ئاخ ئاخ ئاخ،... " ئەو حوسێنە لیقەوماوەی بە شەلەشەل دەڕوا، ئەو حوشێن کەروێشکە، هێشتا هەر گەنجە، بەڵام زۆر کز و لاوازە. ئێسك وپێستێکەو هیچی دی. بە خوای تا دەگاتە چوکوور پێستەکەشی پێوە نامێنێ. دەتوێتەوە و هەڵدەوەرێ... لە پێشیانەوە مەحموودە گڕوێ، قوونی دابووە سەر بەردێك و خۆی هەڵدەکڕاند*.حەوت ساڵە گڕوێ بووە. خۆزگە بچێتە سەربازی و نەجاتی بێ.

"حەمە تەبدیلی هەوا" لە چەقی جادەکەدا راوەستاوە و هەناسەی سوارە. ئەو دەمەی منداڵ بوو کەس دەنگی هێندەی دەنگی وی خۆش نەبوو. ئەوە نۆ ساڵە سەربازییەکەی پێ تەواو نەکراوە. بۆ گۆڕینی کەش و هەوا هاتەوە پشوویەك بدت و گەڕایەوە بۆیە گوندییەکان ناوی "حەمە تەبدیلی هەوا" واتە حەمە هەوا گۆڕیان بەستۆیدا بڕی و دوای ئەوە هەتا مردیش ئەو ناوەی هەر پێوە بوو.

"ئەو تەنەکانەش کە بەسەر پشتی ئەو گوێدرێژەوەن، دەنگەدەنگیان چ زۆرە. کراسەکەی نەنە زەڵەجەش لە پشتەوە هەڵتلیشاوە و ناوەڵکراسەکەی دیارە. زەڵەجەی لیقەوماو، ئەوە گەیشتینە یوزتاش. بەبیری هاتەوە شەوێکیان شەوێکی تاریکەسەلات کە شیر نەیدەبڕی، لێرە، لەگەڵ ئەسپ دزەکان، لەگەڵ چەتەکانی تاقمەکەی ئەسلان ئاغا ئاگرێکیان کردبۆوە. هەموو وڵات وەك رۆژی رووناکی لیهاتبوو. قەول وابوو چەرکەزییەکی گەمژە ئەسپەکان بەرێتە حەلەب. پشتوێنە زیونیشانەکەی وەك تیشکی خۆر لێی دابێ ئاوا دەدرەوشایەوە."

مرێمۆك هەروا دەیبۆڵاند:

ــ هەیها، حەیوان، هەی ها حەیوان کە پیرە بەرازێك سوارت بووە، تۆش هەر سەرسمان دەدەی. هەی بێ خودان. ئەوەندەت نەقیزە تێدەوەژێنم تا دەتۆپی. پیرە بەرازی کوێر. لە گەنجێکی هەرزەکاری پازدە ساڵان باشتر بە رێیەدا دەڕوا. منداڵەکانی عەلیی کوڕم، ئەوەندە بە پێیان رۆیشتن هەموو بەری پێیان بلۆقی کرد. ئەگەر ئەو پیرە سەیە نەبوایە، ئێستا کچۆڵەکەم لە سەر کۆشی خۆم دادەنا، تۆش ئەی ئەسپەکەم، خێرت دەگەیشتێ ئەو منداڵەت سوار کردبا و دەچوویە بەهەشتێ. بستە منداڵێك چۆن بەو خڕکە بەردانەدا بڕوا؟ ها ئەسپەکەی من؟ ئەو کابرا بووك قەحپەی ریش بە گووە لە جێی ئەوان دانیشتووە، ردێنی پڕە لە کێچ و ئەسپێ...

---

* خۆ هەڵکڕاندن: خۆ خوراندنی توند و خێرا.

سەگ چۆن كلكی لە گەلۆزی دەنێ و كێچەكانی دەجوێ، ئەویش ئەو ردێنە ئەسپێونە پڕ لە كێچەی دەخورێنێ... هەر دەیخورێنێ و دەیخورێنێ... ئەدی، مندالّەكان بە پێیان دەڕۆن، چون ئەو پیرە سەیە جێی گرتوون. تۆ دەزانی ئەسپەكەی من، ئەو كافرە، خۆی كەڕ كردووە، هەر دوو گوێچكەی بە پەڕۆی بێ‌تویێژی بووكەكەی ئاخنیوە، قورقوشمی لە گوێچكەی كردووە و نابیستێ... هەی ها، هەی ها...

ئەسپەكە چیی نەمابوو تەخت بكەوێ. مرێمۆك وای لێ راهاتبوو، هەموو جارێ رێك ئەو دەمەی دەیویست هەڵخلیسكێ، لیزانانە رێشمەكەی دەكێشا و وای لێ دەكرد ئەسپەكە خۆی بگرێتەوە.

" تۆ باش دەزانی ئەسپە باشەكەم، باش دەزانی ئەو كابرا هیچ و پووچە هیچ خێری لێ هەڵناوەرێ. هەتا دەگەینە چوكوور مەمرە. ئەتۆ بمری من لە رێیە جێ دەمێنم و گورگ و كەمتیاران دەمخۆن. لە بری تۆ وا باشترە ئەو مل بەكوێنەی وەك گەنە و قورنوو* پێمانەوە نووساوە، بمرێ. مەمرە ئەسپەكەی من مەمرە. دەزانم ئەم ساڵ ئەو بارە قورسەت پێ هەڵناگیرێ، بەڵام دیسانیش مەمرە ئەسپەكەم. ئەو هەمووە ساڵە پێكەوە ژیاوین. هەی ها."

لە سەرەخۆ ئاوڕێكی دایەوە و سەیرێكی مام خەلیلی كرد. چاوەكانی مام خەلیل دیار نەبوون. چرچ و لۆچی دەموچاویشی پتر ببوو، وای لێ هاتبوو دەموچاوی لەبەر چرچ و لۆچ دیار نەبوو. لە سەری رۆیی:

" ئۆی ی ، ئۆی یاخوا ئەو قسانەم وەك گوللەی گەرم لە دڵی راچن با ئەتۆ نەكوژێ، ئەسپەكەی من. ئەسپەكەی خۆم، جوان گوێ بگرە و بزانە دەڵێم چی، ئەمن لەگەڵ كەسم نییە و هەر بەتۆی دەڵێم. یەكێك كە بووكەكەی لە باوەشی كوڕی مەلادا ببینێ و بێ دەنگەی لێ بكا و خۆی لێ گێل بكا، ئەویش لەبەر ئەو نیو كیلۆ ترێیەی لەو هەتیوەی وەرگرتووە، یاخوا ئەستۆی بشكێ، خوا غەززەبی لێ بگرێ و سوورە كوان دەربكا و مانگ و ساڵان زەلیلی سەر جێگە بێ و كرمی لەبەر بڕوا. یا خوا دەرد و مووی بەرامبەر بن. گوێم دەیە ئەسپەكەی خۆم، لەگەڵ تۆمە، ئەدی ئەسپەكەم، ئەو پیرە گڕوێیەی لە پشتمانەوە دانیشتووە، بەو ردێنە گواوییە ئەسپێونەیەوە، بە چاوی خۆی كەرەی بەیانی، دەكرێ بڵێی بە رۆژی رووناك لە نێو مەزرای لۆكەدا كوڕەكەی مەلی بەسەر بووكەكەیەوە دی و هەر ئەوەندەی گوت:"خوایە تەوەكول بەتۆ".

---

* قورنوو: لەو جروجانەوەرانەیە كە لە مۆڵگەی مەڕ و ماڵات و لە گەوری مەڕدا زۆرە و پێیانەوە دەنووسێ و خوێنیان دەمژێ. پێستێكی رەقی هەیە و بەزەحمەت دەكوژرێ.

ئەدی ئەسپەکەم، راست ئاوای گوت. ئێستاش هاتووەو سواری تۆ بووە. دەشیەوێ ئەتۆ بکوژێ... هەی ها، هەی ها، مردەلۆخە ئەوە چیتە؟

دیسان لای کردەوە و سەیرێکی دواوەی کرد ودیتی ردێنی مام خەلیل وەلەرزین کەوتووە. دڵی خۆش بوو.

"ئەسپەکەی من، ئەگەر تۆ نەبی، خۆ ئەمن هەنگاوێکیش چییە ناتوانم هەڵێنمەوە... دەرپێی بووکەکەیان لە نێوەڕاستی کێڵگەکە بە نووکی دارێ وەکرد. کوڕەکەی شانی هەڵی-نەگرت، بەڵام ئەو پێشی بە کوڕەکەی گرت، هەر لەبەر نیو کیلۆ ترێی کوڕەکەی مەلا. تۆخوا لە ژیانتدا پیرەمێردی وا گەوادت بینیوە؟ هەمووی خەتای ئەو "عەلی"یە ئەستۆ شکاوەیە ئەو تووک لێکراوە سواری تۆ بووە و فیکەی سمێڵانی دێ.

مام خەلیل چلووکی ردێنی خستبووە نێوان ددانەکانییەوە و لەسەر یەک دەیجوی و لیکاوی هاتبووە خوارێ. زۆر تووڕە ببوو.

لە پڕ بە دەنگی بەرز بانگی هێشت:

ـ هۆۆی خەڵکینە... خەریکە لە دەستی ئەو قەحبەیە وەزگ دەدەم.

مرێمۆك بە شەپازللە لە ملی ئەسپەکەی راکێشا و گوتی:

ـ ئەسپەکەم، ئەمن لەگەڵ تۆمە. تۆ گوێت لێ بێ. با کەس بە دڵی نەگرێ. کەی وەزگ نەدا.

تروسکەی هیوایەك لە دڵی مرێمۆك گەڕابوو. دڵنیا ببوو لەوەی بەو جۆرە مام خەلیل رەپاڵ دەنێ*.

ئەگەر وەزگ دەدەی، تۆ وەزگ دە ئەسپەکەی من. با ئەو سیسارکە کەچەڵانەی بەو ئاسمانەوە دەسووڕێنەوە گوشتەکەت بخۆن، ئەسپەکەی خۆم. ئیشاڵا، ئامەمین، ئەتۆ ئێستا دەتەقی و ئەمنیش سێ مانگان رۆژوو دەگرن و سێ جومعە لەسەر یەك لەگەڵ سەیەکی گڕوێ لە قاپێکدا نانی دەخۆم."

مام خەلیل ریشی دەجوی و قەپی پێدا دەکرد و هەڵیدەکەند و هەڵیدەپساند. بە پاڕانەوە گوتی:

ـ کچێ مرێم، مرێمۆك، کچێ ئەگەر توانیبام بە ریدا بڕۆم چۆن ئەو قسە تاڵانەی تۆم قبووڵ دەکرد کە لە پێش سەگیان دانێی نایانخوا. وەرە بیکە بە خاتری خوا دمت لێك نێ خوشکە مرێم، بێ دەنگ بە خوشکەکەم.

---

* رەپاڵنان: راونان بە داخ و کەسەرەوە. وەك دەربەڕاندن. برێك لێرە مایەوە و رەپاڵیان نا. واتە دەریانپەڕاند.

مریەمۆك ئاورێکی لێ داوە. جلەوی ئەسپەکەی کێشا و بە سەرسوورماوییەوە گوتی:

ــ یانی چی؟... جا بە تۆ چی؟ یانی بنیادەم بۆی نییە ئەسپەکەی خۆیشی بدوێنێ؟ بەتۆ چی باوکم؟..

لێی کردەوە و بە دەنگێکەوە کە نیشانەی دڵخۆشیی پێوە دیار بوو گوتی:

ـ دەی باشە ئەسپەکەم، بەڵێ، ئەو پیرە گەوادانە ئاوان. ئەگەر لە دەستیان بێ خۆیان دەست لەگەڵ بووکەکەیان تێکەڵ دەکەن. لەوە خراپتریش دەکەن. بۆ وا نییە ئەسپەکەی من؟

دەستی بە یاڵی ئەسپەکە دا هێنا و چەند قەمچییەکی بە نەرمی لە لا ملی راکێشا.

ــ بڕوات بێ ئەسپەکەم. بڕوات بێ، ئەتۆ ئەو پیرە بەرازانە ناناسی. ئەو پیرە گەوادانە. شەرم لەو ردێنە سپییەی ناکەن. لە چوکوور بەجێی ئەوەی لۆکە بچنێتەوە، دەدزێ و خاوەن کێڵگەکان قۆڵبەستی دەکەن و دەیهێننە نێوەڕاستی گۆڕەپانەکە و هەمووان کۆ دەکەنەوە تفی لە رووی بکەن. جا ئەو کابرایەش سوێند دەخوا چیتر کاری وا ناکاتەوە. بەڵام دیسانیش هەر دووپاتەی دەکاتەوە و بە ئەستۆی باوکە بێ تاوانەکەی خاوەنەکەی تۆ "عەلی"ـی دادێنێ. هەموو سووچ و تاوانەکانی خۆی دەخاتە ئەستۆی ئەو و سواری ئەسپی کوڕەکەشی دەبێ. مریەمۆکی دایکی "عەلی"یە درێژیش ئابڕووی دەبا... ئەتۆش کە هیچ گوێت پێی نابزوێ. لەو گوێیەتەوە دێ و بەوی دیکەتدا دەڕواتە دەرەوە. ئەگەر لەجێی تۆ، ئەدی ئەسپەکەی من، ئەگەر ئەو قسانەی بەتۆی دەڵێم بەو بەردەم گوتبایەن، ورد وپرد دەبوو، بەرە یەك دەچوو... ئەو بەڵایانەی بەسەر برایمی منی هێنان...."

"خۆ تۆ هیچ ناچێتە مێشکتەوە، ئەسپەکەی من؟ ئەگەر لە ردێنیشت بڕین و تێشی هەڵسوون هێشتا وەرووی خۆتی ناهێنێ؟....

مام خەلیل هەتا هێزی دەبەردا بوو بە زویرییەوە هاواری کرد:

ــ عەلی! عەلی! وەرە دامبەزێنە. ئەو پیرە قەحپەیە کەوڵی کردم و یەکسەر خواردمی. لەو ساتەوە سواری ئەو ئەسپە بووم، نیوەگیانی کردووم. عەلی ی ی... عەلی! فریام کەوە.

دەنگەکەی ئەوەندە سامناك بوو لە ناکاو هەموو کاروانەکە کپ و بێ دەنگ بوو. بۆ ساتێك کەس سریوەی لێوە نەهات.

عەلی بەرەو ئەسپەکە رایکرد.

ــ مەردی خوای بە رۆڵە، لەو ئەسپەم بێنە خوارێ. ئەو دایکەت، ئەو قەحپە پیرە کوشتمی و کوندەجەرگی کردم.

عەلی بە تووڕەییەوە سەیرێکی دایکی کرد و گوڕاندی:

ـ دایە!

مام خەلیل لەسەری رۆیی:

ـ دامبەزێنە رۆڵە گیان، دامبەزێنە. بەنۆکەرت بم. حاشا لە گۆشتی کەروێشك و بۆتسی تاژی.

بەخوای بە گاگۆلکێ برۆم پێم لەوە باشترە.

مرێمۆك لەسەر ئەسپەکەوە خۆی بەلای کوڕەکەیدا نووشتاندەوە و گوتی:

ـ کوڕە خۆ چم نەکردووە. دڵم توند ببوو، گوتم با برێك دەردە دڵ بۆ کەحێل بکەم. ئەوەش بە دڵی گرتووە.

مام خەلیل گوتی:

ـ عەلی بمهێنە خوارێ ئەگینا خۆم فڕێ دەدەم دەست و لاقم دەشکێن.

عەلی بە هێمنی گوتی:

ـ بە قوربانی ئەو ردێنەت بم مامە خەلیل، خۆ ئەو لەگەڵ تۆی نەبووە. قسەی لەگەڵ ئەسپەکەی کردووە. و دیسان رووی لە دایکی کردەوە و گوتی:

ـ دایە بیکە بەخاتری خودای، دەی تۆش دەردەدڵ بۆ ئەسپەکە مەکە. خۆ دنیا خەرا نابێ دایە؟...

مرێمۆك:

ـ دەی باشە، ئێستا کە مام خەلیل بە دڵیەوە گرتووە قسان ناکەم. وەڵلا، بیللا، قسە ناکەم. چما، چیم بە خەلیل ئاغای خۆم گوتووە؟

بە ئاماژەی دەست عەلی بانگ کردە لای خۆی و کە عەلی نزیك بۆوە، خۆی نووشتاندەوە و بە سرتە پێی گوت:

ـ ئەسپەکە دەمرێ. هەردووکمانی پێ هەڵناگیرێ. لانیکەم ئەمن دابەزێنە کوڕم. وەڵلا خەریکە دەمرێ.

عەلی خێرا خۆی لە دایکی دوور خستەوە و گوتی:

ـ با بمرێ. بمرێ و ئەمنیش رزگارم بێ.

مام خەلیل چاوەکانی پڕ ببوون لە ئاو. لەسەر قسەیەکی دیکە ماتڵ بوو بداتە کوڵپەی گریان و وەك منداڵان زۆڕ زۆڕ بگریێ. گریان لە ئەوکی گیر ببوو. قوڕگی دەبرژایەوە. پەژارەیەکی تاڵ لە چاوە وردیلە و سەوز و منداڵانەییەکانیدا هەبوو. لە دڵی خۆیدا گوتی:

ــ خەلیل، کوا تۆ ئەو پیاوە بووی ئەو قسانە قبوول بکەی؟ خەلیل، گورگ کە پیر بوو دەبێتە گاڵتەجاڕی سەگ و لەوەش خراپتر دەبنە گەپجاڕی دێڵە سەی گڕوێ. ئاخ، خۆزگە لاقەکانم هێز و توانایان لەبەردا مابایە و لێرە خۆم فڕیدابا خوارێ و ئیتر گوێم لە بۆڵەبۆڵ و تەشە و قسەی ساردوسووکی ئەو مرێمۆکە ناکەسە نەبوایە. ئاخ حەیف تین و گۆڕم لەبەردا نییە."

هەرچی زیاتر بیری دەکردەوە، تووڕەتر دەبوو. دەیویست دیسان لەبەر عەلی بپاڕێتەوە دایبەزێنێ. بەڵام دەیزانی هەر زاری بکاتەوە، گریانەکەی کڵپە دەکا. نەیدەتوانی زار بکاتەوە.

عەلی گوتی:

ــ دڵگران مەبە مامە. ئەو دایکەی من هەر وایە و لەبەرخۆیەوە دەبۆڵێنێ. گوێ مەدەرێ مامە. لێی گەڕێ چیی دڵی دەخوازێ با بیڵێ. گوێی مەدەرێ.

ئەو قسانە بڕێك دڵی ئاوپرژێن کرد:"ئەو "عەلی"یە درێژە چەندە کوڕێکی باش و نازدارە. هەر دەڵێی لەو مرێمۆکە یەزیدەش نەبووە."

کە بڕێك هێور بۆوە، بانگی عەلیی کرد و دەستی لەسەر شانەکانی دانا و بە خۆشەویستییەوە رێکی گوشی و گوتی:

یاخوا تەمەن درێژ بی رۆڵە بە روحم و دڵەکەم. تۆ وەك بابی خۆت دەچی. ئەمن ترێم لە هیچ کەس وەرنەگرتووە عەلی. لە چوکووریش بە خوای کەس تفی لە رووم نەکردووە. کەسیش سوارم نەبووە.

عەلی بزەی هاتێ:

ــ کوڕە ئەوانە بۆ خەم نابن مامە خەلیل. ئەوان تف لە رووی بنیادەم دەکەن و دەشیکوژن. ئەوان ئاغای چوکووراوان. مۆر و نقێم بە دەست هەرکەسەوە بێ ئەو سلێمانە، مامە خەلیل...

ــ گوێ بدەیە با پێت بڵێم عەلی گیان، بڕوات بێ. ئەمن بووکەکەمم نەدیوە. کوڕە بێ غیرەتەکەم خۆی شانی هەڵێگرتووە ئەمن قوڕی کوێ وەسەرخۆ کەم...

ــــ وەختایەکی ئەو شانی هەڵێدەگرێ، ئیتر بەتۆ چی؟

مرێمۆك هاواری کرد:

ـ هەی ها، حەیوانی چەپەڵ. بمرە با لە دەستت رزگارم بێ، ئیشاڵا.

تاشباش ئۆغڵو لە دواوە بانگی عەلیی کرد. عەلی راوەستا. تاشباش ئۆغڵو گوتی:

ــ وەرە برالە. دیتت دیسانیش گوندییەکان لای کوێخایان گرت. وا باشترە ئێمە لێیان جوێ بینەوە و بۆخۆمان کێڵگە بدۆزینەوە. خۆ نابێ هەموو ساڵێ لەسایەی بەرتیل خواردنی کوێخاوە بەدەستی بەتاڵ بگەڕێینەوە ماڵەکەمان. خوا هەڵدەگرێ؟

عەلی گوتی:

ـ ئەو کوێخایە تووشی زۆر نەهامەتیی کردین. دەبێ سەبر بگرین تا هەموو گوندییەکان پشتی ئێمە دەگرن. سەیر بکە رۆژ لە نیوەی لای داوە. دوو هەورامان بڕیوە و ئەو کابرایە نەیهێشتووە کاروانەکە وچانێك بدا. سەیری هەوا بکە، هەها ئەوە خەریکە دەشێوێ. لەسەر شەرت و گرێو ئەو بایە بارانی پێوەیە. بڕوا ناکەی لە مام خەلیل بپرسە. ئەو سەگبابە دەیەوێ گوندییەکان تووشی چەرمەسەرێ بکا.

تاشباش گوتی:

ـ بە ئانقەست وا دەکا.

عەلی:

ئەگەر کاروانەکە هەتا ئێوارێ ئاوا بە رێگەدا بڕوا، هەموو پشوویان لێ دەبڕێ.

تاشباش گوتی:

گوندییەکان ئاخری نەیانتوانی خۆیان لە بن نیری ئەو قەشمەرە گەوادە رزگار بکەن.

عەلی:

ـ ئەگەر کۆستوز ئۆغلی هەڵنەدەگەڕایەوە...

مرێمۆك هەروا دەیبۆڵاند. تاشباش سەری بەرەو باشوور وەرسووڕاند و ئاماژەی بۆ ئەو گەواڵە هەورە رەشانە کرد کە لە دوورەوە و لە ترۆپکی شاخەکانەوە دەهاتن:

ـ ئەوانەت دیوە؟ ئەگەر بگەنە ئێرە، هەموو وڵات دەکەوێتە سەر لافاو. ئەو کات جا دەبینی دەبێتە چ قیامەتێك. جا دەیبینی ئەو کابرایە چۆن لێی دەقەومێ. خوا بکا تا ئەو کات یاڵەکەمان بڕیبێ.

عەلی چاوی بڕییە هەورەکە و گوتی:

ـ بۆ سەعاتێکی دی دەگاتە ئێرە. وا دەشریخێنێ پیاو زراوی دەچێ. بارانی هاوینییە.

تاشباش:

ـ ئەی هاوار، کوڕە با خۆ بگەیێنینە کوێخا و ئاگاداری بکەینەوە. ئەگەر خۆ نەگەیێنینە دارستانەکە، لەو شیوو دۆڵەدا لافاو رامانده‌ماڵێ. خێرا بە عەلی، ئەی هاوار، با زوو بین.

بە هەڵەداوان خۆیان گەیاندە کوێخا کە لە پێشەوەی کاروانەکەوە دەڕۆیی:

تاشباش بە دەست هەورە رەشەکانی کە لە دوورەوە دەهاتن پێشانی دا و رێك لەو کاتەدا تەزووە بای باران تەپوتۆزی لە زەوییەکە هەستاند و تێپەڕی.

کوێخا سەری لێ شێوا:

ـ ئەی باوکە رۆ. ئەوە لە کوێوە هات؟ بە خەڵکەکە بڵێن خێرا بن.

نەقیزەیەکی لە گوێدرێژەکەی بن خۆی وەژاند. کەرە رەشە ماندوو ببوو، بەڵام نووکی نەقیزەکەی کە گەیشتێ غاری دا.

کوێخا هەرای کرد:

ـ براله تاشباش، بە گوندییەکان بڵێ خێرا کەن. بەرەو لای دارستانەکە. ئەگینا ماڵمان وێران دەبێ. خەڵکەکە هەموو کۆخەرەشە دەگرن و نەخۆش دەکەون. هۆی گزیر، گزیر، وەرە جاڕ بکێشە.

خەڵکەکەش خۆیان هەستیان پێ کردبوو و دەیانزانی چییان بەسەر دێ و هەنگاویان خۆش کردبوو. گزیر جاڕی دابا یان نا ئەوان خێرا ببوون. بەڵام هەر دەبوو هەبێ. کوێخا بەبێ جاڕکێشان هیچ کارێکی نەدەکرد.

"هۆۆۆۆۆی ی ی ی خەڵکینە، دوایی نەڵێن نەمانبیست، ئەو هەوەرە رەشانە دەبینن وا لەسەر ئێرجێیسەوە دێن؟ زۆر خێرا دێن، ئەگەر لەو پێدەشتە بێ دار و بارەدا باران بەسەرماندا بباریێ، لافاو هەموومان دەبا. ئەگەر بارانمان وێکەوێ و ئاگر و ئاوردوومان بۆ سووتاندن دەست نەکەوێ، هەموومان کۆخە رەشە دەگرین و وەك گەڵای داران هەڵدەوەرین. بۆیە دەبێ دان بە جەرگتاندا بگرن و بە هەموو هێز و تواناوە خۆتان بگەیێننە دارستانەکە. ئەوی ئەسپی هەیە با ئەسپەکەی و ئەوی گوێدرێژی پێیە با کەرەکەی تاو بدا، ئەوانەی بە پێیانن پانێی پێڵاو هەڵکێشن. نەڵێن گوێمان لێ نەبووە ها...."

کوێخا بە دەنگە گڕ و زلەکەیەوە بانگی گزیرەکەی کردەوە.

لەو دەمەدا دەنگی تەنەکە و ناڵەناڵ و قیژە و زریکەی منداڵان و دەنگی دیکەش بەرز بوونەوە. هەمووان لە لاقانیان وەراندبوو.

ـ گزیر! خراپت جاڕ کێشا. نەتگوت: بە ئەمر و فەرمانی ئەنجوومەنی گوند و کوێخاکەمان و بەهۆی بارانەوە". نەشتگوت: دەبێ زۆر خێرا بڕۆن و، هەروەها "گاڕان و مێگەلت لەبیر کردن و هەروەها عەلیی کوڕی برایم لە دایکبووی ۱۳۳۸ و ئۆکسوز دۆرانی کوڕی جەبار لە دایکبووی ۱۳۳۵ بە فەرمانی ئەنجوومەنی گوند و بڕیاری کوێخاکەمان دەبێ بگەڕێنەوە و بەو شوانانەی لە دواوە دێن بڵێن خێرا گاڕان و مێگەل کۆ بکەنەوە و بەرەوە دارستان لێیانخوڕن. یاڵلا دەی خێراتر...

دەنگی جاڕکێشانی گزیر لە نێو قریوە و زەنازەنادا بزر بوو. عەلی و ئۆکسوزدۆران گەڕانەوە دواوە.

دۆران گوتی:

ــ ئەو سەگبابە تانەی تێگرتین، دەست هەڵناگرێ... نەوێرا تاشباش. باشاری ئەو ناکا.
عەلی:
ــ پیاوی وا دەبێ لە رووی راوەستی.
لە ژنەکەی کە رووبەڕووی دەها خوڕی:
ــ ئاگات لە ئەسپەکە بێ. دوێنێ دەمی لە هیچ نەدا.
لەو دەمەدا دایکی بە لایدا رەت دەبوو. بە ناخۆشییەوە پرسی:
ــ ئەوە ئەو بێ دینە دەتنێرێ بە دوای مێگەلەکەدا؟ بۆ چت پێ گوت. جوابەجەنگێت کرد؟ رۆڵە ئەو ئەسپەش تین و هێزی دەبەردا نەماوە. دووجاران چۆکی نووشتانەوە و دیسان هەستایەوە سەر پێ. هەر دوو هەنگاو سەرسمێك دەدا.
عەلی گوتی:
باش دەبێ دەی.
و گورج رۆیی.
هەورەکە وردە وردە رەشتر دەبوو و نزیکتر دەبۆوە. بای باران ساتێك دەکەوت و دیسان هەڵیدەکردەوە و گێژەڵووکەیەکی وەڕێ دەخست و بەسەر کاروانەکەیدا دەکرد. بۆ ساتێك چاو چاوی نەدەدی.
هەر لە ئێستاوە هەمووان چەقوچۆیان هاتبوویە لەسەرمان و وەك خووساوی بەر باران کروشمەیان کردبوو. کەحێل جارێکی دیکەش چۆکی نووشتانەوە. مرێمۆك هاواری کرد:
ــ ئەی هاوار، هاوار، کوڕینە بگەنێ.
یەك دوو گەنج خۆیان گەیاندێ و هەر گەیشتنێ، کەحێلەکە تەکانێکی لەخۆی دا و هەستایەوە. مرێمۆك گوتی:
ــ وەیشش، خوایە گیان زۆر زۆر شوکرت، هەزار و هەزارجار شوکرت.
بای باران جارێکی دیکەش هەڵیکردەوە و هەموو ولاتی لە خۆڵ و تەپوتۆزدا نوقم کرد.
مرێمۆك بە دەنگێکی گریاناوییەوە گوتی:
ــ ئاخە نەمگوت ئەو ئەسپە پیرە دوو کەسی پێ هەڵناگیرێ؟ ئەو هەتیوە کەرەی من قسەی گەورانی ناچێ لە گوێیەوە. لێی گەڕێ با ئەسپەکەی بمرێ و سەرگەردان بێ. سەرگەردان...
پەنجەی خستە نێو زارە بێ ددانەکەیەوە و مژیی و بە توورەییەوە هێنایەوە دەرێ. پەنجەی کە هێنایەوە دەرێ پلتەی دەمی هات. قامکی لە هەوادا راگرت و گوتی:

ــ ئاوا، ئاوا رووت و ڕەجاڵ و سەرلێشێواو، با لانیکەم من دابەزم و بە پێیان بڕۆم. کوڕینە وەرن دامبەزێنن.

دوو گەنج هاتن و لەسەر ئەسپەکە دایانگرتە خوارێ.

مام خەلیل بە چاوە وردیلە سەوز و فێلاوییەکانییەوە پێکەنی:

ــ دەی باشە کوڕینە ئەمنیش هەڵگرن لەسەر زینەکەم دانێن. خۆ هەموو ئێسکی سمتم لەسەر ئەو ئێسك و پرووسکە داماڵدرا و بوو بە برین.

دوو گەنج هاتنە پێشەوە و هەڵیانگرت و لەسەر ماڵی زینەکەیان دانا. مام خەلیل بە دەنگێکی بەرز هەرای کرد:

ــ خوایە ئەو "عەلی"یە درێژە بە ئاواتی دڵی بگا. لەو گوندەدا کەس وەکی ئەو نییە. ئەگەر ئەمن کوڕێکی ئاوام هەبایە، نە دەمخوارد و نە دەمخواردەوە. ڕۆژ تا ئێوارێ شوکری خوام دەکرد، کە وەها فریشتەیەکی داومەتێ. وەك ئەو دایکە سپلانە بەردەوام نەمدەبۆڵاند و جوێنم بە ریش سپییەکانی گوند نەدەدا. ئاخ، بن قوونم حەساوە، وەی لەو زینە خۆشەی.

مریەمۆك لە قەراغ ڕێگەکە ڕاوەستا هەتا مام خەلیل گەیشتێ. بە تووڕەییەوە سەیرێکی کرد. مام خەلیل لە خۆشیانا فیکەی سمێڵی دەهات. مریەمۆك لە داخانی دڵی پڕ بوو و سەری ئەسپەکەی گرت و هەرای کرد:

ــ کوڕینە، خودا لە مردووتان خۆش بێ، وەرن لەسەر ئەسپەکەم دامنێنەوە.

دیسان دوو گەنج هاتنەوە پێشێ. پێدەکەنین.

- ئەو پیرە مێردە بەرنەوە سەر جێیەکەی خۆی و ئەمنیش لە جێی خۆم دانێنەوە.

پیرە بارگینەکەی "عەلی"یە درێژیش دەتۆپێ یان ناتۆپێ چش.

گەنجەکان مام خەلیلیان لەسەر زینەکە هەڵگرتەوە و لە پاشتەرکێیان دانایەوە و مریەمۆکیان سەرلەنوێ لەسەر زینەکە دانایەوە.

مریەمۆك گوتی:

ــ یاخوا بە مەخسوود* و مراد بن ڕۆڵە.

ڕێشمەکەی بەدەستەوە گرتەوە و لە ڕکێفی ئەسپەکەی دا. ئەسپەکە، کە وەك مردووان بەلادا دەهات تینێکی دایە خۆی. ئەو جار بە دەستە ڕاستی زللەیەکی لە لاملی ئەسپەکە دا.

---

* پیرەژنانی موکریان لەبری ئەوەی بڵێن مەقسوود، دەڵێن مەخسوود. دەشڵێن خوا مرادت حاسڵ کا.

ــ لەگەڵ تۆمە ئەسپەکەی خۆم. جوان گوێت بکەوە و ببیە. جوان گوێت لێ بێ دوو قسەم پێتە. قسەیەکت زارت گەزێت داپچڕی. وای داپچڕی تا هەتایە لێکی نەنێیەوە، ئەسپەکەی خۆم. ئەوانەی چاویان لە چاوی مار دەچێ... ئەوانەی خەیانەت لە چاوەکانیانەوە دەبارێ، ئەوانەی لەگەڵ جەردە و رێگر و پیاوکوژ و خوێنمژان رێك دەکەون، ئاخۆ ئەو رۆژانەیان لەبیر نەچۆتەوە کە بۆ جگەرەیەکی دەستی ئاغاکانی چوکووراوا وەزگیان بە گوندییەکان دەدا؟ و دواییش گوناحەکەیان بەستۆی برایمدا دێنا؟ ئەسپە باشەکەم، جوان گوێ بدەیە. ئەوانەی چاویان وەك ژەهر سەوزە، ئەسپەکەی من، ئەتۆ تا ئێستا ژەهرت بینیوە؟ ژەهرێکی سەوز؟ وەك چاوە مارەکانی ئەو پیرە تووك لێکراوە... ئەو چاوە ژەهراوییانەی سوێندیان خواردووە تۆ بکوژن.... چاو ، چاو ، ئێسکی هێندەی بەرداشێك قورسن. چزیلکی پێوە نەماوە، گۆشتەکەی وەك ددانەکانی هەڵوەریوە... تازە بەو دم و فلچەوە شمشاڵیش لێ دەدا. پیرە ئەسپ بۆتەوە جوانوو و خۆی هێناوەتەوە ریزی منداڵان. جوان گوێ بگرە ئەسپە داماوەکەی من...

گوندییەکان وردە وردە خێراتر دەڕۆیشتن. ئەو تەپوتۆزەی لە عەرزەکە هەڵدەستا، وەك هەور بەری ئاسمانێی دەگرت. تەق و هۆڕی تەنەکە و دەنگە دەنگی دیکە ئەو شیو و دۆڵە خۆڵەمڕەیەیان دەئاخنی و بەر ڕەوەزە دورەکان دەکەوت و دەنگی دەدایەوە. ئێستا کاروانەکە بە ژن و منداڵ و ئەسپ و گوێدرێژەوە بەرەو دارستانەکە غاری دەدا. بارەکان خلۆر دەبوونەوە و دیسان دەخرانەوە جێی خۆیان و هەر نەبا بەکۆڵ هەڵیاندەگرتن. کوێخا بە گوێدرێژە ڕەشەکەیەوە بە قۆرتە کەوتبووە پێش کاروانەکەوە و جار جار ئاورێکی دەدایەوە و دەیگوڕاند:" بەرەو دارستانەکە، بەرەو دارستانەکە... خێرا، خێرا.." کاروانەکە سەرەتا زۆر بە پاڵەپەستۆ دەڕۆیی، وردە وردە لێك دەڕەوییەوە و درێژتر دەبۆوە. لە رێگادا لێك بڵاو دەبوو و درێژ دەبۆوە. سەرەدای کاروانەکە گەیبووە نزیك دارستان و سەرەکەی دیکەی لەو بەرەوە مابۆوە. گژە بایەکی باران هێنەر، سارد و سڕ لە شیوەکە گەڕا و تەپوتۆزی هەستاند و سەر کاروانەکەی کە وەك دەنکی تەزبێح بە درێژایی رێگەکە دەهات، داپۆشی. وڵات تاریك داهات، وەك تاریکە شەو. دوو سێ دڵۆپەی گەرم کەوتە سەر خاکەکە: تلپ...تلپ...

کەحێل، لە بن بارستایی مام خەلیل و مرێمۆکدا، کەوتبووە دوا دواوەی کاروانەکە. مرێمۆك لەسەریەك بە قەمچی لێی رادەکێشا، بەڵام ئەو بەستەزمانە هەر گوێشی پێی نەدەبزووت. تەنیا چەند هەنگاوێك بە یۆرغە رۆیی و دیسان شل بۆوە. هەرچی ئەسپەکە شلتر دەبۆوە، مرێمۆك ئیتر پێی نەدەگوت "لەگەڵ تۆمە ئەسپەکەی خۆم..." و لە تووڕەییان کەفی هەڵدەخڕاند و بێ پێچ و پەنا بە ریشی مام خەلیلدا دەهات.

شریخە شریخی ئاسمان چڕتر بۆوە. لە دوورەوە، لە ناخی ئاسمانەوە، هەورەتریشقە دەیشریخاند و دەنگەکەی لە پانایی ئاسمانیٚ دەگەڕا و دەنگی دەدایەوە. سەر ڕەوەزەکان دەبریسکانەوە و برووسکەکان دەخوشین.

ئەسپەکە چەند جارێکی دیکەش سەرەنگریٚ بوو و هەستایەوە. دیار بوو جاری جاران ئەسپێکی بەتین و گوڕ بووە. مرێمۆك پەیتا پەیتا قەمچیی لیٚ رادەکێشا ومام خەلیل بە دارەکەی دەستی بەردەوام لە پاش قوونی دەوەژاند.

مرێمۆك لە نێو تەپوتۆزەکەدا دیتی کە سەرەدای کاروانەکە گەیشتە دارستان. قەمچییەکەی توند لە ئەسپەکە راکێشا.

"دەی، دەی، هەی داوەشێی چ کەحێلێکی. لەو نێوەڕاست بیابانەدا بەجیٚ ماین."

ئاوڕی دایەوە و بە دەنگێکی گریاناوی و نووساو گوتی:

ــ کوڕە لەسەرت گەڕێم کا خەلیل، خەڵك گەیشتنە دارستانەکە، خێوەتیشیان هەڵدا. ئێمە لە بەر بارانیٚ ماینەوە، ئەویش چ بارانێك، وەی وەی وەی، هاوار. چ بکەین باشە؟ قوڕی کویٚ وەسەر خۆ بکەین؟

مام خەلیل هانی دەدا و دەیگوت:

ــ لێی راکێشە خوشکیٚ، لێی دە. ئەگەر لەبەر بارانەکە بەجیٚ بمێنین، دەمرین. وەی لەو بارانەی...

بە دارە دەستەکەی تا هێزی بوو لە بن زگی ئەسپەکەی کوتا:"

ــ لێی دە خوشکیٚ...

ژنەکە دەتگوت دەیەویٚ زگی ئەسپەکە کون بکا. لینگی لێك کردنەوە و تا هێزی بوو بە گویزینگان لە بن زگی ئەسپەکەی دا. دیسانیش... "مام خەلیل"یش، ددانی دەچیرەوە بردبوو و پەیتا پەیتا لێی دەدا.

کەحێلە برێك بە یۆرغە رۆیی و هەندێکیش بە چوار ناڵە غاری دا. بۆ ئەوەی نەکەون، مام خەلیل مرێمۆك و مرێمیش توند زینەکەی گرتبوو. برێك ئاوا رۆیشتن. کەحێلە بە نیخە نیخ هەناسەی هەڵدەکێشا و زگی دەفی دەدا.

گێژەڵووکەیەك هەستا. شەپۆلە بارانێك دای کرد و تێپەڕی و بە شوێنیدا هەورەتریشقەیەك هەموو وڵاتی رووناك کردەوە. دوایی هەورەکە گرماندی و ئاسمانی داگرت. کەحێلە لەو تەقەو گرمەیەدا تەواو جارێك نووشتانەوە، گورج هەستایەوە جارێکی دیکەش کەوتەوە و هەستاوە. کەوتەوە و سەرموقلاتێکی دا و ئیتر هەڵنەستایەوە.

مام خەلیل لەولاترەوە دەی نالآند:"وەی پشتم شکا باوکەڕۆ، وەی، ئەوە موسولّمانێك نییە، موسولّمانێك نییە بە هانامانەوە بێ؟"

مریّمۆك دوای هەندێك پەلەقاژە هەستایەوە و بەرەو ئەسپەکە رای کرد.

کە دیتی ئەسپەکە پشووی لەبەردا ماوە گوتی"

ـ خوایە گیان، خوای گەورە، تۆ زۆر گەورەی...

مام خەلیل لەو شوێنەی کەوتبوو، بەبێ ئەوەی هەستێتەوە، بێ پسانەوە هێندێ قسەی دەکردن و دوایی بە پاڕانەوە هاواری کرد:

ـ کوڕە فریام کەون...

مریّمۆك سەری ئەسپەکەی لە باوەش گرت و گوتی:

ـ شوکری خوای نەمردی. هەزار و هەزار جار شوکر, بە قوربانی ئەو خوایەی بم تۆی بە من داوە...

ماوەیەك دەستی بە سەری ئەسپەکەدا هێنا و دوایی ئاوڕی داوە و سەیری مام خەلیلی کرد کە لەسەر عەرزەکە پەلەقاژەی بوو و دەینالآند و هاواری دەکرد و لەبن لێویەوە دەیگوت:

ـ خۆ ئەسپەکە چیی لێ نەهاتووە؟

دای دایە بارانێك وەك گۆزەی سەروبن. ئەو ڕێژنەیە برێکی کێشا و تێپەڕی. پاش هێوربوونەوەی ڕێژنەکە مام خەلیل لە جێی خۆی هەستا و گوتی:

ـ هەتیو، ئەوانە چ مرۆڤێکن. بە خودای خەلّکی ئەو دەور و زەمانەیە سەیر و سەمەرەن.

باشە چۆن دەبێ پیرەمێرد و پیرەژنێك بە تەنێ لە لاپاڵی کێوێك بەجێ بێڵن و خۆیان لە دارستانەکە پەستێون.

مریّمۆك وەلآمی نەدایەوە. لە تەنیشت سەری ئەسپەکەوە دانیشتبوو و دەموچاوی نابووە نێو لەپی دەستەکانییەوە، ددانەکانی شەقەیان دەهات و وەك بیی نێو ئاوێ دەلەرزی.

مام خەلیل هات و لە تەنیشتییەوە دانیشت. ئەویش تەواو خووسابوو. بایەکی سارد هەڵیکردبوو، کاری لە ئێسقان دەکرد. ئەویش وەك مریّمۆك هەڵدەلەرزی و سەری وەك گەڵای دار دەلەرییەوە:

ـ خۆت نارەحەت مەکە خوشکێ. ئەسپەکە لە بارانەکە ترسا و خۆی لە عەرزی دا. ئەسپی رەسەن ئاوان. پێشبینیی مەترسییەکان دەکەن. هەر لەگەڵ رەوینەوەی هەورەکان ئەسپەکەش هەڵدەستێتەوە. ئەو لە باران دەترسێ.

مریّمۆك دیسانیش وەلآمی نەداوە و سەبرێ لای کردەوە و پشتی تێ کرد. ئەو کارەی ئەو وەك ژەهرێکی لە گیانی مام خەلیل گەڕا.

ــ خوشکم، مریّمە خاتوون، دڵت هیچ نەکا. ئەو ئەسپەرەسەنانە، ئەو ئەسپە برایم لە کابرایەکی دزی کە لە ئۆرفاوە هێنابووی. جا بۆیە دەزانم ئەو ئەسپە رەسەنە. رەچەڵەکنامەکەشی لە گیرفانی خاوەنەکەیدا بوو. برایم دەیگوت ئەگەر ئەویشم پێ بدزرێ، ئەسپەکەم دەبردە کێلگەی ئەسپ چاکردنی مێرجی مەك و لەوێ وەك ئەسپی نموونە بە هەزار لیرەم دەدا. زۆر هەوڵمان دا بەڵام نەمانتوانی رەچەڵەکنامەکەی بدزین. ئەو رەچەڵەکنامەیە تاقە شتێك بوو لەو دنیایە برایم نەیتوانی بیدزێ.

"کەس نەبوو بڵێ برایم. بۆ زەماوەندەکەی تۆ، خوشکە خاتوونەکەی من، چی لۆکەی چوکووراوا بوو دزیمان و لە مەزرای میسری هەڵمانچنی. خاوەن کێڵگە هات چاوەکانی ئەوی ماچ کرد."

مریّمۆك بە تووڕەییەوە ئاوڕێکی لێ داوە و چاوی لێ زەق کردەوە و بە قورسی وەرسووڕایەو و پشتی تێ کردەوە و مام خەلیل قسەکەی لە زاریدا مایەوە. چاوە وردیلەکانی کە دەتگوت قۆپچەن، بریسکەیەکی خەفەتباریان تێدا بوو. لە قسەکردنەکەیدا لە لەرزین کەوتبوو، دیسان دەستی کردەوە بە لەرزین.

هەورەکان بەرەو باشوور کەوتبوونەوە رێ. ئاسمان لە باکوورەوە ساماڵ ببۆوە. لە ئاسۆوە بە درێژایی چیاکان، هێڵێکی ئاماڵ شین وەك جادەیەك کێشرابوو. ئەو جادەیە وردە وردە پانتر دەبۆوە. تا ئاسمان ساماڵتر دەبوو، کزە بایەکەش توندتر و تیژتر دەبوو.

ئەسپەکە زاری بەرەو ئەو وشکە گیایە درێژکردەوە کە لە تەنیشتییەوە بوو و هەڵیقەند و بە زەحمەت دەستی کرد بە جویتنی. دوایی شەویلگەی یەکسەر لە جووڵە کەوت. سەری زیاتر شۆڕ دەبۆوە. لیچی ئەسپەکە چوار پەنجەی مابوو لە عەرزەکە هەڵچەقێ. خۆر نیشتبوو. ئاسمان کرابۆوە، شین شین و ساماڵ... بای شەماڵ سارد و سڕ هەڵیکردبوو.مریّمۆك هەر لەوێ کە دانیشتبوو، کروشمەی کردبوو و وەك گلۆڵەیەکی لێ هاتبۆوە. مام خەلیلیش وەك ئەو.

مام خەلیل ماوەیەك بوو بەردەوام قسەی بۆ مریّمۆك دەکرد، هەندێ شتی لێ دەپرسی کەچی وەڵامی وەرنەدەگرتەوە. دەپاڕایەوە. متەق لە بەردەوە دەهات بەڵام لە مریّمۆکەوە نەدەهات.مریّمۆك چاوی لە چاوەکانی ئەسپەکە بڕیبوو کە هەر دەهاتن و لێڵ وتار دەبوون و وێك دەهاتن و کەوتبووە بیری مێردەکەی کە پیاوێکی پاك و خاوێن و لەسەرەخۆ بوو وەك کچێکی شەرمن. ئەو رۆژی هاتەوە پێش چاوی کە ئەو ئەسپەی هاتە ماڵەکەیان. بەبێ ئەوەی کەس پێ بزانێ، لەبری ئەو ئەسپە ئەو مافوورە گوڵدارەیان دابووە مام خەلیل کە دایکی چنیبووی. لە دڵی خۆیدا گوتی:

ـ ئاخ... ئاخ بۆ ئەو رۆژانەی رابردن... ئەو پیرە بەرازەش کاتی خۆ عـەجایب قارەمانێـك بوو...

مام خەلیل هەستـایە پـێ. دەسـت و لاقـی سـڕ ببـوون و رەنگـی سپی هەڵگـەڕابوو. بـەلا مرێمۆکدا نووشتایەوە و گوتی:

ـ خوشکەکەم، خوشکە چاو مامز و کەزی بۆنخۆشـەکەم. یـاڵڵا هەسـتە بـڕۆین. دەنـا لێـرە لەسەرمان رەق هەڵدێین و دەمرین. هەستە با بڕۆین.

دەنگی نەرم و نیان و شیرن و بلاوێن بوو.

مرێمۆك تەنانـەت سەریـشی هـەڵ نـەهێنا. چـۆنی کروشـمـەی کردبـوو، ئـاوا مایـەوە و نەبزووت.

ـ هەستە لاساری مەکە. ئەوە بای شەماڵە بایەکی خراپە. ئەو بایـە خەتـەرە، لـە ورمێـوە دێ. خوا دەزانێ رەقمان دەکاتەوە. یالاّ هەستە. هەستە بـا بـڕۆین. بـن پیلت دەگـرن. ئـەگینا ئەگەر لێرە بمێنیتەوە، کەمتیار دەتخۆن. خۆر ئاوابێ هەموو ولاّت دەیبەستێ.

مـام خـەلیل خـۆی پـێ نـەگیرا. رۆیـشت و لـە بـەردەمی هەڵتڕووشـکا و دەسـتی کـرد بـە زمانلووسی. بە هەزار جۆر قسەی بۆ کرد بەڵام مرێمۆك هەر مێشێکیشی لێ میوان نەبوو. لـە قوڕەکەدا دانیشبوو و دەستەکانی هەڵپێکابوون و هەڵدەلەرزی. ئاخۆی مام خەلیل تووڕە بوو.

ـ دەسەڵاتم چییە. تۆ کچی گۆك حـاجی ی. ئێـوە هـەمووتان لاسـارن. چـارم نییـە. ئـەمن بەجێی ئەوەی لێرە رەق هەڵێم دەبێ بڕۆم.

شانەکانی مرێمۆکی گرت:

ـ لەگەڵ تۆمە خوشکە جوانەکەم. وەرە بـا بـڕۆین. مانـەوە لەسـەر ئـەو ئەسـپە چـیی لـێ هەڵناوەرێ. خۆ تۆ پێت هەڵناستێتەوە.. یاڵلاّ وەرێ کەوە.

مرێمۆك هیچ نەبزووت.

مام خەلیل گوتی:

ـ پێستی سەرتان بە لەعنەت بێ. هەی وەچەی لاسار. گۆگ حاجی... هەی بەر لەعنـەتی خودای کەون.

بە پەلە دوورکەوتەوە. مرێمۆك سەرە سڕبووەکەی بە حاڵەحاڵ هەڵێنا و ماوەیـەك لـە دواوە سەیری کرد. ئازای گیانی دەلەرزی. بە زەحمەت دەمی بزاوت و هێنـدێ شـتی لـە بـن لێوانـەوە گوت و سەری بەسەر سینگیدا شۆڕ بۆوە. هەر دەهات و گرمۆڵەتر دەبۆوە و ئەژنۆکانی تەواو بە

سینگییەوە نووسابوون. لاقەکانی کۆکردەوە و وەبن خۆ دان و نێوچاوانی لەسەر کەشکەژنۆی دانا. دەستەکانیشی خستە نێوان لاقەکانییەوە و تەواو گرمۆڵە بوو.

مام خەلیل کە مەودایەك دوور کەوتبۆوە، خۆی پێ نەگیرا و گەڕاوە. هات و پیلی مرێمۆکی گرت و هەتا هێزی لەبەردا بوو رایوەشاند و بە دەنگێکی گریاناوییەوە گوتی:

ـ خوشکم، خوشکە خانمەکەم، خوشکە چاو مامزە قژ بۆنخۆشەکەم، خاتوونی خاتوونان، هەستە با برۆین. ئەو ئەسپە چیی لێ نایە. هیچی لێ نایە. ئەگەر لێرە بمێنیتەوە دەمری. وەڵڵا بیبلا دەمری. سەیر کە لەو لاوە بەفر دەبارێ.

زۆری گوت و پاڕایەوە هیچ فایدەی نەکرد. پیلی ژنەی بەردا. ماوەیەك بە تووڕەییەوە بە سەر سەرییەوە راوەستا و چاوەڕێی کرد. دوایی تا هێزی هەبوو لەقەیەکی لە کەلەکەی سرەواند و گوتی:

ـ دەبمرە... بمرە مل بە کوێن. بەمن چی؟ بمێنەوە و بمرە.

بە تووڕەیی و سەرلێشێواوییەوە وەڕێ کەوت.

ـ ئیشاڵڵا زۆری پێ ناچێ، هەر لێرە لە تەنیشت پیرە ئەسپەکەتەوە کەلاکە رەقەڵاتووەکەت دەدۆزنەوە.

سوورە گڵە باران وێکەوتووەکە وەك بنێشت بە لاقانەوە کلاشەی دەکرد: "دەبێ خێراتر برۆی... دەبێ خێراتر برۆی و ئەو مل بە کوێنە ماڵوێرانە لە مەرگ رزگار بکەی." ئەو بارەش کە بەکۆڵییەوە بوو، زۆر قورس ببوو. ماوەیەکی زۆر رۆیشت و برستی لێ بڕا. لە قەرغ رێگەکە لەسەر گژوگیا خووساوەکان دانیشت. دەستەکانی رەق هەڵاتبوون. گەڕایەوە و سەیری لای مرێمۆکی کرد کە بەجێ مابوو. مرێمۆك و ئەسپەکەی لە قوڵکەکەدا مابوونەوە و نەدەبینران. بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ وەی لە دەست تۆ ژنی سەر شین. ئاخر چۆن دەکرێ. مرۆڤ ئاوا لە چیا و چۆڵان بمێنێتەوە و لە لاسارییان بمرێ. ئەمن بڵێم چی. خۆ ناشتوانم بگەڕێمەوە. ئەگەر بشمرێ ناتوانم. خۆ بشگەڕێمەوە هیچ سوودی نییە، خۆ نایە.

دیسان بە زەحمەت هەستایە سەر پێ و بە وردە لۆقە* ی ماندوو شەکەت بەرەو دارستانەکە چوو. لە دوورەوە دەنگی کەڵەبابێك لە نێو دارستانەکەوە هات. کەرێکیش زەڕاندی. یەکێك لە دووردوورەوە دەنگی لێ هەڵێنابوو و لێی نەدەبڕیەوە.

---

*وردە لۆقە: وردە هەنگاوی بێ تین. هەژار دەڵێ: خوشی بە وردە لۆقان... تا گەییە ئاغای بۆقان.... لۆق: هەنگاو، شەقاو

لەبەرخۆیەوە گوتی:

ـ نای، ماڵوێران، ئەو ژنەتیوە دیقی پێ کردم. هەر لەبەر ئەوەی سواری ئەسپەکەی بووم. کچێك لە گۆگ حاجی بووبێ لەوە زیاتر چی لێ هەڵدەوەرێ؟ لێگەرێ با رەق هەلێ ئەو پیرە مالۆسە. خۆ عومری نووحی بۆ نەهاتووە. بارێکیش لەسەر شانی عەلی سووك دەبێ.

کە گەیشتە قەراغ دارستانەکە، خۆر خەریك بوو ئاوا دەبوو. تەختی بنی گۆلاوە بارانەکان برێك سوور هەڵگەرابوون. دەنگەدەنگی پێکەنین و جوێندان لە نێو دارستانەکەوە دەهات. دەنگی لایەلایەی ژنێکیشی گوێ لێ بوو. هەستی کرد گەرماییەك لە لەشی گەرا. جۆرە شادی و وشیارییەك... هاتەوە سەرخۆ...بۆنی شیداری دارستانەکەی بۆ هات. لەوانەیە سی چل ساڵ دەبوو دەچووە چۆکووراوا، سی چل ساڵ دەبوو کە دەگەیشتە ئێرە ئەو بۆن و بەرامەیەی بەسەردا دەهات. هەر شوێنە و بۆنی خۆی هەبوو. تەنانەت ئەگەر لە تاریکەسەلاتی شەویشدا بوایە کە چاو چاوی نەدەدی، مام خەلیلیان بە شوێنکدا بردبایە، لەرێوە دەیگوت ئێرە کوێیە. دەیگوت:"ئێرە "چیغلی چەپینار"ە... ئێرە یەکەم زینوێی "قرقسوو"سیە... ئێرە رێگەی خوار ئاق قەڵایە و ئێرەش سەر ساروونە و ئێرە خوار دیکیرلییە... چاوەکانیان دەبەست، بۆ ئەوەی نەتوانێ بە لاقەکانی زەوی تاقی بکاتەوە و بیناسێتەوە سواری گوێدرێژەکەیان دەکرد و بە رێگەی پڕ پێچ و گەوەی نێو ئاواییدا ماڵ بە ماڵ دەیانگێڕا. مام خەلیل دەیگوت:" ئێرە ماڵی گۆگ ئۆغڵانە، ئێرە عەمبارەکەی کوێخایە... و ئێرەش کادێنەکەی ئۆکسوزدۆرانە..."

سی چل ساڵ بوو، بۆن بە بۆن ئەو رێگەیەی دەناسی. بۆنی دارستانەکەی هەڵدەمژی و دەیگوت"کورە ماڵ کاولینە، کورە، ئەوە دارستانە نازدارەکەیان سووتاندووە و هەڵیانبرینگاندووە. هەی ماڵتان کاول بێ، چیتان لە گیانی ئەو دارستانە دەوێ لەسەر لووتکەی چیای خودا؟ بۆ لەناوی دەبەن؟ نە ئاوی لێتان دەوێ نە نان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بۆن و بەرامە خۆشەتان دەداتێ. پەناگەی باڵندە و خشۆك و خزۆك و ریبواری غەریب و لێقەوماوە. کورە خۆ ئەو کافرانەی خۆشمان هەر کامەیان ئاگرێکیان کردۆتەوە. ئەی ئەی، ئەوە خۆیان گەرم دەکەنەوە...."

هەموو گیانی ببووە یەکپارچە سەهۆڵ و سڕ ببوو. بە لارەلار و بێهێز دەڕۆیی. لەپڕ کەوتەوە بیری مرێمۆك:" ئێستا دەڵێن ئەو پیاوە زلە پیرەژنێکی لەو چیا و چۆڵە بەجێهێشت و کوشتی. تووکم لێ دەکەن. هەی ماڵتان کاول بێ. ئاخ خ، جا ئێستا من بڵێم چی؟

دەستی کرد بە هاوار هاوار:" ئەی هاوار فریام کەون، کورە یەکێك خەریکە دەمرێ... کۆمەگ... دینی ئیسلام."

خۆی بە عەرزیٚ دادا و وەك ریٚوی خۆی مراند. هەر لە گەنجیٚتیەوە خووی گرتبوو، کە لەسەر دزییٚ دەیانگرت و دەیزانی دارکارییەکی باشی دەکەن، هەر لەگەلٚ یەکەم داری ویٚدەکەوت خۆی بە عەرزی دادەدا و خۆی دەمراند. گەلیٚ جاران بەو جۆرە گیانی خۆی رزگار کردبوو.

هەولٚ و جۆش و خرۆشی گوندییەکان... و هەلاٚتنیان بەرەو ئەو لایەی دەنگەکەی لیٚوە هاتبوو... بەر لە هەمووان عوسمانۆك گەیشتیٚ. داهاتەوە و دیتی، مام خەلیل پشووی لیٚ براوە. گوتی:

"ئای پیرەمیٚردی داماو" هەر وا بەسەر سەریەوە راوەستا. ئەوانی دیکەش گەیشتنیٚ و دوای هەمووان کویٚخا هات. گوندییەکان وا مات و خەمبار ببوون وەك بلیٚی لەسەر تەرمی مردوویەك راوەستابن. کویٚخا هەر لەگەلٚ گەیشتیٚ قاقایەکی کیٚشا:" کەر بەو کەریٚتییەی خۆی، ئەگەر جاریٚك بە ریٚگەیەکدا بروا و لەویٚ لە قوریٚ بچەقیٚ، تا عومری بیٚ رووی تیٚ ناکاتەوە. کورە خۆ ئیٚوەش بنیادەمن و حاشایەکی، خۆ کەر نین و پەرژینیٚکی قایم بیٚ... و کە دەبینن شتەکە ئاوایە و ئەوجار سەد جاران مام خەلیل لەبەر چاوتان خۆی مراندووە، ئیٚوە دیسان پیٚتان وایە بەراستی مردووە. ئەوجار بنیادەم ئەقلٚی لە ئاژەلیٚش کەمترە... ئاژەلەکان مانگیٚ جاریٚك لە سالدٚا دەپەڕن و زاووزیٚ دەکەن. ئیٚوە هەر دوو قاچتان کردووتە یەك پیٚلاٚوەوە و دەلیٚن، لە زەویی ریٚك و لە کیٚلگەی بیٚ ئاویشدا لۆکە نارِنینەوە. ئەوجار مەترەقەکەتان لەسەر بەری دەستتان داناوە، هەر بۆیەش هاونیشتمانییە ئازیزەکانم، بەلٚیٚ هەر لەبەر ئەوەشە، ئەی گوندییە رەسەن و باشەکانم، بنیادەم زۆر زۆر لە ئاژەلٚ و حەیوانەکان نزمتر و کەم ئاقلٚترە.

هەر وا کە پیٚی بە عەرزی دادەدان، خیٚرا چووە ژوور سەری مام خەلیل کە لیٚی تخیٚلٚ ببوو و تەنانەت هەناسەشی نەدەهات. نووشتایەوە و هەردوو پیلی گرت و یەك پیٚ هەلیٚستاند. مام خەلیل کە هەستا، چاوەکانی هەلیٚنان و گیٚژ و وڕ، وەك بلیٚی کەس ناناسیٚ، ماوەیەك سەیری دەوروبەر و سەیری روخساری یەك بە یەکی گوندییەکانی کرد. دوایی چەند جاریٚکی چاوەکانی پتاندن و وردە وردە هەلیٚهیٚنان. بە دەنگی نەخۆشیٚکی کە وەك بلیٚی تازە لە مەرگ نەجاتی بوویٚ، سەبریٚکی گوتی:"موسولٚمانینە... بیٚ دەنگ بوو و سەری بەردایەوە، ئەژنۆکانی نوشتانەوە و لەسەر عەرزەکە دانیشت. کویٚخا پیلی گرت و هەلیٚستاندەوە سەر پیٚ. مام خەلیل دیسانیش بە حالٚ سەری بەرز کردەوە و گوتی:"هۆی موسولٚمانینە، دەستم بە داویٚنتان، فریام کەون. مریٚمۆك خەریکە دەیبەستیٚ. لە نیوەی ریٚیە ماوەتەوە. لە تەنیشت ئەسپەکەی. یان بەستوویەتی و بووەتە سەهۆلٚ یان خەریکە دەیبەستیٚ..."

دەنگی بەرزتر کردەوە و هاوار کرد:"بیگەنێ موسوڵمانینە".

دیسان ئەژنۆی نووشتانەوە و رێك لەو کاتەدا کە هات وەعەرزی بکەوێ کوێخا پرِی پێدا کرد و گوتی:" بەسە مەکەوە. تێگەیشتین."

خەڵکەکە و لە پێش هەمووانەوە تاشباش و عوسمانۆك بەرەو جادەکە خوشین و بەبێ ئەوەی ورتەیان بێ، راستەورِێ گەرانەوە دواوە. ژنەکەی عەلی دەستی کرد بە لەخۆدان:"دایکی خەریکە رەقهەڵدێ و خۆی چووەتە شوێن گاران و مێگەل. ئەسپەکەی کەوتووە و خەریکە دەمرێ..."

هەم لە خۆی دەدا و دەنووزایەوە و هەمیش بە نێو خەڵکەکەدا رای دەکرد. دوو منداڵەکەشی کەوتبوونە شوێنی بەڵام منداڵەکانی هەر نەشدەدی.

کوێخا کە لە قەراغ دارستانەکە لەگەڵ مام خەلیل مایەوە گوتی:

ـ سەیرکە مامۆ، تۆ هەموو کەست پێ دەخەڵەتێ بەڵام من نا...

مام خەلیل:

ـ بروات بێ جەنابی کوێخا، خوا دەزانێ کەسیرە بووم. ماڵتان ئاوەدان بێ کە رزگارتان کردم. ئەمن قەت ئەو چاکەیەم لە بیر ناچێ...

چاوە سەوز و وردیلەکانی کە هەر دەتگوت قوپچەن لە بن برۆ چەرمووەکانییەوە لە مەرمەرِی شووشە دەچوون. کوێخا:

ـ مرێمۆکت کوشت. ئەسپەکەشی... ئێستاش هاتووی و خۆت مراندووە، ئەو پیرەژنەت بۆچی کوشت مامۆ؟...

مام خەلیل پێڵوە قورسەکانی چاوی لێك نان و وەك منداڵان گوتی:

ـ کورە وەڵڵاهی من نەمکوشت گەورەم.

کوێخا:

ـ پیرەژنە، تووکی لێ کردی چون سواری ئەسپەکەی ببووی. تۆش ئەوت لە ئەسپەکەی خستە خوارێ و کوشتت. جا ئەتۆ لە دەست من رزگارت نابێ و دادپەروەری بەرێوە دەچێ. مام خەلیلۆك، ئەوجار تۆ گوندییەکان لە دەوری خۆت کۆوە دەکەی و بەرتیل وەرگرتنی من لەقاو دەدەی...

مام خەلیل کەوتە سەر عەرزی و خۆی بەسەر پێڵاوەکانی کوێخا کێشا:

ـ کورە بە نۆکەرت بم کەیخوا ئەفەنی، ئەمن و بابت بەبێ یەکتریان نان نەدەخوارد و هەر بەیەکەوە کۆت و رێشمەی ئەسپەکانی چوکووراوامان دەدزی. بابەت دەستی لە رەش و سپی

نەدەدا. ئەمن هەموو کۆت و پاوانی ئەسپەکانم هەڵدەبڕی. بە نۆکەرت بم. بیکە بە خاتری ڕۆحاناتی بابت... کوڕە خۆ من بەو مرێمۆکە بێوەژنەم گوت وەرە... گوتم ڕەقەڵدێی*. بەڵام نەهات.

کوێخا لاقەکانی لە باوەشی مام خەلیل هێنایە دەرێ و خێرا لەوێ دوور کەوتەوە و هەرای کرد:

ـ ئەوجار ئەگەر من تۆم لە زیندانێ توند نەکرد.. ئەوجار ئەگەر تۆم نەدایە دەست سەربازان چلێ بە چلێ ئەو ردێنەت هەڵکێشن... کوڕە هۆی گزیر...

گزیر کە لە پشت دارە ئەستوورەکانەوە هاتبووە دەرێ، وەڵامی دایەوە:"ئەمر کە گەوەرم.."

ـ خێرا وەرە... خەلیل تاش یوریك ی کوڕی موستوك و ئاقاقیز لە دایکبووی ١٣٠٠، مرێم ئۆزونجای کچی گۆگ حاجی و ئەنشە لە دایکبووی ١٣٠٢ی کوشتووە... بڕیاری گرتنی دەدەم و ئەوجار دەبێ دەستەکانی شەتەك بدەیت و بەندی بکەی و بە هەموو کەرەستەی پیاوکوژییەوە بیدەیتە دەست جەندرمەکان... ئەوجا ئێمە ئەو قانوونەمان پەسند کردووە.

ـ کوڕە بە نۆکەرت بم. ئێسکی باوکت گۆڕ هەڵدەتەکێنێ... ئەگەر دەستی من شەتەك بدەی.

ـ گزیر... بۆ ڕاوەستاوی... خێرا دەستی ئەو کابرایە ببەستە. زۆر توند.

گزیر مام خەلیلی گرت و بەو پەتەی لە گیرفانی دەرهێنابوو دەستەکانی لە دواوەی شەتەك دان و وەپێش خۆی دا و بردیە ڕەشماڵەکەی کوێخا. دوایی بە هەوسارێکی قایمی ئەسپەکە توند لە دارەکەی تەنیشت ئاگرەکە بەستییەوە.

کوێخا بە تووڕەییەوە دەهات و دەچوو، مام خەلیل سەری هەڵدێنا و ئاخی هەڵدەکێشا و دەیگوت:

ـ ئاخ، بۆ ساڵی ساڵان... لە کوێن ئەی ئەو ڕۆژانەی مام خەلیل، مام خەلیل بوو. گورگ کە پیر دەبن، دەبنە گاڵتەجاڕی سەگان... هەی دەرکت دەرێ پیری... ئەی چەپ گەڕی گەردوون، یاخوا چەرخت وەرگەڕێ...

کوێخا گوێی لێ دەبوو بەڵام خۆی لێ کەڕ دەکرد: جەمال قۆشاق بەگی خاوەنی زەوییە بەناوبانگەکەی گوندیش هەر وای دەکرد. کاتێ حەقدەستی کرێکارەکانی نەدەدا، ئەگەر لە پەنا گوێچکەشی جوێنیان بە دایك و خوشکی دابایە هێشتا گوێی لێ نەبوو و دەیگوت:" ئەگەر

---

* ڕەقەڵدێی: ڕەق هەڵدێی. ڕەق هەڵاتن لە گوتندا کورت دەکرێتەوە و پیتی دەسوێ. دەبێتە: ڕەقەڵاتن.

بنیادەم بیەوێ لەم دنیایەدا بژیێ نابێ گوێی بەو قسانە ببزوێ. لێیان گەڕێ با ئەوەندە جوێن بدەن تا دەدڕێن. خۆ دەستیان ناگاتە ژنەکانمان. ژنەکانمان ڕۆحیشیان ئاگادار نییە." ڕاستیشی دەکرد. خەڵکەکە کاتێ لە تاریکیدا چاویان بە ئەسپەکە کەوت کە لە قوڵکەکەدا کەوتبوو و مرێمۆکیش لە تەیشتییەوە گرمۆڵە ببوو، لە ناکاو ڕاوەستان و چاوەڕێ مان. کەس متەقی لێوە نەهات. تا تاشباش دەنگی هەڵبڕی:

ـ کوڕە فریا کەون کوڕینە... ئەوە بۆ کڕ بوون و دەڕوانن. لەوانەیە پیرەژن هێشتا زیندوو بێ...

خەڵکە کڕ و ماتەکە لە ناکاو بەرەو مرێمۆك هوروژمیان برد. عوسمانۆك ڕای کرد و بە هەر دوو دەستی، گرتی و ڕایوەشاند و گوتی:

ـ زیندووە. هەناسەی دێ. بەڵام سڕ و کەسیرە بووە. دەی خێرا ئاگرێك بکەنەوە.

بووکەکەی کە لە پشتەوەڕا دەهات، خۆی بەسەر خەسووەکەی کێشا و هاواری کرد:

ـ دایە، دایکە داماوەکەم، چت بەسەر هاتووە.

دوایی ئاوڕی دایەوە و سەیرێکی ئەسپەکەی کرد و دیتی ئەسپەکەش زیندووە. گوتی:

ـ خوایە تۆ گەورەی. هەزار و هەزار جار شوکرت.

عوسمانۆك:

ـ بەڵام کوڕینە... هەتا ئاورەکە دەگرێ، با دەست و قاچەکانی لە نێو قولمان بگرین و هوو*ی بکەین. پشتیشی داماڵن.

بووکەکە و چەند کەسێکی دیکە قاچ و قولی مرێمۆکیان خستە نێو لەپیانەوە و دەستیان کرد بە هووو لێ کردن. برێکی پێچوو مرێمۆك کە هەستی بە گەرمای لەش و پشووی مرۆڤ کرد، وردە وردە بەخۆ هاتەوە و وردە وردە چاوەکانی هەڵێنان و لە بن لێوانەوە گوتی:

ـ بە فوربانتان بم، ڕزگاریدەرەکانم، چ زوو فریام کەوتن.

دەمودەست دەستەچیلە پووشکە و ئاوردوویان کۆ کردبۆوە، هەر لەوێ لە نێوەڕاستی ڕێگەکە، لە تەنیشت مرێمۆکەوە ئاگرەکەیان کردەوە. عوسمانۆك هەرای کرد:

پووش و پەڵاش بێنن و لەسەر ئاگرەکەی ڕادێرن و وشکی بکەنەوە و لە دەوری ئاگرەکە ڕایخەن.

---

* هووکردن، هوو لێکردن: گەرمکردنەوەی دەست و قاچ بە هاڵاوی دەم.

گیا و گژیان هێنا و لە سەر ئاگرەکەیان راداشت، وشك بۆوە و لە تەنیشت ئاگرەکـە رایـان-خست. مریمۆکیان هەڵگرت و لەسەر گیایەکە درێژیان کرد. بڵێسەی ئاگرەکە بـەرەو مریمـۆك دەخوشین. برێکی پێچوو مریمۆك قیت بۆوە و دانیشت. دلۆڤانانە سەیرێکی خەڵکەکەی کـرد. لە یەك بە یەکیان ورد بۆوە و لاواندنییەوە و خۆشەویستیی خـۆ دەبـڕی. لـەو نێـوەدا چـاوی بـە بووکەکەشی کەوت و لەسەرخۆ گوتی:

ـ کچە جوانەکەشم هاتووە. کچەکەم، ئەسپەکەت دی؟ زیندووە؟

بووکەکەی نزیکتر بۆوە و گوتی:

ـ خەمت نەبێ. ئەسپەکە ماوە. چاك دەبێتەوە. ئێستا ئاگرێکیش بۆ ئەسپەکە دەکەینەوە.

ئەوانەی گوێیان لەو قسانە ببوو، دەمودەست بـە شـوێن پـووش و پەڵاشـدا رۆیـشتن. برێـك دواتر لە هەرچوار تەنیشتی ئەسپەکەوە ئاگریا کردبۆوە.

تاشباش:

پوورە مریم، دەتوانی هەستی. هەستە با بچینە بن خێوەتەکان.

مریمۆك بە لێوەلەرزەوە پرسی:

ـ ئەو لە کوێیە؟ ئەوەی ژەك وشیری مەمك بەحەرامی بێ.

بووکەکەی وەڵامی دایەوە:

ـ کوێخا ناردوویەتە شوێن مێگەل. هێشتا نەگەڕاوەتەوە.

مریمۆك:

ـ وەرن. وەرن یاخوا ئەو شیرە سپیەی لەو مەمکانەم داومەتێ، بە قوزەڵقۆرتی بێ. وەرن و ئەو حاڵ و باڵەم ببینن. هەتا ئەو نەیە لێرە نابزووم. ئەگەر بشمکوژن و لەتوپەتیشم بکەن هـەر نابزووم.

تاشباش گوتی:

ـ ئەتۆش نەبزووی ئەمن دەتبزوێنم.

ویستی لـە کـۆڵی بکـا. مریمـۆك وەپەلـەقاژەی کـەوت و قیژانـدی و دایـە پڕمـەی گریـان. گریانەکەی نەدەبڕایەوە.

تاشباش وەك گوناحێکی کردبێ گوتی:

ـ نا، نا دایە، ناتبەم. هەر لێرە بمێنەوە هەتا کوڕەکەت دێ. کەس لە کۆڵت ناکا.

مریمۆك بێ پسانەوە و نەرم نەرم دەگریـا. بووکەکـەی و ژنـەکانی دیکـە لەبـەری پاڕانـەوە. زۆربەی ئەوانەی لەوێ بوون، بە ژن و پیاوەوە لەبەری پاڕانەوە. مریمۆك هەر وا پێی چەقاندبوو.

بووکەکەی بە منداڵەکانی گوتی:

ــ وەرن رۆڵە. لەبەر دایەگەورەتان بپاڕێنەوە با لەگەڵ خۆمان بیبەین. بەقسەی ئێوە دەکا.

نەوەکانیشی لەبەری پاڕانەوە. لە بانگیان دا و تێیداشل و کوت بوون، مریەمۆك دەستی بە سەر و قژیاندا هێنا بەڵام بە ئاماژەی سەر پێی وتن:"نا."

تاشباش گوتی:

ــ ئەمن دەڕۆم. خەریکە لەسەرمان رەقەڵدێم. خوا پێستی سەری ئەو پیرەژنانە بە لەعنەت بکا.

و پشتی تیهەڵکردن و لەسەری رۆیشت":

بەخودای من سەرمامە، وەختە رەقەڵێم.

مانگی سارد و رچیو هەڵاتبوو. بای شەماڵ هەڵیکردبوو و وردە وردە بە تەوژمتر دەبوو. خەڵکەکە یەك یەك و دووان دووان گەڕانەوە. برێك دواتر هەر بووکەکە و نەوەکانی و "وەلی"یە رەش لە تەنیشت مریەمۆك و ئەسپە کەوتووەکە مابوونەوە. "وەلی" بەردەوام پووشکەی بۆ ئاگرەکە کۆ دەکردەوە کە خەریك بوو بکوژێتەوە و خۆشی دەکردەوە. بووك و نەوەکانی مریەمۆك دانیشتبوون و بە روخسارێکی خەفەتبارەوە بیریان دەکردەوە. "وەلی" لە تەنیشت جادەکەوە هێندەی باڵی بنیادەمێك پووشکەی کۆ کردبۆوە و گوتی:

ــ ئەگەر تا بەیانیش لێرە وەمێنین، بەسمانە.

جا هات لە تەنیشت بووکەکە و مریەمۆك دانیشت. ماندوو ببوو. ئەژنۆکانی کۆ کردنەوە و چەنەی خستە سەر چۆکی. چی وای نەمابوو رۆژ ئاوابێ. مانگ وەك لەتە سەهۆڵێکی لێ هاتبۆوە. دەتگوت شەپۆلی سەرماکە لە مانگەوە هەڵدەڕژێتە سەر زەوی. "وەلی" لە پێشەوە خەریك بوو بسووتێ و لە پشتەوەڕا خەریك بوو دەیبەست.

لە نێو جادەوە، لەو لایەوە کە مانگ ئاوا دەبوو، دەنگێك هات. "وەلی" گوێی هەڵخست. دەنگی عەلی بوو. سەری هەڵێنا و دەستی برد و دەستی مریەمی گرت و بە دڵێکی خۆش گوتی:

ــ پوورە مریەم... پوورزاکەم خەریکە دێ.

مریەمۆك متەقی نەکرد. گێژ و وێژ بوو. "وەلی" هەرای کرد:

ــ وەرە عەلی، وەرە عەلی، مەترسە، هیچ نەبووە. ئێمە لێرەین.

عەلی چیی نەگوت. کە هاتە پێشێ و تارماییەکەی دەرکەوت، "وەلی" بەپیرییەوە چوو.

ــ دایکت باشە براله. بەڵام ئەسپەکە ناژیێ. دایکت پێی چەقاندووە، منداڵەکانیش برسییانە و خوشکە ئەلیفیش بێ تاقەت بووە. دایکت لەکۆڵ بکە و بیبە دارستان. نارەحەت مەبە.

عەلی، لە پێشدا هاتە لای ئەسپەکە و سەیری چاوەکانی کرد. دوایی چووە لای دایکی و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە پرسیی:

ـ چیت بەسەر هاتووە دایە؟

مرێمۆك هەر نەشبزووت. عەلی لە تەنیشتییەوە لە سەر گژ و گیایەکە هەڵترووشکا و گوتی:

ــ باشی؟

مرێمۆك هەر ئەوەندە دەستی راستی هەتا نێوچاوانی بەرز کردەوە. هەر ئەوەندە.

ــ ببوورە دایە گیان، چ بکەم، ناردیانمە شوێن مێگەلەکە.

مرێمۆك متەقی لێوە نەهات. عەلی کە بینی دایکی وەڵام ناداتەوە، لە دڵە خۆیدا گوتی:

ــ خودا ئەو خولق و خووەت بەرێتەوە. ئاخر من چم لێ‌کردووە؟

نەرڕاندی:

ــ ئاخە چ خراپەیەکم بۆت بووە؟

پشتی تێ کرد و گوتی:

ــ "وەلی"، دایکم بخە سەر پشتم.

"وەلی" مرێمۆکی سواری کۆڵی عەلی کرد. عەلی کە ماندوو شەکەت بوو، بە زەحمەت هەستایە پێ.

ــ یاڵڵا منداڵینە دەی. یاڵڵا کچێ. ئێوەش وەپێش کەون. "وەلی" تۆ لێرە بمێنەوە. دۆینەت بۆ دێنم.

کە برێك دوور کەوتنەوە، لە بەزێکەوە وەك داوای لیبووردنی لێ بکا گوتی:

ــ بۆچی لە من تووڕەی دایە. ئاخر من چم لێ کردووی؟

عەلی هەتا گەیشتە دارستانەکە لەبەر دایکی پاڕایەوە و لە سووچ و گوناحی خۆی پرسی. دایکە لەبزی دە لەبزی نەگەڕا. دیار بوو بەدڵ دەنگی لێ گۆڕیوە.

زۆری مابوو بۆ سیوادی بەیانی، کە خەڵکەکە لەبەر دەنگەدەنگ و هەرا لە خەو هەستان. دووکەڵ دارستانەکەی داپۆشیبوو. لەبەردەم هەر خێوەتێکا هەتا بەیانی ئاورێکی گەورە داییسا و دووکەڵەکەی وەکو مژێکی خەست هەموو دارستانەکەی تەنیبۆوە. هەموو خەریك بوون خۆیان ئامادە دەکرد. یەکێك ئەسپەکەی و ئەوی دی، گوێدرێژەکەی بار دەکرد. هەندێکیشیان ئەوەی هەیانبوو بە کۆڵیاندا دەدا.

لەو جەنگەیەدا عەلی کە هەتا رۆژ ببۆوە بە دیار ئەسپەکەوە دانیشتبوو، گرژ و مۆن هاتە دارستانەکە. ئەوانەی دیتیان، لە دەوری کۆوە بوون. عوسمانۆك لێی پرسی:

ــ حەیوانەکە چۆنە؟

ــ دەم لە هیچ نادا. هەر وەك خۆیەتی.

ئاگری لە دڵی بەرببوو. لەسەری رۆیی:

ــ دەمەوێ ئەو بەستەزمانە بێنمە دارستانەکە. تاشباش ئۆغلۆ، دەتوانی کۆمەگم بکەی؟

تاشباش سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و بە ئاماژەیەکی چاو گوتی:

ــ یاڵڵا، تۆ... ئەتۆ... دورموش تۆش... یاڵڵا وەڕێ کەون. خێرا بن. پێش ئەوەی کاروانەکە وەڕێ بکەوێ...

گەنجەکان بە دوای عوسمانۆکدا بەرەو ئەو شوێنە وەڕێ کەوتن کە ئەسپەکەی لێ کەوتبوو. ""وەلی""یە رەش کە لە قەراغ ئاگرەکە خۆی گەرم دەکردەوە، بە دیتنیان لە خۆشیانا قیت بۆوە و هەرای کرد:

ــ قولێ گیای خوارد. ئەوە کام لە پێش رۆ کردووە.

سەری ئەسپەکە تەواو بە کایەکەدا رۆچوبوو. عوسمانۆك گوتی:

کوڕە، خۆ ئەتۆ سەری ئەسپەکەت ناشتووە. خۆ داماوە ناتوانێ پشوو بکێشێ.

چووە پێشێ و بەپەلە کاو کۆتی لە دەوری سەری ئەسپەکە لادا. بە پێکەنینەوە گوتی:

ــ زۆر شوکر نەمردووە.

رووی لە گەنجەکان کرد و گوتی:

ــ دورمووش تۆ بەهێزتری. ئەتۆش "میستیك" لای سەری بگرە، تۆش کلکی، ئێمەش لا شانی دەگرین.

ئەسپەکە لە قوڕەکە چەقیبوو. ملی درێژ و لاواز بوو. دیار بوو رەنگی جارانی کوێت بووە. ئێستا سپی‌یەکی بۆر پەڵەپەڵەی قاوەیی مەیلە و سووری تێکەوتبوو. جێ جیش مووی سەر شان و لا تەنیشت و سەرچۆکەکانی وەریبوو. کلکی کورت ببووەوە و تەنکیش ببووز یاڵی نەبوو. نیوەی هەڵوەریبوو و نیوەکەی دیکەشی هەڵکەنرابوو. گوێچکەکانی وەك گۆشتێکی سوور بەوێوە مابوونەوە. چاوەکانی زەرد هەڵگەڕابوون و مژۆڵەکانی ریپۆقاوی بوون. وەك مرۆڤێکی کە دەستی لە دنیا بەردا بێ، سەرساردانە سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد. عوسمانۆك هەرای کرد:

ـ یاڵڵا کوڕینە دەست دەنێ، یەك... دوو... یاڵڵا، هاااااا

ئەسپەکەیان هەستاندە پێ. ئەژنۆکانی دەلەرزین. بەڵام دیسان لاقەکانی لەسەر عەرزەکە چەقاند.

کەحێلەیان توند گرت و بە دارەدارە بردیان. ئەسپەکە لاقەکانی تێك دەهاڵان، دەهات چۆکی بنووشتێتەوە، سەرەنگرێ دەبوو، بەڵام ئەوان بەریان نەدەدا و دەیانکێشا.

عوسمانۆك گوتی:

ــ هەی ها، کەحێل، ئاوات نەبینم، دەی، دنیایە ئیتر چیی لەگەڵ دەکەی، دنیایەکی قەحپەیە. لەبیرتە عەلی؟ ئەو دەم کە عەلی تازە هاتبوو. چیها کەروێشکمان پێ راو نا و گرتانن. کەحێل وەك با دەفڕی. ئەو ڕۆژانەت لەبیرە عەلی؟

عەلی بە خەفەتەوە سەری لەقاند. ئەو وەبیرهێنانەوەیە بڕێك دڵی خۆش کردبوو. تاشباش زۆر لەمێژ بوو بێ دەنگ بوو. کە ئەوانی دیکەش بێ دەنگ بوون، لە ناکاو دەنگی بەرز کردەوە:

ــ خەمتان نەبێ. ئەو ئەسپە پیرە نامرێ. کەحێل نامرێ.

هەموو پێکەنین. عەلی گری گرت.

خۆر رمبێك بەرز ببۆوە. کەحێلیان هێنایە دارستان. لە بن ئەو دارەی عەلی باری لێ خستبوو، ڕێك لە پێش مرێمۆکەوە و لە تەنیشت ئاگرەکەیان دانا.

مام خەلیل لەولاترەوە راوەستابوو، بە روخسارێکی خەفەتبارەوە، جارێ بە نارەحەتی و جارێکیش لە رووی سۆزەوە سەیرێکی ئەسپەکە و عەلیی دەکرد. کە چاویشی بە مرێمۆکێ دەکەوت، پێڵووی لێك دەنان و رووی وەردەگێڕا.

ئەو دەمەی مرێمۆکیان هێنابووە دارستانەکە، مام خەلیل هەستابوو و بە کوێخای گوتبوو:

ــ دەستەکانم بکەوە، هەی سەگی سەگباب، بیکەوە، ئەگەر گەیشتینە ئەو خوارە و چوومە لای سەرۆك و پێیم گوت دەستی ئەمنێکی پیر و پەککەوتەی شەتەك داوە و تفی لە ردێنم کردووە، ئەو کات تۆ تا هەی چاوت بە کوێخایەتی ناکەوێتەوە. کوێخا ئەگەر هەبوو ئەو بابە گۆڕبەگۆڕەی تۆ بوو. سەی کوڕێ سەی، سەگی هار، تف لەو روویەت. تف لەو چڕوچاوەت، سەگبابی قەحپە دایك. بێ دین و ئیمان. ئەو دەستمانەم بکەوە...

کوێخا گوێچکەی خۆی ئاخنیبوو و گورج لەوێ دوور کەوتبۆوە. هەتا هێزی بوو دەنگی بەرز کردبۆوە و چیی بە زاری داهاتبوو حەواڵەی کوێخا و بابی و ژنەکانی کردبوو. ئەو قسانە ماست بوایە و لە پێش سەگت دانابا، نەیدەخوارد. بەڵام کوێخا گوێی لێ نەبوو.

خەتای بوو. هەموو گوندییەکان خەوتبوون بەڵام مام خەلیل دەنگی جنێوانی هەر دەهات و نەدەبڕایەوە. لەو جەنگەیەدا کەس پەیدا نەبوو پێی بڵێ:"بیبڕەوە، بەسە، مام خەلیل شوورەییە، ئەو کابرایە کوێخای گوندێکی گەورەیە، پێی وابوو تۆ تاوانباری و دەستەکانتی شەتەك دابوو." هەمووان بەو جوینانە شاگەشکە ببوون. ئاخرییەکەی گەنجێك کە خزمی کوێخا بوو، لە نیوەشەوێدا سەری بەرز کردبۆوە و بە مام خەلیلی گوتبوو بێدەنگ بێ. مام خەلیلیش زانیبووی شووی زۆر لێ کێشاوە و سەری لەو ئازایەتییەی خۆی سوور مابوو و دەمودەست بێ دەنگ ببوو.

یەك دا بەدوو، هەموو گوندییەکان، بە ژن و پیاو و منداڵەوە لە ئەسپەکە کۆ بوونەوە. کەس متەقی لێوە نەدەهات. هەمووان بە ریزەوە لەبەردەم ئەسپەکەدا راوەستابوون، دەتگوت، تەرمی مرۆڤێك، تەرمی پیاوچاکێك لەوێ کەوتووە.

مام خەلیل بەبێ ئەوەی سەرنجی کەس رابکێشێ، لە عەلی چووە پێش. پەنجەی دەستە راستی گرت و دایماڵی. چاوە وردیلە فرمێسکاوییەکانی تێوەبڕی و لەسەرخۆ گوتی:

ـ عەلی رۆڵە، لە چاوی منی مەبینە. زۆر پیر ببوو، ماڵ وێرانە. ئەمن دەمزانی، بەهەر حاڵ لێم خۆش بە.

عەلی بەلای ئەودا نووشتایەوە و بە سۆزێکەوە بزەی هاتێ. شتێك ئەوکی مام خەلیلی گرت. هەر یەك ئاماژە بەس بوو بۆ ئەوەی بداتە پڕمەی گریان. دوور کەوتەوە. لە دڵیدا گوتی:

" ئەدی، باوکە خواڵیخۆشبووەکەی، برایمی خوالیخۆشبووش هەر وابوو. هەرچی لێت کردبایە دڵی نەدێشا. ئەگەر گوتبام لەبەر من بمرە، دەمرد. دۆستی وا لە کوێ پەیدا دەبێ؟ ئای رۆژگاری رابردوو ئاخ. چەخت بشکێ گەردوون. ماڵەکەت کاول بێ، وەجاغت کوێرەوە بێ و قەت روون نەبێتەوە.

دوور لە خەلکەکە، پاڵی وەدارێکەوە دابوو و دانیشتبوو و وەك لافاوی بەهاران فرمێسکی هەڵدەڕشت. لە پڕ وەبیری کەوتەوە و گوتی:" خوایە گیان تۆش مشووری هیچ ناخۆی." و دوایی گوتی:"تۆبە خوایە، کفرم کرد، تۆبە تۆبە، بەڵام ئاخر خوایە گیان ئەگەر تۆ مشوورت خواردبایە، کوا ئەسپە داماوەکەی عەلیت دەکوشت و دایکە دەم هەراشەکەی ئەو، مرنمۆکی کچی گۆگ حاجیت دەهێشتەوە؟ تۆبە گووم خوارد تۆبە خوایە، ئەتۆش هەموو کارت سەرەوبنن."

دەنگێکی بیست. ئاوڕی دایەوە و کوێخای بینی کە لە هات و هاوار دڕی بە خەلکەکە دەدا و دەچووە نێو ئاپۆراکەوە. ئەویش بە دیتنی ئەسپەکە پێی بە عەرزییەوە وشك بوو. دەنگی

نەرمتر کردەوە و داهاتەوە و سەیری چاوی ئەسپەکەی کرد. سەری لەقاند و نچ نـچ ی کـرد. لـە نێو خەڵکەکەدا سەیرێکی ئەولاوئەملای کرد و پرسیی:

ـ کوا "کاك یەمەن"، لێرە نییە؟

دەنگێکی زیقی وەك دەنگی کچۆڵان لەو لاوە گوتی:

ــ لێرەم کوێخا.

ــ سەیری ئەسپەکەت کرد؟ گوتت دەژیێ یان نا؟

کاك یەمەن جوابی دایەوە:

هێشتا سەیرم نەکردووە قوربان.

ـ وەرە سەیرێکی بکە، بشڵێ ئاخۆ دەمرێ یا دەژیێ؟

کاك یەمەن هـات و ماوەیـەك ئەسـپەکەی پـشکنی و بـەبێ ئـەوەی چـاو لەسـەر ئەسـپەکە هەڵگرێ گوتی:

ــ ئەو ئەسپە گیانی دەبەردا نەماوە. بە خوای حەیفی کـرد. ئەسـپی حـدوود بـوو. کـەحێل بوو. حەیفی کرد.

هەم سەری دەلەقاند و هەمیش دەستی بەسەر ئەسپەکەدا دێنا.

کوێخا گوتی:

ــ خۆ دیتان کا یەمەن چیی گوت؟ ئەو ئەسپە نـاژیێ. کـە کـاك یەمـەن بڵـێ نـاژیێ ئـاوی حەیاتی بە گەروودا بکەی ناژیێ. ئەوجار ئەو بـە ئەسـپی سـاغ و سـەلیمیش بڵـێ دەمـرێ، بـە دڵنیاییەوە دەمرێ و ئەوجار ئەو لەو کارە شارەزایە.

یاڵڵا با بـڕۆین. ئەگـەر درەنـگ بگـەینێ، خـەڵکی گونـدەکانی دیکـە مـەزرا و کێڵگـەکان دەگرنەوە. ئەوجار ئیتر من بەرپرسیارەتییەکەی وەئەستۆ ناگرم. یاڵڵا خێرا بن.

دیسان دڕی بە خەڵکەکە دایەوە و ڕۆیشت و بەرەو دەرەوەی دارستانەکە وەڕێ کـەوت. ئـەو خەڵکەی دەوری ئەسپەکەیان دابوو لە جێـی خۆیـان نـەدەبزووتن. کوێخـا لـەولاترەوە ڕاوەسـتا، ماوەیەك لە خەڵکەکە ڕاما. دوایی ئەمری بە گزیر کرد:

ــ برۆ بەوانە بڵێ وەڕێ کەون.

گزیرەکـە بـەرەو لای جەماوەرەکـە بـە تونـدی جـاڕی دا و دەسـتی پـێ کـردەوە:"دوایـی نـەڵێن نەمانبیست." خەڵکەکە بە هەنگاوی قورس و گران دوور کەوتنەوە. ژمارەیـەکی کـەمیان بـە دەوری ئەسپەکەوە مانەوە. کوێخا لە گزیرەکەی کە چووبووە لای، پرسی:"کێ لەوێ ماوەتەوە."

گزیرە وەڵامی دایەوە:

ـــ "عەلی"یە درێژ نایەوێ ئەسپەکەی بەجێ بێڵێ و بێ. "وەلی"ی پوورزاشی ئەوە لەبەری دەپارێتەوە. مام خەلیلیش پاڵی وەدارەکەوە داوە و چاوی بڕیوەتە ئەسپەکە و هەروا راوەستاوە. تاشباشیش خەریکە بە عەلی دەڵێ وەرە با بڕۆین. کاک یەمەنیش سوێند بۆ عەلی خواردووە ئەو ئەسپە دەمرێ.

کوێخا گەڕایەوە لای ئەسپەکە و هەرای کرد:

ـ "عەلی"یەدرێژ، ئەو ئەسپە ئەمڕۆش نەمرێ، سبەی هەر دەمرێ. سەری ببڕە و کەوڵی بکە و وەڕێ کەوە. لە کۆنەوە گوتوویانە، بەرخێك لە مێگەل دابڕێ، گورگ دەیخوا. ئەوە لێت خۆش بووم. لەبەر ئەو ئەسپە مردەلۆخەیە ریزی گوندەکە مەشێوێنە. لێرە بەجێ مەمێنە.

دەیزانی ئەگەر بڵێ :"لێرە بەجێ مەمێنە"، عەلی لە داخی ئەو دەمێنێتەوە. جا بۆ ئەوەی عەلی تووڕەتر بکا، رووی لە مام خەلیل کرد و گوڕاندی:

ـ پیری خەرەفاو، دەی یاڵڵا تۆش وەڕێ بکەوە.

دەیزانی ئەویش پێچەوانەی داواکەی ئەو دەجووڵێتەوە و حەزی لێ بوو مام خەلیلیش بمێنێتەوە و لەسەری رۆیی:

ـ گیانت باش رزگار کرد. یاڵڵا،دەی یاڵڵا. ئەتۆش بەڕێ بکەوە یەمەن ئاغا، منداڵان ئێستا بەرێی چوکوورەوەن.

مام خەلیل گوتی:

ـــ لەعنەت لە شیر و لە بنە و بنەچەکەت، گووی سەگ بە ئێسك و پرووسکەکانی کوێخا خدر...

و تفێکی رۆکرد. لەسەری رۆیشتەوە:

ـ لە داخی تۆش بووبێت، لێرە لەگەڵ عەلی دەمێنمەوە و ناڕۆم. بەڵام لە بەر ئەو مرێمۆکە وەختە ببمە تنۆکێك ئاو. هەی دایك و ژن و ئێسك و پرووسکەکەی کوێخا خدریت....

کاك یەمەن خۆی پێچایەوە و گوتی:

ـ بەڵێ گەورەم راست دەفەرمووی. و بەپەلە وەڕێ کەوت.

تاشباش گوتی:

ـ برالە، عەلی، چار نییە. خۆ ناکرێ لەبەر مردووان بمری. ئەو کوردە باشی لێ دەزانێ. ئەسپەکە دەمرێ. سەیر کە بزانە کوێخا دەڵێ چی. لە خۆشیی ئەوەی ئەسپەکە دەمرێ و تۆ لێرە

بەجێ دەمێنی، هەر فیکەی سمێڵانی دێ* و خەریکە شاگەشکە دەبێ. پەیتاپەیتا دەڵێ:" بەجێ مەمێنە، مەمێنە." وەرە با لە داخی ئەویش بێ، سەری ئەسپەکە ببڕین و کەوڵی بکەین. یاڵلا دەست ببزێوە. ئەسپەکە هەر دەمرێ.سەیرکە کوێخا چۆن بە چێژەوە سەیر دەکا. سەیر بکە سەیر...

عوسمانۆك گوتی:

ـ کوڕە وەڵڵا دەمرێ. دە هەستە. لێرە مەمێنەوە و دوژمن بە خۆت خۆش مەکە.

مام خەلیل لە جێی خۆی هەستابوو و بە تووڕەییەوە دوور کەوتبۆوە و هێشتاش هەر وا بێ پسانەوە پاشەملێ جوێنی لە کوێخا دەدا و جار و بارەش دەگەڕایەوە و سەیرێکی ئەسپەکە و عەلی و مرێمۆکێی دەکرد و دوودڵ بوو:"بڕۆم یان نا." ساتێك وێستا و چاوەڕێ مایەوە و بیری کردەوە:"جا بشمێنمەوە چم لە دەست دێ. خۆ ئەسپەکەیانم پێ زیندوو ناکرێتەوە. وەڕێ کەوت بەڵام لاقەکانی لە دووی نەدەهاتن.

لە دوورەوە دەنگی تەنەکە و قاوقیژ و هەر وەهای دەنگی گۆرانییەکیش دەهات. دوایی کەڵەبابێك خوێندی. ماوەیەك درێژەی کێشا.

ئەوانەی "عەلی"یان خۆش دەویست هێشتاش بە دەورییەوە مابوون: تاشباش ئۆغلو، ئۆکسوز دۆران و عوسمانۆك و موسا کاکلی، لە بەریدا شل و کوت بوون و لەبەری پاڕانەوە و پێیان گوت لێی دەقەومێ و درەنگ دەگاتە لۆکەچنینەوە و ئەسپەکەش هەر دەمرێ. زۆریان هێنا و برد بەڵام نەیانتوانی قایلی بکەن. مانەوەی عەلی بە کەیفی دڵی کوێخا بوو، پێی شاگەشکە ببوو. هەر هەموویان زیاتر لە دە جاران ئەوەیان لە گوێی خوێند بەڵام نەچوو لە گوێچکەیەوە. دوایی بێ دەنگ بوون. ئیتر وردە وردە وەك بڵێی مردوویەك بەجێ بێڵن، مات و بێدەنگ لێی دوور کەوتنەوە و بەجێیان هێشت. هەمووان سەریان بەردابۆوە.

تەنیا "وەلی"یەڕەش مابۆوە و گوتی:"ئەمن دەمەوێ لەگەڵت بمێنمەوە پوورزا، با ئەوان بڕۆن." عەلی بە تووڕەییەوە سەری هەڵێنا و گوڕاندی:"تۆش بڕۆ. ژنەکەت ناساغە. ئەو ئەسپە هەتا دوو ڕۆژی دیکە یان دەمرێ یان زیندوو دەبێتەوە. تۆ بڕۆ. سێ ڕۆژ ناگرێ دەتانگەمێ."

---

* لە وەرگێڕانە فارسیەکەیدا دەڵێ: لە خۆشیانا هەر گوێ دەلەقێنێ. دیارە گوێ لەقاندنەکە ئەگەر بە ڕواڵەت نیشانەی خۆشی بێ، ئەوان واتایەکی شاراوەشی هەیە ئەویش مرۆڤ گوێ نالەقێنێ بەڵکو گوێدرێژ و شتی وا گوێ دەلەقێنن. من بۆیە دەقاودەق خۆیم دانەنا و ئیدیۆمێکی کوردیم لە جێگەی دانا، ئیدیۆمەکەم پێ باشتر بوو لەوەیان.

“وەلی”یەڕەش نەدەڕۆیی. بەڵام کە دیتی عەلی چاوی لەسەر هەڵناگرێ، ترسا. عەلی بە تووڕەییەوە دووپاتەی کردەوە:”بڕۆ “وەلی”. تۆ ژنەکەت ناساغە. یالڵا دەی.” “وەلی”ش بە نابەدڵی وەڕێ کەوت.

عەلی کە تەنیا مایەوە، سەری هەڵێنا و دیتی کوێخا گەڕاوەتەوە و دێ بۆ لای:” ئەو کابرا هارە لە چی دەگەڕێ.”

کوێخا کە دڵنیا بوو لەوەی عەلی بە تووتووش* لەگەڵیان ناچێ، گەڕایەوە بۆ ئەوەی گوندییەکان ببینن و بڵێن:”ئەی لەو کابرایە چەندە پیاوێکی باشە. تەنانەت چاکە دەرحەق دوژمنیشی دەکا. چەندە کابرایەکی خاکەڕایە. دڵی بەرایی نادا تەنانەت عەلیش لەو چیا و چۆڵە بەجێ بێنێ.”

ـ لەگەڵ تۆمە “عەلی”یەدرێژ، هەروەها فەرمانیشت پێ دەکەم و دەڵێم ئەوی لە مێگەلێ دابڕێ گورگ دەیخوا. ئەگەر بەڵایەکت بەسەر بێ، لەستۆی من نییە و ئەوجار ئەنجوومەنی ئاوەدانیش و ئەمنیش لێت خۆش بووینە.

بڕێك لەولاوەتر و بەرەوڕووی عەلی ڕاوەستا. چاوەڕێ بوو یەك دوو قسەی لێ ببیستێ. بەڵام عەلی لەبزی نەگەڕا.

ـ هەرچی ببێ لە ئەستۆی خۆت.

کاروان دوور کەوتبۆوە. رووی لە عەلی وەرگێڕا:

ـ لە ئەستۆی خۆت.

گورج بەجێی هێشت.

مرێمۆك و بووك و منداڵەکانی لە دەوری ئەسپەکە کۆزیلکەیان بەستبوو و وەك پەیکەری بەردین لە نێو دووکەڵ و ئاگری دوو ئاورگەدا مانەوە.

دەنگی تەق و تۆقی تەنەکەی وردە وردە دوور کەوتەوە. دەنگە دەنگەکە بڕایەوە. بڕێك دواتر کەڵەبابێك دەنگی لێ هەڵێنا، بەڵام دەنگی بەزەحمەت دەبیسترا. ئیتر بێ دەنگی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشا.

دەنگی خشەخشی لك و پۆپی دارەکانی جەنگەڵ و دەنگی بەربوونەوەی گەڵاکان و خشکانیان بەسەر عەرزەکەدا دەبیسترا.

---

*بەتووتوو: بە هیچ شێوەیەك. بۆ شتێکی کردنەکەی مەحاڵ بێ. هێمن دەڵێ: بەتووتووش تووشی مەکتەب کوا دەهاتم من کە زانیبام....

ئەسپەکە ئاوی بە لووتیدا شۆڕ ببۆوە. لمبۆزی کەوتبووە سەر عەرزی و هەموو قوڕاوی ببوو. ڕەگی دارەکان لە بن کۆگایەکی گەڵای زەردی وەریودا مابۆوە و نەدەبینرا.

دوایی عەلی هەستا و بەرەو نێو دارستانەکە کەوتە ڕێ. مریەمۆك بە نیگەرانییەوە لە پشتەوەڕا چاوی تێوەبڕی هەتا لە چاوان ونبوو. ئەوجار سەری بەردایەوە. بڕێك دواتر عەلی بە باوەشێك گیای شلك و تازەوە گەڕایەوە. گیاکەیان لە تەنیشت ڕەگی دارێکەوە دانا.

مەنجەڵ لەسەر کوچکاورەکە* بوو. مەنجەڵەکەی داگرت. بڕێك دۆینە لە بنی مەنجەڵەکەدا مابۆوە.

بە منداڵەکانی گوت:

ـ یەکێکتان وەرن و ئەوە تەواو کەن. با خەسار نەبێ.

کوڕیژگەکەی کە کەوچکێکی دارینی بەدەستەوە بوو هات و لەتەنیشتی دانیشت و دەستی کرد بە خواردنی دۆینەکە. لە چاوترووکانێکا هەڵیلووشی. عەلی سەری هەڵێنا و ڕووی لە ژنەکەی کرد. ژنەکەی تێگەیی. مەنجەڵەکەی هەڵگرت و بردیی لەسەر کانییەکە کە بڕێك لەولاترەوە بوو بیشوا. شوشتی و پڕی کرد لە ئاو و هێنایەوە و دایە عەلی. عەلی مەنجەڵەکەی لەسەر کوچکاورەکە دانایەوە. ئەسپەکە تەواو سەری بە عەرزییەوە نابوو. عەلی قامکە تووتەی لە ئاوەکە ڕۆکرد. ئاوەکە شلەتێن ببوو. مەنجەڵەکەی لەسەر ئاورێ هەڵگرت و هێنایە تەنیشت ئەسپەکە. لە لای سەرییەوە دای نا. چوو و لە لێفەکە لەتێ قوماشی لێ کردەوە. لە ئاوەکەی ڕۆکرد و هێدی هێدی چاوەکانی ئەسپەکەی خاوێن کردەوە. ژنەکەی خێرا لێی چووە پێشێ یارمەتیی بکا. عەلی ئەو کۆنە قوماشەی بە دەستیەوە بوو دایە ژنەکەی. سەری ئەسپەکەی کە تەواو بەقوڕەکەدا چووبوو، بەرز کردەوە. ئەلیف ئاوی بە دەستی داکرد و دەم و لمۆزی ئەسپەکە و ئەو شوێنانەی قوڕاوی ببوون و بەردەوام لیکاوی پێدا دەهاتە خوارێ، بە جوانی شوشتەوە.

عەلی دوای ئەوەی سەری ئەسپەکەی لە شوێنێکی وشك دانا، چوو و گیایەکەی کە لە پەنا دارێکی دانابوو، هێنا و لەبەردەمی ئەسپەکەی دانا. لەوێ دانیشت و سەری حەیوانەکەی لە ئامێز گرتەوە و زاری ئەسپەکەی بە گیایەکەوە نا. ئەسپەکە تەنانەت زاریشی نەبزوواند. گیا تازەکە هەروا لە لا لغاویدا مایەوە. زاری داپچڕاوی پڕ لە گیای تازە و ددانی سپی، زیاتر لە ددانێکی ئێسك و پرووسك دەچوون. عەلی قولە گیایەکەی لە زاری ئەسپەکە هێنایە دەرێ و قولێکی دیکەی تێ-

---

*کوچکاور: کوچك/بەرد+ئاور: واتە ئەو کوچك و بەردانەی بۆ ئاور دانراون بۆ ئەوەی شتی لەسەر دانێن.

ئاخنی. قولێکی دیکەشی لە جێی ئەو قولە دانا... دوایی سەری حەیوانەکەی کە لە باوەشیدا بوو، خستە سەر گیایەکە و هەستا. لە خەفەتان خەریك بوو شێت بێ. لاقی راستی دەیزیراند. ماوەیەك بێ جوولە بەسەر ئەسپەکەوە راوەستا. بووکەکەی لەولاترەوە لە پشت دارێکەوە کروشمەی کردبووو دەگریا. مرێمۆك چەنەی لەسەر ئەژنۆکانی دانابوو، دەموچاویشی لە لەپی دەستیدا شاردبۆوە و گرمۆلە ببوو. منداڵەکان بە چاوی ترساوەوە، سەیری ئەسپەکە و باوکیان و دایە گەورەیان دەکرد و جار وبارەش بە پەرۆشەوە سەیری دایکیان دەکرد کە لە پشت دارێکەوە ئەژنۆکانی لە باوەش گرتبوون. بەو شێوەیە نیوەڕۆ داهات و کەس لە جێی خۆی نەبزووت. لەو ماوەیەدا ئەسپەکە چەند جارێك کلکی راوەشاند. عەلی دڵی وە تەپەتەپ کەوت. بە خۆشحاڵییەوە هاواری کرد:"دایکە، دایکە، ئەلیف، سەیر کەن، بڕوانن. کلکی جوولاند."

دایکی دەستی لەسەر دەموچاوی هەڵگرت و بە ناقایلی چاوێکی لێ‌کرد. دیسان دەموچاوی داپۆشییەوە و ئیتر نەی‌کردەوە. منداڵەکان ك دڵخۆشییەکەی باوکیانیان دی، سەیرێکی یەکتریان کرد و پێکەنین. هەستان و وردە وردە لە باوکیان چوونە پێشێ و خۆیان پێوە نووساند.

کوڕەکە گوتی:

ــ کچێ دیتت، خەریکە کلکی دەبزوێنێ. چەندەش جوان دەیبزوێنێ. کلکی چ جوانە.

داهاتەوە و دەستێکی بە گوێی ئەسپەکەدا هێنا. کچەش داهاتەوە و بە ترسەوە پەنجەی لە گوێی ئەسپەکە دا و گوتی:"گوێچکەشی جوان دەلەقێنێ."

دەستیان لە لەشی ئەسپەکە دەخشاند و بە ترسەوە سەیری باوکیان دەکرد و گوێچکە و کلکی ئەسپەکەیان دەگرت و دەستیان پێدا دەخشاند.

لە دوورەوە ئەلیف بە تووڕەییەوە لە پشت دارەکانەوە هاتە دەرێ و هەرای کردنێ و گوڕاندی:

ــ سەربەقوڕینە، مەڕ لە خەمی گیانی دایە و قەساب لەبیری دووگ. سەیریان کە. ئەوانە گەمەیان هەستاوە.

منداڵەکان گورج لە ئەسپەکە دوور کەوتنەوە و وەك پشیلە دزەکە لە پشت دایەگەورەیان خۆیان شاردەوە و دانیشتن.

سیبەری هەورێك بەسەر سەریاندا تێپەڕی. لە دوورەوە دەنگی قومرییەك هات. کلك هەڵتەکێنەیەك لەسەر لقەدارەکەی رووبەڕوویان هەڵنیشتز ئەوەندە نزیك بوو پێت وابوو دەستت بۆ بردبا دەتگرت. دوایی هەڵفڕی.

ئەلیف یەك دوو باوەش پووش و پەلاش و چرپی و داری هێنا و خستییە سەر ئاگرەکە کە خەریك بوو دادەمرکاوە. چەند کۆتەرە دارێکیشی هێنا. یەکێکیان پڕ بوو لە مێروو. ئەویانی

گەڕاندەوە دارستانەکە و لە جێی خۆی دایناپەوە. مەنجەڵەکەی کە لە تەنیشت ئەسپەکەوە بوو هەڵگرت و پڕی کرد لە ئاو و لە جێی خۆی دایناپەوە و ساواری تێکرد. هەتا ساوارەکە پێ گەیشت، لە دەم ئاورەکە دانیشت و چاوی لە ئاورەکە بڕی و چاوەڕێ مایەوە. کە پلاوەکە پێ گەیشت، بەبێ تاقەتییەوە مەنجەڵەکەی لەسەر ئاگرەکە هەڵگرت و لە قەراغێی دانا. دوایی لە پێستەکەی تەنیشت خۆیەوە هێندەی پەنجەیەك رۆنی هەڵگرت و لە تاوەکەی کرد. رۆن لە تاوەکەدا دەستی کرد بە چزەچز و بۆنێکی تاڵی لێوە هەستا. کە رۆنەکەی بەسەر پلاوەکەدا کرد، دیسانیش چزەچزەکەی لێ هەستایەوە. پلاوەکەی تێك وەردا. گورج هەستا و سفرەکەی راخست و بە لەبزێکی شەرمنانەوە گوتی:

ــ وەرن بخۆن.

عەلی هات و چوار مەشقی لەسەر سفرەکە لێی دانیشت. منداڵەکانیش بە ترسەترس هاتن و دانیشتن. بووکەکە چووە لای مرێمۆك و دەستی لەسەر شانی دانا و گوتی:

ــ دایکە، دایەگیان دەی یاڵڵا، هەستە و پارووە نانێکی بخۆ. دایە گیان، دایە...

مرێمۆك گوێشی پێ نەبزووت. متەقی لێوە نەهات. بووکەکە تێیداشل و کوت بوو. مرێمۆك ئاخری گوتی:

ــ نیشتیام لێ نییە کچە جوانەکەم. ئەتۆ بچۆ بخۆ. ئەمن بە قوزەڵقۆرتم بێ کچم.

بە زۆر پێش خۆی گرتبوو، ئەگەر بووکەکەی برێکی دیکەی داوا کردبا، هەڵدەستا. کاتێ بووکەکەی پێدا گریی نەکرد، زۆر تووڕە بوو... ئەگەر پێشی تووڕەبوونەکەی خۆی نەگرتبا، لەوانەبوو بەردەکەی بەر دەمی خۆی هەڵگرێ و بە تۆقی سەری دابدا.

دەستی کردە بۆڵاندن.

رۆژ ئاوا بوو و گۆشە و قوژبنی ئاسمان سوور داگەڕا. کاروانکوژە دەتگوت ئاوێنەیەکە و بە ئاسمانەوە هەڵواسراوە. عەلی ئاگرەکەی وا خۆش کردبوو کە دەوروپشتی وەك رۆژی رووناك لێ-کردبوو. جگە لەوەش ئاگرێکی لە لای کلکی ئەسپەکەوە و یەکی لە ژوور سەرییەوە و دوو ئاگری دیکەی لەملاولای ئەسپەکەوە کردبۆوە. لە دارستانەکەوە دار و چرپیی بۆ ئەو پێنج ئاگرە دەهێنا.

ئەسپەکە، کە دەوری بە ئاگر تەنرابوو، هیچ نەدەبزووت. سەری لەسەر گیایەکە تخێڵ کردبوو و لیکاوی زاری یەك پشوو لووزەوی بەستبوو.

عەلی هەر ئاگرەکەی خۆشتر دەکرد و دوایی دەهات و چاوی لە لووتی ئەسپەکە دەبڕی و بە وردی سەیری دەکرد.

منداڵەکان سەریان وەسەر چۆکی دایە گەورەیان کردبوو و لێی خەوتبوون کە لە تەنیشت ئاگرە سەرەکییەکەوە دانیشتبوو. مرێمۆك لە بەیانییەوە چۆن بوو هەر وابوو. ئەوەندە نەبێ، هەر جارەی تیشکی ئاگرەکەی وێدەکەوت، بچووکتر دەبۆوە و کە دەکەوتەوە تاریکی گەورەتر دەبۆوە.

عەلی ماندوو و شەکەت، پووشکە و دارێکی زۆری کۆ کردەوە و لە تەنیشت ئاگرەکە هەڵیچنی. ماوەیەك هەر لەو دەوروبەرە هات وچوو. لە دوورەوە دەنگی لوورەی چەقەڵ دەهات. لەوانەبوو سەت چەقەڵ دەبوون کۆ ببوونەوە. دوایی کەڵەبابێکی ناوەخت خوێندی. کێ چووزانێ لەوانەبوو کاروانی گوندێکی دیکە بەرەو چوکووراوا بەرەوخوار دەچوو.

سیڕی سیسرکان شەویان ئاخنیبوو. عەلی سەری هەڵێنا و رووی لە ئاسمان کرد. ئاسمان پڕ بوو لە ئەستێر. حاڵەتێکی سەیری بەسەردا هات. ئەستێرە پاییزییەکان دەتگوت: سەرمایان بووە و ئەوەندە ناسك ببوونەوە پێت وابوو دەشکێن. کاتێ عەلی هەتا ماندوو بوو سەیری کردن، هات و لە ژوور سەری ئەسپەکە راوەستا و هەر لەوێش ئەژنۆی لە باوەش وەراندن.

خۆر لە ئاسۆ دەهاتە دەرێ کە ئەسپەکە هەر دوو پەلی پێشەوەی راکێشا و لەبەریەکی کێشانەوە. دەستەکانی ساتێك لەرزین و هەر بەو جۆرە مایەوە و سەری بە لایەکدا شۆڕ بۆوە. عەلی سەری ئەسپەکەی گرت و سەیری کرد پشووی لێ بڕاوە. ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:"بابەڕۆ ماڵم وێران بوو.

بەرەو پشت کەوت. ئەلیف کە خەونووچکە دەیبردەوە، راچڵەکی و قیژاندی. منداڵەکانیش بەخەبەر هاتن وبەبێ ئەوەی بزانن چیان بەسەر هاتوو دەستیان کردە گریان.

مرێمۆك بە حاڵەحاڵ لە جێی خۆی هەستا. هات و خۆی بە سەر ئەسپەکە کێشا:

ـ یاخوا لەسەرت گەڕێم. ئەسپە داماوەکەم. یادگارەکەی برایم. وەی رۆژۆ چمان بەسەر هات وەی رۆ. یانی هەر دەبوو چاوم بەو رۆژانەش بکەوێ؟

بەسەر ئەسپەکەدا پان ببۆوە و دەنووزایەوە. چەقەڵەکانی بەرەبەیانی دەیانلووراند. ئاگرەکان دامرابوونەوە.

خۆر کەوت. هەمووان چاویان سوور هەڵگەڕابوو. هەستان و ساتێك بەرەو خۆرەکە راوەستان. بایەکی فێنك هەڵیکردبوو. کزەی بایەکە دەخزییە ناخیانەوە. هەڵدەلەرزین.

مرێمۆك پیلی بووکەکەی گرت:

ـــ لەگەڵ تۆمە کچە جوانکیلەکەم. لەگەڵ کەسی دیکەم نییە. بەوانە ناڵێم کە یادگارییەکەی برایمیان لێ کوشتم. کەوڵی بکەن لانیکەم با کەوڵەکەی زایە نەبێ. دەیفرۆشین.

عەلی تووڕە بوو:

ـ کچێ دایە چۆن کەوڵ دەکرێ. ئەمن کێردم پێ نییە. پێشم بێ بەو هەمووە بارەوە چۆنم پێ هەڵدەگیرێ؟

مرێمۆك:

ـ بووکەکەم بە تۆ دەڵێم. کێردێکی تیژ لە کیسەی ساوارەکە دایە. بەڵام سەبارەت بە بردنەکەشی، هەر وەك چۆن ئێمە بەرێیەدا دەڕۆین، ئەویش دەڕوا. ئەمن بەکۆڵی خۆمی دادەدەم. تێگەیشتی بووکەکەم؟

عەلی هیچی نەگوت. دەیزانی ئەگەر کەوڵی نەکا، دایکیشی لەگەڵی نایە. ژنەکەی لە ساوارەکەدا کێردەکەی دۆزیبوّوە و عەلی لێی وەرگرت. لە سەر سەری ئەسپە مردووەکە ڕاوەستا. هەم بە خەم و پەژارەوە سەیری دەکرد و هەمیش ئەو کێردەی بە دەستییەوە بوو بۆ ئەوەی تیژتری بکا لە قایشە چەرمییەکەی دەخشاند.

دەستی کرد بە کەوڵکردنی. دایکە و بووکەکە هەر کام لە لایەکەوە پشتیان لە ئەسپەکە کردبوو و لە سەر عەرزەکە هەڵتووتەکابوون. منداڵەکان لە تەنیشت ئەسپەکە ڕاوەستابوون. چاوە درشت و خەواڵووەکانیان پڕ بوون لە خەم و پەژارە. کوڕە تا توانیی یارمەتیی باوکی کرد. لە دوورەوە سیسارکە کەچەڵە دەسووڕانەوە.

کە عەلی لە کەوڵکردنەکەی بۆوە، خۆر گەیبووە نێوەڕاستی ئاسمان. نیوەڕۆ داهاتبوو. عەلی ماندوو و شەکەت هەرای کرد:

ـ ئەلیف خوێ بێنە.

کەوڵەکەی کە وەك خێوەتێك لەسەر زەوییەکە پان کردبۆوە، خوێی کرد:

ـ خۆڵەمێشیش بێنە. خەڵوز و پۆلووی پێوە نەبێ.

ژنە مستێکی خۆڵەمێش لە نێو ئاورگەکە هەڵگرت و بەسەر پێستەکەیاندا کرد. پێستەکە یەك دوو سەعات لەبەر تاوەکە مایەوە. دوایی عەلی جێ و بانەکە و لێفە و تەنەکەکانی کە لە جاجمێکییەوە پێچابوون، بە کۆڵ دادا. کەلوپەلەکانی دیکەشی دایە دەست ئەلیف. دەتگوت قورقوشمن.

لە بن لێوانەوە بۆڵاندی:

ـ کێ پێستی ئەو ئەسپە دەکڕێ.

دەستی دایکشی گرت و هەڵیستاند. لەوێ دوور کەوتنەوە. هێشتا سەت سەت و پەنجا مەترێك دوور نەکەوتبوونەوە کە پۆلە سیسارکەیەك لەسەر کەلاکەکە نیشتنەوە. عەلی

ناورێکی دایەوە و سەیرێکی دواوەی کرد. سیسارکەکان ئەوەندە زۆر بوون کەلاکەکەیان داپۆشی.

لە باشوورەوە هەورێکی سپی هێدی هیدی دەخزی. لە لای راستەوە، سپێندارێك زەرد هەڵگەرابوو. لك و پۆپەکانیشی لەبەر پیری و بەتەمەنی داهاتبوون و خوار ببوون.

کەوتنە رێ. عەلی بە ژنەکەی کە لە تەنیشتییەوە دەرۆیی گوت:

ـ ئەگەر ئاوا خۆش برۆین لە "ئاشاغی ئاندرێن" دەیانگەینێ.

ئەلیف جوابی نەدلیەوە:

عەلی:

ـ ئەو پەری پێنج رۆژی دیکە دەبینن لە پرێکا لە بەردەمیان قوت دەبینەوە. وا نییە؟ دەی بلێ دەی.

ئەلیف تەواو بە ناخی خۆیدا رۆچوبوو و دەتگوت: هیچ نابیستێ.

ـ لێیانگەرێ با دڵیان خۆش بێ لەوەی ئێمە ئەسپەکەمان تۆپیوە و بەجێ ماوین. سەگی بنی سەگینە... پێیان خۆش نییە...

ئەلیف سەیرێکی کرد. راوەستاو لێی راما. دیسانیش گوێی پێ نەدایەوە. عەلی بە خێرایی بە پەنایدا تێپەری.

هەرچی لەسەر پشتی کەحێلە بوو لەگەڵ کەوڵەکەی، پشتی عەلی کوور دەکردەوە. لەگەڵ ئەوددا کە هێشتا زۆر نەرۆییبوون، لە بن ئەو بارە قورسەدا شەلاڵی ئارەقە ببوو و هەناسەبڕکێی بوو. لە هەموان خراپتر ئەو پێستەیە بوو، دەتگوت قورقوشمە بە سەر پشتیەوە.

بەختەوەرانە بای باشوور لە پێشیانەوە هەڵیکردبوو و بۆن و بەرامەی کاژ هەوای تەنیبوو. کەوڵە ئەسپەکەش بۆگەنی چڵك و خوێنی لێ دەهات.

عەلی لە ناکاو توورە بوو. هەڵچوو و گۆراندی:

ـ ناکرێ نەگەینێ نا. بەر لەوەی کاروان بگاتە "ئاشاغی ئاندرین" ئێمە دەبێ بیانگەینێ... بگەینێ... بگەێنی...

ئەلیف هاتەوە سەرخۆ. سەرسوورماوانە لە جێی خۆی وێستا. نەیدەزانی عەلی بۆ وا ماندوو بووە.

ـ ناکرێ... نا، ناکرێ... ئەگەر نەگەمێ... ئەوان لەمێژە رۆیون. ئەگەر نەگەمێ ژن و منداڵم رووت و قووت و برسی دەبن. ئەگەر قەرزەکەشم پێ نەدرێتەوە، عادیل ئەفەندی حەیام

دەبا. ئەگەر ئەمن نەگەمێ گوندییەکان بە دەست کوێخا و سەگرد شێتەوە لێیان دەقەومێ.
لێیان دەقەومێ ژنەکە. گوندییەکان لە کێلگەی بێ بەرهەمدا گیان دەدەن و بە گیرفانی بەتاڵەوە دەگەڕێنەوە ئاوایی. گوێت لێیە ژنەکە؟ دەمەوێ بڵێم ناکرێ نەگەینێ نا. دەبێ دلن بە جەرگی خۆماندا بنێین و چیی خێراتر بڕۆین، ئەگەر لە ئاشاغی ئاندرێنیش نەیانگەینێ، لانیکەم لە هەوارگەی هەنارستاندا دەیانگەینێ.

ئەلیف لە مێژ بوو نەیدیبوو عەلی ئاوا بگۆڕێنێ و توورە بێ. هەر بۆیە چیی زیاتر بیری دەکردەوە، لە بری ئەوەی سەرسوورمانەکەی کەمتر بێتەوە پتر دەبوو. دەیویست شتێك بڵێ و وەڵامێك بداتەوە. بەڵام هیچی بە مێشکیدا نەهات.

- کاروان رۆیشت و تێپەڕی...هەڵفڕی و رۆیی... ناکرێ نەیگەینێ.

هەنگاوەکانی خۆشتر کرد. غاری دەدا. برێك دواتر، منداڵەکان و ئەلیف و مرێمۆك زۆر بەجێ مان. هێشتا لە دارستانە کاژەکە نەچووبوونە دەرەوە.

ئەلیف چەندی لە توانایدا بوو خێراتر دەڕۆیی بەڵام چما دەکرا بگەیتە عەلی. ئەلیفیش بارەکەی قورس بوو. جار نەجارێ ئاورێکی دواوەی دەدایەوە و کزەی لە هەناوی دەهات. دەیدی خەسووەکەی هەر دێ و وەدوا دەکەوێ و لەگەڵ هەر هەنگاوێکی دەینێ، وا سەرەنگرێ دەبێ وەختە وەعەرز بکەوێ.

عەلیش کە لە دارستانەکە چوبووە دەرێ و لە چاوان ون ببوو، شەلاڵی ئارەقە ببوو و لاملی سوور هەڵگەڕابوو و دەمارەکانی هێندەی پەنجەیەك هەستابوون. دایە گەورەش بێ پسانەوە تەشەری پێدا دەدا و تووکی لێ دەکرد و بەو کارەی داخی دڵی خۆی بەسەردا دەڕشت.

کوڕێژگە لە ناکاو دەستی نەنکی بەردا و بە راکردن خۆی گەیاندە دایکی و گوتی:

ـ دایە؟

ـ دایکی گوڕاندی:

ـ هەتیوە، نەنکت بەجێ مەهێڵە. لێرە راوەستە و مەبزوو هەتا دایەگەورە دەگاتێ. دەبێ لەگەڵ ئەو بێی.

کوڕە چڵمی هەڵلوشی و گوتی:

ـ ئەمن زۆرم برسییە. نازانی چەندەم برسییە....

دایکی گوڕاندی:

ـ قوزەڵقۆرت بخۆی. چاوەڕێی دایەگەورەت بە.

منداڵەکە بە خەمناکیەوە راوەستا. لە دایکی ترسا.

مریەمۆك پشتی تەواو کۆمابۆوە. ئازای ئەندامی دێشا و لاقەکانی لە دووی نەدەهاتن و ئەژنۆی دەلەرزین. هەنگاوێك دەڕۆیشت و رادەوەستا. رووی لە ئاسمان دەکرد. رێك وەك پەلەوەر کە ئاو دەخواتەوە....

هەناسەی قووڵ قووڵی هەڵدەکێشا، دوایی لاقەکانی بە حاڵە حاڵ هەڵدێنان و بە دووای خۆیدا دەخشکاندن. روخساری رەش داگەڕابوو. دەتگوت پێستێکی بەر خۆرەتاوە و چرچ و لۆچی تێکەوتووە. چاوەکانی وا بە قووڵدا چووبوون نەدەبینران. زارە بێ ددان قوپاوەکەی و روومەتەکانی وێك هاتبوون. قژە خەنەلیدراوەکەی لە بن چارشێوەوە هاتبۆ دەرێ و بە دەموچاو و ملی‌یەوە نووسابوو.

ئەلیف غاری دا. کە لە دارستانەکە هاتە دەرێ، لە دوورەوە عەلیی دی و هەرای کرد:

ـ عەلیی ی ی.... هۆۆۆۆۆۆۆۆۆ عەلی ی ی ... عەلی ی ی ی ..

عەلی گوێی لێ نەبوو.

ئەلیف کە جار بە جار خێراتر رای دەکرد، دەمودەست خۆی گەیاندە عەلی و پیلی گرت و رایوەشاند و بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

ـ دایکت باش نییە. هی باش نییە عەلی... بگەڕێوە بیبینە. ئاوا نابێ... لێقەوماوە عەلی. لێقەوماو...

عەلی راوەستا و برێك راما جا گوتی:

ـ چیی لێ نایە.

بە تووڕەییەوە قۆڵی لە دەستی ئەلیف راپسکاند و هەر وا بە خێرایی ملی رێگەی گرتەوە.

ئەلیف لە دواوەی گوتی:

ـ هۆی عەلی. ئەوە شێت بووی؟ وەڵڵا ئەو لێقەوماوە شپرزە.

عەلی دیسان گوێی نەدایە. ئەلیف گەڕایەوە داوە بۆ لای مریەمۆك کە تازە لە دارستانەکە دەهاتە دەرێ و چوو بن پیلی گرت. زۆر لە عەلی تووڕە بوو. پرسی:

ـ چۆنی دایە گیان؟..

مریەمۆك ئاخێکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

ـ باشم کچە جوانەکەم. ئەوە دەمبینی. ئەگەر باش بوون ئەوە بێ، خوا بیبڕێ و بە زیادی نەکا.

ئەلیف بە شەرمەوە گوتی:

ـ دەتوانی بەرێدا بڕۆی؟

مرێمۆك وەك شیشێکی سوورەوەکراویان پێوەنابێ، بە تووڕەییەوە گۆڕاندی:

ـ ئەمن دەڕۆم. واش دەڕۆم زەوی لە بن پێیاندا گلۆڵە بێ. جا چت دیتووە، ئەمن هێشتا تەواو لەگەڵی رانەهاتووم. هێشتا گیانم خاوە.

بەلام دەنگی وەك جاری جاران نێر نەبوو. دەستێکی ئەو لەسەر شانی منداڵەکە بوو و ئەلیفیش شانی گرتبوو. دەمودەست دەستی لەسەر شانی منداڵەکە هەڵگرت.

پاڵێکیشی بە ئەلیفەوە نا. خۆی قیت کردەوە. ئاوا چەند هەنگاوێکی هاویشت. دوایی کەوتەوە سەرسم دان. باش بوو ئەلیف لەوێ بوو. ئەگەر هەر لەو دەمەدا نەیگرتبایە، مرێمۆك زرمەی لێوە دەهات.

ـ هێشتا خووم بە رێگارۆیشتنێ نەگرتووە. بنیادەم یەك دوو رۆژان هەر وایە تا رادێ پێوەی دیارە. دوایی وەك ئەسپی جلیتبازیی لێ دێ. پەلە مەکە کچم، سەبرێ بگرە، با پشووەکم بێتەوە بەر... دوایی دەکەومەوە رێ.. وا دەڕۆم وا دەڕۆم.. وەك کچۆڵەیەکی پازدە ساڵانە...

لەسەری رۆیشتەوە:

ـ وەیش ش ... خۆزگە ئەسپەکەم زیندوو بایە... ئەسپە رەسەنە چاو رەشەکەم. ئەگەر مێردە بێ ئاقڵەکەی تۆ ئەو پیرە بەرازە، ئەو خەلیلە سەگبابەی سوار نەکردبایە و ئەسپەکەی لێ نەکوشتباین، ئەمن بۆ دەبوو ئاوا بە راکێش راکیش بڕۆم...

چاوەکانی پڕ ببوون لە ئاو. بە کوڵی گریانەوە گوتی:

ـ ئەمن شیری ئەو مەمکانەم لە مێردەکەت حەلاڵ ناکەم. ئەگەر ئاسمان و زەوی سەر لێك دەن، حەلاڵی ناکەم. یاخوا لە سەر کلەکەی جەحەندەمێ بکەوێ و ببێتە خەڵووز. شەرتە تا ماوم لەبزم دەلەبزی ناگەڕێ.

پێی عەیب بوو بگریێ. کلپەی گریانەکەی لە ئەوکیدا دەخواردەوە. ماوەیەك ئاوا مایەوە. دوایی لە پڕ هێور بوویەوە. لکی کۆڵوانەکەی هەڵکێشا و بزەیەکی هاتێ. وەك بڵێی نە بای دیبێ و نە بۆران.

ـ وەرێ کەوە کچم، وەرێ کەوە. تا ئێمە ئەوەندە بێ ئاقڵ بین....

توند دەستی بە بووکەکەیەوە گرت و بە شەلەشەل وەرێ کەوت:

ـ چاو چەندە باش بەرێیەدا دەڕۆم کچە جوانەکەم... ئەو دەمەی تۆم لەگەڵی...

ئەلیف چاوی لە عەلی بوو کە لە پێشەوە بە خێرایی دوور دەکەوتەوە. چیی نەمابوو لە یاڵەکەی رووبەڕوویان بپەڕێتەوە و لەچاوان ون بێ. ئیتر کەس نەیدەزانی لە کوێ رادەوەستێ و چاوەڕێیان دەکا. هیچ دوور نەبوو هەر ئاوا خۆی لەبیر بکات و نان و ناوی لەبیر نەمێنی و هەتا چوکوور داگەڕێ. ئەلیف مێردەکەی خۆی باش دەناسی.

هەتا هێزی دەبەردا بوو هەرای لێ کرد:

ـ عەلی ی ی ی ی ، عەلی ی ی ی ی ی

مرێمۆك بە توك و دوعاوە گوتی:

ـ لێی گەڕێ با بڕوا، تووتکە سەگە، با بڕوا بۆ دەرەك...

ئەلیف گوتی:

ـ دایە، ئەو شێتە. ئێمەی لەبیر نامێنێ و ئاوڕێکیش ناداتەوە.

مرێمۆکی بەردا و بە منداڵەکانی گوت:

ـ ئێوە دایە گەورەتان جێ مەهێڵن. ئەمن با بچم پێشی بابتان بگرم.

کوڕەکە گوتی:

ـ ئاخر من برسیمە.

ئەلیف:

ـ قوزەڵقۆرت بخۆی. جا ئەوە دەیبینی، ئەگەر بە بابتم نەگوت.

عەلی خەریك بوو لە یاڵەکە ئاوا دەبوو. ئەلیف نەیدەتوانی غار بدا. کۆڵەکەی داگرت و لە چەقی جادەکەی دانا، گەڕایەوە و گوتی:

ـ دایکە، منداڵەکان، هەتا ئەمن دەگەڕێمەوە، ئێوە لە لێرە لە پەنا ئەو بارە دانیشن.

لەچکە سوورەکە خزیبووە سەر شان و ملی. قژی پەخش و پەرێشان ببوو. کە غاری دەدا ئاڵۆزتریش دەبوو.

کاتێ عەلی لە یاڵەکە دەچووە خوارێ، خۆی گەیاندێ و گوتی:

ـ عەلی، کوڕە ئەوەندە بە شوێنتدا رامکرد، دڕام.

عەلی بە کۆڵەکەیەوە خۆی بە عەرزی دادا.

ئەلیف بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

ـ دایکت پرزەی لێ بڕاوە. ئەتۆ لێرە راوەستە با ئەمن بچم بیانهێنم. هەتا ئێمە دەگەینێ، ئەتۆ لێرە ئاگرێك بکەوە.

عەلی سەرێکی لەقاند. کڵاوە کۆنەکەی کە لێوارەکانی تیتۆڵ تیتۆڵ ببوو، لەسەری دەرینا و لە تەنیشت خۆیەوە داینا. قژی سەری خوسابوو. بە لەپی دەستی ئارەقەکەی نێوچاوانی سڕییەوە و پەنجە تەڕەکانی بە شەکەتییەوە تەکاندن. کۆڵەکەی لە تەنیشت گابەردێکەوە دانا. کەوڵی ئەسپەکەشی راخست و لە سەر شیناوەردەکەی قەراغ رێگاکە هەڵیخست. مێشێکی کەسکی زل وەك بریسکە لەسەری نیشت. دیسانیش هەر وا خێرا هەڵفڕییەوە. زۆری نەبرد مێشە کەسکەکان بوونە سیان.

عەلی ئاورەکەی کردەوە و لە تەنیشتی دانیشت. هەموو گیانی دەیزریکاند. هێندەی نەبرد ئاگرەکە کوژایەوە. عەلی جارێکی دیکەش و دیسانیش بۆ جارێکی دیکە هەڵی کردەوە.

چەند جارێك لەبەر خۆیەوە بۆڵاندی:" ئەو بەڵا لیدراوانە لە کوێ بەجێ مان... چیی وای نەماوە رۆژ ئاوا بێ... خەیاڵ هەڵیگرت. چاوی لە ئاگرەکە بڕیبوو و بە باڵی خەیاڵ هەڵفڕیبوو. ساڵێکیان زۆر لەوە پێش، کە هێشتا منداڵ بوو. رۆژێکی باراناوی لە چوکووراوا، باوکی تووڕە بوو. لە پەنا ئاگرێکی رێك وەك ئەوە. باوکی بەردەوام بەرد و ئەستێی لێك دەدا و جگەرەی دادەگیرساند. جار بە جار تووڕەتر دەبوو. خەریك بوو لە تووڕەییان بدڕێ. دیار نەبوو دایەگەورەی لە کامە کێڵگەدا بەجێ مابوو. ئەوەندە پەرۆش بوو خەریك بوو شێت بێ. رۆژ ئاوا ببوو و شەو بەسەردا هاتبوو. باوکی لە تەنیشت ئاگرەکە جارێك دادەنیشت و جارێك هەڵدەستا. هەتا رۆژ بۆوە هەر جگەرەی هەڵبەست و کێشای.

ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

"ئێمە تەنانەت ناتوانین جگەرەش بکێشین. دەور و زەمانەیەکی قۆڕە."

باوکی وەك سەرخۆشان رۆژی کردبۆوە. چاوەکانی دەتگوت گۆمی خوێنن. ئاگرەکە لە ئەستێرەیەك دەچوو کە لە نێوەڕاستی پێدەشتەکە وەعەرز کەوتبێ. لە گەڵ تێپەڕینی کاتدا گەورەتر ببوو. پەیتاپەیتا بڕکە لۆکەکانیان خستبووە سەری. لەوانەیە بە قەد سێ عارەبانە:"تۆخوا پیاو دایکی خۆی لە ژێر باراندا بەجێدەهێڵێ و لیدەدا دەڕوا؟"

دەمەدەمی نیوەڕۆ لە کێڵگەی جیرانەکەی تەنیشتیانەوە دایکیی دۆزیبۆوە. دایەگەورەی عەلی بزەی هاتبوویە و باوکی نێوچاوانی تێك نابوو. سێ رۆژی رەبەق نێوانی لێ گۆڕیبوو و دەم لە زەواد نەدابوو.

نەرمە گەرمایەك لەگەڵ بیرەوەرییەکانی ئەو رۆژانە لە جەستەی گەڕا.

لە جێی خۆی هەستایە پێ و باوێشکێکی دا:

ـ ئەوانە لە کوێ بەجێمان. جا ئاوا چۆن دەگەینە چوکووراوا؟ جا چۆن دەکرێ نەگەینێ؟ ئێرە کوێ و چوکووراوا لە کوێ.»

لە برسانا دڵەکزەی گرتبوو و دڵ لە بوورەوە دەهات. دانی بە جەرگیدا نا و بەغاردان بەرەو دواوە گەڕایەوە. هەر وا بە خێراییش یاڵەکەی بڕی. لە دوورەوە ژنەکەی بینی. منداڵەکانی لەگەڵ بوون. دایکی هیچ دیارە نەبوو. خێراتر غاری دا. زۆر ترسابوو. کە نزیکتر بۆوە، بینی ئەوەی بە کۆڵی ژنەکەوەیە دایکێتی. دەمودەست غاری دا و دایکی لە کۆڵی ژنەکەی کردەوە و بەکۆڵی خۆی دادا. کە گەیشتنە لای ئاگرەکە، خۆر لە ئاوابوون بوو. هەوا ساردی کردبوو. دیار بوو شەوەکەی زۆر سارد دەبێ. دەبوو هەتا بەیانی ئاگرە باییسێنن. ئەلیف ساوارەکەی لەسەر کوچکاورێ دانا. هەتا پێگەیشتنی ساوارەکە هەمووان لە تەنیشت ئاگرەکە کپ و بێ دەنگ چاوەڕێ مان. دواتر مەنجەڵەکەیان کە دووکەڵ تەواو رەشی کردبوو لە نێوەڕاستیان دانا و لە دەوری هاڵان و بە تاسەوە ملیان لەبەر نا و بەکەوچکان وەریگەڕانێ. بەڵام مرێمۆك دوای ئەوەی یەك دوو کەوچکی خوراد، کشایەوە. عەلی وەك فیشەکێکت بەسەر دڵیەوە نابێ ئاوا بوو. چووە پێشەوە و دەستی لە ملی دایکی کرد و بە کوڵی گریانەوە گوتی:

ـ دایە گیان، دایکە باشەکەم. ئەگەر گوناحێکیشم کردووە لێم خۆش بە. پیرەمێردێك هات و پاڕایەوە. سێ مانگی رەبەق... دەی سوارم نەکردبا چیم کردبا. ئەوجار خۆ ئەسپەکە بە سواربوونی ئەو نەمرد... خۆی پیر ببوو. پیرە پیاوەکە گوتی: لاقەکانم لە دووم نایەن. ئەژنۆکانم دەلەرزن و دەنووشتێنەوە. ئەمنیش... خۆ کەحێلە گیانی دەبەردا نەمابوو. مام خەلیل دۆستی بابم بووە. زۆر شپرزە بوو، دایکە باشەکەم.

مرێمۆك ئاوڕی دایەوە و رووی لەو دار کاژەی پشتەسەری کە زۆر ئەستوور و بڵند بوو و لە هەموو لاوە بنیشتی پێدا چۆڕابۆوە، کرد و گوتی:

ـ دارەکە، لەگەڵ کەسم نییە لەگەڵ تۆمە، لەگەڵ تۆمە دارە بەرزەکە. مام خەلیل ئەسپەکەی لێ کوشتم. تەمەنی لێ کورت کردەوە. لەگەڵ تۆمە ئەی پیرەدار. ئەتۆ تەمەنێکت بڕیوە. ئەتۆ سارد و گەرمی رۆژگارت چێشتووە ئەی پیرەدار. هەرچی هەی و رابردووە، هەمووی لە نێو لەپت دایە. مام خەلیل برادەر و دۆستی راستەقینەی مێردەکەی من نەبوو. دارەکە گیان، ئەوە ئێستا بەتۆی دەڵێم. مام خەلیل لە دوژمنی قەستەسەریش خراپتر بوو بۆ مێردەکەم. ئەتۆ دارێکی گەورەی، هەموو شتێك باش دەزانی. سەرت لە ئاسمانێ دەسووی و رەگت لە بەهەشتێ دایە. ئەوە هەر ئەمن و تۆ دەیزانین و ئەو خەلیلیە چاو شینە مل شکاوە.

خۆ ناکرێ پرێسکەی دڵت بۆ هەموو کەسێ بکەیتەوە. تەنانەت گەر کوڕیشت بێ. بەڵام بە تۆی دەڵێم کە بڕوام پێ بکەی ئەی دارەکە. مام خەلیل دۆستی برایم نەبوو. برایم مێشی پێ لە دمی خۆی هەڵنەدەفڕی. باش بزانە ئەی دارەکە، برایم کە بە چەتەیی نـاوی رۆیبـوو، دەرزییـەکیش چییە لە کەسی نەدزیبوو. باش لە گوێی گرە و بڕوام پێ بکە. گوێت لێ بوو چیم گوت؟ بنیادەم بڕوا بەو شتانە ناکا. ئەتۆ بڕوا بکـە دارەکـە. ئـەتۆ گـەورەی. چـڵ و پۆپـت سـەر لـە خۆرەتـاو دەسـووین. ئەتۆ نوقمی تیشك دەبی. ئەتۆ گەورەی، ژیری، جوانی، خـۆ نـاکرێ سـوڕ و نهێنیـی دڵی خۆت لە هەموو جێیەك و لای هـەموو کـەس بـدرکێنی، بـا کوڕیـشت بـێ. دەزانـی بـرایم ئەوهەمووە دزییەی بۆچی وەئەستۆی خۆ دەگرت؟ ها دارە جوانەکە؟ ئەگر دەسـتم بـەو خەلیلـە رابگا، دەیهاڕم. ئەنجن ئەنجنی دەکەم و دەیخەمە پێش سەگان. ئـەو کـات ئۆخـژنم بـە دڵ دادێ. ناوبڕژێنی دڵم دەکـرێ. دوای ئـەوە دەیکەمـە جێـژن. دەیکەمـە جێژنـە و سـەما دەکـەم ئـەی دارەکە. ئەگەر هیچ کەس بە حەقم نەزانێ تۆ دەزانی حەقمە دارەکە. با ئـەوەت پـێ بڵـێم ئـەی دارەکە. ئەی ئەو دارەی چڵ و پۆپت دەگەنە تیرێژی بەیان. برایمی من لەبەر ئەو پیرە سەیە چـاو قۆپچەیە تێدا چوو، ئەسپەکەشمی کوشت. لەگەڵ کوڕەکـەم.. ئـەمنیش تـا رۆژەکـەی قیامـەتێ شیری ئەومەمکانەمی لێ حەرام دەکەم. لەبزم دەلەبزی ناگەڕێ. و هەتا رۆژی مردنێ نێوانی لێ دەگۆڕم. ئەتۆ شایەت بە دارەکە.

مرێمۆك هەر وا کە قسەی دەکرد دەستیشی بە دارەکە دا دەدا ئاخریی وای لێ هـات کـەس تێی نەدەگەیی.

عەلی باوەشی پێ دا کرد و گوتی:

ـ هەستە بنوو، دایە گیان. درەنگە.

هەڵیگرت و بردی ولەسەر ئەو جێ و بانەی دانا کە ئەلیف لە بن لقە کۆماوەکەی دار کـاژە بەرزەکە و لە تەنیشت مندالەکان بۆی چاکردبوو، درێژی کرد. خۆشی چووە ئەو نـوێن و بانـەوە کە برێك لەو لاترەوە و لە بن کاژێکی دیکـەوە راخرابـوو. ژنەکەشـی هـات و لـە تەنیـشتییەوە راکشا. دەمودەستی خەویان لێ کەوت.

مرێمـۆك خـەو نەدەچـووە چـاوانییەوە. هـەتا رۆژ بـۆوە هـەر ئەمدیونـەودیوی کـرد. بـەو حالەشەوە بەبێ دەنگی دەگریا و لەبەرخۆیەوە دەیگوت:"هەی لەو رۆژە رەشانەی دەبوو بیانبینی مرێمۆك. چاو لە دەستی ئەم و ئەو بی و بە کۆڵی خەڵکەوە بچیتە سـەفەرێ مرێمـۆك، ئـیتر وا باشترە سەر بنێیەوە و بمری."

چیی وای نەمابوو سیوادی بەیانی بدا خەو بەربینگی پێ گرت. کە هەستا دەمێك بوو تاو کەوتبوو. عەلی و ژنەکەی کە لە تاریکانەوە هەستابوون، نەیانویستبوو هەڵی‌ستێنن و چاوەڕێی بوون خۆی بەخەبەر بێ.

کە هەستا، هەلیماوەکەیان* لە پێش دانا. برسیی بوو. دوای ئەوەی بەپەلەپەل دەموچاوی شوشت، هەلیماوەکەی خوارد.

جارێکی دیکە رووی لە دارەکەی پێش خۆی کرد و گوتی:"دارەکە، دارەکە، زۆر شوکر بۆ خودای هێشتا حەوجێم بەکەس نییە. بۆخۆم بە پێی خۆم دەڕۆم. دەی خۆ گوێت لێ بوو دارەکە. کەس نیگەران نەبێ و نەڵێ ناچارم مرێمۆك لە کۆڵ بکەم. خۆ جوان و قازاخ گوێچکەت کردەوە و قسەکانمت بیست؟"

دەستی نەوەکانی گرت و وەڕێ کەوت.

عەلیش چیی نەگوت. بارەکەی لە کۆڵ نا. ئینجا کەوڵەکەشی کە لە تەنیشت ئاورەکە پانی کردبۆوە لوولە کرد و گلۆڵەی کرد و خستییە سەر کۆڵەکەی. پێستەکە برێك وشك ببۆوە، بەلاَم دیسان دەتگوت قورقوشمە. "ئەلیف"یش باری خۆی بە کۆڵ دا دا. هەتا دەمی نیوەڕۆیە بەبێ کێشە رۆیشتن. گەیشتنە یاڵی "کارادۆمان"(یاڵە رەش). لە لێژایی یاڵەکە پشوویەکیان دا. منداڵەکان و مرێمۆك برێك لەولاوەتر لە بن دارێك دانیشتبوون.

لە پێشدا مرێمۆك و دواتر منداڵەکان هەستان و بەرەو سەر کشان. دوایی ژن و مێردەکەش هەستان. هەورازەکە زۆر رژد و دوور بوو. تا ترۆپکەکەی سێ کیلۆمەتر بوو. زەردایی گەلای دارەکان خوارەوەی داپۆشیبوو و وەك خۆرەتاو شەپۆلی دەدا.

ژن و مێردەکە هێندەی پێنەچوو مرێمۆك و منداڵەکانیان بەجێ هێشت. عەلی دە هەنگاوێك دەڕۆیی و رادەوەستا پشوویەکی بێتەوە بەر. ئەگەر پێی عەیب نەبوایە بار و بنەی توور هەڵدەدا و ملی رێگای دەگرت و دەڕۆیی. زۆر زۆر وەڕەز بوو.

کە گەیشتە نیوەی رێیە، ئیتر خۆی پێ رانەگیرا. چاوی لە ژێلاَ هاتبوون. ئاوڕی دایەوە و سەیری شیوەکەی کرد. لە تەرکی شیوەکەدا دایکی و منداڵەکانی دەتگوت مێروولەن لە هەوڵ دان.

ئەلیف لە پێش مێردەکەیەوە بوو، بەلاَم برستی لێ برابوو. گەرما شیوەکەی داگرتبوو. ئارەقە لاقەکانی لیچق کردبوو.

---

* هەلیماو: چێشتێکی سادەی کوندییەکانە. چێشتێکی ئاوەکییە.

مریمۆك لەسەر دەستەکانی دەڕۆیی. هەستا و چەند هەنگاوێکی نا و دیسان کەوتەوە. گوێی نەدایە بێ هێزییەکەی و ملی بادا. ئەمجارەیان نەیتوانی هەستێتەوە. نەیویست هەستێ. دەستی کرد بە گاگۆڵکێ. ئاوا باشتر دەڕۆیی. گوتی:

ـ منداڵینە، وەسەرەکەوتن ئاوا خۆشترە. ئێوەش وەك من بکەن.

لەبەر منداڵەکان تەریف ببۆوە. کچەکەی گوتی:

ـ وایە دایە گەورە، ئاوا باشترە.

عەلی کە گەیشتە سەر یاڵەکە، پشووی بڕابوو. کۆڵەکەی خستە سەر عەرزی و لێی تخێل بوو. سینگی دەفی دەدا. شەلاڵی ئارەقە ببوو.

کە وەخۆی هاتەوە نزیك نیوەڕۆ بوو. لە لووتکەوە سەیرێکی خوارەوەی کرد و سێ کەسی دی، کە چنگیان لە کوچکە بەردە گەورە و بچووك و تیژەکان گیر دەکرد و بە گاگۆڵکێ وەسەر دەکەوتن. ئەلیف گوتی:

ـ کوڕە ماڵ کاول. ئەو ژنە ئاوا دەمرێ. خۆی دەکوژێ. ئەو کوا دەتوانێ ئەو یاڵە ببڕێ؟

عەلی بە راکردن چووە خوارێ. ئەو دیمەنە ئاوری لە هەناوی بەردا. دەستی دایکی هەمووی دادڕدادڕ ببوو و ئەژنۆکانی شەلاڵی خۆێن بوون. گوتی:"دایە گیان، دایکە داماوەکەم، حەقتە، کەس، کەسی تێ شکاوان نییە".

دایکی بە کۆڵ دادا. مریمۆك بە کۆڵیەوە پەلەقاژەی بوو:"هۆی یاڵەکە، یاڵەکە، لەگەڵ تۆمە، ئەگەر بشمرم هەر لێت سەر دەکەوم. پێی بڵێ بەو کەسەی شیرەکەمم لێ حەرام کردووە. پێی بڵێ دامنێتە عەرزی، با دامنێ."

پەلەقاژەی دەکرد:"با دامنێ."

لە تەپۆلکەکە وەسەر کەوتن. خوار یاڵەکە لەسەرەوەڕا وەك هەڵدێرێکی تاریك دەهاتە پێش چاو. عەلی لە ترۆپکی چیاکە دەموچاوی خستە نێو هەردوو لەپی دەستییەوە و خەیاڵ بردی. لە ناکاو شەپۆلێکی شادی و خۆشی لە دڵی گەڕا. هەستایە پێ. لەو دەمەوە کە ئەسپەکە مردبوو ئەوە یەکەم جار بوو روخساری لە خۆشیانا گەش ببۆوە. بە شادییەوە بانگی ژنەکەی کرد و پێی گوت:

ـ دۆزیمەوە. وەرە یارمەتیم بدە با کۆڵەکەم هەڵگرم. خێرا کە. دایکم و منداڵەکان با لێرە بمێننەوە. ئەتۆش بەشە قورسەکەی بارەکەت بدە بە من.

داهاتەوە و بە سرتەی بە ژنەکەی گوت:" ئەو کەوڵە ئەسپە فڕێ دەدەم."

ئەو کات بارەکەم سووکتر دەبێ. بەڵام نابێ دایکم پێ بزانێ."

کۆڵەکەی بە کۆڵ دادا و گوتی:" ئەنگۆ لەگەڵ دایە گەورەتان لێرە بێننەوە. ئەمن ئێستا دەگەڕێمەوە و دەتانبەم. لێرە مەبزوون. باشە رۆڵە؟" باشە دایە گیان؟ ئەو رێگەچارەیەکی باشە."

خێرا لێیان دوور کەوتەوە. ژن و مێردە هەتا عەسرێ بە کەیف خۆشی‌یەوە رێگەیان بڕی. کە گەیشتنە دەم کانی‌یەکەی "باغلاما"، عەلی لە بن دار گوێزە پیرۆزەکە، کە لەبەر کۆنە پەرۆیان دیار نەبوو و هەر دەتگوت جلوبەرگی لەبەر دایە و بەو لك و پۆ چڕانەیەوە سەری لە ئاسمانێ دەسووی، کۆڵ و بارەکەی دانا. پشوویەکی دا و بە پەلە هەستا و گەڕایەوە. کە گەیشتەوە لای دایکی خۆر خەریك بوو ئاوا دەبوو. لە لای دایکی هەولێ دا شاد و هێمن بنوێنێ. یەك دوو جاران بیری لە باشترین و خۆشترین شتەکان کردەوە و پێکەنی.

دایکی لە جێگەکەی خۆی نەبوو. زۆر هاتبووە پێشەوە. بەڵام ژنەی داماو دەیتوانی چەندە رێ بڕێ؟ عەلی لە دوورەوە بە خۆشحاڵی‌یەوە هەرای کرد:

ـ دایکە باشەکەم. ئاوا باشترە. خۆزگە وەڕێ نەکەوتبایەی. بۆ وەڕێ کەوتی. ئەمن ئێستا بەکۆڵمت دادەدەم و دەفرم. لەوەی درەنگ گەڕامەوە تووڕەبووی؟

لە بەردەمی هەڵترووشکا. سەیری روخساری کرد. دەموچاوی ژنە دەتگوت بەردە. چاوەکانی نەدەبینران. لێوە پڕ لە چرچ و لۆچەکانی قوپابوون و روخساری رەش داگەڕابوو و شەلاڵی ئارەقە ببوو.

ـ چاو لێکە دایکە باشەکەم. کۆڵەکەمم گەیاندە سەر کانیی باغلاما، بن دارگوێزە پیرۆزەکە. باڵم گرت و هەڵفڕیم.

مرێمۆك چاوەکانی لە عەرزیەوە بڕیبوون. هەر دەتگوت گوێشی لێی نییە. هیچ گوێی پێ نەبزووت و جووڵەیەکیش چییە پێوەی دیار نەبوو. عەلی کە دیتی دایکی ناجووڵێ، هەر دوو دەستی گرت و بەرەو لای خۆی کێشای و بە کۆڵیدا دا و بە زەحمەت هەستایە پێ. مرێمۆك کە بە گەنجێتی ژنێکی بەخۆوە و بالابەرز بوو، ئێستا رەقەڵە و قورس بوو.

منداڵەکان کە دیتیان باوکیان دڵی خۆشە، ئەوانیش دڵیان خۆش بوو و بە حەقلی مەقۆ لە پێشیانەوە دەڕۆیشتن.

پیرەژنە، کە عەلی بە کۆڵیدا دابوو، متەقی نەکردبوو. تووڕەتر ببوو. چیی عەلی پێدەکەنی، ئەو تووڕەتر دەبوو. عەلی لە بن بارستایی دایکیدا لەبەر دڵی ئەو خێرا دەڕۆیشت و دەیگوت:

ـ ئەگەر رێگە و هەوا ئاوا خۆش بن، وا دەگەینەوە کاروانەکە هەر مەپرسە. گوندییەکانیش سەریان سوور دەمێنێ. ئەوە بۆ خۆت سەغڵەت دەکەی دایە. هەی هوو، تۆش تەواوی بکە ئیتر. بۆخۆشت باش دەزانی ئەو حەیوانە بەستەزمانە سەردەمی دایکە حەوای لەبیر بوو.

کمحێل ئەو دەمەی هاتە ماڵی ئێمە ئەسپێکی گەورە بوو. ئەمن هێشتا منداڵ بووم. کاك یەمەن گوتی: کوڕە هیچ ئەسپێك هێندەی ئەوە ناژیێ. تەمەنی ئەو ئەسپە لە بیست پترە.

وا خێرا دەڕۆیی کە پشووی سوار دەبوو و قسەکانی بە قەڵت قەڵت لە زاری دەهاتنە دەرێ. پێی وابوو ئەگەر شلی بکاتەوە، لەوانەیە دایکی بەزەیی پێی دا بێتەوە و زویر بێ. لەسەری رۆیی:"کە ئەسپ تەمەنی لە بیست لای دا، دەبێ حیسابی مردووانی بۆ بکەی. ئەمن دەزانم دایکە باشەکەم، ئەتۆ بۆیەم لێ زویر و تووڕەی چونکە مام خەلیلم سوار کرد."

مرێمۆك وردە وردە تووڕەتر دەبوو و بیری لەوە دەکردەوە:" زویر بووم! بەڵێ زویر بووم و دڵم شکاوە توتکە سەگ. واش دڵم شکاوە هەتا مردنێ هەتا ئەو دەمەی ئێسك و پرووسکم لە گۆڕدا دەرزێن، ئەگەر لەبزم دە لەبزت گەڕا، ئەمن مرێمۆك نەبم. تەنانەت بۆ تاقە ساتێکیش چییە، شیر و ژەکی ئەو مەمکانەمت لێ حەڵاڵ ناکەم عەلی. ئەی "عەلی"یەدرێژ. بە بە سەوانەی بەستەڵەکی زستانێ هەتا کەڕەی بەیانی لانکەتم رادەژاند و قوونە بەگووەکەتم دەشوشتەوە. بۆ ئەو شەوانەی هەتا سپیادی بەیانی لەبەر تۆ بەخەبەر ماومەتەوە و بۆ هەموو ئەو سۆز و خۆشەویستیانەی پێم داوی، گەردنت ئازا ناکەم. بە زنجیرەکەی مالیکی دۆزەخێوە کە لە ملتی دەکا، دەچیتە جەحەندەمێ، ئەی "عەلی"یە درێژ. مەگەر لە مەلاکانت نەبیستووە کە موشکولۆزمەی دایك و باوك بوون یانی چی "عەلی"یە درێژ؟ ئاوری جەحەندەمت نەبیستووە؟"

عەلی لەسەری رۆیی:

ـ ئەگەر مام "خەلیل"یش سوار نەبایە هەر دەمرد. وای سەیر کردم کە.... "خۆزگە کوێر بوایە و سەیری نەکردبای. لە خۆوە خۆت ماندوو مەکە "عەلی"یە درێژ. ئەمن هەتا زیندووم قسەت لەگەڵ ناکەم."

ـ خۆم پێ نەگیرا. چۆنت خۆ پێ دەگیرا... پیرەمێردە زۆر شپرزە بوو. بۆ تۆ نەتدی چۆن بوو دایە گیان... خۆمم پێ نەگیرا و سوارم کرد. ئەدی دایە گیان."

بەو هیوایەی دڵی دایکیی چا کردبێتەوە، ماوەیەك بێدەنگ دەمایەوە و گوێی هەڵدەخست بەشکم لە دواوەی گوێی لە دەنگێك بێ. بەڵام بچووکترین دەنگێکی لە دایکییەوە نەدەبیست. مەتەقی لێوە نەدەهات. عەلی ئەگەر هەستی بە گەرمای لەشی ئەو نەکردبا لەسەر پشتی خۆی، پێی وا دەبوو مردووە.

" شیرە سپیەکەمت لێ حەڵاڵ ناکەم. لە خۆوە خۆت ماندوو مەکە. یەخەمم دادڕی "عەلی"یە درێژ تووك ئاهی دایك زۆر سەختە. هەرچی بکەی منت پێ قایل ناکرێ. دڵ وەك شووشە وایە. کە شکا، ئیتر جێی خۆی ناگرێتەوە، "عەلی"یە درێژ. ئەگەر بە کوڵ نەك بۆ

چوکووراوا بەڵکو بمبەیە مەکە و مەدینەش و زیارەتی حەجیشم پێ بکەی، ئەگەر هەموو پشتت داماڵکێ و بنی پێیەکانت بلۆق بکەن، دیسان دڵمت پێ چا نابێتەوە. ئەتۆ ئەسپەکەمت، یادگارییەکەی برایمی منت کوشت "عەلی"یە درێژ. ئەمنت کردە سۆدرەی عالەمێ."

ــ چ خراپەیەکم لەگەڵ کردووی ئاوا دەکەی، بە قوربانی ئەو تیتکەت بم دایە.

"خۆت ماندوو مەکە. قسەم لێ نابیستی. بە قوربان و سەدەقەم نا ئەگەر لەبەریشم بمری هێشتا لەبزم دە لەبزت ناگەڕێ.

ــ ئاخە من چووزانم مام خەلیل سوار بێ، ئەسپەکە دەمرێ.

"ئەو مام خەلیلە پیرەشترین مرۆڤی سەر ئەو عەرزەیە. ئەگەر دەست بۆ زێڕیش بەرێ، دەبێتە بەرد. چۆن تۆ مام خەلیل ناناسی "عەلی"یە درێژ؟ نازانی بابت بە دەستییەوە چیی چێشت؟ چما ئەمن تۆ ناناسم عەلی؟ ئەتۆ بەس بۆ خۆنواندنی مام خەلیلت سواری ئەسپەکە کرد. سوارت کرد و ئەسپەکەت کوشتم... ویستت بڵێن، بارەقەڵا عەلی چەندە کوڕێکی باشە. رۆڵە پیاو دەبێ بۆ دایك و ماڵ و منداڵی خۆی باش بێ جا خەڵك بارەقەڵای بۆ بڵێن."

ـ دایە، ئەسپەکە هەر پرزەی لێ براببوو. لە ئاواییش دەمی لە هیچ نەدەدا. بۆچی مردنەکەی دەخەیە ئەستۆی ئەو پیرەمێردە لێقەوماوە دەستەوستانە؟"

ــ دەستەوستانە؟ دەڵێن پشیلە حەوت گیانی دەبەر دایە*. دەستەوستانییەکەی لە من بپرسە. لە من بپرسە هونەرەکانی ئەو سەردەستەی چەت و رێگرانە. ئەو عومرێك خویناو و زووخاوی بە بابت هەڵێنا. چما تۆ ئەوانە نازانی، کاکە "عەلی"یە درێژ؟"

ــ وەڵڵاهی دایە هەر وا بوو. ئەتۆ خراپ بیر مەکەوە. ئەمن بە کۆڵمتدا دەدەم و دەفرم. شوکری خوای هێز و تینەکەم هەیە.

"بمبە سەر کلەکەی جەحەندەم. هەی کافر. مەپاڕێوە. لە خۆوە خۆت ماندوو مەکە "عەلی"یە درێژ. ئەوە تۆ بووی لەگەڵ مام خەلیل رێك کەوتی. ئەتۆ بووی ئەسپەکەمت کەوڵ کرد. یادگارەکەی برایمت کەوڵ کرد."

عەلی هەر دەهات و شل دەبۆوە. هەتا شلتر دەبۆوە، دڵی توندتر دەبوو. شیبا** هەڵی- کردبوو و ئەستێرە تریفەیان داویشت. بایەکە بۆنی سوێسنی وشکی لەگەڵ خۆی دێنا. تاڵ تاڵ.

---

* دەقە فارسییەکە نووسیویێتی: دەڵێن پەرەسێلکە مەرگی نیە و نامرێ. بەڵام ئەمن بۆیە ئەودم لەجێی دانا، لە کوردەواریی خۆماندا بە یەکێکی گیان سەخت بێ دەڵێن:"وەك پشیلە وایە حەوت گیانی هەیە و نامرێ."

** شیبا: بای شەوێ

عەلی شەلاڵی ئارەقە بوو. خۆزگە دەیتوانی برێك دانیشێ و پشوویەك بدا.. نەدەکرا. کزە بای پاییزی وەك چەقۆ ئێسکی دەبڕی. ئەو بایە یای ئەو کێوانە نییە. لە دوورەوە، لە پێدەشتەکەی خوارەوە، لەو پێدەشتە قاقڕەوە دێ و بەرەو چوکووراوا دەچێ. پیاوی ئارەقەکردوو بێت و ڕاوەستێ و لەو سەرمایەدا پشوو بدا، کۆخەڕەشەیەکی پێوە دەنووسێ تا هەتایە راست نەبێتەوە. ئەگەر ئاگریش بکاتەوە و خۆی گەرم بکاتەوە زۆری پێ دەچێ.

بەلام پشت و ملی کە مرێمۆکی پێوە هەڵواسرابوو زۆر دێشان و بنی پێی دەبرژانەوە. بۆنی سوێسن..ز لە دوورەوە دەنگی خشەخشی گەلای دارێکی گەورە و خوڕەی ئاو دێ. منداڵەکان وەك تارمایی شان بە شانیان ڕێگە دەبڕن.

عەلی کە لە کەلێك وەسەر کەوت، هەستی کرد بڕستی لێ بڕاوە. دایکی لەسەر تاوێرە بەردێك دانا.گوتی:

ـ دایە گیان سەرماتە. پشتت لە بایەکەیە. بایەکەش دەڵێی سەهۆڵە.

دەست و قاچی مرێمۆك سڕ ببوون. خەریك بوو بیبەستێ.

ــ با ئاگرێکت بۆ بکەمەوە برێك گەرم بیەوە. دوایی دەڕۆین.

"ئەگەر ئەسپەکەم زیندوو بایە، نە سەرمام جەبوو نە ئاواش بەو شەوە لێم دەقەوما. وەجاغت کوێر کردمەوە "عەلی"یە درێژ. ماڵوێرانت کردم. لەپاش وی من دەمرم. گیانم دەبەردا نەماوە، هەر بە فوویەك لە جەستەم دەچێتە دەرێ. فوویەکی لێ بکە عەلی، ئاخ هەی کافری کافران ماڵت وێران کردم.

ـ وەرن منداڵینە لەو دەوروبەرانە پووشکە کۆ بکەنەوە، دایەگەورەتان سەرمای بووە.

ئارەقەکەی پشتی عەلی خەریك بوو سارد دەبۆوە. هەر بۆیەش نەدەبزووت. کوڕەکە باوەشێکی پووشکە هێنا و لەبەردەم دایە گەورەیدا داینا. عەلی شقارتەی لە گیرفانی هێنابووە دەرێ، دایگیرساند. پووش و پەلاش و پووشکە دەمودەست ئاگریان گرت. کچەش هێنای. عەلی ئەوەی کچەکەی هێنابووی خستیە سەر ئاگرەکە و کە زانیی ئاگرەکە دەکوژێتەوە خۆی هەستا و بۆ کۆکردنەوەی دار و پووشکە لە جادەکە پەڕیەوە. هەر دار و پنچکێکی بەر پێی دەکەوتن کۆی دەکردنەوە. هەتا گەڕایەوە منداڵەکان ئەوەندەیان لە دەوری ئاگرەکە کۆ کردبۆوە پێی سەیر بوو. دایەگەورەیان بە سۆزەوە سەیری کردبوون و لە دڵە خۆیدا گوتبووی:"ئەگەر منداڵی "عەلی"یە درێژ نەبوایەن، زیاترم خۆش دەویستن. "ڕۆڵەکانم"، لە داخی بابتان دڵم بەرایی نادا پێتان بڵێم "ڕۆڵەکانم". ئەی "عەلی"یە درێژ، ئەی دوژمنی ماڵ و منداڵەکان و

بووکەکەی من. ئاگر بکەوە. چیی لە دەستت دێ بیکە. لەو دنیا بەو دەستانەم بەرۆکت دەگرم و لە هەنتەشی خودایدا دایدەڕم. دەڵێم، ئەوەم بۆ بخەنە سەر کلەکەی جەحەندەمێ.”

عەلیش دانیشت و لاقەکانی بەملاولای ئاگرەکەدا راکێشا.”

ـ دایە برێك بەرەو ئەو لایە وەرسووڕێ، پشتت بەستوویەتی. ئەمڕۆ شەومان بەسەردا هات. ئیتر نابێ... لەمەودوا نابێ وامان لێ بێ. چما وەك بای شەماڵ نەمگەیاندیتە ئێرە؟ ئاواش دەتگەیێنمە چوکووراوا.

چیی ئارەقەکەی ساردتر دەبۆوە، جەستەشەی وردە وردە شل دەبۆوە. و چیی جەستەی شلتر دەبۆوە، لە ناخیەوە زیاتر هەستی بە ماندوبوونەکەی دەکرد. پێی وابوو قەت ناتوانێ لەجێی خۆی ببزوێ.

مانگ خەرمانەی دابوو. سەرمایەکی وشك هەڵیکردبوو. لەدوورەوە دەنگی چرکەچرکێك دەهات. عەرزەکە لەو سەرما وشکەدا درزی دەبرد. وەك گۆزەیەکی کە باش سوورەوە نەکرابێ و لە نێوەڕاستەوە دەقەڵشێ. منداڵەکانیش پاڵیان وەیەکتری دابوو و وەك بڵێی دەیانەوێ بچنە نێو ئاگرەکەوە، لێی چووبوونە پێشێ. کوڕەکە گوتی:

ـ بابە، پیاو کە رادەوەستێ زیاتری سەرما دەبێ. کە دەڕوا وەك ئاگر سوور دەبێتەوە.

عەلی هیچ حەزی لێ نەبوو هەستێ.

ـ دایە گیان، دایکە باشەکەم، ئیتر سەرمات نییە؟ گەرم بوویەوە؟ ئەو دەمەی هاتمەوە بە بووکەکەتم گوت، کچێ ئێمە بەو سەرمایەدا دێین، هەتا دەگەینێ ترخێنەکە وەسەرنێ، با وابێ کە گەیشتینێ هەڵمی لێ هەستێ. هەڵمێکی وای لێ هەستێ کە... کاتێك دەگەینە ئەوێ لە بن دارگویزە پیرۆزەکە و... دارە پیرۆزەکە شانس و بەختی پێوەیە.

“حەول مەدە عەلی، ئەگەر شیری باڵندەشم بۆ پەیدا بکەی، ترخێنە سەهلە، شیری مریشك و باڵندانیش ناخۆمەوە. قەت قەت دڵم لێت پاك نابێتەوە. شکا... ورد و خاش بوو... ئەو دڵە...”

ـ کەرەی بەیانی وەڕێ دەکەوین. هەر ئەو کێوە رەشە ببڕین، ئیتر بۆنی چوکووراوا، بۆنی گەرمی چوکووراوامان بۆ دێ. گەرم گەرم... ئەوە بۆ هیچ نالێی؟ بۆ قسە ناکەی دایە گیان؟ دەزانم دڵت شکاوە. کەحێلەت زۆر خۆش دەویست. یادگاریی باوکم بوو. بەڵام خۆ ناکرێ لەبەر مردووان بمری دایە. ئەگەر خوا ویستی و ئەمساڵ لۆکەی زۆرمان بۆ کۆ کرایەوە، گوێدرێژێکت بۆ دەکڕم. گوێدرێژێکی پەل ئەستوور... گوێدرێژی قوبرسی. جا سواری بە. هەر وەك بەسەر عەرزێکی رێکدا بەرێدا بڕۆی، بە دوو رۆژان بگە چوکوور...

“قسە ناکەم. بشمرم قسە ناکەم. دوای ئەوەی ئەو کارەت لەگەڵ کردم. لاڵ دەبم و زارم ناکەمەوە. دەمرم و وەسیەتیش دەکەم عەلی نەیەتە سەر گۆڕەکەم. دەستی وەکێلەکانم نەکەوێ.”

ــ سەیر کە دایە گیان. منداڵەکانیش گەورە بوونە. ئەمساڵ منداڵەکان پتر لۆکە دەڕنەوە. وا نییە حەسەن؟...

ــ وەڵڵاهی دایە گەورە ئەوەندەت لۆکە بۆ دەڕنمەوە پێت سەیر بێ. لەگەڵ تاریک و روونی بەیانی هەڵدەستم. ئۆمەخانیش لەگەڵم هەڵدەستێ.

کچە بە دەنگە ناسکەکەی گوتی:

ــ نیوە شەو... وەك کچەکەی کۆستوئۆغلو شەوێ هەڵدەستم و لۆکەی دەدزم.

ئاگرەکە کوژایەوە. "عەلی"یەك دوو باوەش پووشکەی خستەوە سەری و ئاگرەکەی هەڵیساندەوە. ئیتر ئاوردوو نەما. منداڵەکان چوونەوە و پووشکەیان هێنایەوە.

عەلی هەر جارەی تەکانی لە خۆی دەدا بەڵام نەیدەتوانی هەستێ. تا گەرمتر دادەهات لەشی شلتر دەبۆوە.

ــ گوێدرێژەکە دەبێتە هی خۆت دایە. جگە لە خۆت کەس ناتوانێ دەستی بۆ بەرێ. کەیفت هێنای هەموو خەڵکی گوندیی سوار دەکەی و حەزت لێ نەبوو نایەڵێ کەس لێی بچێتە پێشێ، تەنانەت مێشێکیش.

مرێمۆك لە تەنیشت کوچکاورەکە بەسەر ئاگرەکەدا نوشتابۆوە. چیی وای نەمابوو سەری لە ئاگرەکە بچەقێ. دەموچاوی دیار نەبوو. بڵێسەکان لەچکە سپییەکەیان دەلستەوە.

ــ ئەگەر ساڵێکی دی گوێدرێژێکم بۆت نەکڕی ناوی خۆم دەگۆڕم. بە قەرز و قۆڵەش بێ تەنانەت ئەگەر لەبەر عادیل ئەفەنیش پاڕابێتمەوە، گوێدرێژێکت هەر بۆ دەکڕم.

"پێت ناکڕدرێ. بشیکڕی، دڵی منت پێ وەك خۆی لێ ناکرێتەوە. ئەمن ئیتر خەریکە دەمرم. پێت ناکڕدرێ. قەرزەکانی خۆتت پێ نادرێتەوە. قەرزی دە ساڵەی بابت لە دەفتەرە زەردەکەی عادیل ئەفەنیدا لەسەر یەك کەڵەکە بووە "عەلی"یە درێژ. پێت ناکڕدرێ. ئەمنیش ناگەمە چوکوور دەمرم. لە داخی تۆ دەمرم. دیتت ئەسپەکەم چۆن مرد؟ رۆحی هەڵفڕی و چووە بەهەشتێ. چەندە ئاسان مرد. دەستەکانی لەبەر یەك کێشانەوە، ئەگەر سەری نەکەوتبایەتە سەر عەرزەکە هەر نەتدەگوت مردووە. ئەگەر نەشمرم، ئەمن ئەمساڵ ناتوانم لۆکەت بۆ بڕنمەوە..."

رادەسپێرم کورتانێکی نەرمیش بۆ گوێدرێژەکەت بە دروستکردنێ دەدەم.

منداڵەکان لە تەنیشت ئاگرەکە خەونووچکە دەیبردنەوە. زۆر لە مێژبوو دانیشتبوون. شەوگار شەق ببوو. لە دوورەوە دەنگی زەنگوڵەی ئێسترێك هات و بڕایەوە. شەو کپ و خامۆش بوو. مانگ داکشا بوو. دەتگوت دەیەوێ ئاوا بێ. ئێستا لەوانەیە لەسەر چوکوور بێ. بڕێك لەولاترەوە بەردێك وەکو سپێدارێك قیت راوەستابوو. ئاخۆ ئەوەی پێی دەڵێن "بەردە بووکێ" هەر ئەوەیە؟

عەلی دیسان لەخۆی نووسا. نەیتوانی هەستی. یان نەیەویست. بە دڵنیاییەوە ژنەکەی نیگەران دەبوو."باشە چاکم کرد ژنێکم بە تاقی تەنێ لەو چیا و چۆڵەدا بەجێ هێشت و هاتم؟ خۆزگە لانیکەم منداڵەکانی لەلا بوایەن. کێ کاری بەو پیرەژنە بوو. هەتا دەگەڕامەوە سەبری دەگرت. ئاگرێکیشم لەبەردەمی هەڵدەکرد. منداڵەکان دەبوایە لای دایکیان بوایەن. هەر واش راستە. ئەگەر ژنە بە تەنێ تووشی یەکێك بێ یان یەکێك پڕی بداتێ، جا وەرە و نامووست رزگار بکە... خۆ نامووس گیای ورچ نییە... کچی خەڵکی تێدا دەچێ. بڵێی ئێستا چ بکا؟...

ـ یاڵڵا دایە. با هەستین وەڕێ بکەوین. حەساینەوە.

گوتی: با هەستین، بەڵام دیسان نەیتوانی لە جێیەکەی خۆی ببزوێ. دەتگوت دەست و لاقەکانی پێوەی نین. شتێك قورگی رێك دەگوشی. مرێمۆك چیی نەمابوو لە داخانا بتەقێ. هەر قسەیەکی عەلی دەیکرد ئەوی تووڕەتر دەکرد. قسەیەکی دیکە و دیسانیش تووڕەبوونێکی پتر.

"هەستە وەڕێ بکەوە، بکوژەکەی من، تۆ کوڕم نی، تۆ قاتڵی سەرمی. ئەگەر من مردم دەبێ بەرۆکی تۆ بگرن. بڵێن ئەو هەتیوە درێژە دایکەکەی خۆی...لە پێشدا ئەسپەکەی و دواییش ئەوی کوشت. دەبێ تووك و دوعایەکت لێ بکەم "عەلی"یەدرێژ... تووك و دوعایەکت لێ بکەم... ببیتە تۆزی بانان... بەڵام، ئاخ چ بکەم دایکم دایك. زمانم ناگەڕێ تووکت لێ بکەم، دەستەکانم بەرەو ئاسمانێ هەڵێنم و بڵێم خوایە، خوا خۆشەویستەکەم، ئەو "عەلی"یەدرێژەش وەك ئەسپەکەی من بکوژە با قەل و داڵ گوشتی بخۆن. وەڕێ بکەوە و بڕۆ بۆ جەحەندەمێ."

عەلی دەستە گەورەکانی کە قامکە درێژەکانی دەتگوت شمشاڵن لە سەری عەرزەکە دانان. ماوەیەك هەروا خۆی دابووە سەر دەستەکانی. ئاگرەکەی بەردەمیشیان دامرکابۆوە و خۆڵەمێش داپۆشیبوو. بە زەحمەت هەستایە پێ، دایکی بەرز کردەوە و وەریسووڕاند و گوتی:

ـ دەی منداڵینە، وەڕێ کەون.

منداڵەکان وەنەوزیان دەدا. عەلی لەبەردەم دایکیدا دانیشت. ترسی وەی بوو نەکا نەتوانێ هەستێ. دەستەکانی گرت و کێشایە سەر کۆڵی. تەکانێکی لە خۆی دا. یەکەم جار نەیتوانی هەستێتە سەرپێ، تەکانێکی دیکەشی لە خۆی دا. سێهەم جار قیت بۆوە بەڵام وەخت بوو بە دایکییەوە وەعەرزی بکەون. دایکی وا قورس ببوو کە عەلی پێی وابوو بارە قورقوشمیان لێ ناوە. ترسی ڕێتێشت و بەخۆی گوت:"ئەو ترسە بەرۆکی پیاو بەر نادا. ترس پیاو لە دەست و پێ دەخا. نەکا لێرە بکەوم. هەر لێرە بکەوم و بمێنمەوە و لە خۆ بچم. .. ئەو کات با بزانم چۆن قسەم لەگەڵ ناکا.

هەر دەهات و تووڕەتر دەبوو. تووڕەییەکە تینی زایتر ودبەر دەنا و مریەمۆك سووکتر دەبوو منداڵەکان لە پێشەوە و ئەوانیش لە دواوە ماودیەك بەبێ دەنگی ڕێیان بڕی. مریەمۆك نەوەندەی برسی بوو وەخت بوو دڵی لەبوورەوە بێ. وەبیری هاتەوە کە دەمێکە دەمی لە هیچ نەداوە. ئەو ترخێنەیەی هاتە پێش چاوی کە بووکەکەی لێی دەنا. گەرم بوو و هاڵاوی لی هەڵدەستا. بۆی لە قاپێکی مسیی کردبوو کە تازە زرینگابۆو و بریقەی دەهات.

دەستەکانی چیتر هێزیان دەبەردا نەمابوو کە نێوشانی کوڕەکەی بگری. ئەگەر پەنجەکانی ڕەوبیانەوە و دەستی لە شانی بەربوویا، ئیتر خۆی پێ نەدەگیراوە. هەر بۆیە قامکی لێك گرێ دابوون.

عەلی بڕێك رادەوەستا، پشوویەکی دەدا و دوایی بڕێکی دیکەش دەڕۆیی. جاروبارەش بە خۆی دەگوت:"دیارە بەو جۆش و خرۆشەوە بارەکانم زۆر زیاتر بردۆتە پێشەوە."

کە لاقی لە بەردێك ئاڵقا و دایکیی وەك بلێی فڕێ دابێ، بەرەوپشت بە عەرزەکە دادا، مانگ خەریك بوو ئاوا دەبوو. لە ڕێوە دانیشت و سۆڵەکانی داکەند. مریەمۆك کە بە پشتەوە بە عەرز کەوتبوو و خلۆر ببۆوە قەراغ ڕێگەکە، تەنانەت نقەشی لێوە نەهاتبوو. خۆی دابووە سەر نانیشکی راستی و چاوەکانی قووچاندبوون. گوێچەکەکانی دەزرینگانەوە. منداڵەکان خۆیان گەیاندبووە سەری و بە ترس و لەرزەوە راوەستابوون. ئەوتارماییە ئاڵۆزەی لە بەردەمیان کەوتبوو، دایە گەورەیان بوو کە وەخت بوو بیبەستێ. لە سەرمانا هەڵدەلەرزی.

عەلی پەنجە گەورەکەی لاقی کە وەبەردەکە کەوتبوو، پشکنی و دایماڵی. قاچە بەژانەکانی کردەوە نێو سۆڵە وشك و رەق و تەقەکەی. گورج قەیتانەکانی توند کردنەوە و هەستایە سەرپێ. دەستی دایکی گرت و بەرەو لای خۆی رایکێشا. لەبەردەمی هەڵترووشکا و بە هەموو تین و هێزی خۆی بە کۆڵێدا دا و دەمودەست راست بۆوە.

خەریك بوو غاری دەدا. منداڵەکان زۆر دوا کەوتبوون. دایکی کە بە کۆڵیەوە بوو، دەخزی و دەیخستەوە سەرێ. منداڵەکانی لە لاقانیان وەراندبوو* بەڵام نەدەگەیشتنە باوکیان. ماوەیەك غاری دا و غاری دا و راوەستا. ئەگەر رانەوەستابا هەڵدەخلیسکا. ژەنۆکانی دەلەرزین . لەسەرەخۆ دایکی دانایە عەرزی و پاڵی وەدارێکەوە دا.

---

*لە لاق وەراندن: واتە غاردان بە هەموو تواناوە. لە موکریان دەڵێن: هەر چاویان لێی خافڵ بوو لە لاقانی وەرێنا. یان دەلاقانی وەرێنا...

شەوێکی سارد بوو. تەنانەت ئاقڵی پێ نەدەشکا ئاگرێکیش بکاتەوە. لە ناکاو کەوتە بیر منداڵەکان. لەوەها شەوێکدا چۆن دوو منداڵی ئاوای لەو چیا و چۆڵەدا بەتەنێ بەجێ هێشتبوو؟ لە جێی خۆی دەرپەڕی و هەرای کردن:"لە کوێن منداڵینە؟ لە کوێ بەجێ ماون؟"

منداڵەکان کە گوێیان لە دەنگی باوکیان بوو زۆر دوور بوون. وەڵامیان دایەوە و دەستیان کرد بە غاردان.

عەلی کە منداڵەکان گەیشتنەوە لای، هەلینگی لە خۆی دا هەستێ بەڵام نەیتوانی. هاوکات دەشلەرزی:"چۆنە لێرە بمێنەوەوە و ئاگرێك بکەمەوە؟ بەڵام ئاخر ئەو ژنە گەنجە لەو چیا و چۆڵەدان لە نێو درندە و خشۆك و خزندە و فرندە و لە نێو جەرگەی چەتە و پیاوکوژ و ڕێگراندا... چۆن دەکرێ... ئاگرێك...

گوتی:

ـ حەسەنە، دا دەستم بگرە بزانم.

بۆخۆی پێی سەیر بوو ئەو قسەیەی بۆ کردووە:" ئاخۆ مرێمۆك گوێی لێ ببوو؟ ئاخۆ ئەگەر بیستبای بەزەیی پێی دا دەهات؟ زگی پێی دەسووتا؟ هیچ پێ دەزانێ؟

بەر لەوەی کوڕەکەی لێی نزیك بێتەوە قیت بۆوە:"گاڵتەم کرد. ویستم بزانم دەتوانی هەڵمستێنی؟"

خۆی کۆ کردەوە و دەنگی خۆی نێر کردەوە و گوتی:

ـ وەرە دایە.

دایکی بەکۆڵی دادا. دەستەکانی بەسەر لاقەکانیدا هێنا و لە پشتەوە تێکی ئاڵقاندن. مرێمۆکی چەند جارێك هەڵتەکاند و تەواو خستییە سەر کۆڵی:"وەی بابەڕۆ لەو کزە سەرمایە. پیاو دەیبەستێ. ئەو کوێستانە هەر وایە. هاوین و زستان... جوانیان فەرمووە"با و بۆرانی تۆرووس مرۆڤ کوژە.

دەنگی باڵندەیەك هەستا. کە لە جۆگەیەك پەڕینەوە، کزەبایەکی سارد ڕوومەتیانی داماڵی و تێپەڕی. دەنگی ئاو و دەنگی با نێو لك وپۆی دارەکانیان تەنییەوە. لەوشوێنەوە وا مانگ ئاوا ببوو، برە ڕووناکییەك مابۆوە.

بنی پێیەکانی دەستی کردەوە بە برژانەوە. جەرگ و دڵی بەو کزانەوە و برژانەوەیەوە دێشا. لەگەڵ هەر هەنگاوێکی دەینا، دایکی بە پشتیەوە برێك قورستر دەبوو. لاقەکانیشی باش یارمەتییان نەدەدا بۆ ڕۆیشتن. بەڵام ئیتر ڕاوەستانێك لە گۆڕێ نەبوو. نەیدەتوانی ڕاوەستێ."ئەلیفی داماو، لەو شیو و دۆڵەدا بێکەس و تەنیا لە نێو جەرگەی درندە و فرندەدا...

بەراستی جسناتی ئافرەتیش شتێکی ترسنۆکن. ئەو داماوانە لە منداڵیش خراترن. باش و میهرەبان و بەبەزەیین، وەك منداڵ. هەر هەموویان ئاوان. بە پیر و گەنجیانەوە. پیاو زگی بە هەموویان دەسووتێ. ئەو جسناتی مێینەیە باش و وەفادارن. ئەمن بۆچی منداڵەکانم لای ئەلیف بەجێ بهێشت. دایکم خۆ هیچی لێ نایە. ئەوجار خۆ پیرەژنەکان هێندەی ژنە گەنجەکان ناترسن."

دڵی لێی دەدا. سەدان دەنگی سەیر و سەمەرە لە مێشکیدا دەگەڕان. ئاخرییەکەی بە دەنگێکی کزەوە گوتی:

ــ دایکە، بووکەکەت بەو شەوە لەو چیا و چۆڵەدا ماوەتەوە. پێت وا نییە بترسێ؟ ناترسی بەڵایەکی بەسەر بێ؟

مرێمۆك بە هەموو گۆشت و ئێسك و پرووسك و بە هەموو هزر و خولیا و خەون و خەیاڵەکانییەوە، تەواو سڕ ببوو. لە ناکاو تووڕە بوو. هەموو لەشە نووستووەکەی بەخەبەر هات و جووڵا و گیانێکی بەبەردا هاتەوە و تووڕەییەکە خۆی نواند" بەڵێ بەڵێ ماوەتەوە... دیارە دەشترسێ.. دیارە بەڵایەکیشی بەسەر دێ... "عەلی"یە درێژ گیان، لە نێو گورگ و سەگەل و چەتە و ڕێگراندا.. جا چیی بەسەر نایە. ئێستا ئەو ڕێگایانە پڕن لە ڕێگر و چەتە. ئەوە تازە ئەقڵت پێی شکاوە "عەلی"یە درێژ؟ یاخوا نانی زیندووان نەخۆی. ئیشاڵلاّ ئەوەی بیری لێ دەکەیەوە وەڕاست دەگەڕێ و بەسەر بووکەکەم دێ. جا ئەو دەم با ئەمن بچمە گۆڕەپانەکەی گوندی و دە دانە زەنگوڵە وەخۆم بخەم و سەما بکەم و چەقەنە لێ دەم و بڵێم: ئەی دەر و جیران، جا گوێتان لێ بێ و پێشتان سەیر بێ. دوایی دیسان چەقەنەی لێ دەدەمەوە و سەمای دەکەم. جا با لە سایەی بێ ئەقڵیی تۆوە شتێك بەسەر بووکەکەم بێ... ئەوە تۆی ئەمنت تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە کرد. ئەتۆ ئەمنت وەك نەخۆشێك، وەك ئیفلیج و پەککەوتەیەك خستە سەر کۆڵت. لێی دە بابم ها ها لێی دە..."

ــ دایکە بووکەکەت ناترسێ. نا؟ نا بابە ناترسێ. جا بۆ بترسێ.

"هە ئەتۆ وا بیر بکەوە. وەڵڵاهی زراوی دەچێ. جگە لەو هەمووە مرۆڤە دڕندەیەی ئێستا بەو چیا و چۆڵەوەن، جگە لە گورگ و ورچ و دڕندە کە مرۆڤ لەت و پەت دەکەن، جگە لەو مردووە کفن پۆشانەی بە کێوەکاندا دەگەڕێن، جگە لەو پڵنگانەی دەنەڕێنن و ددانە تیژەکانیان دەردەخەن، جگە لەوانەش، "داری چاکی*"یش پیاو شێت دەکا. جا ئێستا تۆ وای دانێ ناترسێ. تۆ هیچ لەسەر

---

*چاك: شەخس، پیر. پیر و پیاو چاك. داری چاکی، ئەو دارەی پێیان وابووە پیاو چاکە و زۆر جاران لە شار و گوندەکانی کوردستاندا کۆنەدار هەبوون خەڵك زیارەتیان کردوون و پێیان وابووە ئەو دارانە شەخس (پیاوچاك)ــن.

جندۆکە دەزانی کە خۆت لێ دەکەنە ریزە بەردێك و وەڕێ دەکەون و هەڵدەفڕن و ئەگەر تووشی یەکێك بن دەتەقنەوە و دوایی لە نیوەی ڕێیەدا دەبنە هەمبانە و دەمێننەوە و دواییش مرۆڤ بە عەرزییەوە مەڵاس دەکەن؟ ئەتۆ حیسابی خێو و جندۆکان ناکەی؟ دەی باشە حیسابیان بۆ مەکە. بەڵام ئەوان دەبێ وات لێ بکەن تۆ واقت وڕ بمێنێ. بە تایبەتی کە نزا و پاڕانەوەی دایکیشت بەسەرەوە نەبێ... لەوەش خراپتر تووك و دووعاشی لێ کردووی. ئەتۆ باسی خێو و جنۆکانت بیستووە بەڵام بڕوا ناکەی. جا ئێستا بڕوا بکە. ئەو پیاوە بێدین و ئیمانەی ئەسپەکەی دایکی بە بەر چاوییەوە بکوژێ و دواییش کەولی بکا، باوەڕ بە چی دەکا؟ بڕوا مەکە. ئەگەر بەسەرت هات جا ئەو دەم چاك باوەڕ دەکەی. ئەگەر دیتت ژنەکەت لە بن "داری چاکی" زاری خوار بووە و شێت بووە، جا ئەو دەم وا باوەڕ دەکەی هەر نەبێتەوە. بووکە لێقەوماوەکەم، لەبەر تۆی بێ خێر و بێر... بەڵام ئەگەر ئەمن ناوم مرێمۆك بێ، دەزانم بێت و بەڵایەك بەسەر ئەو بووکەم بێ چیت لێ دەکەم. جا بۆ ئەسپەکەت کوشتم چم لێ کردی، هەتا ئەگەر بووکەکەشم شێت و فێدار بو شتێکت لێ بکەم؟... با شێت و فێدار بێ. وەی ڕۆۆۆۆ... وەڕۆۆۆ... خەریکم هەڵدەلەرزم... چەقوچۆمە... سڕ دەبم. زۆر ساردە. ئەوهەتیوە هیچی لێ نایە. ئەمن نایەڵم پشتی سەرمای بێ. ئەگەر یەکێکیش پشتی منی دا پۆشیبا و گەرمی داهێنابام، شەوێك سەهلە بگرە پێنج شەوانیش ڕێگەم دەبڕی. گورگەکان، ئەی خوایە، بە سڵامەتی بمگەیێنیتە چوکووراوا. لاق و ئەژنۆم سڕ بوون. ئەو لاقانە ئیتر بۆ ڕۆیشتنێ نابن... ئاخر پیاو دەچێ باروبنەی لە بن داری چاکی دەخا؟ ئەوە کەرێتی نییە؟ هەر بەڕاستی "موستان چاوەشی" ڕەحمەتی چیی دەگوت؟ ردێنی درێژ و سپی بوو. وەك تووکی ئاسك دەبریسکایەوە. جوان و پاك و خاوێن. پیاوچاك بوو. ئەگەر یەکێك شتێکی گوتبا و لە دڵی گران هاتبا، ئەگەر تۆزێك دڵی ئێشابا، ئەگەر شتێکی عەنتیکە و کرانبایی لە شوێنێك دیتبا، دادەنیشت و زۆرزۆر دەگریا و وەك منداڵان چڵمی هەڵدەلووشی.

دەیگوت: شەوێکی بە بن داری چاکیدا ڕەت دەبووم. تاریکەسەلاتێك بوو شیر نەیدەبڕی. با دەستی لە لك و پۆی دارەکە وەراندبوو. لك و پۆی دارەکە دەتگوت جۆگە ئاوی نێو تاریکییە. دارەکە هەموو ئاسمانی داپۆشیبوو. لەناکاو تەقەی شتێك هات.

ئاوڕم دایەوە. جەغزێکی نوور لە عەرزەوە بەرەو دارەکە دەخزی. تا نزیکتر دەبۆوە دارە گویزەکە زیاتر نوقمی نوور دەبوو و دارەکە یەکپارچە دەبووە نوور و ڕووناکایی. ئەمن لەوێ پێم بە عەرزییەوە ڕەق ببوو. پەیتا پەیتا دووعام دەکرد برێك دواتر هەموو لك و پۆ و گەڵاکان، دارەکەش سەرتاپێ وای لێ هات دەتگوت لەو تاریکەسەلاتەدا یەکپارچە لە نوور ساز کراوە. دوایی دارەکە بە گەڵا و لك و پۆوە بەرەو ئاسمان هەڵکێشرا و بەرەو چیاکانی ڕووبەڕوومان پان بۆوە. هەموو شوێنێك وا ڕووناك بۆوە دەتگوت تاو هەڵاتووە. تاریکیی چیاکان و تاریکیی شەو نەمان. ئەتۆ قەت دارێکی گەورەت دیوە لە

نێو جەرگەی تاریکیدا لە نوور ساز کرابێ و هێندەی دنیایەك گەورە بێ؟ ئەی خوایە گیان، بە قوربانی حیکمەتەکەت بم، دارێکی گەورە لە تیشك و نوور. بەرەو ئاسۆی رۆژهەلات و بەرەو ئەستێرەکان دەخوشێ. شەوێك بوو گوللە نەیدەبڕی. خوا دەزانێ تاقە ئەستێرەیەك چییە دیار نەبوو. دارەکە گەورە دەبۆو و گەورە دەبۆوە. لافاوێك لە لك و پۆ و گەلا، لافاوێك لە داری نوور بەرەو ئاسمان دەخوشی. هەتا سیوادی بەیانی داری چاکی تیشکی پژاند. هەتا رۆژ بۆوە لەوێ راوەستام و سەیریم کرد. چاوەکانم بە مۆلەق وەستابوون و خەریك بوو لەخۆ دەچووم. ئەو ئەسپەش کە سواری ببووم، ئەو حەیوانە بەفەرِەش گوێچکەکانی قوت کردبوو و سەیری دەکرد. کە لە ئاسۆگی بەیانییەوە ئاسمان رووناك بۆوە، دارە گویزەکەش بچووك و بچووکتر بۆوە و نوورەکەی کاڵ بۆوە و هاتەوە سەر عەرزی. کە خۆر کەوت، دارە بەرزەکەی چاکی،م بە لك وپۆ و گەلا سەوزەکانی و بە کۆتەرە قەڵشیوەکەیەوە لەپێش خۆم بەدی کرد کە لەسەر جێی خۆی بوو. ئەمن راستەرێ چوومە لای مەلا قاراتۆپاکلی...”

ــ چەندمان ماوە بۆ بەیانی دایە؟

“ئاخە پیاو دەچێ لە بن داری چاکی باروبنەکەی دەخا؟ پیاو لە بن دارێك کە شەوانە دەبێتە نوور و بە رۆژ دەبێتەوە دار، دادەنیشێ؟ شەوانە وەرێ دەکەوێ و دەڕوا و لە چاوان ون دەبێ. دەڕۆی و دەبینی دارەکە لەسەر جێی خۆی نییە. یەك دوو مانگ کەس بەسەر و سۆراغی نازانێ. دوایی رۆژێك دەبینی و هاتۆتەوەو لە سەر جێی خۆیەتی. پیاو دەچێ لە بن دارێکی ئاوا بار دەخا؟

ــ دایە، سەرماتە دایە؟ دەڵێی با پاڵتۆکەم داکەنم بتدەمێ لەبەرتی بکەی. ئەمن ئەوە بەردەوام ئارەقە دەکەم.

“بە ملی شکاوت بێ*. نامەوێ ئەمن هیچ شتێکی تۆم ناوێ “عەلی”یە درێژ. ئەگەر دارەکە بووکەکەمی کوشتبێ، ئاخ “عەلی”یە درێژ.”

ــ بەلام دیارە بارەکەم زۆر دوور خستووەتەوە. ئیدی کاری وا ناکەم. سوور بووم لەسەر ئەوەی لە بن داری چاکی بارەکە بخەین.”

“گوویەکی باشت خواردووە. ئەگەر بووکەکەم لەوێ دەستیان لێ وەشاندبێ چی؟”

عەلی لاقی لە دوو نەدەهاتن. بە بیانووی قسەکردنەوە پەیتاپەیتا رادەوەستا و ماندووی دەحەساندەوە. لە هەمان کاتدا چاوی بڕیبووە ئاسۆ.

---

* لە فارسییەکەدا دەڵێ: "خیر سرت": کە واتە وشەییەکەی ئەوەیە بە قوربانی سەرت بێ. بەلام ئەوە تەوس و تانووتێکە و مەبەستی ئەوەیە سەرت بخوا. وەك ئەوەی زۆر جاران بە یەکێك دەڵێین بە ملی شکاوت.

ـ مام خەلیل گوتی...

"یاخوا مام خەلیل زەلیل بێ و ملی تۆش بشکێ."

ـ.... ئەمساڵ بەرهەمی لۆکەی چوکوورواوا ئەوەندە دەبێ کەس بۆی کۆ نەکرێتەوە. هەر کەسە و بە سەت لیرەی تەواوەوە دەگەڕێتەوە ئاوایی. ئەمساڵ ئیزگیل زۆر درشت و هەراش بوو. زۆر خێراش دەڕۆیی. مام خەلیل دەیگوت: بە عومرم ئیزگیلی وەهام نەدیوە. ئەمساڵ لۆکە زۆر بە پیت و بەرەکەتە...

""جا بە تۆ چی هەتیوە.... تۆ کە ئێستا ئەسپەکەی منت کوشتووە، خەڵك کۆی دەکەنەوە و دەگەڕێنەوە ئاوایی و جا تۆ دەگەیە ئوکوور و هەمووان گاڵتە و قەشمەریت پێ دەکەن. یاڵلا بڕۆ دەی. رامەوەستە "عەلی"یە درێژ. ئەوە لە تۆڵەی ئەو کارەی کردت، بیکێشە. ئەمن هیچ زگم پێت ناسووتێ. ئەوە بۆ راوەستاوی؟ ماندوو بووی؟ خۆزگە شەو نەبایە و روخسارە تێکسمڕاوەکەت و خورەخوری ئارەقەکەتم دیتبایە "عەلی"یە درێژ. ئەوە فێر دەبی ئەو پیرە گەوادە سواری ئەسپەکەی من دەکەی و ئەسپەکەم لێ دەکوژی؟ دەی بیخۆ، تێر بخۆ دەی؟ ئەمنیش ئیشەڵلا بەسەر کوڵتەوە رەقەڵدێم و دەمرم."

ـ دەیگوت لۆکە ئەوەندە بەپیت و بەرەکەت دەبێ، چوکووراواییەکان تەنانەت نیوەشیان بۆ ناڕنرێتەوە. ئێمەش پاشەرۆکەکەی لە نێو خۆماندا دابەش دەکەین.

"ئەو قسانەی بۆوە دەکرد دڵت نەرم بکا و سواری ئەسپەکەت بێ و بیکوژێ. هەتیوە کەرەکەی من. نا، نا، "عەلی"یە درێژ کوڕی من نییە. کوڕی بەرازە.

عەلی هەر رستی ولەسەری رۆیی، بەڵام کە جوابی وەرنەگرتەوە، بە تووڕەییەوە ملی رێگەکەی گرت. بەخۆی دەگوت:" چم لێکردووە ئەوا لێم بووەتە دوژمن؟ خۆ پیاو ئاوا لە دوژمنەکەشی ناکا."

تووڕە دەبوو و ئیمانی نەدەما. راوەستا. قسەی پێ نەمابوو.

ـ لە کوێی حەسەن؟ ماندوو بووی؟

حەسەن گوتی:

ـ کوڕە ئەمن چۆن ماندوو دەبم. زۆر باش رێ دەبڕم. ئۆمەخان ماندوو بووە.

کچە گوتی:

ـ درۆیە دەکا. ئەمن هیچ ماندوو نەبوومە.

عەلی لە ناکاو لووتکەی چیاکانی دی ڕووناك دەبنەوە:

ـ خودایە گیان زۆر شوکر. خەریکە رۆژ دەبێتەوە.

سەیری پێش خۆی کرد. زۆر دوور بوو. ترسی ڕێ‌نیشت. هەنگاوێکی نا. ددانەکانی چیڕ کردنەوە. ماسوولکەی لاقەکانی لەبەر یەك کشانەوە. هیچ کوێی بۆ هیچ کوێی نەدیّشا، جێیەکی نەشی نەبوو نەکزێتەوە و نەیەشێ. دەلەرزی. وەخت بوو بکەوێ. چووە قەراغ ڕێگەکە و دایکی دانا. هەموو دنیا لەسەر سەری دەسووڕایەوە. دارێکی دی. چوو و لە بنی لێی تخێلّ بوو. پالّی بە دارەکەوە دا. هانکەهانکی بوو. دەموچاوی ڕەش داگەڕابوو و چاوەکانی دەقوولّ کەوتبوون. یەخەی کراسەکەی وا پەلە کردەوە کە چیی وای نەمابوو بیدڕێنێ. تووکی سینگی هاتبوونە دەرێ. دلۆپە درشتەکانی ئارەقە دەموچاویان خووساندبوو. پشووی نەدەهاتەوە بەر. وەخت بوو پشووی راوەستێ.

لەوێ پالّی بە دارەکەوە دا و بە زاری داپچڕاو و بە ڕوومەتی بەقوولّداچوو و بەو ردێنەوە کە مووەکانی وەك نەشتەر راست ببوونەوە، ماوەیەك جوولّەی لێ بڕا. پێی وابوو ئیدی ناتوانێ هەستێ. خۆر لە ئاسۆوە دەرکەوت و لە لووتکەی شاخەکە گیرسایەوە. ئەوجار بەرزتر بۆوە و تیشکی تاوی بەسەر هەموو ولاّتەکەدا پژاند. کە هەوا گەرم داهات، مریەمۆك تینێك لە گیانە سڕەکەی گەڕا. ویستی هەستێ و هەستا. هەنگاوێکی نا، دوایی وردە وردە وەڕێ کەوت. ئاوڕێکی لە کوڕە نیوەگیانەکەی دا و بڕێکی زگ پێی سووتا، بەلاّم بۆ ڕەواندنەوەی هەستی بەزەییەکەی چیی جوێنی لە هەگبەیدا هەیبوو، حەوالّەی وی کرد. چیی زیاتر سەیری دەکرد، پتر زگی پێی دەسووتا و تووڕەییەکەی پتر دادەمرکایەوە. بەو حالّەشەوە مریەمۆك نەیدەتوانی لەوە پتر لەوێ بێنێتەوە.

لقێکی لە دارەکەی دەم ڕێگەکە شکاندەوە. لك و گەلاّی لێ دارنی و کردییە داردەست. بۆ دواجار سەیرێکی کوڕەکەشی کرد و بە پەلە پشتی تیهەلکرد و بە کۆمەکۆمە وەڕێ کەوت و ڕۆیی. کە گوێی لەدەنگی پێ بوو، ئاوڕی دایەو و لە پتشەوە نەوەکانی دی. ئەوانیش لەگەلّی دەهاتن.

ــ وەرن، وەرن هاوسەفەرە ئازیزەکانی دایە گەورە. ئۆمەخانە چاو ڕەشەکەم. حەسەنە ڕەشیدەکەم. وەرن، دایە گەورە لەسەر سەرتان گەڕێ. یاخوا دایە گەورە بە قوربانتان بێ و لەبەرتان مرێ، ڕۆلّەکانم. خۆزگە مندالّی ئەو "عەلی"یە درێژە کافرە نەبایەن. ئای ی چۆنی کوشت، چۆن ئەسپەکەی منی کوشت. خۆزگە لە بری ئەو مارێکی ڕەشم بوایە. خۆزگە... ئەسپەکەی لێ کوشتم و ئاوا ئاوارە و دەربەدەری چیا و چۆلاّنی کردم. ئیشەللاّ "عەلی"یە درێژ ئاقیبەتت خێر نابێ.

کچە گوتی:

ــ ئیشەللاّ دایەگەورە. ئیشەللاّ. ئەسپەکەمان حەیف بوو.

هەتیوەکە نقورچکێکی تێ‌کوتا و تێی خوڕی:

ــ قوزەلّقورت، دایە گەوورە، بابم هەر بگاتە چوکوور گوێدرێژێکت لە تۆلّەی ئەسپەکە بۆ دەکڕێ.

دایە گەورە ئاوڕی دایەوە و دارەدەستەکەی راوەشاند:

ـ بێ دەنگ بە بزانم، بێ دەنگ بە تووتکە سەگ. حەوجێ بە کرینێ نییە. یاخوا ئەستۆ و گردە رانی ورد بێ و نەگاتە چوکوور. هەر دوو گلێنەی بێتە دەرێ ئەو "عەلی"یە درێژە کافرە. باشە؟...

حەسەن بە تووڕەییەوە بێ دەنگ بوو. نزیك نیوەڕۆ بوو کە عەلی لە دواوەیان گەیشتە سەریان، هەر وا کە بە قسەکردن وردە وردە دەڕۆیشتن. کە هەستیان کرد عەلی گەیشتێ بێ دەنگ بوون. بەڵام ئیدی مریمۆك تین و تاقەتی تێدا نەمابوو. عەلی دەمودەست لەبەردەمیا هەڵتررووشکا و مریمۆك خۆی هاویشتە سەر پشتی. عەلی مێشەیەکی چڕی لە پێشەخۆیانەوە پێشان دا و گوتی:

ـ بڕوانە دایە. مەگەر کانییەکەی ئاغلاما لەوێ نییە؟ ئەوچڵووکە باریك و بەرزە دەبینم، سەرچڵووکی داری چاکی نییە؟

"یاخوا هەم تۆ بەقوڕێ دا بچی و هەمیش سەرچڵووکی داری چاکی. جا فایدەی چی "عەلی"یە درێژ. ئەمنیش وەك ئەسپەکەم کەوڵ دەکەی. هەر ئەو چاوەڕوانییەشم لێتە."

کە سەری هەڵێنا، لە دوورەوە تارمایی قەڵافەتی بووکەکەی دی، رقەکەی برێك نیشتەوە.

"بووکەکەم نابینێ دەڵێی گوڵە، چڵی دارەکە دەبینێ. ئاخ، ئەتۆ چ ژنێکی باش و بەروحم و حەڵاڵزادەی، ئەلیف. بەڵام یەك عەیبت هەیە. خۆزگە ژنی ئەو پیاوە گەمژەیە نەبای. خۆزگە... من تۆم لە خۆم خۆشتر دەوێ."

عەلی لە ناکاو راچڵەکی و شادیی لە دڵی گەڕا و لە خۆشیانا هاواری کرد:

ـ دایە، دایە، سەیر کە، بڕوانە، سەیر کە، بووکەکەت وا دێ.

# ٦

لەگەڵ گەیشتنە پەنا دارە گویزەکە، عەلی دایکیی لەسەر کۆتەرە دارێك دانا. کاتێك ئەوان بەوەوە خافڵابوون ئەلیف بەرەو مەنجەڵە ترخێنەکە چوو، کە لە دویَ شەوەوە لەسەر کوچکاورەکەی دانابوو. بە پەلە ترخێنەکەی لە قاپێکی گەورە کرد. کچەکە لەو لاترەوە و لە پەنا دارە گویزەکە سفرەکەی راخستبوو. ئەلیف قاپەکەی کە هێشتا هەڵمی لیَ هەڵدەستا، هێنا و لە نێوەڕاستی سفرەکەی دانا. دوایی چوو دەستی مرێمۆکێی کە لەسەر کۆتەرە دارەکە دانیشتبوو گرت و هێنای و لەسەر سفرەکە داینا.

بانگی مێردەکەشی کرد.

ـ وەرە عەلی. عەلی راوەستابوو و هەر بەلادا دەهات. کوڕیژگەکە، بە برێك شەرم و ترسەوە دەستی بابی گرتبوو و بە بزەوە گوتی:

ــ وەرە بابە.

ئەلیف کە چاوەکانی بە مۆڵەق وەستابوون، سەیری مێردەکەی دەکرد. عەلی خۆی لەسەر پیَ نەدەگرت و دەگوت گێژ و وێژە بۆ تۆزە خەوێك. هەر چاوێکیش چییە لە سفرەکەی نەکرد. دەستی لە نێو دەستی کوڕەکەی دەرهێناو بە لاترەلاتر بەرەو نوێنەکان کە لەسەر یەك هەڵچنرابوون رۆیی. بەڕەیەکی دەرکێشا و لە لایەکەوە رایخست و لەسەری تخێڵ بوو.

ئەلیف لەسەر سفرەکە هەستا. لە نێو بار و بنەکەدا بالیفێکی گچکۆکەی چلکنی هێنایە دەریَ و سەری مێردەکەی هەڵێنا و بالیفەکەی لە بن سەری نا. لێفەیەکیشی پێدا دا.

عەلی سەری نەگەیشتبووە عەرزی، خەوی لیَ کەوتبوو. ئەلیف بەسەر سەرییەوە راوەستا. بە خەفەتەوە سەیری روخسارە رەش هەڵگەڕاو و تێکسمڕاوەکەی کرد. دەموچاوی عەلی وشك و رەق هەڵاتبوو و مووی ریشە تەنکەکەی هەر دەتگوت درووی ژیشکن دانە دانە لە روومەتی رۆچوون.

ئەلیف کە گەڕایەوە و لەسەر سفرەکە دانیشت گوتی:

ـ کوڕەکەت زۆر ماندوو بووە دایە. بەو دوو ڕۆژە دەموچاوی وەك دەموچاوی منداڵان بچووك بۆتەوە.

مریەمۆك کەوچکەکەی کە بە دەستەوە بوو لە قاپەکە خستەوە و لە ئەژنۆی خۆی ڕاکێشا و گوتی:

ـ ئۆە یاخوا لەوە خەراتری بەسەر بێ، ئەو "عەلی"یە درێژە. ئای کە خۆشحاڵم ئاوای دەبینم.

ئەلیف گوتی:

ـ وا مەڵێ دایە. خودا هەڵێناگرێ. کوڕتە. گوناح نییە؟مریەمۆك قیت بۆوە و گوتی:

ـ نەخێر هیچ گوناحیش نییە. وەختایەکی ئاقڵی لە مێشکی دا نەبێ، لاقەکانی جەوری دەکێشن. بۆ ناچار بوو مام خەلیل سوار بکا و ئەسپەکەمان بکوژێ؟ بۆ؟ بۆ؟ هەر بۆوەی خەڵك بڵێن بارەقەڵا، عەلی چەندە باشە؟...

دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردنەوە و لالایەوە:

ـ خودایە گیان، لەوە خراپتر بەسەر ئەو "عەلی"یە درێژە بێنی. ژن و منداڵەکەیت ئاوارەی چیا و چۆڵان کرد. خۆشیت وا لێ کرد. لەوەش خراپتری بەسەر بێنی. ئەی خودا گەورەکەی من. خودا گەورە و چاوڕەشەکەی من.

ئەلیف گوتی:

ـ دایە نەکەی، نەکەی، کوڕەکەت چووزانێ...

مریەمۆك هاواری کرد:

ـ بێ دەنگ بە، ئەتۆش لای ئەو مەگرە. دەبێ لەوەش خراتری لێ بێ. خراتر، داماو و دەستەشکاو بێ. ئیشەڵلا ئەمساڵ ناگاتە لۆکەڕنینەوەی چوکوور، با تەمبێ بێ. عادیل ئەفەنیش بەرۆکی بگرێ.

لەسەر سفرەکە هەستا. بە کۆمەکۆم و شەلەشەل، چووە پشت دارە گوێزەکە و نێو گژ و گیاکان:

ـ ئەمن دەمەوێ ئە لێرە بنووم. کاتی ڕۆیشتنێ هەڵمستێنن. باشە بووکە خان؟...

ئەلیف بەبێ ئەوەی گوێ بداتە لەبزە تەوساوییەکەی بە خەمەوە جوابی داوە:

ـ باشە دایە گیان.

سفرەکەی کۆ کردەوە و خستەوە نێو بارەکە. هەتا بەیانی خەو نەچووبوو چاوەکانییەوە. بە ترس و دڵەڕاوکێوە چاوەڕێیان ببوو. بانگی منداڵەکانی کرد":

ـ ئێوەش بنوون منداڵینە.

کچەکەی وەنەوزی دەدا. هەڵیگرت و بردی لە تەنیشت بابی نواندی و لۆیەکی لێفەکەشی پێدا دا. بە کوڕەکەی گوت:

ـ تۆش لەوبەری بابتەوە بنوو.

چاوەکانی لێڵی خەو بوون. مریەمۆك و منداڵەکانی و مێردەکەی لە شیرین خەوێ دا بوون. ئێستا نەدەکرا ئەویش بنوێ. لەوانەبوو ئەگەر یەکێك بە جادەکەدا رابرێ لا بدا و کەلوپەلەکانیان بدزێ. چوو و لە تەنیشت ئاگرەکەوە دانیشت. ئەژنۆکانی لەباوەش گرتن. چەناگەی لەسەر ئەژنۆی دانا و چووە فکرەوە: دە ساڵ بوو هاتبووە ئەو ماڵە هەتا ئێستا مریەمۆکی ئاوا نەدیبوو و قەت نەیدیبوو ئەو رقە و قینەی ئەمڕۆ لە کوڕەکەی هەڵگرتبوو لە کەسی هەڵگرێ. ئەوە چ رقێك بوو؟ هەر ناوی ئەسپەکە دەهات، پیرەژنە وەك شێت و فێداران هەڵدەلەرزی و کەفی هەڵدەخراند. ئەگەر یەکێك مردبایە، یان یەکێك لە منداڵەکان مردبان، مریەمۆك ئەوەندە تووڕە نەدەبوو و بە رقدا نەدەچوو. جارانی کوڕەکەی چەندە خۆش دەویست و زگی پێی دەسووتا، عەلی تاقانەکەی بوو. هەشت منداڵی ببوو و لە هەشتان ئەوەی بۆ مابۆوە. ئەگەر عەلی دەچووە جێیەك و برێکی پێ دەچوو، ئەوەندە بۆی پەرۆش و نیگەران دەبوو کە نەکا شتێکی بەسەر هاتبێ هەر خۆی دەخواردەوە. عەلیی وەك منداڵێکی دوو ساڵانە خۆش دەویست و دەیلاواندەوە. وەختایەك لە گوندەکەیان تەرزە باریبوو. مریەمۆك بە هات و هاواران داوای یارمەتیی لە هەموو خەلکی ئاواییەکە کردبوو کە عەلی لە مەزرایە ماوەتەوە و لەوانەیە دەنکە تەرزەیەك وەسەری بکەوێ. ئاخرییەکەی عەلی لە ماڵێکی ئەو سەری گوندەکەوە دەرکەوتبوو و مریەمۆك بە دیتنی لە هۆش خۆ چووبوو. ئەو رقە و قینەی ئێستا مریەمۆك لە عەلیی هەڵگرتبوو، خۆ پیاو ئاوا لە دوژمنەکەشی بە رقدا ناچێ. هەرچی هەیە لە بن سەری ئەسپێکی مردەلۆخەدا بوو. ئاوی حەیاتت بە دەمەوە کردبا نەدەگەیشتە ساڵێکی دیکە. تۆبە، تۆبە، هەزار جار تۆبە. چۆن دەبێ زیندەوەرێك ئەجەلی هاتبێ و زیاتر بژیێ؟ مەلا قاراتۆپاکلی هەمیشە وای دەگوت. ئەدی ئەو ژنە چیی دەوێ. مەگەر گوێی لە قسەی مەلا نەبووە؟ خۆ ئەو وەختەی مەلا ئەو قسانەی دەکرد ئەویش لەوێ بوو. هەر دەڵێ:"دەستەشکاوت کردم "عەلی"یە درێژ. لەو چیا و چۆڵەدا ئاوارەت کردم. یاخوا لەوە خراپترت بەسەر بێ." تۆخوا ئەوەش بوو بە قسە؟ پیاو کوڕەکەی سەهلە ئاوا تووك و دووعا لە دوژمنەکەشی دەکا؟

خەونووچکە بردیەوە.

رۆژ ببۆوە و خۆر گەییە نێوەڕاستی ئاسمانێ. سەری هەر وا لەسەر چۆکی بوو. ئاگرەکە بڵێسەی کێشا و دامرکایەوە و خۆڵەمێشی بەسەر کشا و ئەو نەیزانی. نیوە خەوتوو و نیوە بەخەبەر بوو. جۆرێك لە خەوە گورگانە. بەڵام زیاتر خەوتبوو.

بە بیستنی دەنگەدەنگ و قریوە سەری بەرز کردەوە. دیتی لە خوارەوە کاروانێکی دیکە لە گوندێکی ترەوە دێ. خەڵکێك بە ئەسپ و گوێدرێژ، بە پێیان، بە شەلەشەل، نەخۆش، دڵخۆش، خەفەتبار، بە بەردەمیدا تێپەڕین. منداڵێك دەگریا. لەو ڕێگەیانەدا منداڵە گچکەکان هەمیشە دەگریێن. شەپۆلێکی شادی هەموو گیانی تەنییەوە.

نەیدەزانی دڵی بەچی خۆشە. لە جێی خۆی هەستا و چووە دەم جادەکە. ئەو خەڵکەی بە بەردەمیدا تێدەپەڕین، تەنانەت سەیرێکیشیان نەکرد. لەم وەرزەی ساڵدا ئەو ڕێگەیانە پڕ دەبوون لە خەڵکی گوندەکان. هەتا کاروانەکە بە بەردەمیدا تێپەڕی، هەروا ڕاوەستا و سەیریانی کرد. دوایی پەژارە و بێهیواییەك هەموو ناخی داگرت. چوو و دیسان لە تەنیشت ئاگرە دامرکاوەکە دانیشت.

بیری کردەوە:"یانی لەو قافڵەیەدا ئەسپێك یان گوێدرێژێك دەست نەدەکەوت ئەو پیرەژنەی سوار کەین؟ خۆزگە عەلیم هەستاندبایە لێیان بپرسێ. هێشتاش هیوایەك هەر هەیە. کاروانەکە زۆر نەڕۆیوە.

هەستا و چوو. ماوەیەك بەسەر سەری "عەلی"یەوە ڕاوەستا و لێی ڕاما. عەلی وەك منداڵێك لێی خەوتبوو. دەتگوت هەناسە ناکێشێ. لێوی سەرەوەی بڕێك هاتبووە پێشەوە و لەگەڵ هەر پشوویەکیدا جووڵەیەکی دەکرد.

"ئاخۆ دەبێ هەڵیستێنم؟ بەسەریدا نووشتایەوە. سەبرێ پیلی گرت و گوتی:

ـ عەلی، عەلی...

ساتێك ڕاوەستا و دیسانەوە گوتی:

ـ عەلی، عەلی هەستە.

عەلی نەبزووت.

ـ عەلی هەستە، چیی نەماوە بۆ نیوەڕۆ.

عەلی قاچی ڕاستی کۆ کردەوە. دیار بوو دەیەوێ هەستێ.

ـ عەلی نیوەڕۆیە. دەبێ وەڕێ کەوین.

عەلی هەستا و دانیشت.

ـ عەلی، تۆم بەخەبەر هێنا کە...

عەلی بە پشتی دەستەکانی چاوی هەڵگلۆفین. بە داهێزراوییەوە بۆڵاندی:

ـ ها، چ بووە؟...

ـ نیوەڕۆیە. دایکت و منداڵەکان هێشتا خەوتوون. ئەگەر قەرارە وەڕێ کەوین، هەستە. ئەگەر دەشمێنینەوە، ئەوە هیچ.

عەلی گوتی:

ـ با بمێنینەوە.

ئەلیف:

ـ ئێستا تۆ وەرە قەراغ ئاگرەکە.

عەلی هەستا و هاتە قەراغ کوچکاورەکە و لەوێ ڕاوەستا.

لك و پۆی دارە گوێزە بەرزەکە بە هۆی ئەو بایەی هەڵیکردبوو، هێدی و هێور خشەخشی دەهات. ئاسمان دیار نەبوو. ئەلیف دەمی هێنایە بن گوێی عەلی و گوتی:

ـ بڕێك لەوە پێش کاروانێك بێرەدا ڕۆیی. نەمزانی هی کامە گوند بوو. دوایی بە فکرمدا هات بەخەبەرت بێنم.

عەلی لە پێشدا گوتی:

ـ دەی با ڕابردبێ، بە ئێمە چی؟

خەیاڵ بردی.

ئەلیف:

ـ هێشتاش دەنگیان دێ. پێم وایە، بڕێك لەولاترەوە لە تۆپاك تاش دەیخەن. لێرە نایخەن. لە داری چاکی دەترسن.

عەلی بزەیەکی هاتێ و گوتی:

ـ بەڵێ دەترسن. هەر من و تۆین ناترسین. بە خوای کەرن. پیاو نابێ لە شتی باش بترسێ. زەرِیان بۆ مرۆڤ نییە هیچ، بگرە خێر و بەرەکەتیشان پێوەیە.

ئەلیف:

ـ ئەگەر ڕاستیت دەوێ گوتم...

عەلی پێ کەنی، لێوەکانی باریك بوونەوە و بە گرژییەوە گوتی:

ـ ئەرێ ژنەکە ئەوە تۆ شێتی؟ ئاقڵت نەماوە؟ لەو وەرزەدا کە هەموو گوندی وەرِێ کەوتوون، چما لای ئەو گوندییە کوێستانییانە یەك سمی زیادی دەست دەکەوێ؟ ئەگەر باش سەرنجت دابنێ، دیارە دیوتە خەڵکێك بە کۆڵی ئەوانی دیکەوە بوون. نەخۆشەکان و پیر و پەککەوتەکان. دەی ئەگەر ولاغیان پێ بوایە و من داوام کردبایە دەیاندایێ. دەزانم دەیاندایێ. بەڵام لەو وەزعەدا کوا دەکرێ بچی و بڵێ:"تۆخوا کاکە ئەسپەکەت بدە من، دەمەوێ دایکمی سوار بکەم"؟ شتی وا دەکرێ؟

روخساری نائومید و تووڕە بوو. گوتی:

ـ خوا ئەو ژیانە ببڕێ.

بێ تاقەت و ماندوو لەسەر عەرزەکە دانیشت و لەسەری ڕۆیی:

ــ ئاگرەکەش خەریکە دەکوژێتەوە. چار نییە. دەبێ ئەمشەو بمێنینەوە. کاتێ باش حەساینەوە، دوایی...

ئەلیف گوتی:

ـ دوایی.... دەی باشە ئەگەر وایە باشترە ساوارەکە وەسەر بنێم.

عەلی پرسی:

ـ نان ماوە؟... یان یارمەتیت بدەم

ئەلیف گوتی:

ـ هەیە. لە هەوارگەکەی پێشوو کردوومە.

لك وپۆپ و پووشکەی کۆ کردەوە و ئاگرەکەی خۆش کردەوە.

عەلی بە لەشە داهێزراوەکەیەوە، لە تەنیشت ئاگرەکە دانیشت. ماندوو شەکەت و خەواڵوو بوو. هەر دەتگوت بەو ڕۆژە ڕووناکە مۆتەکە سواری بووە. نەیدەتوانی ببزوێ. ئەگەر لێی گەڕابایەن، هەر ئەلێرە لە تەنیشت ئەو ئاورە دە ڕۆژان دەمایەوە. بەبێ ئەوەی ببزوێ. خەوی ڕۆژ ئاوایە. خەوی بن دارە گوێز باش نییە. سیبەرەکەی قورسە و زیانی هەیە. عەلی ماندووبوونەکەی خۆی بەستۆی سیبەرە قورسەکەی دارە گوێزەکەدا دێنا. هێندێ دواتر، سیبەری تارمایی حەسەنی کوڕی بە بەرچاویدا ڕەت بوو. بڕێك لەولاترەوە پشتی تێکردبوون و لە بن پنچکێك میزی دەکرد:"هەی تووتکە سەگ، وەی وەی، ئاخر هەتیوە پیاو لە بن داری چاکی میز دەکا؟ پیاو شێت دەبێ. خوا دەزانێ شێت وخوودار دەبی. بە خودای دەبی. تووتکە سەگ. هەر بۆیەشە گوندییەکان لە بن داری چاکی نای خەن. لەبەر ئەوەیە. میزی لە بن دەکەن. لك و پۆی دەشکێننەوە. بزماری لێ دادەکوتن. ئەو دارانەش گیانیان دەبەردایە. دەست لە پیاوی دەوەشێنن و نقوستانی دەکەن. ئەگەر داری چاکی وەڕەز نەکەی، چاکەت لەرێ دێنێ. کێ چووزانێ. لەوانەیە ئەو دارە، ئەو دارە ڕازاوەیە چاکەمان لەرێ بێنێ. زۆر شتی لە دەست دێ. ئەگەر بڕێك بێمەوە سەرخۆ، لە بن ئەو دارە نوێژێکی پێنج ڕکاتی دەکەم... ئەو دارانە کەیفیان بە نوێژ دێ. لەوانەیە ئەو دارەش دڵی خۆش بێ و یارمەتیمان بدا. کێ چووزانێ... بەشکم دڵی پێمان سووتا. خۆزگە ئەو دایکەم ئاقڵی بوایە و ئەویش نوێژێکی کردبایە. خۆ ئاقڵی پێ ناشکێ. لە خۆوە سێ چوار مانگان نوێژان دەکا، بەڵام لە بن ئەو دارە بەپیت و بەرەکەتە، هەر ئاقڵیشی پێ ناشکێ تاقە ڕۆژێکیش نوێژان بکا. چۆنە پێی بڵێم. بەخوا لە داخی من بە فکریشیدا بێ، هەر لە

لاساریان نایکا. دەی با نەیکا. ئەگەر بەیانی بەخەبەر هاتم هەتا تاوکەوتنان هەر نوێژێ دەکەم. دەبێ بیکەم. خۆزگە پیاو خەوی نەهاتبایە و چاوەڕێ بوایە و دیتبایەی ئەو دارە چۆن دەبێتە نوور. چۆناوچۆن رەگەکان، ئەو رەگە درێژانەی لەو خاکە دەردەکێشێ و... و چۆن دەچێتە گەڕان و سەیرانێ. نەدی، دەبێ ئەو نوێژە هەر بکەم. دیارە دەبێ دڵم پاك بکەمەوە. وای بێ تۆزکاڵێك قین و ئێرەیی تێدا نەمێنێ، تەنانەت بیر لە بەکرە شێت و کوێخا و ژنەکەی بەکرە شێتیش نەکەمەوە. فکری لۆکە و نەسپ و قەرز و قۆڵەش لە سەرم دەراوێم. دوای ئەوەی پاکژ بوومەوە و بەتاڵ بوومەوە، ئەوکات لە هەنتەشی خودای....”

قەت نەیتوانیبوو ناخی خۆی تەواو پاك کاتەوە. لە هیچ نوێژێکدا. بەخۆی گوتبوو: با بیر لە هیچ شتێ نەکاتەوە. لە هیچ شتێکی خراپ. تەنانەت شتە باشەکانیش. بەڵام هەموو جارێ بیر و فکر هورووژمیان بۆی هێنابوو و مێشکیان داگرتبوو. هەتا کۆتایی نوێژەکەش نەیتوانیبوو خۆیان لە دەست قوتار بکا و بەو جۆرە نوێژەکەشی هیچ نەڕۆیبوو.

شەوێکی تاریك بوو. ئەو کات هێشتا بابی مابوو. لەبیری نەبوو کەی بوو و ئەو تەمەنی چەند بوو؟ وەبیری نەدەهاتەوە بەڵام شەوە تاریکەکەی بە هەموو دەنگەدەنگ و هات و هاوار و یاری و جوێنەکانییەوە لەبیر بوو. ئەو شەوە منداڵەکان خۆشاردنەوەیان دەکرد. منداڵەکان... دە پازدە منداڵ کە هەمووان رێی یەکتری دەکەوتن، یەکتریان دەتلاندەوە. عەلی ئەوەندەی را کردبوو و هەوڵی دابوو خۆی بشارێتەوە، وەك شێتانی لێ هاتبوو. لەو جێیەی خۆی شاردبۆوە، سێ منداڵ دۆزیبوویانەوە و بەسەری وەربببوون. لە پشت گیشەیەکی گەنمەشامییەوە خۆی حەشار دابوو. دەترسا. چەقۆیەکەی هەڵکێشابوو. لە تاریکییەکەدا چاو چاوی نەدەدی. منداڵەکان خشەی بزووتنەکەیان بیست و خۆیان بەسەر دا دا. لە ناکاو دەنگی بابەڕۆیەك، زانیی نووکی چەقۆکە ملی یەکێکی سمیوە. بەبێ ئەوەی متەقی لێوە بێ، رای کرد. کەس نەیدەزانی ئەو بووە، لە تاریکییەکەدا هەر ئەو نەبوو کە خۆی شاردبۆوە. ئۆکسوز مەمەد بوو بریندار ببوو. هەتیوێکی بێکەس و بێدەر بوو. ئەوەندەی بەزەیی بەو هەتیوەدا هاتەوە کە پاشی چەند مانگیش نەیدەتوانی چاو لە چاوی بکا. بن شەویلکەی چەپی ئۆکسوز بە قووڵی بریندار ببوو. ساڵێك دواتر ئۆکسوز لە گەورێکدا بە نۆبەتێ مرد. عەلی تەنانەت نەیوێرا چاو لە تەرمەکەشی بکا.

“ئاخ، خۆزگە ئەو ئۆکسوزە قەت لە دایك نەبووبا و ئەمن وەبیری نەکەوتبامەوە.”
رۆژێکیش لە دەم رووبارەکە منداڵەکان کیسەڵەکانیان دابووە بەر خڕکە بەردان. یەکێکیان قاوغەکەی شکابوو. پشتی ئەو بەستەزمانە شەڵاڵی خوێن ببوو.

“نەمدەتوانی ئەوەش لە بەر چاوم دوور کەمەوە. بە هیچ شێوەیەك بیر لە ئۆکسوز مەمەد و کیسەڵ ناکەمەوە. بە دڵێکی رووناك وەك تیشکی هەتاو، لـە بـن داری چـاکی و لـە هەنتەشـی خوای گەورەدا رادەوەستم بەشکم رۆحمێکم پێ بکا...”

“هەر بە راستی دایکم بۆ وای لێ هاتووە؟ چیی لە گیـانی مـن دەوێ؟ ئەگـەر بمرم، ئەگـەر هەر ئێستا بمرم، بڵێی بۆم بگرییێ؟ زۆر تووڕەیە. ئەڵڵاهو ئەکبەر. پیاو سەری سوور دەمێنێ. لە کۆڵمی دەکەم. دەی باشە دایك چ چاوەڕوانییەکی دیکەی لە کوڕی هەیە؟ کوڕ لەوە زیاتر چیی لە دەست دێ بۆ دایکی بکا؟ ئای خۆزگە ئەو مام خەلیلەش سندانەی لێ دابوایە. خۆ ئەسپەکە هەر دەمرد. دیسانیش لە کۆڵمم دەکرد. بەڵام ئەو کات ئاوا لێم بەقیندا نەدەچوو.”

کە چاوەکانی هەڵێنان، سەیری کرد لە تەنیشت ئاگرەکەیە و بڕێك سەری بەرز کـردەوە، کـە چاوی بە دایکی کەوت، لە خۆوە و بە دەنگێکی ماندوو گوتی:

ـ دایە، ئەمن بەیانی بەر لەوەی رۆژ بێتەوە، هەڵدەستم و لـە بـن داری چـاکی، هـەتا رۆژ دەبێتەوە نوێژان دەکەم.

“بکە، ئەگەر پێشت خۆش بوو مـانگێکی رەبەق هەموو شەوێ تا بەیانی نوێژان بکـە. چـما خوا یارمەتیت دەدا هەتیوە؟ چما، خوای گەورە بەزەیی بەو کەسەدا دێتەوە کە دڵی دایکەکەی شکاندووە و ئەسپەکەی کوشتووە و لە نێو خەڵکدا شکاندوویەتەوە؟ تۆ دڵمت پێ چا نابێتـەوە. نوێژ بکە بزانم. بەشکم خودا لە گوناحت خۆش بێ. دەروویەکت لـێ بکاتـەوە. بـەڵام تـۆ بـارت کەوتووە. ئەتۆ بەبێ رەزامەندیی دایکت کارێکی زۆر زۆر خەراپت کردووە. پێم وا نییـە خـودا باشەکەی من، خودا چاو رەشەکەی من لێت خۆش بێ... هیچ پێم وا نییە.”

ـ کە گەیشتینە چوکوور، دەست دەکەم بە نوێژ کردنێ. پێنج فەرزەکەی دەکەم.

ـ دەست پێ بکە با بزانم دەتوانێ دڵە شـکاوەکەی دایکـت چـا بکاتـەوە؟ ئەگـەر هەشـتا و هەشـت هەزار ساڵیش نوێژێ بکەی، بێت و بەقەدەر سەرە موویەك دڵی دایکت ئێشاند و دڵێت شـکاند لـە لای خودا قبووڵ نابێ. ئەگەر حەزت لێیە برۆ و لە مەلا قاراتۆپاکلی بپرسە. بە دەستی خۆت ئـەو ئەسـپەت کوشت. لەبەرت پاڕامەوە و گوتم: کوڕە ئازاکەم، لەسەرت گەڕێم، ئەو کابرا پیڕەشە سواری ئەسـپەکەی من مەکە، هەر لە داخی من سـوارت کـرد. سـەرەڕای هـەموو ئەوانـەش ئـەو پـیرە سـەیە لێـشی دام. وەڵڵاهی لەقەیەکی لە کەلەکەم دا هەر مەپرسـە، جـەرگی بـڕیم. ئەگـەر یـەکێکی دیکـەی لـێ دابـان، جەرگ و دڵم بە زارمدا دەهاتنە دەرێ. جا ئەتۆ بچۆ سەت سـاڵان نوێـژان بکـە کـوڕە گەمژەکـەی مـن. پێت وایە لە لای خودا قبووڵ دەبێ؟ نوێژەکەی تۆ و نوێژی بەکرە شێت وەك یەکن. ئای ی ی .. عـەلی. قەت قەت دڵم لێت پاك نابێتەوە.”

عەلی بە خۆشیەوە رووی لە ژنەکەی کرد و گوتی:

ــ ژنەکە، ئیدی دەمەوێ نوێژ بکەم. هەموو رۆژێ پێنج فەرزەکەی. هەر بگەمە چوکوور دەست پێ دەکەم. ئەوجار سەریشم بچێ نوێژم ناچێ.

ژنە نەرمە بزەیەکی هاتە سەر لێو و گوتی:

ــ بیکە پیاوەکە. بیکە. نوێژکردن شتێکی گەلەك باشە. بابم قەت نوێژی نەدەچوو. بۆیەش قەت تووشی تەنگانە نەدەبوو. هیچ شتێك لە نوێژکردنێ باشتر نییە.

حەسەن دەستی بە قژی ئۆمەخان داهێنا کە لە پەنایەوە دانیشتبوو و گوتی:

ــ کە گەیشتینە چوکوور بابم نوێژ دەکا. ئەمنیش فێری دوعاکان دەبم و نوێژ دەکەم.

ئۆمەخان:

ــ خۆ منداڵ نوێژ ناکەن.

حەسەن چووە فکرەوە و ئینجا گوتی:

ــ دەی ئەمنیش گەورە دەبم دوایی...

مرێمۆك گوێی لە قسەکانی منداڵەکان دەبوو. لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە:

" بیکەن، بیکەن و هەمووتان بچنە بەهەشتێ. بابیشتان کە ئەسپەکەی دایکیی کوشتووە دەچێتە بەهەشتێ. لە بەهەشتێ کۆشکی سەوز و سووریان بۆ ئامادە کردووە و چاوەرێی هاتنی عەلی ئاغان. ئێوە بکەن، داکیشتان با بکا، با ماڵەوە مریشك و سەگ و پشیلەکانیش نوێژ بکەن... تۆبە... تۆبە... هەر هەمووتان بکەن و بچنە بەهەشتێ. ئەمن ئە لێرە بکوژن و راستەرێ برۆنە بەهەشتێ... لەوێ باشترتان وەردەگرن، دواییش پێغەمبەر بانگتان دەکاتە سەر سفرەیەك. دەڵێن ئەوانە لە پێشدا ئەسپەکەی دایکیان و دواییش ئەویشیان کوشتووە و هاتوون. ئەوانە شیاوی ئەوەن لە ریزی پیاوچاکان و پێغەمبەراندا بن."

برێك دواتر ئەلیف چێشتەکەی لەسەر کوچکاورێ داگرت. لە شووشە نارەقێکدا برێك رۆنیی کردە تاوەکە و لەسەر ئاگرەکەی دانا. برێك دواتر بۆنی تاڵی رۆنە قرچ بووەکە هەستا. کە رۆنەکەی بەسەر قبوولێیەکەدا دەکرد، قبوولێیەکە قرچەقرچی لێوە دەهات.

عەلی تەواو برسیی ببوو. چوو و لە تەنیشت سفرە بڵاونەکراوەکە دانیشت و چاوەرێ ما و گوتی:

ـ ئای ژنەکە، ئەو قبوولێیە پیوازێکیشی لەگەڵ بوایە... تاقە پیوازێك... ئەلیف کە قبوولێیەکەی دەکردە قاپە بەتاڵەکەوە گوتی:

ـ لە تەختی گۆنییەکە دایە. دەرهێنانی زۆر چەتوونە.

عەلی: خۆزگە بتوانی دەریبێنی. زۆرم ئێشتیا چۆتێ.

ژنە قاپەکەی لە نێوەڕاستی سفرەکە دانا و چوو زارکی گۆنییەکەی کە بە دارە گویزەکەوە دابوو، کردەوە و قۆڵی هەڵماڵی و دەستی بردە تەرکی گۆنییەکە و ئارەقەکردوو، پیوازەکەی دۆزییەوە و هێنایە دەرێ و سەرکەوتووانە گوتی:

ـ ها پیاوەکە...

ئەوجار هات و لە تەنیشت مێردەکەیەوە لە سەر سفرەکە دانیشت.

مریمۆك و منداڵەکانیش دانیشتبوون و ملیان نابوو لە خواردنێ.

عەلی کە بە مشتەکۆڵە پیوازەکەی ورد دەکرد، لە پشتەوە گوێی لە تەپەی پێیەك بوو. ئاوڕی دایەوە.

ـ سڵاوتان لێ بێ. خوا زیادی بکا.

عەلی بەسەر سووڕماوییەوە وەڵامی دایەوە.

ـ سڵاو لە خۆت. سەلامەت بی. فەرموو براکەم.

کابرا توورەکە پێستە بزنەکەی لە کۆڵی داگرت و لە تەنیشت کوچکاورەکەی دانا و خۆشی لەوێ دانیشت. ـ عەلی بڕێك خۆی کۆ کردەوە و بە بزەیەکەوە گوتی:

ـ فەرموو برالە. فەرموو پارووە نانێکمان لەگەڵ بخۆ.

شادییەك لە دڵی گەڕابوو. کابرا بەبێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، وەك قسە لەگەڵ خۆی بکا گوتی:

ـ نۆشی گیانتان بێ. خوا بەرەکەت بە سەر سفرەتاندا ببارێنێ. زۆر ماندوومە. ئیشتیام لەهیچ نییە.

عەلی ویستی هەستێ و بە پێدا گرییەوە گوتی:

ـ وەرە برالە. بەشی هەمووومان دەکا. زورە وەرە. چۆن دەبێ برسی بی. خۆ شکوور نەهاتوویە ماڵی هەتیوان. ئەلحەمیلا...

کابرا دەستی لەسەر عەرزەکە دادا و هەستا. باڵایەکی بەرزی هەبوو، چوار شانە و کەپۆیەکی قەپۆز بەرانیی هەبوو. هەر دانیشتە سەر سفرەکە، پارووەکی گەورەی کرد. عەلیش لەو پیوازەی وردی کردبوو، لەتێکی بۆ راداشت. کابرا گوتی:

ـ هیچ شتێك نابێتە پیواز. لە نێو خواردنەکاندا یەك پیواز و دوایش خوێ. بە رای من سفرەی بێ پیواز، هەر سفرە نییە.

عەلی: ببوورە، ناوی شەریفت؟...

کابرا بزەیەکی هاتێ و گوتی:
ـ پێم دەڵێن کۆرلوو عوسمان. خەڵکی گوندی "یانیق ئۆغلان"ـم. دەچمە لۆکە رنین. ئێوەش؟ ها؟ ... خەڵکی کام گوندن؟
عەلی ناوی خۆی و گوندەکەیان گوت. عوسمان دیسان پرسیی؟
ـ کاروانەکەتان دوا کەوتووە؟
عەلی گوتی:
ـ نا لە پێشەوە رۆیوە..
دەیویست قسەیەکی بکا. بەڵام مرێمۆك قسەکەی لە زاری قۆزتەوە و بۆی لە بنی کوولەکە دا. عەلی سەری سوور ما. عوسمانۆکیش...
عوسمانۆك کە گوێی دەدایە قسەکانی ئەو، خەریك بوو بگرییێ. مرێمۆك لە نێو قسەکانیدا لەسەر یەك دەیگوت:
ـ ئای براله. تۆ منداڵت هەیە؟ براله، مێداڵ گەورە دەکەی، لە سیبەری دا بحەسێیەوە، بەڵام ئەو دەتکوژێ.
هەژابوو. لە چاوترووکانێکدا، مەرگی ئەسپەکە و سەرما و، سڕبوون و پێلەقە و زوڵمی مام خەلیلی هەر هەمووی بۆ گێڕایەوە. دواییش وا ماندوو شەکەت بوو وەك بڵێی لە بەیانییەوە هەتا شەوێ بە کۆڵ بەردیان پێ کێشابێ:
ـ ئەدی، براله، بۆیە لەو چیا و چۆڵە، لە نێو خێو و پەری و دڕندە و فڕندانـدا بێکەس و بێدەر مامەوە.
عەلی وا تەریق ببۆوە نەیدەتوانی چاو لە چاوی عوسمان بکا. مرێمۆك وای لەسەر رۆیبوو، وەك بڵێی عەلی بە ئانقەست، هەر بۆ ئەوەی ئەو ئاوارەی چیا و چۆڵ بێ، ئەسپەکەی بە دەستی مام خەلیل لێ کوشبتوو.
دوای نان خواردنێ، عەلی دەستی عوسمانی گرت و بڕێك بردییە ئەولاترەوە و بە سرتە پێی گوت:
ـ ئەرێ براله، بەڕاستی بڕوات بە قسەکانی دایکم کرد؟ تۆخوا پیاو ئەسپەکەی دەکوژێ بۆ ئەوەی دایکی سەرگەردانی چیا و چۆڵان بکا؟ ئەسپەکی دەکوژێ و دوایی خۆی وەك گوێدرێژ دایکی بە کۆڵ هەڵدەگرێ؟
عوسمان بزەیەکی هاتێ و داهاتەوە و بە سرتەیەك بە عەلیی گوت:
ـ نا، براکەم، چۆن بڕوا بە شتی وا دەکەم؟ بۆ من پیرەکان ناناسم؟ وەك منداڵی ساوایان لێ دێتەوە.
هاتنەوە قەراغ ئاگرەکە و شان بە شانی یەك دانیشتن.

عەلی کەیفی بە عوسمان هاتبوو. ئەو لە قوولایی دڵیەوە پێ دەکەنی. ئەوانەی ئاوا پێ دەکەنن، زەرڕیان بۆ کەس نییە.

شادییەك لە دڵی عەلی گەڕا. لە عوسمان ورد بۆوە. چاکەتەکەی نوێ بوو. باشترین جۆری قاچاغ بوو. هەموو کەس شتی وای پێ نەدەکڕدرا. ئەو تروسکەی هیوایە ساتێك کوژایەوە:"ئای لەو چاکەتە جوانە..." دوایی لە چاکەتەکەوە نیگای چووە سەر روخساری عوسمان: چاوە رەشەکانی نوقمی خەم و پەژارە بوون. لێوە سوور و ئەستوورەکانی بەزەییان پێوە دیار بوو. روخسارە ئەسمەرەکەی جوان و میهرەبان بوو. عەلی دیسانیش هیوادار بۆوە. بەخۆی گوت:"دەکرێ داوای هەموو شتێك لەو پیاوە بکەی." کە چاوی بە زنجیرە زیوەکەی سەر سینگی کەوت، سەری سوورِ ما. دیسانیش رەنگی گۆڕا و نوقمی هیوا بوو. چاوەکانی بڕییە ناگرەکە و چووە فکرەوە. دوایی سەری بەرز کردەوە و سەیری چاوەکانی عوسمانی کرد. چاوە رەش و درشتەکانی عوسمان تروسکەی شادییان لێ دەبۆوە. بەخۆی گوت:"دەی باشە، با زنجیری زیوی هەبێ. دەی جا چییە؟" دوایی سەیری لاقەکانی کرد. کالە چەرمیە خاوەکانی شڕ ببوون. عەلی بە خۆی گوت"پێی دەڵێم. دەی جا چییە. کالەکانی زۆر کۆنن. کالە زیادییەکانی دەدەمێ با لە پێیان بکا. ئەو گۆی زەوییە قەت بێ چاکەکار نابێ. کراسەکەشی کۆنە. زۆریش چلکنە. ئێستا پێی دەڵێم. دیارە تەواو دڵی خۆش دەبێ و قبوولی دەکا." نەیدەتوانی چاو لە زنجیرە زیوەکەی و چاکەتە قاچاغەکەی هەڵگرێ. تا بێ هیوا دەبوو، چاوی لە چاوە شاد و زیتەکانی عوسمان دەبڕی. دواییش نەیدەتوانی سەیری کالەی شڕ و کراسە چلکنەکەی بکا. دڕدۆنگ بوو:"بیڵێ یان نا؟"

چاوی لە چاوی هەڵنەدەگرت. ئەو چاوانە غیرەتیان وەبەر دەنا. چیی چاوی لێ دەکرد هیوادارتر دەبوو. ئاسان بوو. هات بڵێ.

لەو جەنگەیەدا عوسمان دەستی بردە گیرفانی و قوتووە جگەرەیەکی دەرینا. قوتووەکە ئەوەندە جوان بوو عەلی بە حەیاتی شتی وای نەدیبوو. لە دارەگویز ساز کرابوو و وێنەی سەگ و مەل و مار بە سەدەف لەسەری کێشرابوو. لە خوارەوەش گوڵێك نەخشێنرابوو. عوسمان قوتووەکەی کردەوە و بە هێمنی و لەسەرەخۆ جگەرەیەکی هەڵپێچا و خولقی عەلیی کرد. عەلی جگەرە کێش نەبوو. بە دڕدۆنگییەوە دەستی برد و برێك راوەستا، ئینجا وەریگرت. عوسمان لە شێوەی جگەرە کێشانەکەیەوە زانیی ناشییە. بە خۆنواندنێکی تایبەتی ئەوانەی تازە دەست پێدەکەن دەیکێشا. منداڵەکان، ئەلیف و مریەمۆك سەیری جگەرە کێشانە ناشیانەکەیان دەکرد.

ئەلیف دلۆڤانانە و بە دڵسۆزییەوە بیری کردەوە:" تف لە هەژاری. تۆقی گەردنە. لە هەر کوێ بیەوێ پیاو دەکوژێ. عەلیی من، ئەتۆ هیچ کات نەتتوانی وەك خەڵکی دانیشی و پاڵ وەدارێکەوە بدەی و جگەرەیەك بکێشی."

چاوەکانی پڕبوون لە ئاو.

عەلی هەر وا چاوی لە قوتووە و جگەرەکە بڕیبوو. لە دڵیدا گوتی:"ماڵ کاول، هەرچی هیوام بوو کوشتت. بڕۆ خوات لەگەڵ. تۆ هاوشانی ئێمەمانان نی. بۆوە نابی داوای هیچت لێ بکەن. بڕۆ خوا ئاگادارت بێ. پیاوێکی باشی، بەڵام قوتووە جگەرەکەت..."

بزەیەکی هاتێ. عوسمانیش لەگەڵ ئەودا بزەی هاتێ. عەلی دیسان بیری کردەوە:"هاوڕێ، تۆ بەو هەڵسوکەوتەت، جوان دەرتخست یان ئاغای یان کوڕە ئاغای. مەیشارەوە. بێ و نەبێ لە گوندەکەتان بە "عوسمان بەگ" بانگت دەکەن. دەنا پیاو ئاوا بەخۆوە دەبێ؟ هەی تف لە ڕەچەڵەکی بابت. تۆخوا ئەوەش قەڵافەتە. سەرێکی لە مەغریبە و یەك لە مەشریق..."

لەسەر یەك بە ڕووی عوسمانەوە پێ دەکەنی و عوسمانیش وەڵامی بزە و پێکەنینەکانی دەدایەوە. عەلیش دەیویست زۆر گوێ بە شتەکان نەدا و وەك ئەو هەڵسوکەوتەکانی خانەدانانە بێ. بەڵام چۆن دەیتوانی لە هەنتەشی کوڕە ئاغایەکدا، گوێ بە شتان نەدا. بە شەرمەوە گوتی:

ـ براله عوسمان ئاغا، بێ ئەدەبی نەبێ. ئاوا بە تاقی تەنێ لە کوێوە دێی و بۆ کوێ دەچی؟ کاروانەکەی ئەنگۆش تۆی بەجێ هێشتووە و ڕۆیوە؟

عوسمان بە جگەرەکەی سەر لێویەوە بەبێ ئەوەی بزەکەی ببڕێتەوە گوتی:

ـ ئەمن لە ئاوایی بەجێم هێشتوون و دەڕۆم.

عەلی ماوەیەك بڕێك بیری کردەوە و دیسان سەری هەڵێنایەوە و بە شەرمەوە پرسی:

ـ یانی چۆن؟

عوسمان بەبێ ئەوەی هیچ خۆی تێك بدا گوتی:

ـ دڵم لە ئاوایی ئێشا و لێیان دابڕام و وەڕێ کەوتم و هاتم.

مرێمۆك لە دڵە خۆیدا گوتی:"ئەها، هەر ئاوا، زار خۆش، کاکی ڕیبوار، تووڕە بە، تووڕە بە و هەتا هەی ئاوڕ لەو گەوادانە مەدەوە. کەوابوو دیارە دڵیان شکاندووی. ئازاریان داوی. بڕۆ و تا هەی ئاوڕیان لێ مەدەوە و هەتا مردن لەبزت دەلەبزیان نەگەڕێ. ئەوانە هەموویان بە قوربانی نینۆکێکی تۆ بن. چەندەش جوانی کاکی ڕیبوار. دەڵێی ئەسپی حدوودی. ماشەڵڵا، ماشەڵڵا... ئەی خودا باشەکەی من. لە چاوی پیسی بەدوور بکەی...

عەلی ملی بەلاوە نا. ئەوەی دەیگوت دەنگی لە هەموو ئاوایی گۆڕیوە دیارە دەبێ کابرایەکی گرنگ بێ:

ـ گەورەم، بۆچی دەنگت لێ گۆڕین؟

عوسمان:

ـ ئەمن دەنگ دەگۆڕم. واش دەنگ دەگۆڕم کە ئیدی چاوم بە چاویلان نەکەوێتەوە و هەتا هەم روو لەو گوندە ناکەمەوە.

مرێمۆك بە خۆی گوت:"ئەدی، رووی تێ مەکەوە. ئیدی چاو لە چاوی ئەو کافر و زاڵمانە مەکەوە."

عەلی بە دەگێکی کز و هێمن قسەکەی خۆی دووپاتە کردەوە:

ـ بۆچی؟

عوسمان برێك بە تووڕییەوە گوتی:

ـ ئەمن دەنگ دەگۆڕم. ئەوان وەك سەگ پەژیوان دەبنەوە. دێنە بەر دەرگام و وەك سەگ لەبەرم دەپاڕێنەوە. بەڵام ئیدی ئەوکات فایدەی چییە، خۆ دەستیان پێمڕاناگا.

مرێمۆك لە جێی خۆی هەستا و هات چۆکی بە چۆکییەوە نا و بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ با لەبەرت بپاڕێنەوە. ئیتر روو لەو گوندە مەکەوە و چاو لە چاویان مەکە. لێیان گەڕێ با بسووتێن و ببنە کۆڵوو. ئیدی ئاوڕێکیشیان لێ مەدەوە.

عوسمان بە روخسارێکی گەش و میهرەبانەوە گوتی:

ـ ناگەڕێمەوە دایە.

لە جێی خۆی هەستا. تووڕەکەکەی هەڵگرت و بە شانیدا کرد.

مرێمۆك دووپاتەی کردەوە:

ـ مەگەڕێوە.

عوسمان:

ـ خوا سەلامەتت بکا. چیی وای نەماوە شەو دابێ. ئەمن هەر حەزم لێیە بەشەو برۆم. زۆر خۆشە. بۆن و بەرامەیەك لەو کوێستانانە دەگەڕێ هەر دەڵێی بەهەشت هاتۆتە سەر زەوی. سەلامەت بن.

هەنگاوی خۆش کردن و خێرا دوور کەوتەوە.

مرێمۆك":

ـ برۆ خوات لەگەڵ رۆڵە قارەمانەکەم. ئیدی مەگەڕێوە لای ئەو کافرانە.. مەگەڕێوە...

عەلی لە دواوە هەتا لە چاوان ونبوو سەیری کرد و گەڕایەوە و لە ژنەکەی پرسی:

ـ بە رای تۆ پێمگوتبا باشتر نەبوو؟

ئەلیف گوتی:

ـ باشتر بوو گوتبات. پیاوێکی باش دیار بوو. هیچ نەبێ لەوانەبوو هەتا نیوەی رێ کۆڵەکەی بۆ هەڵگرێ.

ـ زنجیرەکەیت دی؟

ـ دیتم.

ـ ئەی قوتووە جگەرەکەی...؟

ـ ئەویشم دی.

عەلی ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ چووزانم... نەمتوانی پێی بڵێم.؟

هەوا تاریک ببوو. منداڵەکان لە تەنیشت ئاگرەکە کروشمەیان کردبوو و خەویان لێ کەوتبوو.

عەلی:

ـ چۆنە لەسەر ئەو ئاگرە نانێک ببرژێنین و بە تام و چێژەوە بیخۆین. دیارە ئێستاشمان قبوولیی ساوارەکە بەتام و چێژەوە خواردووە.

ئەلیف هەستا و بابۆڵە نانەکەی لە توورەکەکە دەرهێنا و هێنای. عەلیش پۆلووەکانی لەبن خۆڵەمێشەکە دەرینان. نانە نەرمەکەی کردەوە و لەسەر ئاگرەکە پانی کردەوە. برێک دواتر هەڵیگرت و وەریسووڕاندەوە. دوایی دەمودەست کردیە پارووەك:

ـ خۆزگە ئەو نانە پەنیرێکیشی لەگەڵ بوایە.

ئەلیف بە دڵێکی خۆشەوە گوتی:

ـ هەمانە. پێستەیەکی پڕمان هەیە. ئەو هاوینە هەر شیرێکی هەمانبوو، پەنیرم لێ گرت.

عەلی گوتی:

ـ دەی بێنە.

منداڵەکانی بەخەبەر هێنا.

عەلی دووەم نانی بە پەنیرەوە کردە بابۆڵەیەك و بۆ لای دایکی راداشت. دایکی بابۆڵەکەی لێ وەرنەگرت. عەلی تێگەیشت. دایە دەست حەسەن. حەسەنیش دای بە دایەگەورەی. مرێمۆك

بە زارە بێ ددانەکەی نانە وشکەکە وردە وردە جوی و خواردی. ئەلیفیش لە حاڵێکدا قەپاڵی لە بابۆڵەکە دەدا، لە مێردەکەی پرسی:

ــ بیر لە چی دەکەیەوە پیاوەکە؟ چ بووە؟

عەلی قاقایەکی کێشا و گوتی:

ــ بیر لەوە دەکەمەوە لەو دنیایە بنیادەمی چەند سەیر و سەمەرە هەڵدەکەون. سەیر نییە؟ ئەو کابرایە دەنگی لە گوندەکەی خۆی گۆڕیوە و سەری خۆی هەڵگرتووە و دەڕوا.

ئەلیفیش پێکەنی. منداڵەکانیش پێکەنین. هەر مرێمۆك پێنەکەنی. "پیبکەنن"، پیبکەنن. ئەدی بۆ ئەو دەمەی خۆی لێرە بوو پێ‌نەدەکەنین؟ ئەی دیارە دەنگ دەگۆڕێ. ئەوە کوێی عەیبە. دەنگ دەگۆڕێ. دەنگ دەگۆڕێ و چاویش لە چاویان ناکاتەوە. لەبەریشی دەپاڕێنەوە و بنی پێیانیشی ماچ دەکەن دیسانیش هەر چاویان لێ ناکاتەوە. ئەمن بەوە دەڵێم پیاو. نەك بەوانەی لەگەڵ مام خەلیلی فێڵەباز ئەسپەکەی دایکیان کوشتووە... تێگەیشتی کوڕە باشەکەم. ئەمن ئەوەم پێ پیاو نییە ژنەکەی لە پێش خۆیەوە دابنێ و بتریقێتەوە و حیلکەحیلك پێبکەنێ. یەکێکم پێ پیاوە کە بەتاقی تەنێ سەری خۆی هەڵگرێ و لێدا بڕوا. پێبکەنن، پێبکەنن هەی ئەوانەی دەربێی ژنەکانتان لە پێ دایە. پێبکەنن."عەلی گوتی:

ــ تازە لە خەوێ هەستاوین، بەڵام وا باشترە بخەوینەوە. ئەمن بەر لەوەی تاو هەڵبێ، دەبێ هەستم و نوێژەکەم بکەم. لە بن ئەو دارە جێ بۆ من چاکەن. با سەرمان لای دارەکە بێ. ئەگەر من هەڵنەستام تۆ بەخەبەرم دێنی.

"لەخۆڕا خۆت ماندوو مەکە. خودا چاوڕەشەکەی من بە تۆ ناخەڵەتێ."

خەوتن. ئاگری ئاگردانەکەیان تا بەیانی نەکوژایەوە. چونکە کۆتەرە دارێکی گەورەیان خستبووە سەری.

# ٧

**مرێمۆك كە بەخەبەر هات، سەیری كرد عەلی پشتی لە داری چاكییە و نوێژ دەكا. عەلی هەر دوو دەستی ئاوەڵا كردبوو و گەیاندبوونییە بن گوێچكەكانی و بە لای راست و چەپێدا سڵاوی دەدایەوە. دوای سڵاو دانەوە لەسەر هەر دوو چۆك دانیشت و دەستی كرد بە پاڕانەوە. لێوەكانی دەجووڵانەوە.**

"هۆی خەڵكینە، كورە لەسەرتان گەڕێم. ئەو كورە نازانێ دوعا بكا و بپاڕێتەوە. دانیشتووە و دەیەوێ خودا هەڵخەڵەتێنێ."

عەلی لە لایەكەوە دەپاڕایەوە و لە لایەكی دیكەوە هەوڵی دەدا برینە زار ئاوەڵاكەی ئۆكسوز مەمەد و پشتە خویناوییەكەی كیسەڵەكە لەپێش چاوی دوور بخاتەوە. لەهەمانكاتدا شتێكیش مێشكی ئاڵۆز كردبوو كە لە دڵی خۆشیدا نەیدەتوانی دووپاتەی بكاتەوە... رەوە كیسەڵی پشت قەڵشیوی خویناوی، ئەو كیسەڵانەی چاوە تۆقیوەكانیان وەك زەردێنەی هێلكە لە ژێڵلا هاتبوون، تەرمی بێ گیانی ئۆكسوز مەمەد، دوای مردن، برینەكەی، زەرد وەك كارەبا، زاری ئاوەڵا كردبوو و گەورە ببۆوە:"خودا هیچ كەس بێ كەس و هەتیو نەكا. بنیادەم لە گەوڕی مانگادا دەمرێ و كەس ئاوڕێكیشی لێ ناداتەوە. ئاوڕی لێ ناداتەوە؟ بۆ چما هەموو خەڵكی ئاوایی بۆی بەداخ نەبوون؟ بەڵام بەبێ دایك و باب و بێ كەس و كار..."

"ئەمرۆش نەمانتوانی دڵمان پاكژ بكەینەوە. نوێژەكەمان وەبەر نەكەوت... خۆزگە هەر ئەوەندەش بوایە. بەڵام ئەوەی دیكە... زۆر پیس و چەپەڵە... دەی، گەنجێتییە ئیتر.... ئیشەڵڵا دوای ئەوەی گەیشتینە چوكوور، دوای ئەوەی لە نێوەڕاستی كێڵگەی لۆكەدا چوومە نێو ئاوەكەی ئەوێ و مەلەیەكم كرد و دەستنوێژێكی باشم گرت، و دوای ئەوەی بەرماڵە خاوێنەكەم لەسەر خاكە نەرمەكەی كێڵگەكە راخست، دوای نیوەشەو و دوای ئەوەی هەتا سیوادی بەیانی نوێژم كرد... جا ئەو كات، ئەوكات، چ دەبێ؟" خزییە نێو

بۆشاییەکی تاریکەوە و بەسەر خۆیدا زاڵ بوو و سەرکەوتووانە بە خۆی گوت:"دەی کارنییە خودا چاکی نەکا."

خۆر سەری لە سویّ وەدەر دەنا. لەو سەرەوە، لە بن رەوەزێکەوە کە وەکو مژێك هەلکشابوو و دار و دەرخت لەسەر روابوون، تیرێژە باریکەکان لە چاویان دەدا.

بە بێتاقەتییەوە و قورس و بێهێز، دەستەکانی لەسەر عەرزەکە دادا و هەستایە پیّ. جەواڵەکەی بەر پێشی هەر وا بە داهێزراوییەوە کۆ کردەوە. بەرەو خۆرەکە راوەستا و نێوچاوانی تێك نا. ژانێکی تاقەتبڕی لە قاچ چەپی گەڕابوو. پشتیشی دێشا. گێژ و وێژ بوو. دوای تەواوبوونی نوێژەکە، نیدی نە کیسەڵەکان و نە ئۆکسوز مەمەد و نە شتەکانی دیکەشی لە خەیاڵدا مابۆوە. بەڵام ئەو هەوڵەی بۆ پاکژ کردنەوەی دڵی دابووی تەواو شەکەتی کردبوو. لە ناکاو چاوی لە چاوی مرێمۆك هەڵەنگوت. هەستی کرد پێکەنینێکی شاراوە لە روخساری دایە. بەڵام کامە پێکەنینی شاراوە؟ پیرەژنە لە دڵەخۆیدا قاقا پێی پێدەکەنی... پێی وابوو دایکشی کیسەڵە پشت خویناوییەکانی بە چاوە لە ژێڵڵا هاتووەکانییەوە و برینە زەردە کارەباییەکەی ئۆکسوز مەمەد و ئەو شتەکەی دیکەشی دیتووە. وردە وردە خەریك بوو لە دین دەهەری دەبوو.چاوێکی دیکەشی لە دایکی کرد. دەتگوت پیرەژن بەو پێدەکەنی و دەیگوت:"باش بوو. باش بوو، دڵم فێنك بۆوە..."

"نا، گیانەکەم، پێناکەنیّ. ئەگەر پێکەنیبا دەمدی. بەڵام نا! پێدەکەنیّ. باشیش پێدەکەنیّ، بەڵام دەری ناخا. ئەو وا بە بنیادەم پێدەکەنیّ کە دڵی هەڵدەکەنیّ و لە سینگی دەیهێنێتە دەریّ."

نێوچاوانی تێك نا. چاوی لە روخساری دایکی کە نیوەی لە سیبەردا بوو، بڕی. و لە پڕ پێی سەیر بوو:

لەمەو پێش، تەنانەت ئەو کاتەی هەر بستە منداڵێك بوو، هەرچەندی تووڕەش بایە، هەرچەندی قەڵسیش دەبوو، هەر لەگەڵ ئەوەی چاوی بە روخساری دایکی دەکەوت، رقەکەی دەنیشتەوە. بەڵام ئێستا، ئەوە یەکەم جاری بوو دەیدی کە وا نەبوو. دەستی تێکەڵ هاتن. گوتی:

ـ دایە؟

و چەند هەنگاوێك بەرەو دایکی چوو:

ـ دایە، تۆ لێرە لە بن ئەو دارە پیرۆزە بمێنەوە. ناهێڵم ببێتە نیوەڕۆ دەگەڕێمەوە و دەتبەم.

ژنەکەی باروبنەی تێکەوە دەپێچا.

مریەمۆك جوابی نەدایەوە. عەلی لای کردەوە بە لای ژنەکەیدا و پرسی:

ـ لێ بوویەوە؟...

ژنەکە بە ئاماژەی سەری گوتی تەواو بووە. عەلی کۆڵەکەی بە کۆڵ دادا. لەبەر هەوڵ و خۆماندووکردن و شڵەژان، لاقەکانی تێك دەئاڵان. ئەوەندە خێرا دەرپەڕی دەتگوت غار دەدا.

لك و پۆپ و چڵی دارە گویزە گەورەکە بە دەم بای بەیانییەوە گڤەوگڤەی بوو. مریەمۆك بەرەورووی ئەلیف راوەستا و گوتی:

ـ شوکری خوای... خوایە شوکرت کە هێشتا چوارپەلم ساغن. پێویست نییە، مێردەکەت، "عەلی"یەدرێژ ئەفەنی مشووری من بخوا. هەتا دەگەینە چوکوور دەتوانم لەو باشتر بەڕێیەدا بڕۆم. وەك ئەسپی راوێ. پێت وایە ئەمن کەمم ئەو رێیانە بڕیوە؟ ئەگەر جوان لەو رێیانە ورد بیتەوە شوێن پێی من دەبینی. بەڵام تەنیا ئەو هەورازانە پشتم دەشکێنن کچەکەم... هەر جاری جارانیش، کەیفم بە هەورازان نەدەهات.

دارێکی درێژی دەست دایە"

ـ ئێوە چیتان پێ خۆشە وا بکەن. ئەمن وەڕێ دەکەوم و واش دەڕۆم... ئاوڕی لەنەوەکانی دایەوە:

ـ وەرن، وەرنە گەڵ نەنکتان، جووجەڵەکانی خۆم، چاورەشەکانی خۆم. خۆزگە منداڵی ئەو کافرە نەبوایەن. بریا... ئەو دەم گیانی خۆمم لەسەر دەگێڕان. لە داخی ئەو ئەنگۆشم لەبەر چاو کەوتوون.

خۆر دەرکەوت. گەڵای دڕووە وشترە لە قەراغ رێگەکە نوقمی تۆز و خۆڵ بوون. ئیدی لەوێو بە دواوە پنچکە دڕووەکان کورتەبنە بوون. رێگە باریك و بەردەڵێن بوو. ئەلیف لێی چووە پێشێ و گوتی:

ـ دایە...

تووڕەیی لە چاوەکانی مێردەکەیدا دیتبوو و بە دڵیدا هاتبوو کە کێشەیەك دەکەوێتە نێوان کوڕە و دایکییەوە. گوێی شەیتان کەڕ بێ، هەتا ئێستا دایك و کوڕ و بووك و خەسوو هیچ کێشە و شەڕێکیان نەبوو. ئەلیف جار و بارە ئەویش ساڵێ یەك دوو جار، لەگەڵ عەلی و منداڵەکان دەم بە دەمەی دەکرد. مریەمۆك هەمیشە هەوڵی دابوو پێش بەو شەڕە چەقانە بگرێ. هەڵسوکەوتێکی ژیرانەە و گران و سەنگینی بوو:

ـ دایە... لەسەرت گەڕێم. لێرە بمێنەوە. لە بن ئەو دارە، لە پەنا ئەو ئاورگەیە و چاوەڕێ بە تا کوڕەکەت دێتەوە... هەر شتێك بێ، ئەتۆ ناتوانی رێگە بڕی.

مریەمۆك رەنگێکی هێنا و برد. لێوەکانی وە لەرینەوە کەوتن. تا هێزی دەبەردابوو هەرای کرد:

ـ ئەمن؟... ئەمن ناتوانم بە رێیەدا بڕۆم؟ ئەمن؟

دارەکەی دەستیی لە عەرزەکە کوتا و بەسەر منداڵەکانیدا قیژاند:

ــ یاڵڵا... ئێوەش بڕۆن ملتان بشکێنن هەی توتکە سەگینە... ئێوەشم نەویست... بە تاقی تەنێ وەڕێ دەکەوم و دەڕۆم... ئەگەرچی پیرم، بەڵام خودایە ئەو لاقانەم لێ نەستێنییەوە.

و پیلی ئەلیفی گرت و بەرەو دارەکەی وەرسووڕاند وگوتی:

ــ بچۆ ئەو نانەی لەوێیە هەڵیگرە. ئەمن ناتوانم لێرە بمێنمەوە. منداڵەکانیشت هەڵگرە و بڕۆ.

ئەلیف لەسەر جێگەی خۆی وشك بوو. ئێوچاوانی تێك نا. چاوی لە مرێمۆك بڕی. مەبەستی ئەو ژنە چ بوو؟ نانەکەی پەنا دارەکەی هەڵگرتەوە. لە بن ئەو بارەدا کەبە کۆڵی دادابوو، کۆمابۆوە. کە وەڕێ کەوت و گەیشتە مرێمۆك دیسان خۆی پێ نەگیرا. ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ــ دایە گیان باشتر وابوو لێرە مابایەوە و چاوەڕێی کوڕەکەت بای. ئەتۆ زۆر شەکەت دەبی. هێشتا دوو رۆژمان رێگەی هەوراز لەبەرە، لەوانەشە سێ رۆژان...

مرێمۆك بە قینەوە گوتی:

ــ قەیناکا، با دە رۆژ بێ.

زۆر بە خێرایی دەڕۆیی. ئەبیف بە حاڵە حاڵ توانیی بیگاتێ. منداڵەکان زۆر بەجێ مابوون. حەسەن بە ئۆمەخانی گوت:

ــ دایە گەورەم زۆر لە بابم تووڕەیە ، ئەو هەر چییەك بڵێ، وەڵامی ناداتەوە.

ئۆمەخان:

ــ دەی دیارە جوابی ناداتەوە... هەر جواب ناداتەوە... بابم ئەسپەکەی لێ کوشتووە، یادگارییەکەی بابە گەورەم...

حەسەن:

ــ بابم نەیکوشت، مام خەلیل کوشتی. ئێستاش کە مام خەلیل خۆی شاردۆتەوە و رۆیوە، ئیدی دایە گەورەم داخی دڵی خۆی بە بابم هەڵدەرێژێ.

ئۆمەخان زمانی لێ دەرکێشا و دواییش بۆ ئەوەی بگاتە لای دایکی، لە لاقانی وەراند. مرێمۆك هێز و وزەیەکی وای لە گیان گەڕابوو، خۆشی بڕوای نەدەکرد. وەك ئەو دەمەی لە هەڕەتی لاویدا، بە کەیف و خێرا و بێ ماندووبوون رێگەی دەبڕی. دڵی خۆش بوو. ئیدی ئێستا مەرگی ئەسپەکە و کارەکانی کوڕەکەی لا گرنگ نەبوو.

دەتگوت هەموو ئەو رۆژە رەشانە بۆ ئەو جێژن و شادی بوون. بەخۆی گوت:"کوڕەکەم تاوانی چ بوو؟ ئەو داماوە پیاوێکی بە روحم و دڵە. دەریایەك بەزەیی هەیە. زگی بە داماو و

نیقەوماوان دەسووتیٚ. بە تایبەتی بە منداڵان و پیر و پەککەوتەکان. چما نەتدی ئەو سەگبابە وەك قورِنوو بە کورِەکەمەوە نووسابوو. وەك قورِنوو... ئەو چاو قۆپچەییە، یاخوا هەر دوو گلێنەی بێنە دەریٚ. خەتای خۆم بوو. رۆژێك لە رۆژان ئەو هەتیوەم لە کن خۆم دانەنا و بۆم نەگێرِایەوە ئەو سەگبابە چ بەڵایەکی بەسەر بابی عەلی هێناوە. خۆ ئەگەر بیگێرِمەوە هەم عەلی زاری گەزێك دادەپچرِیٚ و هەمیش خەلقیٚ خوای... ئەو کات دەزانی کەبۆچی ناتۆرەی "دزە گەورەکەی چوکووراوا"یان دایە پاڵ ئەو مێردە داماوەی من کە مێشێکی پیٚ لە دەمی خۆی دەرنەدەکرا. دەبوو بزانیٚ.... رۆڵە دڵ ناسکەکەی من... چۆن دەبیٚ دایکت دەنگت لیٚ بگۆرِیٚ. ئەوە سیٚ رۆژە زووخاوم پیٚ هەڵێناوی... کورِە یاخوا مریٚمۆکت لەسەر گەرِیٚ. گوتت:

- با دایکم خەم نەخوا، ئەو داماوە ئەسپەکەی مردووە و تازیبەبارە. ئەو پیرە ئەسپە یادگارییەی بابی زۆر خۆش دەویست. دڵی بووەتە خوێن." و منت لە کۆڵ کرد و بەو هەمووە هەوراز و نشێوەدا هێنام. هەی بە قوربانی ئەو پشتە پیاوانەیەت بم، "عەلی"یەکەم. یاخوا ئەمن کوێر بم و گۆرِ بە گۆرِ بم کە زوڵمم لیٚ کردی و شیرەکمم لێت حەرام کرد. ئەوە سیٚ رۆژە چاوت لە دەمە وشەیەکی سۆزدارانەم لیٚ ببیستی، کەچی من ئەو زمانە لاڵبووەم هەر نەبزووانە و لەبزم دە نەبزت نەگەرِا. هۆی خوداکەی من، خودا چاورِەشە جوانەکەم. ئەمن هەموو تووك و دووعاکانم وەردەگرمەوە. ئەمن هۆشم بەخۆمەوە نەما و هەرچی هاتە سەر زارم گوتم. ئەمن کاتیٚ لەسەرم دەدا، ئەتۆ هەمووی ئەو قسانە، ئەوانەی لەوەها حاڵێکدا دەیانکەم، مەبیستە. ژنێکی بیٚ ئاقڵی شێتم چاو رەشەکەی من. چیی سووچ و توانم هەیە لێم هەڵوەرێنە. "عەلی"یەکەی من کورِێکی باشە. یارمەتیدەری بە چاورِەشەکەم. ئەو نوێژەکەی بۆ تۆ کرد."

لە خولیایەکی خۆش و شەپۆلی رووناکاییدا نوقم ببوو شتێکی دوور و لێڵ . لە ناخیدا بوو. هەر دەتگوت گۆرانییەکە یان بۆنێکی خۆش یان رەنگێك. رەنگێکی شین باوی دوور و زۆر دوور، لە کەنارەکانی دەریای سپێدا... و سپیاییەکی وەك لۆکە کە بەسەر رەنگە شین باوەکەدا دەخزی و دەرِۆیی... مێردەکەی گەنجە و تیشکەڵە و باڵا بەرز، بە روخسارێکی تاوەسووت و چاوە درشت و کاڵەکانییەوە... قژی کەوتۆتە نێوچاوانی و دەبریسکێتەوە... وا لە دڵەوە پیٚ دەکەنیٚ کار دەکاتە ناخی مرۆڤ. پێکەنینەکەی وەك خەونی منداڵان ناسکە. بە دڵەوە دەنووسیٚ... یاخوا یەمەن بەقورِیٚ گیریٚ...

لە شەوی زەماوەندەکەیاندا، لە تاریکاییەکە دەستی ئەوی گرتبوو و گوشیبووی، تەزووەکی خۆش بە هەموو گیانیدا هاتبوو، لەو ساتەدا چەندە جوان زانیبووی ئەوە برایمە. زانیبووی و لە خۆشییان توابۆوە.

لە بەرزاییەکەی بەرەوروو، تاکەدارێکی کاژ هەبوو کە لك و پۆ و گەڵاکانی وەك دوو باڵی گەورە لێك کردبۆوە و لە باڵندەیەکی گەورە دەچوو کە دەیەوێ هەڵفڕێ. بە سۆزێکەوە سەیری کاژەکەی کرد. سی ساڵ دەبوو ئەو دارە هەر بەو لك و پۆ و گەڵیانەوە لەوێ بوو. هەموو ساتێ دەتگوت ئامادەی فڕینە... مریەمۆك بە خۆی گوت:" کێ چووزانێ، لەوتانەیە هەڵیشفڕێ. دارەکانیش وەك مرۆڤەکان گیانێکی شیرنیان هەیە. چما پیر و پیاوچاکان رۆحیان نییە؟

سەرما و تەزووەکە کەوتبوو و هەتاوەکە بڕێك هەوای گەرم داگیرابوو. مریەمۆك خەریك بوو ئارەقەی دەکرد. بەخۆی گوت:" خەریکم وەك سەردەمی لاوێتم ئارەقەی دەکەم. ئارەقەکردن باشە. زۆر باشە. زۆر دەمێك بوو ئاوا ئارەقەم نەکردبوو.

ئاورێکی دایەوە. بووکێ ومنداڵەکانی بەجێ مابوون:" ئەو بووکە گەنج و بە تین و گوڕە نامگاتێ. ئەوەش حیکمەتی خوایە... ئەو نزایەی لە بن دارە گوێزە پیرۆزەکە کردم بە فیڕۆ نەچووە. رووم لە دارەکە کرد و هەتا رۆژ بۆوە پاڕامەوە. گوتم ساڵی داهاتوو کەڵەبابێك دەکوژمەوە ولێی دەنێم و بەبێ ئەوەی چێشکەی بکەم هەر هەمووی بەسەر ریبوارەکاندا دابەش دەکەم. ئەوە لەسەرم بێ ئەی دارە گوێزە پیرۆزەکەم. لە جێی کەڵەشێرێك، دوو کەڵەشێرت پێ قەرزدارم... سەیری هێزی ئەژنۆکانم بکە. لە هەرەتی لاوەتیشدا وا نەبووم. خۆزگە توانیبام وشترێکت لە بەر پێی بکوژمەوە. هەروەك چەرکەزەکان ئەسپ دەکوژنەوە. وشترێکی تووکنی جووت کۆپان.

لە تاقەدارەکە تێپەڕی. دارستانێکی چڕی لە پێش بوو. مریەمۆك نوقمی خەیاڵەکانی بوو. "رووبارێك هەیە بە ناوی ساورون. ئەوەندە زوڵاڵە دەڵێ چاوی قرژاڵە*.... لە پێشدا سپێدارە گەورەکان دەبینرێن... لەگەڵ دەرکەوتنی ئەوان دنیا نوقمی شادی و خۆشی دەبێ.

گژ وگیا و گوڵ و دار، هەموو دەڵێی جێژنەیانە... لە سولەیمانلی ئاشێك هەیە. کە بە پەنای دا رەت دەبی، بۆنی ئاردی گەرمت بۆ دێ. ئاردێکی سپی وەك شیر، سپی وەك بەفر. دوایی، چنارەکان... پێش چنارەکان پاناوکێکی پڕ لە پنگە کە گوڵی مۆر داپۆشیوە، وەك مافوورێکی رەنگاڵە... ئەودەم لاوێك بوو حەسەنی ناو بوو... حەسەن دەشتی... کوڕی جەبار... حەسەن دەشتی....دایکێکی زۆر قسە خۆشی بوو... کە بە پەنا پنگەکانا تێدەپەڕی دنیا لێوڕێژ دەبێ لە بۆنی پنگە. هەموو شتێك بۆنی پنگەی لێوە دێ: دار و بەرد و ئاو و خاك... هەموو وڵات پڕ دەبێ لە بۆنی پنگەی تازە..."

---

*لە دەقە فارسیەکەیدا دەڵێ: ئەوەندە زوڵاڵە هەست دەکەی ماسییەکانی لەسەر ئاوەکەوەن" بەڵام من ئەو ئیدۆمە رەسەن کوردییەم پێ جوانتر و لەبارتر بوو.

"حەسەن گوتی.. لەپڕ راوەستا و گوتی... حەسەن زۆر جوانکیلە بوو... پیاوێکی جوان بوو، کە سەیری دەم و چاویت دەکرد، دەتگوت: دەبێ حەزرەتی یۆسفیش هێندەی حەسەن جوان بووبێ... حەسەن گوتی:" جەماعەت، جێی خۆیەتی ئەمشەو لێرە لە نێو ئەو گوڵە مۆرانەی ئەو پنگەجارەدا بار بخەین. دەی با لۆکە رنین رۆژێك وەدوایە کەوێ. ئێمەش رۆژێك درەنگتر دەگەڕێینەوە ئاوایی." هەر دەتگوت سێحرێك لە دەنگی دایە. کەس متەقی نەکرد. هەموو چوون بارگەوبنەیان لە بن دارەچنارەکان بەعەرزی دادا."

"پێش رۆژی حەوتەم، نیوەڕۆی رۆژی شەشەم، کاروان دەگاتە جارە پنگەکە. بەڵام قەت لەوێ نایخەن. دوای ئەو ساڵە بۆچی ئیدی گوندییەکان هیچ کات لەو پنگەجارەدا نەیانخست؟ کەس نازانێ..."

"سپێدارەکانی چوکووراوا جوانن. سپێدارە کەزی درێژەکان... وەك بووکی رازاوە... لەگەڵ هەڵکردنی هەر بایەك دەشنێنەوە. چوکووراوا وەك باغێکی سەوزی هەراوە..."

"یانی چی؟ ئەژنۆم دەلەرزن؟ ئای خوایە گیان..."

مرێمۆك دەستێکی بە لاقەکانیدا هێنا.

لێڕوار. مارمێلکە سوورەی سەر رەوەزەکان. دەڵەکێك وەك فیشەکە شێتە هات و تێپەڕی. لاسکە گەنمەکان. لە نێو مەزرایەکی نوقمی تیشك. هیچ شتێ وەك لاسکە گەنم چڕ و بریقەدار نییە. هەر دەڵێ هەرچی تیشکی خۆرەتاوە لەوێدا کۆ بۆتەوە و هەڵدەقوڵێ و بڵاو دەبێتەوە و دەدرەوشێتەوە.

پاڕایەوە. لە ناخی دڵیەوە، بە هەموو وجوودییەوە. ئاوڕێکی دایەوە و سەیری دواوەی کرد. تەنیا تاکە داری چاکی دیار بوو. چاوی لەو دارە بڕی و راوەستا هەتا بووکەکەی گەیشتێ و گوتی:

ـ زۆر خێرا دەڕۆی دایە گیان، هەرچی کردم نەمتوانی بتگەمێ.

مرێمۆك دەستی بەرەو ئاسمان لێك کردبوونەوە. دوایی ماندوو و شەکەت هەر دوو دەستی هێنایە خوارەوە و گوتی:

ـ گەیشتێی کچە جوانەکەم. ئەوە گەیشتێی...

ئەوەندە ماندوو شەکەت ببوو هەر دەتگوت دەست و لاق و سەری پێوە نییە. ئەگەر خۆی شل کردبایە، لەوانەبوو ئیتر هەڵنەستێتەوە. دوو هەنگاوی دیکەشی نا و گوتی:

ـ ئەوە گەیشتێی... گەیشتێی...

هێندە داماوانە وای گوت، ئەلیف چاوی پڕ بوون لە ئاو. کە سەیری روخساری مرێمۆکێی کرد، زەندەقی چوو. رەنگی روخساری زەرد هەڵگەڕابوو. نەخۆش لە دەمی مردنیدا وایان لێ دێ. دەمودەست کۆڵەکەی داگرت. پیلی مرێمۆکێی گرت و گوتی:

ـ دانیشە دایە، دایکە باش و نازاکەم. لەسەرت گەڕێم.

مرێمۆك دانیشت. ئەلیف و منداڵەکان بەسەر پێوە راوەستابوون و بە ترسەوە سەیریان دەکرد. مرێمۆك سەری بەردابۆوە و دەموچاوی نەدەبینرا. زاری وەك دار وشك ببوو و پێستی دەموچاوی لەبەر یەك دەکشایەوە. پاش ئەوەی چەند هەناسەیەکی قووڵی کێشا، روخساری ئەلیف و منداڵەکانی دی کە بەسەرسەریەوە چاوەڕێی بوون. گوتی:

" تەواو بوو. هیچم نییە، پیاو کە خێرا دەڕوا، گەنجیش بێ هەر وای لێ دێ. ئەوە بۆ بەسەرمەوە راوەستاون و ئاوا سەیرم دەکەن؟"

ـ بەقەرەواشت بم دایە گیان... دیارە... ئەلحەمیلا باشی.

مرێمۆك وەڵامی نەدایەوە. بێدەنگ بوو و سەری بەردایەوە. هەموو بێدەنگ بوون. ئەلیف و منداڵەکان پشوویان نەدەکێشا. بڕێك دواتر مرێمۆك سەری هەڵێنا و ئاخێکی هەڵکێشا و بە نووزەنووز دووپاتەی کردەوە:

ـ ئاخری گەیشتێی.

ئەلیف کە دیتی، دڵی خۆش بوو. روخساری گەش ببۆوە و رەنگێکی گرتبۆوە. لە قەراغ رێگەکە و لە لای راستی مرێمۆکەوە دانیشت. منداڵەکانیش لەملا و ئەولای دانیشتن. بڕێك دانیشتن و کەس وستەی نەهات. سەیری یەکتریشیان نەکرد. دەترسان سەیری یەکتری بکەن. تەنانەت منداڵەکانیش. ئاخریەکەی ئەلیف دەستە قەڵشیوەکانی لەسەر عەرزەکە دادا و نرکەیەکی لێوەهات و هەستا. هەموو کەس نەیدەتوانی بە کۆڵێکی ئاوهاوە هەستێتە پێ.

بەسەر سەری مرێمۆکەوە راوەستا و نەیدەزانی چ بڵێ. بە دەنگێکی نەرم و خۆمانە دەستی پێ کرد:

ـ دایە گیان، دایکە خاتوونەکەم. ئەتۆ لێرە مەبزوو هەتا ئێمە دەگەینە عەلی. هەر کات بگاتە هەوارگەکە، ئەگەر ئێمە لای نەبین، ناتوانێ بارووبنەکەی لەوێ فڕێ دا و بگەڕێتەوە. ئەتۆ هەر لێرە وەمێنە و چاوەڕێی کوڕەکەت بە. ئەمن خێرا دەینێرمە دووت.

خێرا کەوتە رێ و دوور کەوتەوە. منداڵەکانیش وەشوێن دایکیان کەوتن. ماوەیەك دوای ئەوەی دوور کەوتبوونەوە، مرێمۆك سەری هەڵێنا و لە دواوە سەیری کردن.

کە منداڵەکانیشی لە دووی دایکیانەوە دی، قرچەیەك لە هەناوی هات. دەتگوت مەنجەڵێکیان ئاوی کوڵیو پێدا کرد. چاوە بەمۆڵەق وەستا و پڕ لە پرسیارەکانی تێوەبڕین و تا ئەوان لە یاڵەکە ئاوا بوون و لە چاوان ون بوون، چاوی لێ هەڵنەگرتن. ناڵاندی:

"ئاخری گەیشتێی بووکە قەحپەکەم. بەو مێردە گەوادەتەوە. گەیشتێیە من و بەجێت هێشتم. ئای خۆزگە دەمردم و تۆم بۆ ئەو "عەلی"یە درێژە نەهێنابا. ئەگەرچی تۆ لەو "عەلی"یە درێژە برێك باشتری. چاو، چاو ئەو منداڵانە، ئەو تووتکە سەگە بێچووە بەرازانە.. ئەوانیش... ئەدی، ئاخری گەیشتێی. گەیشتێی و ئەمنت بە تەنێ لەو چۆڵ و بیابانەدا بەجێ هێشت و رۆیشتی."

لەناکاو بە تین و گۆڕێکەوە کە هیچ چاوەڕوان نەدەکرا، گورج دەرپەڕی و بە چاوی لە ژێلا هاتۆوە تا هێزی لەبەردا بوو هاواری کرد:

ـ عەلی ی ی ی ...

رەوەزە دوورەکان دەنگیان دایەوە:

ـ عەلی ی ی ی ی ی

ئیتر لە سەر عەرزەکە لێی تخێڵ بوو. دەستەکانی بە عەرزی دادەدان و گرمۆڵە دەبوو. ئەو خەیاڵانە وەك بڕووسکە بە مێشکی دا تیدەپەڕین. مەبەستی ئێران لەو شەڕە ئاشکرایە:

ـ هۆی خەڵکینە، لەسەرتان گەڕێم. بە قەرەواشتان بم. ئەوانە خەڵەتاندیانم. ئەی لەو فێڵەی... لەو گزەیەی... ئەی... ئەی... خۆڵم وەسەر. ئەگەر گزە نەبوو بۆچی منداڵەکانیشیان دەبرد و دەڕۆیشتن؟ وەی... وەی... وەی.."

ترسەکەی هەر دەهات و زیادی دەکرد و پنجی دادکوتا:

" ئەی لەو فێڵەی... لەسەر ئەو کێوە... جڕ و جانەوەر... داری چاکی..."

کە وەبیر داری چاکی کەوتەوە، لە ناکاو تروسکاییەك لە دڵی گەڕا. ترسەکەی یەکسەر رەوییەوە. غیرەتی وەبەر هات. سەری هەڵێنا و ئاوڕێکی لە دارەکە دایەوە و دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە.

دڵخۆشییەکەی زۆری بە بەرەوە نەبوو. لەسەر ئەو چیا رووتەن و قاقڕە هەر ئەو و دارێکی لێ بوو. لە دڵە خۆیدا ئەوەندە هەستی بە تەنیایی و داماوی کرد:"بەتاقی تەنێ.. بەتاقی تەنێ... بە تاقی تەنێ... کەس نەمابوو... تەنانەت زەرگەتە و مێش و مەگەزو مێرووله و باڵندە و مار و مارمێلکە و کرم و قالۆنچەکانیش لێیان داوە رۆیون... رۆیون. تاقە دارێك و مرێمۆکێکی تەنیا."

"ئەوجا دار چ قازانێکی بۆ بنیادەم هەیە... خۆ دەست و پێی نییە کەسێك یان دڕندەیەکت لێ دوور بخاتەوە. خۆ زمانیشی نییە بڵێ دوور کەونەوە. تفەنگیشی نییە، چەقۆی نییە، ماڵی نییە، کۆخی نییە. نانی نییە، دۆینەی نییە. چاو و گوێی نییە. هەر وا راست چەقیوە. ئاخر دارێکی داماو چی پێ دەکرێ... نە گوندی هەیە و نە کاولاشێك... نە ژنێکی هەیە و نە منداڵ... رووت و قووت... نە دەوا و دەرمانی هەیە، نە ئاگر... داماوە.."

ترس ورده بەسەریدا زاڵ دەبوو و ئەو خەیاڵە کە داوێکیان بۆی نابۆوە و فریویان داوە و لەو کێو و دۆڵە بەجێیانهێشتووە و ڕۆیشتوون، هەر یەکسەرە زراوی بردبوو."

" چەندە نەرم و نیانیش بەرووممەوە پێدەکەنین... چەندە شیرین. دەموچاوی عەلی دەتگوت روخساری فریشتەیە. بەڵام منداڵەکان نەیاندەتوانی سەیرم بکەن و نەیاندەتوانی پێبکەنن. ئاخر منداڵ فرت وفێڵ نازانێ و ناتوانێ سەگێتی بکات. ئەوە کاری گەورەکانە. ئەوان دەزانن بە هەزار شێوە بەدەفەڕی بکەن و لە رووشت پێبکەنن. ئەوان دەزانن پێش کوشتنەکەت، وەك برا دەست لە ئەستۆت بکەن. منداڵ شتی وا نازانن. حەسەنی من و نۆمەخانی من نەیاندەتوانی سەیرم بکەن. وەختابوو دەست بکەنە گریان. بە تایبەتی حەسەنە قارەمانەکەم بە دەورەمدا دەهات و دەیویست شتێکم بەسرتە پێ بڵێ. بەستەزمانە بۆی رێك نەکەوت و نەیتوانی. ملی بەلارەوە نابوو و دەڕۆیی. وەك ئەوەی بیەوێ بڵێ: ئەمن لە لای ئەنکم نابزووم. لێم گەڕێن با وەك ئەو ئەمنیش گورگ بمخۆن. لەوانەشە گوتبێتی ئەو کاتەی بە چاوی فرمێسکاوییەوە دەڕۆیی. گوتوویەتی بەڵام ئەو بێ دین و ئیمانانە گوێیان نەداوەتێ."

"عەلی"یە درێژی دایك کوژ، لەم دنیایە هیچ، بەڵام لەو دنیا چۆن دەتوانی خۆت لە چنگی خودا چاو رەشەکەی من رزگار بکەی؟"

"سرتوخورتێکیان پێکەوە هەبوو و نەیاندەهێشت منداڵەکان لە من نزیك بکەونەوە. دەبوا بزانیبا. بۆ ئاقڵم پێی نەشکا؟ جا بۆ مەرگی ئەو ئەسپە ئاقڵی پێ هێشتووم؟ چاوی لەسەر یەك دانان و لنگی لێ راکێشا. وەك مرۆڤێکی کە گیانی دەرچووبێ. چاوە گەورەکانی لێکنا."

بە حاڵەحاڵ هەستایە پێ. بەرەوپێشەوە و بەرەو ئەو شوێنەی ئەوان لە یاڵەکەوە لێی ئاودیو ببوون، بەلای راست و چەپێدا، بەرەو لای رەوەزەکان، بە پشتەوەیدا و بەرەو لای داری چاکیی، روانیی. ماوەیەك هەر نەیتوانی چاو لە چلۆوکی دارەکە هەلگرێ. لە خۆی پرسی:"لێرەوە تا چوکووراوا چەندە رێیە؟" ئەوجا هەموو هەوارگەکانی سەر رێی هێنایە پێش چاوی. هەورازەکان، لێرەوارە تاریکەکان، ئاوە رەشە بێ دەرواو و بوارەکان. گۆڕستانەکانی سەر رێ و رەوەزە پڵینگ، هەر هەموویانی هێنایە پێش چاوی خۆی"لە رەوەزە پڵینگان، پڵینگی زەبەلاحی چنگ ئاگرین دەنەڕێنن. سەری بنیادەم هەڵدەقەنن و دەیبەنە کوێستانێ. بەڵام تا ئێستاش کەس نەیدیوە پڵینگ سەری مرۆڤێکی هەڵپساندبێ. پێشینیان وایان دەگوت، بەڵام کەس نەیدیوە. هەورازەکانیش خۆ ئەگەر ورده ورده بڕۆی دەکرێ بیانبڕی. ئاوە تاریکە بێ بوارەکانیش هەر دەبێ دەراوێکیان هەبێ بتوانی لێیەوە بپەڕیەوە. بەڵام کۆنە گۆڕستانەکە،

کۆنە گۆڕستانەکە، کۆنە گۆڕستانەکە، تاریك و سامناکە، زراو بەرە. پاناوکێکی دوور و درێـژ. کێلەکان لەسەرتەنیشت کەوتوون و بەسەر یەکدا کـەوتوون. چـاوت نەقووچێنی نـاتوانی پییـدا بڕۆی. کۆنە گۆڕستانەکە... کۆنە گۆڕستانەکە. هەی خودا پاکت بکاتەوە."

"لێرەوە تا چوکوور چەندە ڕێیە؟ بە چەند ڕۆژان دەگەیێی؟"

"باش بوو بەجێیان هێشتم و ڕۆیشتن. دەگەمـە چـوکوور و دەچـمە مـاڵی ئاغـا و بـە ئاغاژنێ دەڵێم، خوشکێ گیان ئاوام لێ قەوماوە. دەزانم بۆم دەگرییێ. خەڵکی دڵسۆز لـە دنیایەدا زۆرن. دەڵێ دایە، هەر لێرە لای ئێمە بمێنەوە و هەتا زیندوی هەر بخۆ و بنوو. لە ماڵی ئێمە چ زۆرە دۆینە و نان. چاوێکیشت لە منداڵەکان دەبێ. پێی دەڵێم جا ئەوە ئێمە منداڵمان بەخێو کرد چیمان پێ گەیی؟ بـەڵام هـەر خـۆت باشـتر دەزانـی. هـەزار جـار لـە منداڵەکانی خۆم باشتر بە هی تۆ رادەگەم. "

"عەلی ئەو دەمەی لە لۆکە رنینێ دەگەڕێتەوە جا دەزانێ ئەمن لە ماڵی ئاغـام. دێ و لـە بـەرم دەپاڕێتـەوە. دەگریـێ و بـۆ قایـل کـردنم ئەوەنـدە زمانلووسـی دەکـا هـەر مەپرسـە. جـا ئەمنیش... لەو جەنگەیەدا ئاغەژن دێتـە ژوورێ و هەرچـی لـە زاری دێتـە دەرێ بـە عـەلیی دەڵێ. بە منیش دەڵێ ئەتۆ وەك دایکی خۆم وای. نەکەی بچییەوە لای کەسێك کـە لـە چـنگی نیزرایلدا بە تاقەدارێکەوە بەجێی هێشتی و لێیدا ڕۆیی."

ئاخێکی هەڵکێشا و بە دەنگێکی کز گوتی:"حەقتە کـچم، حەقتـە، نارۆمـە لای ئـەو، لای ئەو بیژووەی لە نێو چۆڵ و چیایاندا بەجێی هێشتم بۆوەی قەل ودالٌ و گورگان بمخۆن."

دەنگێکی وەك لوورە لە دوورەوە دەهات. دەتگوت:"شانە مێشێك لە مێشکیدا هـارووژاوە. بـەرەو چوکوور ملی لێ نا. چەند هەنگاوێك ڕۆیی. دوایی ڕاوەستا. شەڕ و هەڵڵا و جۆرە خۆشی‌یەك لە ناخیـدا بوو. روخساری ئاغە ژن بە لەچکە سپی‌یەکەیەوە و چاوە بەکلەکانی و بـزە شـیرنەکەی ئـەو... لـە مێـژ ساڵ بوو دیتبووی. مرێمۆك ئەو کـات تـازەبووك بـوو. لـە کـاتی گەڕانەوەیانـدا ئاغـەژن لـە نێـو لۆکـە ڕنەکاندا تەنیا داوای کەسێکی کردبوو کە دانێك درووومانی بۆ بکا. کە لێ ببـۆوە، ئاغـە ژن یـەکێك لـە کراسەکانی خۆی دابوویە. ئای چەندە ژنێکی باش بوو. ئێستاش بزە شیرنەکەی ئەوی هەر لەبیرە.

دەڕۆیشت و روخسار و بیچمی لە زەینیدا زیندوو دەبۆوە. دەتگوت ئـەگەر دەست درێـژ بکـا دەتوانێ دەستی لێ بدا.

"ئەدی خانم گیان، ئەوە حاڵ و باڵمانە. ژیانی ئێمە..."

"هەر چۆنێك بێ، بەبێ نان و ئاویش بێ دەکرێ بگەیتـە چـوکوور. ئـەمن بـە ڕاسـتەڕێدا دەڕۆم. بـا دووریش بێ. دڵنیام کاروانێـك لـە دوامـەوە دێ. ڕاسـتە ڕێ قـەت بـێ کـاروان نییـە. دەمبیـنن. حـاڵم

دەبینن و لێم دەپرسن چیم بەسەر هاتووە. جا کە سەربردەی خۆمم بۆ یەك بە یەکیان گێڕاوە، کچ و بووکان بۆم دەگرییێن. سواری ئەسپێکی گورج وگۆڵم دەکەن. زینەکەی چەرکەزیانە بێ. گەنجێك دادەبەزێنن و ئەمن لە جێی ئەو سوار دەکەن. ئەمنیش پێیان دەڵێم کوڕینە مەترسن لەوەی وەدرەنگی کەوتوون. هەر لەگەڵ بگەینە چوکوور، کێڵگەیەکی پڕ پیت و بەرەکەتتان بۆ دەدۆزمەوە. بە یەك رۆژ هێندەی حەوتووەك لۆکە کۆ دەکەنەوە و دراوێکی زۆرتان پێدەبڕێ. ئێوە چاکەتان لەگەڵ ئەمنی پیرەژنی پیر و پەککەوتە کرد و ئەمنیش بۆتان قەرەبوو دەکەمەوە. ئەمن پیرەژنێکی پەککەوتەم. ئاغەژن کراسێکی پڕ لە نەخش و نیگاری پێ دام. شەقڵی نەشکابوو. دەستی لێ نەدرابوو. چما دڵم دەهات یادگارییەکەی ئەو لەبەر بکەم. هەر وا دەستم لێنەداوە و ئەوە لە یەغدانەکەم دایە. خۆزگە کراسە جوانەکەی ئەوم دێنا. پێشانیم دەدایەوە. کاتێك یادگارییەکەی خۆی بەدەستمەوە دیتبایە کە هەر وا ماوەتەوە، زۆری پێ خۆش دەبوو:"

لە نیوەی رێ پێی بە عەرزەوە رەق بوون و هەر لەوێ بە پشتی کۆماوە و دەستی پاش قوون و چاوی لە عەرزبڕییەوە مایەوە. کۆنە گۆڕستانەکە، لە نێو دڵی تاریکییە خەست و بێ سنوورەکەوە بە بەرچاویدا تێدەپەڕی، دەجووڵا، دەسووڕا و کێلەکان بە بەرچاویدا غاریان دەدا. بەردەکان دەچوون دەبەریەکەوە. مردووەکان، ئێسك و پرووسکەکانیان! کۆنە گۆڕستان، کۆنە گۆڕستانەکە، هۆووو... کۆنە گۆڕستانەکە، ئای چەندە دوورودرێژە، خۆ ناگەیە ئەوسەری. لە کۆنە گۆڕستانەکەدا، لە قەراغ رێگەکەوە، گۆڕێکی درێژی گەورەی لێ بوو، کێلەکانی کەوتبوون. دار بەڕوویەکی رووتاوەی بێ گەڵای لەسەر بوو، کرم تێی دابوو و بڕگەبڕگەی کردبوو. کەس نەبوو بەوێدا بڕوا و زراوی نەچێ. دەکرێ بەلای ئاوی تاریکی و رەوەزە پڵینگ و ئەشکەوتی جنۆکاندا بڕۆی بەڵام ناکرێ لە کۆنە گۆڕستان بچیتە پێشێ.

گەڕاوە و بە غاردان لە کۆنە گۆڕستانەکە دوور کەوتەوە و بەرەو گوندەکەی خۆیان تێی-قووچاند. ئیدی چوکووراوا و ئاغەژن و ئەو کاروانانەی کە دەبوو بەوێدا بێن و ئەو ئەسپەی دەبوو سواری بێ، ببوونە خەون و خەیاڵ:"ئاخی، خۆ ئەگەر ئەو گۆڕستانە کۆنە نەبوایە. ئاخی ئەگەر نەدەبوو... ئەگەر نەدەبوو." بە غاردان ئەوەندەی هێزی دەبەردا بوو، دوور کەوتەوە. تەنانەت گورگ ئاوڕێکیشی نەدایەوە.

"دەچمەوە گوندی. لە بنی گۆنییەکەدا ساواری تێدا ماوەتەوە. گەنمەکەش لە چاڵ دێنمە دەرێ و بە دەستاڕێ دەیهاڕم. دەی با درشت بێ، چییە. بۆ مەگەر لەگەروو ناچێتە خوار. دەی ئەمنیش دووجاری لە دەستاڕێ دەکەم. نەرمتر دەبێتەوە."

"گوندێکی چۆڵ. وزەی باڵی مێشیش نایە. بێسەرەوبەرە. چۆلەکەکوژی تێدا نییە. جا چۆلەکوژی تێدا نەبێ... بنیادەم خۆ بە دوو مانگ شێت و فێدار دەبێ. تەنانەت سریوەیەکیشی لێوە نایە..."

هیچ بیری لەوە نەکردبۆوە ئەگەر گوند چۆڵ بێ چ دەقەومێ. چۆڵ و هۆڵ. وزەی باڵی مێشیش نایە. یا ئەگەر رەشەبایەك هەڵکا، گڤە و گڤەکەی وەك تۆپ دەنگی دێ. بۆشایی و تەنیایی وردە وردە لە مێشکیدا گەورەتر بۆوە. "ئەگەر چیی ئیزگیلە بێن و گوندەکە داپۆشن چ دەقەومێ؟"

هەر لەوێ لە دەم رێگەکە هەڵترووشکا. ئاسمان بە رەنگە شینەتۆخەکەیەوە، هەر دەهات و پانتر دەبۆوە. چیاکان روونتر رێکتر دەبوون. نە دار دیار بوو نە ماڵ. بۆشاییەکە لە گوییدا دەزرینگایەوە. ئیزگیلە زیوییەکان لەو بێدەنگییەدا تەنیا بوون. شنەیەکیش نەدەهات. هیچ جوولەیەك نەبوو. بێ جوولەییەکی تەواو. لە ناکاو موچڕکەیەك گیانی داگرت. بۆشاییەکە لە ناخیدا هێلانەی کردبوو. ترسا. کروشمەی کرد. ئینجا قیت بۆوە. دیسان رووی کردەوە چوکوور. بەخۆی گوت:

"ئەوە نییە سەگ و پشیلەش لە ئاواییدا نەدەمانەوە. تەنیا جەواڵە رەنگاورەنگەکان و چاڵەکانی دەغڵ و دان بەجێدەمان. ریشۆڵەیەك دەهات و لە گوێسوانەی سەربانەکە هێلانەی دەکرد. ریشۆڵەی رەشی خاڵ خاڵ. لە بن تیشکی هەتاوەکەدا کەسك و رەش و سپی دەچۆوە. زۆربەی جووجەڵەکانی بەردەبوونەوە. نەرم ونۆڵ، لەسەر لەپی دەستم دادەنان و بەبێ ئەوەی ئازاریان بدەم، لەسەر هێلانەکەیانم دادەنانەوە. وەختایەکیش ئاسمان لەبەر ریشۆڵان رەش دەچۆوە.

کە ریشۆڵە ئاسمانێ دادەپۆشن، مندالی دێ شایی لە دڵیان دەگەرێ. ریشۆڵە گچکەیە بەڵام گۆشتێکی خۆش و بەتامی هەیە. کاتێ دە دانەیان لێ بکوژی و جەمە خواردنێك دەبن. دەیخۆی و پەنجە چەورەکانت دەلێسییەوە. لە وەرزی هاتنەوەی ریشۆڵەکاندا، لە هەموو لاوە تەقەی تفەنگ دێ. دەشت و چیا لە مژێکی خۆڵەمێشیندا نوقم دەبن. لەبەر دەرگای هەموو ماڵێك ئاگرێك دەکرێتەوە. لەسەر هەر کوچکاورێك قرچەو چزەچزی رۆن. بۆچرووکی چەوریی گۆشتی تازە و سووتاو بەتام و ئیشتیا بزوێن، گوندەکە پڕ دەکا. ریشۆڵە دێن و رادەبرن. دە پازدە رۆژان دوای هاتن و رۆینی ریشۆڵەکان، هێشتا بۆنی چەوریی تازە و سووتاوی گۆشتی ریشۆڵان، لە هەموو قاپ و قاچاغ و جلوبەرگ و پێست ونوێنەکانی ئاوایی دەنیشێ و دەمێنێتەوە.

ئەو وەختایەکی ریشۆڵەیەکی برینداری گرتبوو. کێ؟ کەس نازانی. ریشۆڵەکە لاقی بریندار ببوو. مرێمۆك دەستی بردبوو، بەڵام ریشۆڵەکە هەڵنەفڕیبوو. چاوە گەورەکانی پڕ ببوون لە ترس. پەڕ و باڵی وەك نەشتەریان لێ هاتبوو. باڵندەکەی هەڵگرتبوو و لە باغەڵی نابوو. دڵی باڵندەکە ترپەترپە لێیدەدا. گەرم بوو. لە باغەڵی دەریهێنابوو و سەیری کردبوو. ئای چ خەمێك

لە چاوەکانی ریشۆڵەکەدا بوو. ئاخ خوایە گیان، وەك چاوی ئاسکێکی بریندار... ئاسکی چوکووراوا. وەك چاوە رەشەکانی کچێکی هیوابڕاو. باڵندەکەی هێنابۆوە و بە برێك گەنمی هاڕدراو برینەکەی بۆ پێچابوو. گوندەکە بۆنی ریشۆڵەی لێ دەهات. دووکەڵی ئەو هەزاران ریشۆڵەیەی لەسەر ئاگرە سوورەکان دەبرژێنران، گوندەکەی تەنیبۆوە.

پەنجەکانی لە بن باڵە گەرمەکانی ریشۆڵەکە رۆکردبوو و گوتبووی:"ناتبرژێنم و ناشتدەم بە راوچی و بە منداڵان و بەهیچ کەس. بخۆ و بخۆوە. کە برینەکەت چاك بۆوە جا بڕۆ خەریکی هێلانەکەت بە."

دیسان راوەستا:"هەریەك کەس، یەك نەفەر بوو کە لە وەرزی سەرمادا راوی نەدەکرد. چاوەکانی وەك چاوی ریشۆڵەیەکی بریندار وابوون. هەمیشە پێ دەکەنی. بێ پسانەوە. تەنانەت لە کاتی گریانێشدا. "ئەحەمەدە شێت"ـی من، رۆڵەکەی خۆم. ئەك، دایك بۆت نەمێنێ، ئێستا لە کوێی؟"

ئەحە شێتە سپیکەڵە بوو. باڵابەرزێك بوو بەژنی دەتگوت دار عەرعەرە. لەو گوندەدا کەس نەبوو لە جوانچاکی و زمانخۆشی دا وەك ئەو بێ و کەسی واش نابێتەوە. "شێتە"قەت دڵی کەسی نەشکاندبوو. لای چیا بەرزەکەی پشت ئاوایی، نزیك لێرەوارە بەرووەکە، ئەوێ وڵاتی شاری پەریانە. کۆشکەکەی یەکسەر لە بلوورە. هەتاو لە کۆشکەکەی ئەوەوە هەڵدێ. رۆژێك لە رۆژان یەکێك لە کچەکانی شای پەریان، چاوی بە ئەحە دەکەوێ کە لە دارستانەکەدا خەریکی دار بڕین و پووشکە کۆکردنەوەیەز کچە بە دیتنی ئەحە زمانی لە گۆ دەچێ. دڵێك و سەد دڵ ئاشقی دەبێ. سەری سوور دەمێنێ. لەو کاتەدا لە جلوبەرگی شای جواناندا خۆی پێشانی ئەحە دەدا. ئەحەیش کە دەیبینێ، ئاشقی دەبێ. ئێستاش کە ئێستایە ئاشقێتی. کچ ئەحە دەباتە کۆشکەکەی باوکی. دوور لە چاوی باوکی زەماوەند دەکەن. ماوەیەك پێ دەچێ، پادشا دەزانێ کچەکەی شووی بە ئادەمیزادێك کردووە. ئەوەندە تووڕە دەبێ هەر مەپرسە. لە تووڕەییان وا لە ئەحە دەدا، ئەو غەڵفە* عەرعەرە نوقستان دەکا. کە دەیەوێ بیکوژێ، کچە خۆی دەخاتە بەینیانەوە و دەڵێ: لە پێشدا من بکوژە، دوایی ئەحەکەم. دەی با ئادەمیزادیش بێ. ئەمن خۆشم دەوێ. لێرە ئەشکەوتێکم بدەیە با لەگەڵ گراوییەکەم تێیدابژیێن. دایك و خوشکەکانی ئێوبژیوانییان دەکەن و ئیزن وەردەگرن ئەوان لە دووری کۆشك لە ئەشکەوتێکا بژیێن.کچە بە ئەحە دەڵێ:"لەم دنیایەدا بۆنی ئادەمیزادم لە هەموو شتێ پێ خۆشترە.

---

*غەڵف: ئەمامی گەنج.

هەر لە منداڵیمەوە هەر کات بایەکە لە لای گوندەکەی ئێوەوە هەڵیدەکرد، شێت و شەیدا دەبووم. بە تایبەتی لە وەرزی بەهاراندا کە هەموو دار و گیاکان گوڵیان دەکرد."

مریمۆك بە دەنگی بەرز گوتی:"گوڵیان دەکرد."

"کە گوندەکە چۆڵ دەبێ و هەمووان دەچنە چوکووری خواروو، ئەحە ژن و منداڵەکەی و ژن خوشکەکانی و هەر پەرییەکی حەزی لە ژیانی لادێیە و بۆنی بنیادەمی پێ خۆشە، هەڵدەگرێ و لە چیاوە دێنە نێو دێ. ئەگەر ئێستا بگەمەوە دێ، چاوم بە ئەحە دەکەوێتەوە."

دیسان ئاوڕێکی دایەوە و بە هەڵەداوان وەرێ کەوتەوە:"ئەحەی من، ببینێ، پێی سەیر دەبێ و وەك منداڵان گڕ گڕ پێ دەکەنێ. دوایی دەڵێ:"منداڵینە را مەکەن، مەترسن پەرییەکان، ئەوە نەنە مریمۆکە، "ئەمنیش بە بووکەکەی دەڵێم، "وەرە کچە جوانکلیەکەم وەرە، ئەتۆ زۆر ژیری. ئەگەر لە هەموو پەرییەکان ژیرتر نەبوای، جوانترین و دەم بە پێکەنینترین ئادەمیزادت هەڵنەدەبژارد. سڵ مەکەوە لە من. بۆ مەگەر پەرییەکانیش موسوڵمان نین؟ مەگەر ئەوانیش وەك مرۆڤ وا نین؟ ئێوە بڕۆن، بگەڕێن و سەما بکەن، ئەمن لایی لایی بۆ منداڵەکانتان دەڵێم و دەیاننوێنم. دەنگم هێندەی دەنگی پەرییەکان خۆش نییە. خوا دەزانێ دەنگی پەرییان چەندە خۆشە. بەڵام هەر لە زووەوە دەنگی من زۆر خۆش بوو. زۆر دەمێکە لایی لاییم بۆ کەس نەوتووە. دوای عەلی و دوای حەسەن... بەڵام ئەو دەمەی من لای لایی دەچڕم، هەر منداڵێکی بگریێ، لەڕێوە گیر دەبێتەوە. ئەمن دەبێ ئەو منداڵەم خۆش بوێ جا دەنگەکەم کاری تێ دەکا و گیر دەبێتەوە. ئەمن منداڵەکانی ئێوەم خۆش دەوێن. تۆ زمانی پەرییەکانم فێر دەکەی کچەکەی خۆم. ئەمن بۆ ئەوان نیوەی بە زمانی بنیادەمان و نیوەشی بە زمانی پەرییان لایەلایەیان بۆ دەڵێم با مافی پەرییەکانیش نەخورێ. کە گوندییەکان لە چوکوور گەڕانەوە، ئێوە ئەمنیش نەبەدی* دەکەن و دەمبەنە ئەشکەوتەکەتان. کچۆڵەکەم، دەڵێن کۆشکەکەی بابت چل ژووری هەیە و دەرگای هەموانیش داخراوە. لە هەر ژوورێکدا کانییەکی زێڕ هەڵدەقوڵێ. هەر کەس لوێچێ لەو کانیانە بخواتەوە قەت نامرێ. ئاخۆ لە ئاوی ئەو کانیانەت بە ئەحەی منیش داوە؟ دەبێ بیدەیەی کچۆڵەکەم. دەزانم بابت پادشایەکی بە زیپکوزاکوونە...."

دەڕۆیشت و ئارەقەی دەڕشت و لێوەکانی دەجووڵانەوە:

---

*نەبەدی: واتە شتێك کە بەدی ناکرێ. غەیب. پیرەژنان لە تووك و دوعایاندا دەڵێن:"دەك ڕۆڵە ڕەببی تیری نەبەدیت وێ کەوێ." واتە تیرێك کە دیار نیە و بەدی ناکرێ.

"کلیلەکانیشی لە نێو قژی سەریدا دەشاردنەوە... ئادەمیزادیش ئەگەر لەو ئاوانەی خواردباوە قەت نەدەمرد..."

"ڕێگەیەك بدۆزەوە کچۆڵەکەم، کاتێك بابت لە خەودایە، ئەگەر پاش مێردەکەت تۆ بمێنی، وەك من ئاوارە و سەرلێشێواو دەبی. بنیادەم پاشی مێردەکەی، وەك ئەوە وایە لەم دنیایەدا، لەو دنیا بێ سەروبەرەیەدا تاك و تەرا بێ. کاتێ بابت خەوی لێ کەوتووە، کلیلەکان بدزە. با ئەحمەد بێن بەو ئاوەوە بنێ و ئیتر نەمرێ. مام خەلیلی تووك لێکراو دەیگوت: ئەسپە ڕەشەکەی کوێر ئۆغلی لەو ئاوەی خواردبۆوە. هەموو ساڵێ لە بازاڕی حەلەب، ئەسپە ڕەشەکە بە سکەیەکی زێڕ دەدرا. ئەسپەکەیان بەر لە کازیوەی بەیانی دەهێنایەوە بازاڕ و لە چەقی بازاڕەکە دەیانبەستەوە، وا لەڕ ببوو سەگ کلکی لێ دابا دەکەوت. هێندە بێ هێز ببوو هەموو پەراسووەکانی دیار بوون. یەکەم کەس کە دەهاتە نێو بازاڕەکە و یەکەم کەس کە ئەسپە ڕەشەکەی دەدی، دەیکڕی. چونکە دەچووە هەر ماڵێکی خێروبەرەکەتی دەهێنا و بەڵا و نەهامەتیی لێ دوور دەخستنەوە. هەر بۆیەش لە ڕۆژانی بازاڕدا، خەڵکێك هەبوون کە شەو هەتا بەیانی چاوەڕێی دەبوون تەنانەت هەشبوون کەسانێك کە سەرانسەری ساڵ چاوەڕێ دەبوون بەشکم پێش ئەوانی دیکەی ببینن و بیکڕن."

"کچۆڵەکەم، دەبێ ڕێیەك بدۆزیتەوە و لانیکەم یەکێك لە چل ژوورەکان تەیار بکەی و بیکەیەوە و لە ئاوەکەی هەر نەبێ بە مێردەکەت بدەی. هەر کەس بۆنی ئادەمیزادی پێ خۆش بێ دەبێ کاری وا بکا، کچۆڵەکەم."

دانەوییەوە و سەیری قاچەکانی کرد. بزەیەکی هاتێ. بەخۆی گوت:"لاقەکانم باڵیان لێ رواوە. هەی لە دەوری ئەو چاوە ڕەشانەت گەڕێم ئەحەی خۆم. دیارە ئاگات لێمە. لەگەڵمی وایە؟ مەگەر ئەوە تۆ نی کە لە وەرزی لۆکە ڕنینەوەی دا، ئیزگیل کە هەواڵی لۆکە پشکووتنێ دێنێ، دەیهێنیتە بەر دەرگای مام خەلیل؟ ئەو "عەلی"یە درێژە کافرە کە دایکەکەی خۆی لە چۆڵ و چیایاندا بەرەڵڵا دەکا بۆوەی قەل و داڵ بیخۆن، لێی گەڕێ با بڕوا و بەغدا نیوەی ڕێیەی بێ. ئەحە گیان، دەبا بڕوا جەحەندەمی لێ پڕ بێ. ئەوە تۆ هەی."

"پێشینیان دەیانگوت: لووتی پەری ئێسکی نییە. هەر بەراست لووتی منداڵەکانی تۆش ئێسکیان نییە؟ دەی خۆ ئەوە عەیب نییە. با بڕێك لووتیان پان بێ چییە. هیچ پێت ناخۆش نەبێ ئەحە گیان. کاتێ لەو خوارەوە بەرەو ئاوایی هەڵدەگەڕێم، ئاخۆ ئەحمەد دەزانێ و دێتە پێشوازیی نەنە مرێمۆکی خۆی؟ لەوانەیە ژنەکەشی هەڵگرێ و لە گەڵ خۆی بیهێنێ."

لەناکاو دڕدۆنگ بوو. لاقەکانی تینیان تێدا نەما. وەك باتمانێکیان قورقوشم بـە لاقییـەوە هەڵواسیبێ. "ئەی ئەگەر نەهاتە پێشوازیت؟ ئەگەر وەك عـادەتی پەرییانـە، نـە ژنەکـەی و نـە خۆی بەچاو نەبینران؟ ئەو دەم چی؟"

"دەگریم. دەپاڕێمەوە و دەلالێمەوە و هاوار دەکەم و دەیکەمە ڕۆژی حەشرێ."

ڕۆژ لە نیوەڕۆی لادا بوو. خۆر بەرەو خۆرنشینێ داکشابوو. بۆ یەکەم جـار ئـاوڕی دایـەوە و بە هیواوە سەیری دواوەی کردەوە. کەس دیار نەبوو. هەر لـەوێ دانیـشت"لـە نێـو قـەل و داڵ و دڕندە و فڕنـدەدا و لـە سـەر ئـەو چیا بەرزانـە، بـە ڕۆژ و شـەو، بـەتاقی تـەنێ مامـەوە." بـە دەنگێکی بەرز و بە ترس و پەژارەوە گوتی:"خوایە گیان بمکوژە."

قاچی ڕاستەی ژانی دەکرد و هەموو گیـانی کوترابـوو و دەیزیڕانـد:"هـەر بـە ڕاسـتی بڵێـی کاروانەکە گەیبێتە چوکوور؟ وا زوو ناگاتێ. زۆری مـاوە. لۆکـە دەپـشکوێ.وەك هـەوری سـپی زەوی دادەپۆشێ. خەڵکی چوکوور ڕەش ئەسمەرن. تاوەسـووت و لـە ڕەنگـی مـس. هـێمن قـسە دەکەن. پێڵاوی ڕەش لەپێ دەکەن."

سیبەر بەسەر لێڕەوارەکە دەکشا. سمۆرەیـەك بەسـەر دارێکـەوە بـوو. چـاوەکانی وەك چـاوی کڵاوکوڕە دەدرەوشایەوە. چوکووراوا لەو باڵندانەی زۆر لێیە.

خاڵخاڵۆکەیەك هاتو لەسەر دەسـتی نیـشتەوە. مرێمـۆك گەشـایەوە و بـەخۆی گـوت"ئـەوە شانس و بەخت دێنێ. مزگێنیی پەرییەکانی هێناوە، مزگێنیی ئەحەی بۆ هێناوم."

بە قامکە قەڵشیوەکانی خاڵخاڵۆکەکەی لاواندەوە و گوتی:"خاڵخاڵۆکێی بـچکۆڵە، نەنـە مرێمۆکـت لەسەر گەڕێ. دەنگ و باس چییە؟ لە هاتنی ئەحەی من چ خەبەر؟ ژنەکەی چۆنە خاڵخاڵۆکە."

خۆشییەك لە ناخی گەڕابوو. کەیفی ساز بوو. وەختابوو خاڵخاڵۆکەکە بگرێ و ماچی بکا. هـاتبۆوە سەرەخۆ. ئێستا ئیتر وەك پەڕە کایەك سووك ببوو. ئەگەرچی هەموو گیان ژانـی دەکـرد بـەلام هەسـتی پێ نەدەکرد. ئەگەر پێی عەیب نەبایە، سەت ماچی لـە خاڵخاڵۆکەکـە دەکـرد و باوەشـی بـە دارەکـەی تەنیشتیدا دەکرد و دەیگوت:"ئەحە شێتۆکەی خۆم. ڕزگاریدەرەکەی من."

"خاڵخاڵۆکە، ئەوە ئەحە تۆی ناردووە بێیتە پێشوازی نەنە مرێمۆك؟ هەر لەبەر ئەوە هاتووی؟ ئـەتۆ خاڵخاڵۆکەی پەرییانی؟ دیارە زۆریش منداڵی. چەنێ گچکۆکەشی. لایی، لایی، لایی لایی لایـێ لایـی ، خاڵخاڵۆکە جوانەکەی من لێ، مزگێنییەکەت لەسەر چاوم. لەسەر سەرم لایی لایی..."

خاڵخاڵۆکەی لەسەر قامکە گەورەی دانا. بەو هەوایەی لایە لایی بۆ دەکرد خۆشی بۆ ڕادەژاند.

"لایی لایی لای ڕۆڵەکەم، لای لایی بچکۆڵەکەم."

“ئەگەر یەکێك ببینێ، دەڵێ ئەو مریشکە شێت بووە. لایەلایە بۆ خاڵخاڵۆکەیەك دەکا. دەڵێ: تەواو تێك چووە و لێم لە قاو دەدا.”

لە ترسی ئەوەی نەکا لەسەر قامکی هەڵفڕێ، وردە وردە خۆی وەرسووڕاند وگوتی:

“پەلە مەکە جوانکیلەکەم، ناقڵەکەم. مزگێنییەکەت لەسەر سەرم، لەسەر چاوم. سەربازی پادشای پەرییەکان. تۆ پەیامنێری ئەحەی منی. لێگەڕێ با پێم پێبکەنن و بڵێن، چما دەکرێ جرۆجانەوەر بدوێنی. دەی با بڵێن. بەڵام وەختێك کچە پەرییەك دەبێتە ژنی ئادەمیزاد، جرِ وجانەوەر ناتوانن ببنە پەیك؟”

چاوی بڕیە پشتە سوورە خاڵ خاڵەکەی. خاڵخاڵۆکە چەند جارێك ویستی بفڕێ و باڵەکانی لێك کردنەوە.

لێرە، لە لووتکەی ئەو کێوانە، پنچك پنچك، دڕکی وا هەن پێیان دەڵێن ماڵی پەرییان. وەکو کوارگ بە عەرزییەوە نووساون. ڕەنگەکەیان خۆڵەمێشییە و هەزاران خاڵخاڵۆکە هێلانەیان تێدا کردوون.

مریشۆك گوتی:”راوەستە ڕۆڵە راوەستە. خوا دەزانێ چ ڕێیەکی دوورت بڕیوە. ئیتر باڵەکانت تاقەتی فڕینێیان تێدا نییە. هەموو گیانت ژانێ دەکا.

لکێکی لەچکەکەی کردەوە و بە دوو قامکان بەبێ ئەوەی ئازاری بدا، خاڵخاڵۆکەکەی تێوەپێچاو گرێیەکی شلی لێ دا:

“ئە لێرەدا بحەسێوە ڕۆڵە گیان. لە ڕێگەی دوورەوە هاتووی. ئێستا دەست و قاچ و باڵەکانت تەزیون.”

بزەیەکی هاتێ و گوتی:”لەوێدا بێنەوە. لەوێدا بە ڕۆڵەم. هەتا گوڵێکی جوان دەدۆزمەوە...”

بە دڵێکی خۆش بەرەو گوندەکەیان بەڕێ کەوت.

## ٨

کە ئەلیف گەیشتە عەلی، لە نیوەڕۆ لای دابوو. دەموچاوە درێژەکەی عەلی رەش داگەڕابوو. چاوەکانی ماندوو بوون. لێڵ ببوون.

هەندێ روخسار هەن کە نهێنییەکان لە خۆیاندا رادەگرن و لە ناکاو هەڵیدەڕێژن. روخسارەکە لە ناکاو دەرەوێتەوە. ئێستا چیی رووناکیی ئەو بوو کوژابۆوە و تەواو تێکسمڕابوو. لەو روخسارەدا، شەکەتی و پەژارە و کوێرەوەری وا کۆ ببۆوە دەکرا دەست لەیەك بە یەکیان بدەی.

عەلی لە بن کۆڵەکەی دا کۆمابۆوە. ئەلیف زگی پێی دەسووتا. لە رێگە رۆیشتنەکەیەوە دیار بوو تینی لە ئەژنۆیدا نییە. بە راکێش راکێش دەڕۆیی. ماندوو و شەکەت، بەبێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، بە دەنگێکی لێڵ گوتی:"

ـ ئەتۆی ئەلیف؟

ئەلیف وەك ئاخێ هەڵکێشێ گوتی:

ـ ئەمنم. پێت وانییە زۆر رۆیوی؟ لە نیوەڕۆ لای داوە.

عەلی بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ با لای دابێ، دەی با لای دابێ. کاروان زۆر دوورکەوتۆتەوە. هیچ شوێنەواری دیار نییە. چیی نەماوە بگەنە لۆکە چنینەوە. شتێکی وای نەماوە. دەی با لای دابێ. و تفێکی خەستی رۆکرد. چۆڕچۆڕ ئارەقەی لە نێوچەوانی دەڕژا.

ئەلیف بە دەنگێکی کز گوتی:

ـ خوا پێستی سەری ئەو مام خەلیلە بە لەعنەت بکا.

عەلی پرسی:

ـ چی؟ چیت گوت؟

که بەدەستی راستەی نێوچاوانی دەسڕییەوە، ساتێك راوەستا:

ـ بەو حاڵەوە تا ئێمە دەگەینە ئەوێ، ئەوان چیی لۆکەیە دەیڕننەوە. هیچیشمان دەست ناکەوێ. ئەو هەمووە نازارەش کە چێشتوومانە، بەپووشێك. بڕۆ، خێرا بە ژنەکە خۆش بڕۆ. خۆ منداڵ ماندوو نەبوون.

حەسەن گوتی:

ـ جا چۆن ماندوو دەبم. ناوەڵڵا ماندووی چی.

بە راکردن وەپێش بابی کەوت.

کچە بڕستی لیبڕابوو. نێوچاوانی تێك نابوو. عەلی پرسی:

ـ دایکم لە بن دارە گویزەکە راوەستا؟

ـ نا، وەڕێ کەوتبوو و دەهات. وەك باڵندە باڵی گرتبوو. بەڵام دوایی دیار بوو ماندووبووە، لە قەراغ رێگەکە دانیشت. چ بکا لێ قەوماوە. هەوڵ دەدا چەندی بڕ دەکا سەرباری کەس نەبێ بەڵام... لەوانەشە وەڕێ کەوتبێتەوە و هەوڵ بدا بگاتە ئێمە. پێم گوت دایە پەلە مەکە. خۆت ئەزیەت مەکە،بەڵام خۆ گوێ ناداتێ و هەر دەڕوا.

عەلی بڕێکی دیکەش رۆیشت و لە قەراغ دارستانەکە راوەستا. لە دوورەوە، دارستانەکە وەك گەواڵەهەوری پەڵە رەش دەچۆوە. ئێستا گەیبوونە لێرەواری تۆرووس. لێرە پیاو بە چلەی هاوینیش دەیبەستێ.

ـ باروبنە بخەین ئەلیف؟ دەڵێ چی؟

ـ دەی باشە. خوا بکا ئەمشەو لێرە کەسیرە نەبین. باشە پووشکە و داری زۆرە. هەتا تۆ دێیەوە من ئاگرەکە دەکەمەوە...

عەلی کۆڵەکەی دانا. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و هەر دووك دەستی لە نێوقەدی نا و باوێشکێکی دا. ئێسکەکانی زریکاندیان. لاقەکانی دەبرژانەوە. لاقی چەپەی هەڵێنا و سەیری کرد. بنی پێی کون ببوو و زیخ و چەو چوبوونە قەڵشتەکەیەوە. پانێشی قەڵشیبوو.

دوای ئەوەی کۆڵەکەی بارەوبار کرد گوتی:

ـ ئەمن دایکی خۆم باش دەناسم ئەلیف، باشی دەناسم. ئەو دوژمنی من نییە. بێ تاقەتییەکەی خۆی پێ قبووڵ ناکرێ. ئەو لەکۆڵ کردنەی من دەمرێ. ئەو دژمنی من نییە، دوژمنی پیرییە. ئەسپەکەش بیانووە. ئەگەر مام خەلیلیش سوار نەبوویا و ئەو ئەسپە مردبایە و ئەمن دایکم لە کۆڵم کردبا هەر وای لەگەڵم خراپ دەبوو و دیسانیش قسەی لەگەڵ نەدەکردم.

ئەلیف گوتی:

ـ نەنە مرێمۆکی من ژنێکی سەیرە. بۆ بنیادەم پیر نابێ؟ لە پێ ناکەوێ؟

عەلی:

ـ دایکم هێشتا بە پیریەتییەکەی رانەهاتووە. بە حاڵ دڵی بێشێنین، خۆی دەکوژێ. کچێ، نەتدیوە هەموو رۆژێ خەنە لە سەری دەداتەوە.

ئەلیف پێ کەنی. عەلیش.

ـ چی وای نەماوە ببێتەوە بووك و قژی کورت بکاتەوە.

عەلی پاڵی بەدارەکەوە دا. حەسەن چووبوو پووشکە کۆ بکاتەوەو لە بن دار نارەوەنێکدا هێندەی خۆی پووشکە کۆ کردبۆوە. پنچکە هێلانە پەرییەکیشی هەڵکەندبوو. ئاخر ئەو هێلانە پەرییە لە پووشکە و چرپییەکە باشتر گڕی دەگرت. حەسەن شەمچەی پێوە نابوو و رێك لەو کاتەدا کە دەیویست هێلانە پەرییەکە ئاگردا عەلی دیتی و هەرای کرد:

ـ کوڕە هەتیوە، رات وەشاند؟ پڕە لە جڕ و جانەوەر. ئەوە هێلانەیە. فڕێی دە و بە شووڵ و چرپی هەڵیکە.

حەسەن بڕێك دوور کەوتەوە و پنجکە دڕووەکەی راوەشاند. بەسەدان خاڵخاڵۆکە کەوتنە خوارەوە. دیتی هەر نابڕێتەوە. هەتا رایدەوەشێنێ هەر خاڵخاڵۆکە بەردەبنەوە. تەلاشێکی لە چنارەکەی تەنیشت خۆیەوە کە بە تەور تاشرابوو، لێ کردەوە و ئاگری دا.

عەلی تاقەتی رۆیشتنی نەبوو. تا زیاتر دادەنیشت پتر شل دەبۆوە و هەموو گیانی دەستی کردبوو بە زیراندن و ئازار. زانیی ئەگەر بڕێکی دیکەش دانشێ ئیتر ناتوانێ هەستێتەوە. وەك کەسێکی لە خەو راچڵەکێ، بە بریارێکی دەربەڕی و گوتی:

ـ من دەڕۆم.

وەڕێ کەوت. ئەلیف لە دواوە گەیشتێ و بابۆڵەیەکی دایە و گوتی:

ـ لە برسانا مردی. هانێ بیخۆ. پەنیریشم تێ کردووە.

عەلی بەبێ ئەوی سەیری بکا، بابۆڵەکەی لێ وەرگرت و وەڕێ کەوت و بە غار دوور کەوتەوە.

ئەلیف ماوەیەك لەوێ راوەستا و لە دواوە سەیری کرد و گوتی:

ـ چ بکا داماوە. هەرچی بشی کا بێ سوودە. بەو حاڵەشەوە هەتا ئێمە دەگەینە چوکوور، خەڵك تەپوتۆزیان لە لۆکە هەستاندووە... لەوانەیە ئەو دەمەی ئێمە دەگەینێ ئەوان لە گەڕانەوە بن. چۆنە زستانی ئەمساڵ لە چوکوور بمێنینەوە.

گەڕاوە لای کۆڵ و بارەکەیان و ترخێنەی لە ناوێ کرد و خووساندی. بەخۆی گوت:" خوا دەزانێ عەلی کەنگێ دەگەڕێتەوە. لەوانەیە نیوە شەوێ و لەوانەشە بەیانی..." لە تەنیشت ناورگەکە دانیشت، سەری خستە سەر ئەژنۆکانی. منداڵەکان لە تەنیشتیەوە یەك پشوو قسەیان دەکرد و نەیاندەبڕییەوە. بەڵام ئەو هیچیان لێ تێ نەدەگەیشت. حەسەن گوتی:

ـ دایە، ئەنکم بەتاقی تەنێ لەو سەر کێوە ناترسێ؟

ئۆمەخان گوتی:

ـ دیارە ناترسێ. ئەگەر ترسابایە ئێمە لەلای دەماینەوە.

حەسەن گوتی:

ــ تۆ بێدەنگ بە، لەگەڵ تۆم نییە. دایە ناترسێ؟

ئەلیف گوێی لێ نەبوو. ئەرێ لەگەڵ تۆمە دایە. دەڵێم ناترسێ؟ دایە.

کچە پەیتاپەیتا وەڵامی دەدایەوە:

ــ ناترسێ... ناترسێ.

ـ دایە گیان، لەگەڵ تۆمە، ناترسێ؟

ئەو جارەیان سیخورمەیەکی گەیاندبوویە. ئەلیف سەری هەڵێنا و بە چاوە ماندووەکانییەوە بەبێ ئەوەی بزانێ دەڵێ چی گوتی:

ــ ناترسی.

دیسان سەری کردەوە سەر ئەژنۆکانی. حەسەن نێوچاوانی تێك نا:

ــ ئەدی بەسەری تۆ، ناترسێ، وەڵڵاهی وا دەترسێ زراوی دەچێ.

کە ئۆمەخان پێی داگرتەوە کە ناترسێ، حەسەن دەستی لە تیتکی نا و شەڕ گەیشتە قرِپی.

دایکە دیسان سەری بەرز کردەوە و بە دەنگێکی کزەوە گوتی:

ــ چیتان دەوێ سەر شینانە، دەردمان کەمە نۆرەی ئێوەیە؟

دیسان سەری بەردایەوە.

دەنگە ماندووەکەی دایکیان، ترساندنی. بە پەژارەوە چاوە کزەکانیان لە عەرزی بڕی و بێ دەنگ مانەوە.

عەلی دەڕۆیشت و یەك پشوو لەبەرخۆیەوە دەیبۆڵاند"

ــ سبەینێش نەبێ دوو سبەی... سبەینێش نەبێ دوو سبەی... سبەینێش نەبێ... لۆکە چنینەوە دەست پێ دەکا و ئەگەر لۆکە بەرەکەتی تێکەوتبێ و باشی گرتبێ، خاکم وەسەر...

هەمووان بە کۆشێك پارەوە دەگەڕێنەوە. ئای بەختە رەشەکەی من... ئاخ، ئاخ لەو بەدبەختییە... نە فڕێ دەدرێ و نە دەشفرۆشرێ... بەو حاڵەوە کە ناچارم سێ جاران رێگەیەك بڕم، چۆن دەگەمە چوکوور. چما خەڵك لەسەر من رادەوەستن؟ ئەوان دەست بەکاری خۆیان دەکەن. جا واش لۆکە دەڕننەوە هەر مەپرسە... عادیل ئەفەنیش خۆ نازانێ موسوڵمانێتی چییە. دەرگای ماڵێ لە رێسمە دەبا و دەیبا. تەنانەت ئەو ئامووره تاوەسووتەش کە لە مەزراکە کەوتووە، هەڵدەگرێ و دەیبا. ئارد و ساواری ماڵەکەش... سبەینێیش نەبێ دووسبەی... کوێخاش خۆ ویژدانی نییە. پیتاکی خۆی دەخاتە سەر برینجیش. دوژمنە دوژمن.. سبەینێش نەبێ دووسبەی...

هەنگاوەکانی لەگەڵ هەوای ئەگەر سبەینێش نەبێ دوو سبەی رێك خستبوو. غاری دەدا. جار و بارە کۆپلەیەکی شینگێڕییەکی وەبیر دەهاتەوە و تا دەگەیشتە سەر زمانی، عەلی لەبیر خۆی دەبردەوە. چەمەرییەکی دیکە، کە پیاوێکی زل لەسەر تاوێرە بەردێك دابنێ و وای لێ بکا زۆر زۆر بگریێ. ئەو چەمەرییەی بۆ عوسمانیان دانابوو. عوسمان کوڕە بووری عەلی بوو. کاتێك لە سەفەرێکی دوور و درێژەوە دەگەڕایەوە، لە زینوێی مرێم چیل تووشی باو بۆران ببوو. دوو شەو و رۆژان لە نێو گژەبا و کرێوەدا رێی بڕیبوو و ئاخرییەکەی لەپێ کەوتبوو و بڕستی لێ بڕابوو. بەهارێ تەرمەکەیان لە بن بەفردا دۆزییەوە. عەلی دڵی خۆش بوو کە وەرزی زستان نییە. ئەوە نەنە سوڵتانجە بوو ئەو چەمەرییەی دەچڕی. دەیگوتەوە دەگریا. تا بە تەنێ وەڕێ دەکەوت، هەوڵی دەدا پێشی بگرێ و نەهێڵێ بڕوا.

کوڕم سەرما کەسیری کردی رۆڵە
چ نامەردی ئەتۆی ناشت دەستی بشکێ
خودایە خۆت بەزەییت بێ بە مندا
کوڕێکم بوو کوڕێ، دوای چوار کەنیشکێ

هەڵت نەدابوو ئاڵا لەسەر بان
ئاگری سین سینت دانەگیرساندبوو
رۆڵە کۆچکردووم بێ مرادەکەم
دەستی بەخەنەت رانەوەشاندبوو

چەمەرییەکە هەر دەهات و لە ناخیدا پنجی دەکوتا. هەرچی هەولّی دەدا لە مێشکی دووربخاتەوە، وەکو سیبەری ترسێك دڵی دەگوشی. چەمەرییەکە وەك بڵێی بە ئەسپایی لە ناخی شینایییەکەوە بێتەدەرێ، دەردەکەوت، ئاخری بوو بە هەوایەك. عەلی تێی چریکاند لە هەوایەکی دڵتەزێنی غەریب و دڵتاوێن. کە دەیچڕی چاوەکانی پڕ دەبوون لە فرمێسك.

بیری کردەوە:"قەت ئەو چەمەرییەم ئاوا بەسۆز و بە غەریبییەوە نەگوتبوو." دیسان لەبەرخۆیەوە گوتی:"سبەینێش نەبێ، دوو سبەی... سبەینێش نەبێ دوو سبەی..."

هیچ رێگە چارەیەکی نەدەدۆزییەوە.

"سبەینێش نەبێ... گوندییەکان..." بەکرە شێتی هاتە پێش چاوی:"ئەگەر ئەمساڵ لە لۆکە رنینێ بوایەم... ئەگەر دەمتوانی لە کاتی خۆیدا بگەمێ... بەکرە شێتەی... خوا بزانێ چیم لەو ژنەت دەکرد، وەڵلاهی کلاوێکم بۆ دەدرووی نەمدەهێشت هەر بشزانی."

دوایی خۆی تەریق بۆوە لەو خەیاڵانەی بە مێشکیدا هاتبوون:"خوایە، تۆ خۆت بەندەی خۆت دەبینی، خوایە گیان لە گوناحانم خۆش بە. خوایە گیان، خوای گەورە... بەڵام ئاخر ئەو بەکرە شێتەش زۆر گەوادە. ئاخر چۆن دەبێ دوو شاخی بۆساز نەکەم و گەوادی نەکەم. ئێستا هەرچی گەنجی گوندییە، ئەرێ وەڵلا... ئێمەش جارێك... هەر لە داخان. ژنە دڵ تەڕە. وەڵلا لە پێش چاوی بەکرە شێت دەرپێیەکەی دادەکێشێ و دەڵێ دەی کوڕە وەرن... بڕواتان بێ وا دەڵێ. ئەگەر یەك رۆژ زووتر بگەمە چوکوور، ئاد و بەڵێن بێ خوایە گیان، قوربانییەك دەکەم. کەڵەبابێکی سووری گەورە. خوایە زوو بمگەیێنە چوکوور. ئەتۆئەگەر زوو بمگەیێنیتە چوکوور ئەمنیش ئەمساڵ هیچ کارم بەسەر ژنەکەی ئەو بەکرە شێتە زۆڵەوە نابێ. چون تۆ قایل نی بەو کارە خوایە گیان. هەموو نیشانەکان وایان پێ گوتم. شەرت بێ دەسنوێژم لێی نەشکێ. هەر لە داخان بوو وام گوت. ژنی کابرایەکی ئەوەندەی زوڵم لەو گوندییانە کردووە... هەر چونکە تۆ پێت خۆش نییە.. ئەمنیش..."

غاری دەدا. کە ماندوو دەبوو شلی دەکردەوە و پشوویەکی دەدا و دیسانەوە غاری دەدایەوە. کە چاوی بە چڵوکەکانی داری چاکی کەوت، بەو خەیاڵەی ئێستا نا تاوێکی دی تووشی دایکم دەبم، هەنگاوەکانی شل کردنەوە.

دەمەدەمی رۆژاوابوون بوو کە گەیشتە بن دارە گویزەکە. پێی وابوو دایکی لەوێیە و لە پەنا ئاگرەکەی ئەوێ چاوەڕێیەتی. کە لەوێ نەیدی، سەری لێ شێوا. لێوەکانی کەوتنە لەرین.

ماوەیەك لە بن دارەکە راوەستا و چووە فکرەوە. کە کزە بایەکە لەشە ئارەقکردووەکەی سارد کردەوە، وەخۆ هاتەوە. بیری کردەوە:"دایکم، لە دووامەوە، لەو ڕێگەیەدا وا بڕیومە جێ ماوە. کە بە پەناشیدا تێپەڕیوم متەقی لێوە نەهاتووە. ئەمنیش کە دەڕۆم خۆ چاو لە راست و چەپی خۆم ناکەم. دایکم بڵێ چی. هەمووی خەتای منە. باشە چ دەبوو ئەو مام خەلیلەم سواری ئەسپەکە نەکردبایە. لەوانەش بوو نەمردبایە. نەمتوانی خۆ لەبەر ئەو ئازارە راگرم وا لە چاوەکانیدا بوو. یا خوا، ئەو پیرە سەیە چاوەکانی دەرپەڕن. ئەویش لەگەڵ کاروانەکە لێی دا رۆیشت و بەتەنێ لەو چیا و چۆڵە جێی هێشتم. خەتای خۆمە، هەر هەمووی خەتای منە. دایکم ئەگەر یەك قسەشم لەگەڵ نەکا، ئەگەر گووشم لە زاری بەستێ، هەر حەقێتی. بەڵام دیارە کە بە پەنایدا تێپەڕیوم دیتوومی. باشە قسان ناکا با نەیکا. بەڵام لانیکەم دەیتوانی بکۆخێ. ناشکۆخێ، خوا کۆخینەکەشی بەرێتەوە و لە کۆڵ منی بکاتەوە. تۆبە، خوایە، هەزار جارتۆبە. پیاو باش نییە ئاواتەخوازی مەرگی یەکێکی دیکە بێ. بەڵام ئاخر بۆ ئەو هەمووە ڕێگەیەی پێ بڕیم و ئەوەندەی ماندوو کردم. نایەوێ بێتە کۆڵم با نەیە. بەڵام تۆ خوا دروستە ئەوەندەم ماندوو بکا و سەرگەردانم بکا؟ با نەیەتە کۆڵم." پێی وابوو:" لەوانەیە هەر لەو دەوروبەرانە بێ، لە نێو ئەو پنچکانەدا. لەوانەشە لە قولکەیەکدا خەوی لێ کەوتبێ، لەوانەشە لە سەر ڕێگا خەو بردبێیەوە و لێی کەوتبێ."

دەستی کرد بە هەرا کردن. تا هێزی دەبەردا بوو هەرای دەکرد و کێوەکان دەنگیان دەدایەوە:"دایەەەەەەەە.. دااااایییەەەەەە... دایەەەەە... وەڵام بدەوە. هاتووم بتبەم. جواب بدەوە دایکە گیان.. جواب دەوە دایە گیان... جواب دەوە ئەگەریش حەزت لێ نییە قسەم لەگەڵ بکەی، مەیکە. لەگەڵ دارەکەی تەنیشتت قسە بکە. لەگەڵ رەوەزەکەی پشت خۆتەوە قسە بکە. لەگەڵ خۆڵەکەی بەر پێت بدوێ. لەگەڵ گەڵا رزیو و پواوەکان بدوێ، لك و پۆپی دارەکان بدوێنە. تەنیا یەك قسە بکە و تەواو. دەنگت بێ دایە... خەڵك سبەینێش نەبێ دوو سبەی دەگەنە لۆکە چنینەوە. ئەزیەتم مەدە دایە. گوویەك بوو خواردم و ئەسپەکەتم کوشت. هەمووی خەتای منە دایکە جوانەکەم، لێم خۆش بە، لای خوداش دەڵێم خەتای من بوو. جواب دەوە دایە دایە..."

زۆری هاوار کرد و راوەستا و پشوویەکی هاتەوە بەر و هەرای کردەوە. لە هیچ کوێوە وستەیەکیش نەهات.

بەخۆی گوت:" ئەگەر لێرە بوایە، لەبەر ئەو هەمووە هەرا و هاوارەی من بێ دەنگ نەدەبوو. خۆ کافر نییە. ئەویش دڵی هەیە.

دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت دایکی لەوێ نییە، هەر بەو ڕێگەیەدا کە لێوەی هاتبوو گەڕایەوە. هەر چارەگێك جارێك رادەوەستا و تا هێزی لەبەردا بوو هەرای دەکرد:

"دایە،، دایە:" دەنگی کز و پەرۆش بوو. وردە وردە دەنگەکەی کزتر و نزمتر دەبۆوە. "هۆۆۆۆۆی ی ی ی دایە هۆۆ ۆ ۆ " هەر جوابێك بدەوە و هیچی تر. قسەم لەگەڵ مەکە نا. بە خۆڵەکەی بن پێت بڵێ:"ئەی خۆڵەکە، ئەمن لێرەم، ئەی خۆڵەکە."

بەتڵێکی شەو راکشابوو، کە گەیشتەوە لای باروبنەکەی. لە پێشدا ئەو ئاگرەی دی کە لە بن دارەکە داییسا. کەنزیك بۆوە، ژنەکەی ناسییەوە سەری وەسەر چۆکی کردبوو. بە شڵەژاوییەوە لە دوورەوە هەرای کرد:"دایکم هات؟ ها ئەلیف؟"

ئەلیف بە خەواڵوویییەوە سەری بەرز کردەوە و بەرەو لای دەنگەکە رووی وەرسووڕاند. کە زانی "عەلی"یە گورج هەستا."دایکم چیی لێ هاتووە ئەلیف؟ ها؟"

ئەلیف چیی نەگوت. نەیدەزانی چ بڵێ. بەرەو لای عەلی غاری دا. عەلی دەستی ژنەکەی بە سۆزەوە رێك گوشی.

ـ دایکم کەی هات؟

ئەلیف تفی زاری قووت دەدا.

ـ بۆ دەنگت نایە ئەلیف، نەکا دایکم نەهاتبێ؟

ئەلیف بە دەنگێکی ماندوو وەڵامی دایەوە:

ـ نا، نەهاتووە، نەتدۆزییەوە؟..

عەلی وەك مردووەك لە پەنا ئاگرەکە لێی کەوت وگوتی:"نا، نەمدۆزییەوە. خوا بە لەعنەتی بکا. خودا غەززەبی لێ بگرێ."

بەرەورووی یەکتری دانیشتن. ماوەیەك بێ دەنگ بوون. دوایی عەلی سەری هەڵێنا. سەیری روخساری ژنەکەی کرد کە لەبەر بڵێسەی ئاگرەکە سوور داگەڕابوو:"پێت وایە دایکم چیی بەسەر هاتووە؟ بەو نیوە شەوە لە کوێ کەوتووە؟"

ئەلیف هیچی نەگوت:"لەسەرەخۆ دەگریا. برێك دواتر گوتی:"چۆنە دۆینەکە بخۆین و بکەوێنەوە رێ و بچین بەشوێنیدا بگەڕێین. ئەمشەو دەمرێ. درندە لەتوپەتی دەکەن."

عەلی گوتی:"ئێشتیام لە هیچ نییە. بەڵام...."

ژنه مەنجەڵەکەی بردە لای عەلی و نانەکەشی لە پەنا دەستی دانا. کەوچکێکی دارینیشی دایە دەستی. عەلی کەوچکەکەی پێ ڕانەدەگیرا. کە دەیویست دۆینەکە بۆلای زاری بەرێ، چی وای نەمابوو کەوچکەکەی لەدەستی بەربێتەوە.

دوای ئەوەی چەند کەوچکێکی خوارد، کەوچکەکەی دانا. دەستەکانی لەسەر عەرزەکە دادان و گیانە تەزیوە بەژانەکەی جووڵاند و هەستا. بەناڵەیەکەوە گوتی:"یاڵڵا ژنەکە، هەستە، هەستە با بڕۆین."

ئەلیف:

ـ ئەی ئەگەر منداڵەکان بەخەبەر بێن؟..

عەلی:

ــ بەرەبەری بەیانی دەگەڕێینەوە.

دیسان بەرەو دارە گویزەکە وەڕێ کەوتنەوە.

لە لێڕەوارە دوورەکەوە گڤەی با و لوورەیەکی لێڵ دەبیسترا. جارنەجارێك بۆنی کاژ و نارەوەن و پنگە لەگەڵ شنەی بایەکە دەهاتن. لە دووردوورەوە و لەوانەشە لەو دیو دارستانەکەوە بوو، چەقەڵێك دەیلووراند. عەلی بەڕێدا دەڕۆیی بەڵام خەواڵوش بوو. ڕێگەکە ڕێك بوو. ئەگەر چاڵ و قووڵی هەبوایە، بە دڵنیاییەوە عەلی هەر سەرموقلاتی دەدا. لەوکاتەوە کەوتبوونە ڕێ، تەنانەت بۆ جارێکیش ڕانەوەستابوون کە دوو قسە پێکەوە بکەن. ئەلیف هەنگاوێك لە پێشترەوە دەڕۆیی.

عەلی بە خەواڵووییەوە خەیاڵی دەکرد. بەخۆی دەگوت:"خۆزگە بارانێکی خەست لە چوکوور دایکردبا و لافاو هەموو وڵاتی داگرتبا." ئەو دەم منداڵ بوو. دەریای بێ سنوور و بێ بن کە مۆر مۆر دەچۆوە، ڕۆژێك دەمەو بەیانی، خۆر کەوتبوو و پێدەشتە لمەکەی داگرتبوو. دەریای لم لە زێڕی تواوە دەچوو. زێڕەکە ماوەیەك شەپۆلی دابوو و دوایی کە هەتاوەکە ڕۆیبوو، دەریاکە دیسانەوە ببۆوە دەریاکەی جاران. بە کەفوکوڵی سپی‌یەوە:"دەریات پێ چییە؟ ئاوێکی زۆرە، تا چاو بڕ دەکا."

"ئێستا دەبێ بارانێکی خۆش بباری. وەك ئەو ساڵە. کەپرەکان ئاو بردبوونی. ئەوبەری مەزرای لۆکەکە دارستانی سپێدار بوو. حیکمەتی خودا بوو. دارستانێك کە لە چڕتر لە لێڕەوارە کاژەکەی چیاکانی تۆرووس. لەوانەشە دە هێندەی ئەوان چڕتر، کە بەرامبەریدا ڕادەوەستای دەتگوت ئەو چوکووراوایە سێ شتی لێیە:"پێدەشتێکی تەخت و بێ هەوراز و نشیو، هێلکەیەك

لەو سەرییەوە دانێـی لەمـسەرییەوە دەبیـینی. دوای ئـەویش دەریایـەك كـە مـۆر دەچـێتەوە و ڕەنگی پرتەقاڵی بەخۆوە دەگرێ و بەردەوام ڕەنگ دەگۆڕێ و کەس نـازانێ سـەری بەکوێوەیـە و لـەکوێ تـەواو دەبـێ. یەکیـشیان ئـەم دارسـتانە سـپێدارە. دەڵـێن ئـاوێکی زۆر بـەودیوی دارستانەکەدا دەڕوا. ئەو دارستانە سەرو بنی دیار نییە. پیاو پێی وایە لەو بەرەوە هەتا دەریا و لە پشتەوەڕا هەتا کێوەکانی تـۆروس هـەر دارسـتانی سـپێدارە. پێـت وایـە هـەموو دنیـا هـەر دارسـتانی سـپێدارە و مـارو کیـسەڵ وکـەمتیار و ڕێـویی کلـك درێـژ و چـەقەڵی چـاو زیـت و بوونەوەری نەبەدی و نەناسراوی تێدایە... پڕە لە پەری و خێو و جنۆکە..."

"یاخوا بارانێ داکا. بارانێکی وەها، خانووبەرە و دار و کەپر لە ڕەگە و هیمەوە هەڵقـەنێ و بیبا. دەبێ ئاومالَّك سەر ئاوەکە داپۆشـێ. بـارانێکی وا، وەك گـۆزەی سـەرەوژێر بێتـەخوارێ. دەبێ بارانێك بباریَ وەك ئەوکاتی کە هەموو داروبارەکانی بە گڵ و ڕەگ و ڕیشە و بـە کیـسەڵ و ڕێوی و گورگ وئەسپ و مانگ و خێو و پەرییەکانەوە رادا و بردنی.."

"ئەوبەری دەریاکە، لەسەر خەرەندەکە کۆ ببووینەوە. تـازە تـاو هـەڵاتبوو. ئێمـە، هەرچـی کرێکاری لۆکەڕنینەوە بوو، هەتا سەر ئیسقان تەڕ ببووین و خووسابووین و هەتا کەڕەی بەیانی لەسەرمانا هەڵلەرزیبووین و خۆمان بەیەکدییەوە نووساندبوو. باران بۆچاوترووکانێکیش چییە خۆشی نەکردبۆوە."

"کـە روونـاکی کـردەوە، دیتمـان بڕێـك دوورتـر، لەسـەر پێدەشـتەکەوە، دارسـتانێکی سپێدار، بەبێ ئەوەی تەنانەت دارێکیشی بەلادابێ یان کـەوتبێ، بـە پانـەوە بـەرەو دەریـا دەخزێ. کرێکارەکان کەسیرە ببوون و بارانەکەش وەك گۆزەی سەروبن هەر دەهاتە خوارێ. هیچ کەس هیوایەکی نەمابوو. بێ پسانەوە هەڵدەلەرزین. ئەگەر بارانەکە لێ نەدەکردەوە، چار نەبوو جگە لەوەی هـەموو لەسـەر خەرەندەکـە بێننـەوە و لـەوێ کەسـیرە بـن و ببنـە سەهۆڵ. دیارە دەکرا بێیە خوارێ و پەنا بەریتەبەر گوندێك، بەڵام نەدەگەیشتێی. مـەودای نێوان تەپۆڵکی خەرەندەکە و گوندەکان هەموو کەوتبووە بن ئـاوەوە. پەردەیـەك لـە بـاران کەوتبووە نێوان ئێمە و هەتاو و ئێمە و دەریاوە. یاخوا دوژمنیش بارانی وای لێ نەبارێ. بەڵام ئێستا با بارانێکی وا بباریَ... سەیرمان کرد. دارستانە سپێدارەکە کەوتووەتە ڕێ و هات و گەیشتە قـەراغی دەریاکـە. هەرکـەس چـیی پـێ خۆشـە بیڵـێ بـەڵام مـام خـەلیل پیاوێکی ژیرە. گوتی:"سەیر کەن کوڕینە، ئەوە حیکمەتێکی گەورەی خودایە. پەرجۆیەکی گەورەیە نیشانی بەندەکانی خۆی دەدا. سەیری کەن کوڕینە..."

لە ڕەوەزەکەی ئەوبەری ڕێگاکەوە کوندێك سێ جار خوێندی. بە دووی ویدا چووڕە پۆپنەکییەك سێ جاری خوێند:"چووڕڕچووڕڕڕچووڕڕڕ". جا ئەگەر ئەو بارانە بە نیعمەتی خوای نەزانین ئەدی نیعمەتی خوای چییە؟ سەیر بکەن. جوان بڕوانن... دارستانێکی ئاوا گەورەی بە ڕەگ و ریشەوە هەڵکەندووە... نەك لە ڕەگەوە، هەر لە تەرکی عەرزەکەوە هەڵیکەندووە و دەیهێنێ."

"کە ڕۆژ بۆوە و تیشکی خۆر لەو لێمشت و لافاوەی دا کە لەبەر بارانەکە دەڕۆیی و چوکووراوا لە بن ئاودا دەبریسکایەوە. گوندییەکان ڕزگاربوونی خۆیانیان لەبیر کرد و چاویان بڕییە ئەو دارستانە سپێدارەی دەخوشی و دەهات. دارستانە سپێدارەکە هات و هات و گەییە لێواری دەریاکە. کرێکارەکان لەسەر تەپۆلکەکە بوون و لە دڵەخۆیاندا گوتیان:"ئیشەڵڵا دارستانەکە هەر لێرە لە قەراغی ئەو دەریایە دەمێنێتەوە." لەگەڵ دەرکەوتنی یەکەم تیشکی ڕووناکایی سپێدارەکان وەك کچ بەناز خۆیان ڕاوەشاند."

"ئەوان چاویان بڕییە کەنارەکە. بۆ ساتێك دەتگوت دارستانەکە لە قەراغی دەریاکەدا ڕاوەستاوە. دوایی لەپڕ دارەکانی پێش پێشەوە خزینە نێو دەریاکەوە. بە دوای ئەواندا ڕیزێکی دیکەش خزین و تێکەوتن و وردە وردە ڕیزەکانی دیکەش. بێ پسانەوە لە دوورەوە دارستانی سپێدار بە دارە بەرزەکانییەوە دەخوشی و دەهات و خلۆر دەبۆوە. خوشی و هات و، ڕیز ڕیز کەوتە خوارەوە. هەتا شەو داهات و باران لێی کردەوە هەر وا بوو."

لە خەیاڵی عەلیدا هەر دارستانە سپێدارەکە بوو کە بێ پسانەوە دەخوشی و دەهاتە پێشەوە. لە کەناری دەریاکە ساتێك ڕادەوەستا و دوایی لە ناکاو دەخزی.

"بارانەکە حەوتووەك خۆشی نەکردەوە. دارستانەکە خزی و هات و لەو حەوتووەدا هەمووی خزی و چووە دەریاوە. ئەگەر گوندییەکان نەهاتبان و لەسەر ئەو تەپکە گڵانە ڕزگاریان نەکردبایەین، هەر هەموومان بە ژن و منداڵەوە تێدا دەچووین."

هەڵەنگووت. عەلی کە شەکەت و خەواڵوو بوو، ئەگەر خێرا خۆی نەگرتباوە، شڵپ بە عەرزیدا دەکەوت.

ئەلیف خێرا خۆی گەیاندێ و پیلی گرت و ماوەیەك بەبێ دەنگی ڕۆیشتن. ئاخری عەلی بە دەنگێکی نەرم و بلاوێن و ناسك بە ژنەکەی گوت:"ژنەکە، ئەرێ بارانەکەت لەبیرە؟ ئەوەی دارستانە سپێدارەکەی وەك لافاو کردە دەریاوە. ئەوێ ساڵێ گوندەکەی ئەنگۆش هاتبوونە چوکوور. وانەبوو؟"

ئەلیف"

ـ ئاییشش.. خوا ئەو ڕۆژانە نەهێنێتەوە. خەڵکی گوندەکەی ئێمە سێ ڕۆژان لـە بـن ئـەو بارانەدا سـەرلێ شـێواو مانـەوە و نـەیانتوانی خۆیـان بگەیێننـە هـیچ گونـدێك. هـەموو وڵات تاریکەسەلات بوو.

عەلی:

ـ جا ئەمشەو بێ یا سبەی دەبێ بارانێـك لـە چـوکوور داکـا. لـەو بارانـەش خـەراتر. چیی دارە لەرەگەوە هەڵیقەنێ. دەبێ حەوتووەك خۆشـی نەکاتـەوە. یـەك حـەوتووی ڕەبـەق هـەتا دە ڕۆژانـیش کرێکار ناتوانن بچنە کێڵگەی. ئەوکات ئێمە دەیانگەینێ... هێشتاش لەبەر چاومە. یـەك حـەوتوو دوای بارانەکە، چووینە کێڵگە و دیتمان لۆکە هەمووی وەریـوە و تێکـەڵی گـڵ و قـوڕ بـووە. خـاوەن کێڵگە چاوی بڕییە مەزراکەی و نەیتوانی نەگرییێ. لە نێو ئـەو هـەموو گونـدی و ژن و منداڵـەدا لـە بانگی دا:"ئەی خوایە گیان، ئەوە چ بەڵایەك بوو بەسەرت هێنـام. ئەوەیـە دادپەروەرییەکـەت؟" جـا کـە وەك منـداڵان چـڵمی هەڵدەلوشـییەوە زۆرِ زۆرِ دەگریـا. ئێمـەش چـووینە نێـو مەزراکـەوە و لۆکەکانمان کە لەگەڵ گڵ وقوڕ تێکەڵ ببوون کۆ کردەوە. لۆکەی قوڕاوی قورس دەبێ. ئـەو ساڵە پـتر لە هەموو ساڵێکمان پارە پەیدا کرد. جا ئێستا ئـەلیف، دەبـێ هـەورێکی ڕەش سـەر ئـەو چـوکوورە کاکی بە کاکییە داپۆشێ. هەورێکی ڕەشی پڕ باران. بایەکیش هـەڵ بکـات و هەورەتریـشقەیەکی وا لێ بدا و هەورێك بگرمێنێ وەك تۆپ دەنگی بێ. ئێمە دەبێ دوای ئەوەی بگەینێ. ئەو کاتـە، هـەم قەرز و قۆڵە عادیل ئەفەنی دەدەینەوە و هەمیش کۆشێك دراو بۆ خۆمان دەمێنێتەوە.

ئەلیف:

ـ ئی ئێمەش وای لێ هاتبوو. لۆکە وەك قورقوشم قورس ببوو. خاوەن کێڵگە تەنیا نیـوە حـەقی ئەو لۆکەیەی پێ داین کە کۆمان کردبۆوە. لەگەڵ ئەوەشدا دوو ئەوەندەی ساڵەکەی پێشووی پارەمـان پێ بڕا. بەڵام خوانەکا پیاوەکە. ئیشەڵڵا خودا ئیدی بارانی ئاوا پێـشانی بەنـدەکانی خـۆی ناداتـەوە. ئەو ساڵە نیوەی گوندییەکان و ئـەو کرێکارانـەی چـووبوونە چـوکوور، نـەخۆش کـەوتن. نەخۆشـەکان هەرچاك نەبوونەوە. زستانەکەی ئەو ساڵە هەر ڕۆژەی یەکێکی گوندەکە دەمرد.

عەلی گوتی:

ـ وەڵڵا لە گوندەکەی ئێمەش وابوو. بەڵام ئێستا، هەر سبەینێ دەبێ هەورێك سەر چوکوور داپۆشـێ. هـەڵبکاتـە کزەبایـەکی سـارد و بیکاتـە تـەپوتۆز. بارانێـك دا بکـا سـێ ئەوەنـدەی بارانەکەی ئەودەم. وەك گۆزەی سەرەوبن و وەك غـەززەبی خودای. ئاسمان وای..."

ئەلیف ترسا. لەو هەمووە دلّڕەقییەی مێردەکەی ترسا و بە دەنگێکی ترساوەوە گوتی:

ـ ئامان پیاوەکە، گوێی شەیتان کەڕ بێ. ئەدی بەزەییت بە منداڵی ئەو خەڵکەی دا نایەتەوە؟ شتی وا نەڵێی عەلی، لەعنەت لەو بارانەیە. ئاخری دەگەینێ و لۆکەش دەڕنینەوە. خودا چەندی رسقی خۆمانە بە نسیبمان بکات. هەرچی قسمەت و نسیب بێ...

عەلی:

ـ دەبێ هەور بگرمێنێ. دەڵێن لە گرمەی هەوران، پەز و پڵینگان زراویان دەچێ. وا بگرمێنێ پڵێنگ زراوی بچێ. گرمەیەکی وەك دەهۆڵ، دەنگی هەزار، دوو هەزار سێ هەزار دەهۆڵ کە وێکڕا لێ دەدرێن."

دەیزانی ئەلیف دەترسێ. خۆشی دەترسا. پێشی خۆش نەبوو، بەڵام خۆی پێ زەوت نەدەکرا و بەو قسانە ئۆخژنی دەهات. لەشە ماندووەکەی دەلەرزی.

"بارانێکی وا داکا کە... دەزانی چوکوور دوو رووباری لێیە یەکیان ناوی سەیحانە و ئەوی دیکەش جەیحان... بارانێکی وا، کە وەك بڵێی سەت هەزار رووباری ئاوات بردۆتە ئاسمان و لەوێوە یەك جێ هەڵیانڕشتوونەتە خوارێ... بارانێك وەك تۆفانەکەی حەزرەتی نووح، پەڵەیەك وشکانی نەهێڵێتەوە."

ئەلیف:

ـ وا مەڵێ پیاوەکە، بەقوربانت دەبم. ئاخر زگت بە منداڵە بەستەزمانەکانی ئەو خەڵکەدا ناسووتێ؟ ئێمە بۆخۆمان منداڵمان هەیە.

عەلی بە تووڕەییەوە گوڕاندی:

ـ نەخێر، ناسووتێ. ئەمن چم بە منداڵی خەڵکی. ئەگەر ئەمساڵ باران نەبارێ، ئەمن چاوم بە کێڵگەی لۆکە ناکەوێ. چاویشم پێی بکەوێ هەر حەوتتووەکی دەبینم. ئەویش تەنانەت یەك لەسەر پێنجی قەرزەکانی پێ نادرێتەوە. هەر دەبێ ببارێ. وەك تۆفان.

ئەلیف:

ـ زۆر کار دەکەین. تەنانەت ئەگەر حەوتتووەکیش بێ، دوو هێندەی خەڵك کار دەکەین...

عەلی گوت:

ـ ئەو مرێمۆکە تووك لێکراوەت دیوە؟ ئاخ نەمرد لەدەستی نەجاتم بێ. کەس نازانێ بۆ کوێ چووە؟ ئەگەر ئاوا بڕوا، خەڵك لۆکە تەواو دەکەن، ئێمە هەر بەرێگەوە دەبین. چارمان نییە. دەبێ بارانێك هەر ببارێ کە... ئەی خوایەگیان، ئەی خودایە، ئەتۆ بارانێکی خەست

بباریّنه، قوربانییەك لە ئەستۆی من. کەڵەبابێکی سووری پڕپنەکی. قەڵەوقەڵەو. ئەی خودایە گیان، بارانێکی وا وەك بڵێی ئاسمان کون بووبێ.

ئەلیف وەختابوو بگری. بەڵام دەیزانی عەلی لە دڵەوە ئەو قسانە ناکا. عەلیش لێی نەدەبڕییەوە و هەر لێی دەڕست:"وەك ئەو بارانەی دارستانە سپێدارەکە! هۆی خوداکەی من."

ئەلیف بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێ گوتی:

ـ لەوانەیە دایە گیان لەو دەوروبەرانە کەوتبێ و دەنگێ لێ براببێ.

با گوێ هەڵخەین بەشکم گوێمان لە دەنگی بێ. جا ئەوجار باشترە هەرای بکەین:"دایە... هۆۆی ی دایە."

عەلی تا هێزی هەبوو هەرای کرد:"هۆ ۆ ۆ ۆ ی ی ی ی دایە هۆ ۆ ۆ ۆ ... دایەەەە." دەك خودا بتباتەوە هەی. کوڕە خۆ نە دەبیستێ و نە شوێنەواری دیارە. کەس نازانێ چووەتە کوێ. نەکا شتێکی لێ هاتبێ.

پیلی ئەلیفی گرت و لەسەری رۆیی:"

ـ خۆ ئەگەر بە زیندوویی دەستم کەوێ و بزانم بە ئانقەست ئاوای لێ کردووم، قەحپەی... جا ئەگەر لە کونە لووتیەوە نەمهێناوە دەرێ. ئیدی من دایك و مایك ناناسم. لە کونی لووتی دەیهێنمەوە دەرێ.

ئەلیف هیچی نەگوت. یەکەم جاری بوو شتی وای لە زاری عەلی دەبیست سەبارەت بە دایکی. پێی سەیر بوو.

"رۆژە رەشی کردم هێندەی بڵێ تۆ ئەسپەکەت کوشتم. تۆ کوشتت. هەر خواردمی و لەوێی دانام. ئەنجنیمی. لەتوپەتی کردم... هەرچی گوتم و شەو و رۆژێ لەبەری پاڕامەوە یەك قسەی لەگەڵ نەکردم. بابی گام. لەبەر ئەو دە جاران وەك سەگ بە هانکەهانك رۆیشتم و گەڕامەوە، هەتا پانێی پێم قەڵشین..."

عەلی ئەوەندە تووڕە ببوو کەفی دەخڕاند.

ئەلیف:

ـ نەکەی عەلی، شتی وا نەکەی، دایکتە. گوناحە. لای خودا گوناحبار دەبی. زنجیری سوورەوەکراوی جەحەنەمت لەستۆی دەکەن. حەقی بەسەتەوەیە. شیرەکەیت لێ حەرام دەکا. ئاه و دووعاکەی دەتگرێ. منداڵەکانیشمان ئاقیبەت بەخێر نابن.

عەلی:

ـ با نەبن، با نەبن... چش با نەبن. ئەمنیش با بخرێمە سەر کلّەکەی جەحەنەمێ و ببرژێم. ئاگری جەحەندەمم قبووڵ کرد. ئەگەرئەمشەو بزانم گاڵتەی پێ کردووم، جا ئەگەر لەسەر ئەو کێوەی تۆرووس و لە نێو گەلە گورگ و کەمتیار و پڵینگ و دڕندانـدا بەجێم نەهێشت و نەڕۆیشتم پیاو نەبم. با لە دەرگای خودای رووت و قووت و جەحەندەمی دەرکەوم. وەك کافران بۆنی بەهەشتێم بەسەردا نەیە و چاوم پێی نەکەوێ و قەت زیندوو نەکرێمەوە. گوێت لێم بوو؟... دایکیشم با هەر دایکایەتی بکا.

ئەلیف:

ـ زاڵم مەبە. زوڵم باش نییە. دوایی پەژیوان دەبیەوە. ئەگەر ئێستا لە بن ئەو دارە مردبێ و هەر لەبەر ئەوەش بێ دەنگی نەهاتبێ، چ دەکەی.؟ وا مەڵێ. هەزارجار پەشیمان دەبیەوە.

عەلی بە بیستنی وشەی مەرگ رقەکەی لە ناکاو نیشتەوە. لەگەڵ رق نیشتنەوەکەیدا لەشی شل بۆوە و بەلادا هات. ماندوویی و شەکەتییەك بەسەریدا هات بۆخۆشی پێی سەیر بوو:"ئەوێ ساڵێ تازە بەفر باریبوو. دەرەوە زۆر سارد بوو. کۆتەرە دارێکی گەورەی هێندەی زەلامێکیان خستبووە نێو سۆبەکەوە. ئاگرێکی سوور سووری وەك دەندووکی کەو لە کۆتەرە دارەکە هەڵدەستا. بەڵام عەلی هەر سەرمای بوو. خەریك بوو دەیبەست. دایکی زانیبووی سەرمایەتی، سینگ وبەریکی خۆی بۆ کردبۆوە و سەری خستبووە نێوان مەمکەکانییەوە و برێك دواتر تا و لەرزەکەی عەلی برابۆوە. بۆنی شلەتێن و خۆشی بنیادەم، بۆنی دایك هەموو گیانی تەنیبۆوە. دواتر، کە نەخۆش کەوت... لە سەردەمی سەربازییەکەیدا، نەیهێشتبوو تاقە رۆژێکیش بێ خەرج بێ:"نەنە مرێمۆك وەك دایکی خەلکی نییە. رۆح سووك و بە بەزەیی و بەهێزە. هەر لە باوەشت بکا و ماچت بکا، هەزار ماچت لێ دەکا. دایکی وا وێنەی نییە. بەڵام لاسارییەکی هەیە هەر مەپرسە... خۆزگە ئەوەی نەبایە. ئەگەر نەمردم و گەیشتمە چوکوور، دەبێ لە پۆلاّ ساز کرابێم."

ـ ئاخ، ئاخ،..

ئەلیف:

ـ ئاخ هەڵمەکێشە عەلی، لەسەرت گەڕێم. ئەگەر نەشگەیشتینە لۆکە رنینەوەی، ئەمساڵ لە چوکوور دەمێنینەوە. رەگ هەڵدەکەنین. دەڵێن ئەویش پارەی باشی تێدایە.

عەلی دیسان بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ دەتەوێ هەموو دنیا، هەموو ئەو گوندییە بێ‌ناموسانە پێم پێبکەنن و بڵێن لە "چوکوور" بەجێ ماوە؟

بێ دەنگ بوو. ئەلیف هەوڵی دەدا هێوری بکاتەوە. قسەیەکی لێرە دەکرد یەك لەوێ. ئەو هیچی نەدەگوت و هەروا ئاخی هەڵدەکێشا.

"خاکی چوکوور گەرمە. وەکو لۆکە نەرمە. خوا دەزانێ چۆن ئەو خاکە وەك ئاردی ساز کراوە؟ رەش و بریقەدارە. کە بەسەریدا دەڕۆی هەتا گویزینگت لێی رۆدەچی. بەیانیان مژێکی وەك خەون و خەیاڵی لێ هەڵدەستێ. وەك بڵێیی لە تیشکی خۆرەوە نییە و لە خاکەکەوە هەڵدەستێ. چیاکان ئاوا نین. سەتی ژنەتیوەکەی بەکرە شێت خڕە و دەڵێیی فەنەرە. بڕێك کورتە باڵایە بەڵام لاروڵەنجەکەی عەقڵی بنیادەم دەبا. دەموچاوی دەڵێ سوورە سێوە دەگەشێتەوە. سێبەری مژۆڵە درێژەکانی دەکەوێتە سەر دەموچاوە سپی و ناسکەکەی. ناتوانی تێر سەیری ئەو چاوە رەشانەی بکەی کە دەڵێی خەڵوزی رەشن. کە رادەوەستی و سەیری دەکەی هەموو گیانت موچڕکەی پێدا دێ و وەك بیی نێو ئاوێ دەلەرزی و نازانی دەستێکی بۆ بەری یان نا. جوانیان فەرمووە:"خەوی بن رەوەزان خۆشە ئەگەر شا ماری لێ نەبن، رابواردن خۆشە لەگەڵ کورتە باڵایان، ئەگەر فیتنە و شۆڤار نەبن. جا هەر بەراستیش فینتەیە. بەکرە شێت بڕوا ناکا. خۆ بەچاوی خۆشی بیبینێ بڕوا ناکا. ئەوە دەساڵە کەس نەیدیوە گەنجێك پێگەیبێ و ژنەتیوەکەی بەکرە شێت دەستی لەگەڵ تێکەڵ نەکردبێ. وەك لە کتیباندا نووسرابێ و یاسای دەوڵەت بێ. هەموو گەنجێك لە پێشدا لەگەڵ خاتوو دۆیندولو Dondulu دەست تێکەڵ دەکا و دوایی ژن دێنێ و دەبێتە باوکی منداڵان، کەچی خەیاڵی دۆیندولوو قەت بەری نادا. دۆیندولو بە دەگمەن دەست لەگەڵ پیاوی خیزاندار تێکەڵ دەکا. ئەو هەمووە گۆرانییەیان بۆساز کردووە. لە لای بەکرە شێتیش دەیلێنەوە. تەنانەت جارێکیان زۆر ساویلکانە گوتبووی:"ئەرێ ئەو دۆیندولووە کێیە ئەو هەمووە گۆرانییەی پێ هەڵدەڵێن؟" یەکێك لە جوابیدا گوتبووی:"ئەنکی منە، زۆر جوان بوو، هەر لەو کاتەوە ئەو هەمووە بەندەیان بۆ وی گوتووە." دەزانێ، دەزانێ، بەکرە شێت بە هەموو شتێکی دۆیندولووی دەزانێ، بەڵام خۆی لێ گێل دەکا. کابرایەکی تایبەتە. بۆی گرنگ نییە. ئاخر رۆژێك نەهاتووە ژنەکەی لە لای خۆی دابنێ و لێ بپرسی:"کچەتیو، ئەوە بۆ وا دەکەی؟"

"شەوێك گەرم بوو، نا زۆر گەرم نەبوو، کە لە رۆژاواوە بایەکە دەشنێ و هەورە سپییەکان بەرەو دەریا پاڵ پێوەدەنێ، دەمەدەمی بەیانی،کاتێ شەو دەزرینگێتەوە، کاتێ ئەستێرەی بەیانی دەنگوێ و تریفەی داوێ، لە وەها کاتێکدا دەبێ دۆیندولوو لەسەر خاکە نەرمەکەی

کێڵگەی لۆکە رابکێشم. سمتە نەرمەکەی خاکەکە دەقۆپێنێ. خاکە نەرم و نیان و بڕێک گەرمەکە. کوڕە خۆ لێی تێر نابی. پیاو سەری لە گێژەوەدێ. لەشی سووک دەبێ و باڵ دەگرێ. دەرفەتی ئاوا لەوانەیە لە هەموو ژیاندا هەر یەک جاران بۆ پیاو بلوێ. دۆیندولوو قەت دووپاتەی ناکاتەوە. جارێ لەگەڵ پیاوی خیزاندار هەرگیز. بەڵام عەلیی خۆش دەوێ. بۆی دەمرێ. حەزی لەدەنگی خۆی و شمشاڵەکەیەتی. کەیفی بە بەژن و باڵا و لێوەکانی دێ. ژنیشت ئەگەر بوو وەك دۆیندولوو بێ."

ئەلیف لە شانی راستییەوە دەڕۆیی. لێی نزیك بۆوە و شانی وەشانی کەوت. بیری کردەوە:"بەستەزمانە، بە دوو ساڵان تین و تەڕایی تێدا نەما. هەر بەجارێ پیر بوو."
ئەلیف گوتی:

ـ پیاوەکە لەسەرت گەڕێم. هەرای بکە. "دایەهههه،، دایەههه." با چاویش بگێڕین. ئەگەر تارماییەکمان بینی...

"ئەمساڵ لە لۆکە رنینەوە، کاتی بەیانی، ئەو دەمەی عەرزەکەکە وەك تەندووری بەتین هەڵمی لێ هەڵدەستێ... دۆیندولوو، شەرت و ئادم کردووە. بەڵام هەتا ئەو مرێمۆکەم لێ بووەتە گونی قۆڕ و ئاوا خۆم لێ ون دەکا.. نەك لۆکە چنینەوەیەك و نە ئەو سمتە خڕ و لەبارەی تۆ..." و هەرای کرد:"

ـ دایە... دایە...هۆۆۆی ی ی دایە...

زایەڵەی دەنگەکە لە رەوەزەکان گەڕا. سیبەری دارە گویزە پیرۆزەکە کەوتبووە سەر شەو.

ـ هۆی دایە هۆ ۆ ۆ ۆ، لە کوێی؟ وەڵام بدەوە.

ئەلیف هەرای دەکرد و دوایی کە بێ دەنگ دەبوو، عەلی دەستی پێ دەکرد. هەتا گەیشتنە بن داری چاکی هەر بانگیان کرد. هەر تارماییەکیان لە بن پنچکەکانی دەم رێگەکە دەدی، دەچوونە سەری. رۆژ بۆوە. ماندوو شەکەت لە بن دارە گویزەکە ئەژنۆیان هەڵپێکا و پاڵیان وەدارەکە دا. هانکەهانکیان بوو. عەلی سەیری روخساری هەڵبزرکاوی ئەلیفی دەکرد کە شەڵاڵی ئارەقە ببوو. گوتی:

ـ چ بووە؟ پێت وایە دایکم بۆ کوێ چووە؟ ئەلیف!

ـ لە هەوارەکەوە هەتا ئێرە هەر بانگیمان کرد. ئەگەر لەو دەوروبەرانە بوایە، دیارە وەڵامی دەدایەوە.

عەلی:

- چووزانم. تۆ پێت وایە جوابی داباوە؟,,,
ئەلیف:
- ئەی چۆن لەو تاریکییەدا سەرگەردانی دەکردین. پێت وایە چووەتە کوێ؟ خۆ ئەو دەوروبەرانە گوندی لێ نییە. لێیەتی؟...
عەلی ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:
ـ نە...
لە بەر تیشکی خۆری دەم بەیانی، نیوەی دەموچاوی عەلی لە رووناکایی ونیوەکەی دیکەی لە تاریکیدا بوو. ئەو تاقە چڵە گیایەی لە تەنیشتیانەوە بوو، لەگەڵ شنەی بەیانیدا دەجوولایەوە. لە دوورەوە پۆلە کۆترێکی سپی هەستان و وەك گلۆڵەیەك بەئاسماندا بڵاو بوونەوە و لەسەر رەوەزەکان نیشتنەوە. ئەگەر دەردی دایکی نەبوایە، بۆ ساتێك خەیاڵی دەچووە لای ئەو کۆترانە و لە دەم چۆم و کێڵگە نەرم و گەرمەکان و باغە پرتەقاڵەکان و هەموو ئەو جوانییانەی لە بن کەپرەشینەکەی ئاسمانن دەنیشتەوە.
ئەلیف چاوەکانی لە چاوی عەلی بڕی و سەیری کرد. شتێکی لێ دەپرسی. عەلی سەری بەردایەوە. دوایی کە سەری هەڵێنا، دیتی ئەلیف دەگرییێ.
- پێت وایە شتێکی لێ قەومابێ؟
ئەلیف:
ـ لەو رێگەیەدا، دەکرێ بۆ کوێ چووبێ؟
عەلی:
ـ دەکرێ بۆ کوێ چووبێ؟
ـ ئەلیف هەستایە پێ. روخساری بزرکابوو:
ـ پێشت چۆنە لەو رووناکاییەدا، بە چاوگێڕان بەرەو لای باروبنەکە بکەوینەوە رێ. هەتا منداڵەکان بەخەبەر دێن..
عەلی بە تووڕەییەوە گوتی:
- منداڵ هیچیان لێ نایە.
یەکیان بەو بەرەی رێگەدا و ئەویتر بەوبەری رێگەکەدا، چاویان بە بن پنچکاندا دەگێڕا و سەیری بن هەموو دارێك و نێو هەموو قوڵك و قەڵشتێکیان دەکرد و دەگەڕانەوە. روخسارە ماندوو شەکەت و خەمبارەکەی عەلی زەرد هەڵگەڕابوو. تووکی ردێنی کە وەك نەشتەریان لێ هاتبوو، داماوییەکەی ئەویان پتر دەردەخست.

بەرەبەری نیوەڕۆ گەیشتنەوە جێ هەوارەکەیان. منداڵەکان لە دوورەوە دیتیانن و بەرەو لایان غاریان دا. زانیبوویان چوون بە شوێن دایەگەورەیاندا و بەبێ ئەوەی بترسن، هێمن و بێ دەنگ دانیشتبوون.

عەلی خۆی بەسەر تاوێرە بەردێکدا دا و تەخت لێی کەوت. چاوەکانی لەبن تیشکی خۆرەکەدا قیچ و بچووك ببوونەوە. منداڵەکان و ئەلیف بە ترسەوە سەیریان دەکرد. قەت باوکی خۆیانیان لە بەردەم هیچ رووداوێکدا ئەوەندە بێ هێز و داماو نەدیبوو. دەموچاوی جار لە جار درێژتر دەبۆوە و ئارەقەی دەکرد. سارد دەبۆوە و کاتێ لێی ورد دەبوویەوە، کەسکێکی وەك کەڕووی لێ هاتبوو. ئەلیف لەو رەنگەی دەترسا. کەسکایی مەرگ بوو.

عەلی سەری هەڵێنا و سەیری چاوەکانی ئەلیفی کرد. بۆ چەند جاران نیگاکان هەر ئەو پرسیارە سامناکەیان دووپاتە کردەوە. جا ئەمجارەیان کە جوابی "ئەرێ"ی وەرگرتەوە، گوتی:

ــ خەتای منە. هەمووی خەتای منە. ئەمن دایکمم کوشت. ئەگەر لەتوپەتیشم بکەن و بخەنە بەر سەگان، جێی خۆیەتی. نەدەبوو مام خەلیل سوار بکەم. ئەمن بوومە سەبەبکار. ئەمن... ئەمن... ئەمن بوومە سەبەبکار. ئەگەر گەیشتیشینە چوکوور، خۆ گوندیی هەر کەولّم دەکەن و دەمخۆن. دەڵێن دایکەکەی کوشت و لە چیا و چۆڵان خستییە بەر دەمی گورگ و کەمتیاران جا هات... هەتا مردنێ چاو لە چاوی هەرکەس بکەم ئەوەم بە چاو دادەداتەوە. ناویشم دەنێن:"عەلی دایکەخۆ کوژ." وەی لەو رۆژەی کوێخا بزانێتەوە. لەتوپەتم دەکا. لەو پۆلیسخانەوە بۆ ئەویدی پەت پەتێنی سەگم پێ دەکا. لەوانەیە بشمگرن. خەتای منە ئەلیف. هەر خەتای منە. لانیکەم خۆزگە تەرمەکەی بدۆزینەوە و لە جێیەك بینێژین. ئاخ، ئەمن شێت و گەمژەم. هەرچیی پێت خۆشە پێمی بڵێ. بڵێ بۆ مام خەلیل سواری ئەسپ دەکەی و ئەو بەڵایە تووشی خۆت دەکەی؟"

حەسەن توند دەستی دایکی گرتبوو و پەیتاپەیتا لێی دەپرسی:

ــ کوا نەنکم؟ نەنکم مردووە؟

ژنە گوێی لە مێردەکەی بوو و سەری بەوەوە خافڵابوو، جوابی منداڵەکەی پێ نەدەدراوە.

حەسەن هەر رستی و رستی و ئاخری خۆی پێ نەگیرا و هاواری کرد:

ــ دایە... ئەرێ دایە... دایە، نەنکم مردووە؟...

دایکی گوتی:

ــ هەی سەر بەقوڕ. نەنکت بۆ بمرێ؟... بزر بووە. نەماندۆزییەوە. نازانین چووەتە کوێ...

حەسەن وەك گەورەكان خۆی قیت كردەوە. دەستی راستەی وەبن شەویلكەی دا. باوكیشی هەركات دەیویست قسەیەكی گرنگ بكا ئاوای دەكرد و گوتی:

ـ ئەمن دەزانم چووەتە كوێ؟... من دەزانم... ئەمن لە دواوەی بووم. هەر ورتە ورتی بوو. بیستم. هەر ئەو دەمەی بابم بە ئێمەی گوت:"ئەنگۆ لەگەڵ دایكتان برۆن". ئەو كات لە دواوەی نەنكم بووم. ورتە ورتی بوو. بیستم...

ئۆمەخان لیچی لێ هەڵقرچاند و گوتی:

ـ درۆیان دەكا. ئەمنیش لە تەنیشتییەوە بووم. هیچم گوێ لێ نەبوو.

حەسەن:

ـ ئەمنیش گوێم لێ نەبوو. لە ورتەورتەكەی و لە جووڵەی لێوەكانییەوە تێگەیشتم.

ئەلیف بێ تاقەت ببوو. بەسەریانیدا قیژاند:

ـ دە بڵێ چیت بیست؟...

حەسەن هەر وا كە دەستی لە بن چەنەیدا بوو گوتی:

ـ نەمبیست، بەڵام تێگەیشتم... نەنكم گەڕاوەتە بۆ ئاوایی..

عەلی گورج دەرپەڕی:

ـ دەمزانی وا دەكا. هەر وا دەكا.

ئۆمەخان گوتی:

ـ درۆیە، حەسەن هەمیشە درۆیان دەكا.

كەس گوێی نەدایە. ئۆمەخان تووڕە بوو:

ـ چما دەكرێ نەنكم بگەڕێتەوە دێ. كوڕە ئەوحەسەنە شەو و رۆژ درۆیان دەكا.

حەسەن لە خۆشیان وەختابوو بفڕێ و گوێی لە ئۆمەخان نەبوو:

عەلی بە غاردان وەڕێ كەوت:

ـ ئەنگۆ لێرە وەمێنن. ئەمن دەیگەمێ. دەیگەمێ و هەڵی دەگرم و دەیهێنم.

خەمبار و شادمان*... لە چاوترووكانێكا لە شیوەكە ئاودیو بوو و لە چاوان ون بوو. بڕێك لە نیوەڕۆ لای دابوو كە گەیشتە بن دارە گوێزە پیرۆزەكە. تیژ لێی تێپەڕی. دارەكە قورس و بە خشەخش، وەك كێوێك لە جێی خۆی چەقیبوو. لقێكی هەبوو پڕ بە پڕ بوو لە كووژەكە و

---

*خەمبار و شادمان: لە شیعرەكەی سالم وەرگرتووە. "خەمبار و شادمانم رەحمەت عەزابی هێنا....

مووڕو. بە درێژایی ئەو ساڵانە کووژەکە گەورە و وردەکان، ریز بە ریز بە رەنگی ئامـاڵ شـین و شینی تۆخ هەموو لاقەکەیان داپۆشیبوو. سـەیرێکی لقەکـەی کـرد. هـیچ شـوێنێکی دارەکـەی نەدی. بەڵام لقی بە کووژەکە پۆشراو لە زەینیدا مایەوە. پاڕایەوە:

ــ ئەی ئەو خوایەی ئەو لقە دارەت بە کووژەکە داپۆشیوە، ئەوە نـامبینی مـن چـۆنم؟ ئـەو بەڵایەی بۆمت نازڵ کردووە... خەڵکی گوندی سبەی دەست دەکەن بە لۆکە چنینەوە ... خـۆت باش دەزانی دەست پێ دەکەن. ئەمن و ژن و منداڵەکەم، دەست بەتاڵ دەمێنینەوە. ئەی خـوای گەورە کە لقی دارە گویز بە کووژەکە دادەپۆشی، ئەوە یارمەتیی من نادەی؟

لە ناکاو کەللەی گەرم داهات:

ــ ئەو ژنە چیی لە گیانی من دەوێ؟ رێگەیـەکی سـێ جـار پـێ بڕیـوم بـەس نییـە؟ ئێـستا دەیەوێ دە جاران بچم و بگەڕێمەوە؟ بە خودایـەتیی خـودا، هـەر لێـرە لەسـەر ئـەو کێـوە، لـە نێوەڕاستی ئەو دارستانە، لە نێو ئەو رەوەزانە بەجێیت دەهێڵم و دەڕۆم. دوو رۆژ نابـا دەمـری و لە ناو دەچی. کچێ وا مەکە بەر لەعنەتی خودای کەوی دایە. دەچییەوە دێ دەڵێی چی؟... دە رۆژ نابا لە برسان دەمری. خۆ دەست و پێت تین و هێـزی تێـدا نـەماوە. وام لـێ مەکـە. خـودا دەزانێ چ بەڵایەکت بەسەر هێناوم... لەسەر ئەو کێوە بەجێیت دەهێڵم و دەڕۆم.”

جار بە جار تووڕەتر دەبوو. تا زیاتر دەڕۆیی تـووڕەتر و تـا پـتر دەچـووە پێـشەوە و دایکـی نەدەدی، لە تووڕەییان شێت دەبوو.

“ وا باشتر نەبوو ئەو هەمووە رێگەیـە بـەرەو چـوکوور بـبڕی؟ هـەی خـودام بەگـژت داکـرد ژنەتیوە. بەڵای گیانی من... چما ئەو بەرەو چوکوور دەڕوا؟... دەیەوێ گوو لـە کارەکـەی مـن بکا. ئەمساڵ ناگەمە لۆکە چنینەوە و ژن و منداڵەکەم لە برسان دەمرن. ئەو دوژمنی منە.”

هەتاو لە ئاوابوون بوو و بە لای پێدەشتەکەی چوکووردا، لەودیوی زنجیرە کێـوە بـەرزەکانی بەرەوڕۆوە خەریك بوو دەچووە خوارێ. سیبەرەکان درێژ ببوونەوە.

ئەگەر لێرە بەجێیت بێڵم و بـڕۆم، وەڵڵاهـی هـیچ خـەتام نییـە.” راوەسـتا. ئـاوڕی دایـەوە و سەیرێکی خۆرەکەی کرد:

“دەبێ لێرە بەجێیت بێڵم و بڕۆم. بۆخۆت بچۆوە گوندە چۆڵەکە. لەوێ بمێنەوە و بمرە.”

رۆژێکی گەرمی هاتە پێش چاوی. تـەرمی دایکـی لـە بـەر حەوشـەکەی خۆیـان. خـۆرێکی گــەرمی وەك هەتاوەکــەی چــوکووراوا. گــەرمێکی خەســت. بــە هــەزاران مێـشی کەسـك هەڵدەنیشنەوە و هەڵدەفڕنەوە. مێشەکان بە لووتیدا دەچنە ژووری و لە زارێوە دێنەوە دەرێ. لە

زارێـوە دەچـنە ژوورەوە و بـە کونەلووتیـدا دێنـەوە دەرێ. گوندییـەکان کـە تـازە لـە چـوکوور گەڕاونەتەوە، پێش ئەوەی باروبنـەیان بکەنـەوە، لەسـەرە تەرمەکـە کـۆ بوونەتـەوە. بـە چـاوی بۆمۆڵەق وەستاوەوە، سەیری مردووەکە و عەلی دەکـەن و دەڵـێن:"ئـای ئـای، خـوا ئـەولادی وا بەرێتەوە. بنیادەم لە جێی ئەولادی ئاوا بەردێکی ببێ باشترە."

"چ گوویەکی دەیخۆن با بیخۆن. گوێم لێ نییە. ئەتۆ کاری ئاوا دەکەی، جا ئـەمنیش دەبـێ بگەڕێمەوە. ئەگەر تۆ نەبی بە پێنج شەش ڕۆژان ئەو پەڕەکەی بە حەوتووەك دەگەمە چـوکوور. دەبێ بگەڕێمەوە. بەڵێ، دەبێ بگەڕێمەوە."

جا بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ دەبێ لێرە بەجێت بێڵم و بگەڕێمەوە. بمرە...

دەنگەکەی ئەوەندە سامناك بوو کە خۆشی ترسا.

بنی پێی دەبرژانەوە. دەتگوت کەوڵی دەکەن:"ئەگەر تووشی تۆ بـووم دایـە، دەبـێ وات لـێ بکەم لەژیان بیزار بی." بە هەرا و هاوار گوتی:

ـ دەمری....

بە تووڕەییەکی پترەوە کەوتە ڕێ.

کە لە پێچ و گەوە پڕ لە دارە کورتەکانەوە تێپەڕی، لە دوورەوە چاوی بە تارماییەك کەوت. دڵی داخورپا. ئاخۆ دایکی بوو یان بەرد...؟

هەنگاوەکانی توندتر کرد. کە نزیك بـۆوە، دایکـی دی. لـە دەم ڕێگاکـە ئـەژنۆ لـە بـاوەش وەراندبوون و سەری لەسەر چۆکی دانابوو. عەلی بە خۆشحاڵییەوە بانگی کرد:

ـ داااایەەە...

پێی سەیر بوو لە ناکاو بـۆ دڵـی خـۆش بـوو. مرێمـۆك سـەری هـەڵێنا و دیـسانەوە سـەری بەردایەوە. عەلی بەرەولای غاری دا و هەرای کرد:

ـ دایە، دایە...

لە تەنیشتیەوە دانیشت و دەستی لە ملی کرد. هەروا پێ دەکەنی:

ـ دایە گیان ئەوە دەگەڕایەوە بۆ ئاوایی؟ خۆ حەسەن نەیگوتبا نەمدەدیتیەوە. ئەگەر بزانی چەندە ترسام... زراوم چوو بە خودا. چۆن بیرت لـەوە کـردەوە بـچیتەوە گونـد؟ ... لـەو گونـدە چۆڵەدا چۆن هەڵدەکەی؟ دەمری دایە گیان وەرە سەر کۆڵم با بـڕۆین. هەوارگەکـەمان زۆر دوور نییە. نیوەشەوێ دەگەینێ.

مریەمۆك بەسپایی لە جێی خۆی هەستا. دەستی لەسەر تاشەبەردێك کە لە تەنیشتییەوە بوو دانا:

ـ ئەی بەردەکە، ئەی بەردەکە لەگەڵ تۆمە، کەس بەدڵی نەگریێ. ئەمن دەڕۆم و دەگەمەوە گوندەکەی خۆم و لەوێ دەمرم. مانگێکی پێ ناچێ دەمرم. لانیکەم لێم گەڕێن با لە گوندەکەی خۆم بمرم. لەبری ئەوەی باری سەرباری خەڵکی بم و ژن و منداڵەکەیان لەبرسان بکوژم و نەهێڵم بڕۆن، دەچمەوە و لە گوندەکەی خۆم، لە زیدەکەی خۆم، لەبەر دەرگاکەی خۆم دەمرم. ئەی بەردەکە لەگەڵ تۆمە. ئەتۆ وەك بنیادەم شیری خاوت نەخواردووە. دەڕۆم و سەر بە شیپانەی دەرگاکەم دەکەم و هەر لەوێ دەمرم.

راوەستا و رووی لە لای گوندەکەی کرد:

عەلی ماوەیەك راوەستا و سەیری پشتەوەی خۆی کرد. پشتی کوورِ ببۆوە. دەشەلی. بە ناستەم دەیتوانی پێ دابنێ. هەوا بەرەو تاریکی دەچوو. عەلی چوو لەبەردەم دایکیدا دانیشت. بەکۆڵی دادا و بەخێرا هەستایە پێ.

مریەمۆك ماوەیەك بوو چاوەڕێی ئەو بوو. چاری نەبوو. لە دڵیدا دەیگوت:

"پیرەژنێکی وەك من بە کۆڵت دا مەدە. تۆخوا حەیف نییە ئەو شان و شەپیلکە جوان و زەریفانە؟ هەك دایك بە قوربانت بێ، رۆڵە گیان. عەلی گیان. خۆ ئەگەر زانیبام ئەو هەمووە رێیە دەبڕی و وەشوێنم دەکەوی کوا لە جێی خۆم دەبزووتم؟ یاخوا بمرم و تۆ نەبینم ئاوا لە چۆڵ و چیایان سەرگەردان بی رۆڵە گیان. خۆت دەزانی چەند لێقەوماوم کوڕە ئازاکەم؟ ئێستا ئیدی گوندییەکان دەستیان بە لۆکە چنینەوە کردووە."

# ٩

چی وای نەمابوو هەتاو تیشکی بخاتە سەر داوێن و لاپاڵی کێوەکەی رووبەڕوو. چیاکە دەتگوت رەنگ دەگۆڕێ و باوێشکان دەدا و چاوەڕێی رۆژێکی گەرم و درەوشاوەیە: بەو زەردەواڵە کێوی و زەرد و سوورانەیەوە کە خاڵی مۆر و باڵی مەیلە و شین و مەیلەو کەسکیان هەبوو، بەو مێرووە لۆق درێژانەوە کە لە دەوری شارەکەیان کۆ ببوونەوە، بەو داڵ و هەڵۆیانەوە کە لە هێلانەکانیاندا هەڵکورمابوون و چاوێکیانیان هەڵێنابوو، بەو کۆترە کێوییانەوە کە لە کەلێنەدارێکدا کۆ ببوونەوە و دەتگوت هەوری سپین، بەو سەقر و سوێسکە و شەهێن و خاڵخاڵۆکانەوە کە هەزاران هەزار دانەیان لە نێو بنچکە درووەکاندا کە پێیان دەگوترێ هێلانە پەری کۆ ببوونەوە، بە بزنە کێوییەکانییەوە، بە چەقەڵە ترسنۆکەکانییەوە، بە رێوییە سووریاوە کلک درێژەکانەوە کە وەك بڵێسە بە دوویاندا دەکشا، بەو ورچە ژیکەڵە خۆڵەمێشییانەوە کە لەسەر گەڵادارەکان وەرکەوتبوون و نوقمی خەوی زستانی بوون و ئەو ئاسکانی چاوەکانیان لە چاوی خەمباری کچانی هیوابڕاو دەچوو و لە رەوەزێکەوە بازیان دەدایە رەوەزێکی دیکە، بە کرمەکانەوە، باڵندەی گەورە و بچووك و بە هەموو مەخلوقاتی بن زەوی و سەر زەوییەوە، سینگی ئاوەڵا کردبوو و چاوەڕێی تاوهەڵاتن بوو.

ئێستا شیو و دۆڵەکان پڕ دەبوو لە جووڵە و هات و هەرا و بزووتنێکی گەورە. کێو و رەوەز و خاك و دار و بەرد بەخەبەر دەهاتن.

هەتاو لە پێشدا لایەکی داوێنی کێوەکەی بەقەدرایی جێ خەرمانێك داگرت، دوایی رووناکاییەکە بەرەو خوارووی شیوەکە کشا. دوو مێروولە کە لە هێلانەکەیان هاتبوونە دەرەوە، ماوەیەك بۆنیان بە یەکتریەوە کرد و دوایی هەر کامەیان بەرەو لایەك رۆیشتن. رێك لەو کاتەدا، عەلیش کە تاوەکە لە نێوچاوانی دابوو، بەخەبەر هات. لە پێشدا نەیزانی لە کوێن. گێژ بوو. کە چاوی بە لووتکەی چیاکەی رووبەڕووی کەوت، خەفەتێکی قورس دایگرت. لە جێوبانەکەی

هاتە دەرەوە. ئاونگی بەیانی لەسەر لێفەکەی نیشتبوو و تەڕی کردبوو. لێفەکەی لە بن دارەکە هەلگرت و فڕێی دایە بەر تاوەکە. ساتێك بۆنێکی ترشاو لە نوێنەکە هەستا و نەما.

عەلی نەیدەتوانی پێی لەسەر عەرزی دابنێ. بە شەلەشەل بە دەوری نارەوەنەکەدا سووڕایەوە و چووە پشت تاشە بەردێکەوە. شانی چەپی بە تاشەبەردەکەوە نا و میزی کرد. دوایی هەر ئاوا کە پاڵی بە بەردەکەوە دابوو، دۆخینەکەی بەستەوە. هەر لەوێش لەسەر بەردەکە دانیشت. هێشتا خەو بەری نەدابوو.

ئەلیف کە بەر لە کازیوە هەستابوو و ترخێنەکەی وەسەر ئاگرێ نابوو، ماوەیەك لە دەم ئاگرەکە چاوەڕێ ما. کە دیتی مێردەکەی هەر دیار نییە، چووە پشت دارەکان و لەسەر بەردەکە عەلیی کە نیوە بەخەبەر و نیوە خەوتوو بوو هەستاند.

ـ دایکت هێشتا هەڵنەستاوە. هەروا لە خەو دایە. لێقەوماوە هەر چنگێکی لێ ماوەتەوە. ئەگەر روخساری ببینی ئاورت تێ بەردەبێ بۆی. هەر بەقەدرایی منداڵێکی لێ هاتۆتەوە، چنگێك پێست و ئیسقان. ئەدی لاقت چۆنن؟

ـ ئاووخوێیەکە هیچ فایدەی نەبوو. هەر وەك خۆیەتی. دەڵێی کەوڵیان کردووە. کە لە عەرزیان دادەنێم، مێشکی سەرم پێوەی دەزیڕێنێ.

ـ خۆزگە نەتهێشتبا دایکت ئەوەندە بە ڕێگەدا بڕوا. خۆزگە دەمودەست لە کۆڵت کردبا.

ـ چار نەبوو. هەتا هێزی لەبەردا بێ دەڕوا. دیسانیش هەر دەڕوا. پێشیت پێ ناگیرێ. کوڕە ئەتۆ لە فکری من دابە. منداڵەکانم ئەمساڵ برسی و رووت و قووت دەکەونەوە. عادیل ئەفەنی کام لە پێستی سەری داخنێ. ئەتۆ مشووری من بخۆ، بیر لە حاڵ و باڵی من بکەوە. ئەمساڵ ئەگەیە لۆکە رنینێ، ئیدی قەت قەت ناگەمێ.

ئەلیف گوتی:

ـ دەمویست بڵێم...

ئیدی بێ دەنگ بوو.

عەلی لقێکی لە دارەکە شکاندەوە. مێشکێکی گچکەی شین باوی لە نێو هاتە دەرێ و هەڵفڕی. عەلی لقەکەی لە نێوەڕاستەوە لەت کرد. پڕ بوو لە هەنگوین، بە نووکی زمانی دەریهێنا و خواردی. یەکی دیکەشی شکاندەوە... و یەکێکی دیکەش... هەنگوینەکە بەتام بوو. مزر و تاڵ. بۆن و بەرامەی هەموو گیا تازەکانی پێوە بوو. عەلی خەو هەر بەری نەدابوو. بن پێی دەبرژانەوە، بۆن و بەرامەی چیا لە گیانی گەڕابوو. ئەلیف ماوەیەك لێورد بۆوە و گوتی:

ـ ئامان، پیاوەکە.. ئامان، کوڕە ئەتۆ هەر تەواو منداڵ بوویەتەوە. لە جێی ئەوەی بێی چێشتەکەت بخۆی، دانیشتووی و وەك منداڵان لقە دار دەلێسیتەوە.

عەلی گوێی نەدایە. ئەو کاتەی هێشتا مامی زیندوو بوو، لەگەڵ ئەو بۆ هەنگوینێ چوبوونە چیای تەکەچ. مامی بست بە بست رەوەز و کێوەکانی دەناسی. دوانیوەڕۆیەکی گەرم، لە شیوێکدا چنارێکیان دۆزیبۆوە. تەمەنی هەزار ساڵ دەبوو. نێو چنارەکە هەتا سەر چڵووکەکانیشی هوڵۆڵ بوو. مامی پەڕۆیەکی لە کونەکەی خوارەوەدا ئاگر دا بوو و ئاگرێکی گەورەشی کردبۆوە. دووکەڵ دارستانەکەی داگرتبوو. نیو سەعاتێك دواتر، پۆڕە مێشێك لە دارەکەهاتبوونە دەرێ و دارستانەکە پڕ ببوو لە مێش هەنگوین. مێش هەنگوین وەك هەورێك ئاسمانی دارستانەکەیان داپۆشیبوو. مامی گوتبووی: "پڕ پڕە... پڕە... دارە چنارەکە لە بنەوە تا سەری پڕە لە هەنگوین."

دوایی لێی زیاد کردبوو:

"ئەگەر بە تەواوی ئەو گوندە لێی بخۆن، ساڵێکیش تەواو نابێ... پاروویان لە رۆنێ دەکەوێ." یەکەم شانە هەنگوینیان کە دەرهێنابوو، دانیشتبوون و دەستیان کردبوو بە خواردنێ، عەلی تەواو نەشە ببوو. هەوایەك لە مێشکیدا وەك وزەوزی مێشەکان لوورەی دەهات. هەموو کوڵەکانی دنیا لە خوێنیدا عەتریان دەپژاند، عەتری نارەوەن و کاژ و ... هەر وەها بۆنی خاکی باران لیدراو کە مرۆڤ تووشی سەرەگێژە دەکا.

لقێکی دیکەی لێ کردەوە. بە خۆشییەوە قەڵشتییەوە. ناوی پڕ بوو لە هەنگوین. بە زمان لستییەوە. بەخۆی گوت:"جا چ فایدە... کیلۆیەکت لەوە نەبێ.. جا ئەو کات پیاو هەم کزانەوەی بنی پێی لە بیر دەچێتەوە و هەمیش شتی دیکە.."

ئەلیف گوتی:

ـ ئەوە تۆ شێت بووی پیاوەکە؟

لقە دارەکەی لە دەستی دەرێنا و لێی فڕێ دا.

وردە وردە لە عەلی دەترسا. لە گۆشەی لێوەکانییەوە شتێکی وەك ئەو شێتانەی دەیانەوێ پێبکەنن بەڵام ناتوانن، دیار بوو. ئەلیف لەوێ لۆچێکی سپیی بەشێوەیەکی لێڵ دەبینی.

ـ وەرە دۆینەکەت بخۆ.

عەلی بزەی دەهاتێ. ئەلیف هەرگیز ئاوا نەی دیبوو. شێتەکان ئاوان. چاوەکانیان پرووش دەبن و بزەیان دێتێ. گوتی:

ـ ئەوە چتە عەلی؟

ئیدی لەبەری پاڕایەوە:

ـ کوڕە لەسەرت گەڕێم عەلی، چتە؟...

عەلی بە پاڕانەوەی ئەلیف وەخۆ هاتەوە:

ــ ئەم زستانە مندالّەکانم برسی و رووت و قووت دەبن. نەگەیشتمیٚ و ئەگەر ئاواش بـچێتە پێش، هەر ناگەمیٚ. دە بلّیٚ چ گوویەك بخۆم؟ عادیل ئەفەنی زیندانە و زیندان پەت پەتێنم پـیٚ دەکا. دواییش گوندییەکان، ئەو بەکرە شێتە بیٚناموسە یان ئەو کوێخا کافرە...

بەرەو ئەو لایەی دایکی خەوتبوو ئاوڕی دایەوە:

ــ ئەو پیرە بەرازە مردەلۆخەیە... ئەو پیرە جندەیەش نامریٚ لە کۆلّم بێتەوە... ئەو نەبایـە ئەمن بە ژن و مندالّمەوە دەمێك بوو گەیبوومە چـوکوور... وەك بلّێـی تـا ئێـستا بـەلاّی کـەم بەسەر هێنابێتم، ئەوجار دەگەڕێتەوە بۆ ئاوایی و دوو رۆژان بە دووای خۆیدا سەرگەردانم دەکا. شەیتان دەلّیٚ: هەر لێرە بەجێی بێلّی و برۆی، با چ رێیەك سەختە ئەویٚ بگریٚ.

ئەلیف بە تووڕەییەوە پیلی مێردەکەی راوەشاند و گوتی:

ــ بیٚ دەنگ بە، بیٚ دەنگ، بەخەبەر هات. ئەگەر گوێی لیٚ بیٚ...

عەلی گوڕاندی:

ــ با گوێی لیٚ بیٚ. گوێی لیٚ بیٚ و بمـریٚ و ژن و مـنـدالّم لـیٚ برسـی نـەکا. ئـەلیف دەسـتی لەسەر دەمی مێردەکەی دانا و گوتی:

ــ ترسێکت لە خودا بیٚ عەلی. دایکتە. تۆ لە خودا ناترسی؟ ئەگەر گوێی لەو قسانەی تـۆ بیٚ دەمریٚ.. دیق دەکا. خۆی دەکوژیٚ.

عەلی لە بن دەستی ئەوەوە بە پلّتەپلّت گوتی:

ــ با خۆی بکوژیٚ... ئەگەر کاری وا بکا، لـە خۆشـییان جێژنـەی دەگـرم. بـە دوو رۆژیـش دەگەمە چوکوور.

ئەلیف:

ئێـستاش دەگـەینیٚ. دەگـەینیٚ. مەترسـە. خـودا تـا دەرگایـەك پێـوەدەدا، یـەکێکی دی دەکاتەوە.

عەلی:

ــ هیچ نایەویٚ بیکاتەوە.

ئەلیف ترسا:

ـ یارەبی خوایە تۆبە... تۆبە بکە... تۆبە بکە...تۆبە.. تۆبە.. کوڕە نوقمی گوناح بووی.

عەلی تا هێزی لەبەردا بوو گوڕاندی:

ـ تۆبە ناکەم.. با هەر نەیکا. دیسانیش نەیکا و ماڵی وێران بێ.. وێـران بـێ... وێـران بـێ... ئەگەر چاوی منی دیبایە... گوێ هەبایە دەنگمی دەبیست... تۆبە ناکەم.

ئەلیف هەر لەوێ هەڵتووتەکا. دەموچاوی خستە نێو لەپی دەستەکانییەوە و دەستی کردە گریان.

ئۆمـەخان و حەسـەن برێـك لـەولاترەوە راوەسـتابوون و سـەیری توورەییەکـەی باوکیان دەکـرد و دەلەرزین. ئۆمەخان کـە دیـتی دایکـی دانیـشتوو و دەگریـێ، غـاری دا و لـە تەنیـشتی دانیـشت و دەستی کردە گریان. مریشۆك بەرەو لای ئاورگەکە دەچوو کـە گـوێی لـە قـسەکانی کوڕەکـەی بـوو. سەری سوور ما. گوێچکەی زرینگانەوە و سەری لە گێژەوە هات. هـەر لـەوێ دانیـشت و کرووشـمەی کرد. جووڵەی لێ برا. تەنانەت سەری پەنجەکانیشی نەجووڵاندەوە. بێ جووڵە وشك بوو.

عـەلی کـە دیـتی ژن و منداڵەکـەی لەسـەر عەرزەکـە دەگـرین، لـە ناکـاو رقەکـەی نیـشتەوە. گوڕاندبووی و بەتاڵ ببۆوە. نەیدەزانی چ بە ژن و کچەکەی بڵێ و چۆن دڵیـان بداتـەوە. بـە دەوریانـدا دەهات. دوایی پیلی ژنەکەی گرت و بە دەنگێکی کز و ماندووەوە گوتی:

ـ هەستە ئەلیف خۆ هیچم بە تـۆ نـەگوتووە. هەسـتە بـا چێشتەکەمان بخۆین و وەڕێ کـەوین. سەیر کە خۆر چەندە بەرز بۆتەوە.

ئەلیف و کچەکەی سەریان بە هەنیسکانەوە هەڵدەقەنرا. عەلی لە کچەکەی خوڕی:

ـ بیبڕەوە... بەسە توتکە سەگ...

ئۆمەخان دەمودەست لە گریان کەوت.

ـ مەگریێ ئەلیف، مەگریێ خاتوونەکەم... تۆخودا...

بزەیەکی نیشتە سەر لێوی و گوتی:

ـ دەی باشە، سەیر کە، تۆبەی دەکەم. سەیر کە... تۆبە ... تۆبە ... تۆبە ...

دەستی گرت و هەڵیستاند. ئەلیف کە هەڵدەستایە پێ، چاوەکانی بە پشتی دەسـتی سڕییەوە و لە بن لێوانەوە گوتی:

ـــ ئـەتۆ ئـەو ژنـەت کوشـت.... دیقـت پـێ کـرد.. ئەگـەر لەمـەودوا بـشمێنێ، ئـیتر راسـت نابێتەوە.... دایکە لێقەوماوەکەم.

کە هاتەوە دەم ئاگرەکە مریشۆکی دی:

ـ دایە گیان... دایە جوانەکەم... تۆ بمانبوورە، کوڕتە. زۆر تـووڕە ببـوو. ئـاقڵی نـەماوە. یەکێکی ئەقڵی هەبێ، ئاوا لەگەڵ خودا گیان دەدوێ؟ تۆ خەمت نەبێ. ئێمـە هەرچـۆنێکی بـێ دەگەینە چوکوور.

عەلی لەولاترەوە راوەستابوو و وەك کەسێکی تاوانێکی کردبێ سەیری دایکی دەکرد. ئیتر تووڕەییەکەی نەمابوو.

ئەلیف دایکی هەستاند و بردییە دەم ئاگرەکە. سفرەکەی راخست و لەبەردەمی دانا. کەوچکێکی دایە. هەر دووکیان ملچە ملچی زاریان دەهات و خەریکی خواردنی دۆینەی بوون. عەلی لە ماوەی خواردنیدا تەنانەت جارێکیش چییە نەیتوانی سەیری دایکی بکا. بەلام مرێمۆك نەیدەتوانی چاو لە کورەکەی هەلگرێ. زۆر سەیری چاوەکانی کردبۆوە و سەیری کورەکەی دەکرد:"ئەوە "عەلی"یە؟"

سالی سالانی دێنایەوە پێش چاوی خۆی. نەیدەتوانی بگرییێ. گریان ئەوکی گرتبوو. نەشیدەتوانی هیچ بلێ:"عەلی، بستەمندالێك...

لە بن لێوانەوە گوتی:"

"ئەو رۆژانەت لەبیرە "عەلی"یە درێژ؟.. خێرم لێت نەدی "عەلی"یە درێژ...

ئیشەللا تۆش خێر لە مندالەکانت نەبینی... با بزانی ئەو دەردە چ دەردێکە عەلی... قسەی عەولاد لە گوللەش خەراترە. وەك گوللەیەکی گەرم وایە کە بە گۆی مەمکت بکەوێ."

کە لەسەر سفرەکە هەلدەستا گوتی:

ــ یاخوا چیت لێ کردووم هەمووت وەرپێیە بێتەوە "عەلی"یە درێژ...

ئەوەی گوت و لە قلپەی گریانێی دا. بۆ ئەوەی بەگریانەکەی نەزانن، خێرا و بە لارەولارەوە چووە نێو گژ و گیاکان و لە چاوان ون بوو.

ئەلیف بە تووڕەییەوە گوراندی:

ــ دیت چت کرد پیاوەکە؟..

عەلی ئاخێکی قوولی هەلکێشا:

ــ دەتەوێ هەر ئەلێرە خۆم بکوژم؟... هەر ئەلێرە؟...

چاوەکانی لە چاوی ئەلیف برین و قامی دۆشاومژەی خۆی گەست و مژی. پینەکەی سەر شانیی پچڕی و تووڕی دا.

ــ خۆم بکوژم؟... بکوژم... بکوژم بکوژم بکوژم؟....

ئەلیف بە دیتنی تووڕەییەکەی مێردەکە وشك بوو و گوتی:

ــ نا عەلی، لەسەرت گەڕێم... لەبەرچاوی مندالەکان؟...

عەلی هەستا و چووە نێو گژ و گیاکان و دایکی دی کە پاڵی وەدارێکەوە داوە و دەگریێ. سەبرێ لێی چووە پێشێ. دەستی گرت و ماچی کرد و گەڕایەوە. گوتی:

ـ ئەلیف بچۆ دایکم بێنەوە... درەنگە... نازانم چ لەو لاقانەشم بکەم... ناتوانم لەسەر عەرزیان دانێم.

چاوەکانی وەك دوو کاسەی خوێنیان لێ هاتبوو.

ئەلیف پیلی مرێمۆکێی گرت و لە نێو گژ و گیاکان هەڵیستاند و هێنایەوە. عەلی گوتی:

ـ ئەلیف بەو پێیانەمەوە ناتوانم بڕۆم. بەری پێم بلۆقیان کردووە و ماسیوە* و سوور هەڵگەڕاوە. شتێکم بەبیردا هات.

دیسان تووڕەییەکەی رەویبۆوە.

ـ دەڵێی چ بکەین؟..

ـ ئەو جەواڵەت دیوە. وا باشترە بیکەیە دوو کوتەوە و هەر کوتەی لە لاقێکم ببەستی.

ئەلیف چووە لای و بە سرتە پێی گوتی:

ـ ناکرێ لە چەرمی ئەو ئەسپە دوو لەت لێکەیتەوەو بیکە کلاش؟

عەلی بە تووڕەییەوە:

"بەخوای شێتی ئاخر چەرمی ئەسپ بۆ کلاش دەبێ؟ لاقت رێك دەگوشێ و نایهێڵێ.

ئەلیف جەواڵەکەی هێنا. عەلی کێردەکەی دەرکێشا و کردییە چوار بەش.

بەشێکی لە لاقی راستەی پێچا. بە پەتێك توند بەستی. وەك ئەوەی لاقێکی شکاویان لە گەچ گرتبێ. دوایی لاقی چەپەی بەو دەستوورە بەست. هەستایە پێ. لاقەکانی جۆرێك بوون. بەڵام نەرم بوو. رۆیی و باروبنەکەی تێك نا و بەکۆڵی دادا و گوتی:

ـ وەپێش کەوە ئەلیف. ئێوەش دەی منداڵەکان... یاڵڵا. دایە تۆ لە دەم ئەو ئاورگەیە بمێنەوە، دوا نیوەڕۆ دێمەوە و دەتبەم. تۆخودا مەگەڕێوە بەرەو ئاوایی.

مرێمۆك خۆی لێ گێل کرد. داردەستەکەی لە قەراغ ئاگرەکە دەست دایە و وەڕێ کەوت. دوایی لە نیوەی رێیە راوەستا و گوتی:

ـ خوایە کەس حەوجێ بە کەسی دیکە نەکەی.

دەستەکانی بەرز کردەنەوە و بە دەموچاویدا کێشان و گوتی:

ـ ئامین... ئامین...

* ماسیوە: هەوی کردووە. ئەستوور بووە. هەڵمسان، ماسین: هەوکردن. با کردن.

عەلی لە دواوەی رۆیی و گوتی:

ـ لاساری مەکە دایە گیان. لێرە وەمێنە. تۆ لەگەڵ ئێمە دەرناچی. هەر لێرە دانیشە. ئێستا تۆ خۆت لەسەر پێ راناگری.

مرێمۆك قیژاندی:

ـ کێ دەڵێ لەگەڵتان دەرناچم. کچم، ئەلیف، ئەوە لەگەڵ تۆمە. ئەنگۆ برۆن. وەڕێ کەون و برۆن... برۆن من خۆم دێمە چوکوور.

عەلی پیلی گرت:

ـ دایە، لاساری مەکە. سەر مەخە سەرم. ئەمن نامەوێ بە راستەڕێدا برۆم. رێیەکی رژدە، بەڵام نزیکە. ئەتۆ ئەو رێیە نادۆزیتەوە. ئەگەر یەکتریمان لێ بزر بێ. وەرە مەرد بە وا مەکە...

مرێمۆك دارەکەی لە نێوقەدی توند کرد. دیسان دەستەکانی بەرز کردنەوە و تا هێزی لەبەردابوو بەرزتری کردنەوە:

ـ خوایە گیان، خودا چاوڕەش و کەزی رەشەکەم... تۆ خۆت کەس حەوجێ بە کۆڵی کەس مەکە، تەنانەت دایکش حەوجێی بە کوڕی نەبێ. ئامین...

رووی کردە ئەلیف و گوتی:

ـ ئەنگۆ برۆن. کچە دڵ ناسکەکەی خۆم. ئەمن وردە وردە دێم. چاوەڕێم مەبن، با ئەو زستانە منداڵەکانتان برسی نەبن.

عەلی دیسان تووڕە بۆوە. دیار بوو دایکی هەموو قسەکانی ئەوی بیستبوو. گوتی:

ـ وەمێنە. برۆ چیت پێ خۆشە بیکە. منداڵەکانم لەبەر تۆ لەبرسان ناکوژم.

رووی لە ژن و منداڵەکەی کرد و گوتی:

ـ وەپێشم کەون دەی، وەڕێ کەون. با لێرە بەجێ بمێنێ و چیی پێ خۆشە بیکا.

ئەلیف ویستی بەرەو لای مرێمۆك بچێ، بەڵام عەلی پیلی گرت و وەپێش خۆی دا.

وەڕێ کەوە. لێی گەڕێ با بەجێ مێنێ. لەو چەند رۆژەدا هەرچی بەڵا و نەهامەتی بوو بەسەرمی هێنا. با بەس بێ. دایکە با دایك بێ، هەموو کەس دایکی هەیە. وەڕێ کەوە.

ئەلیف تەواو لە عەلی ترسابوو. منداڵەکان چاویان لێ زەق ببوو و چاوێکیان لە دایکیان و یەکیان لە بابیان دەکرد.

عەلی وەپێش خۆی دان و گورج و خێرا وەڕێ کەوتن. مرێمۆك لە دواوەیان و لە نێوەڕاستی رێیەکە هەروا کە خۆی دابووە سەر دارەکەی راوەستابوو.

عەلی زۆر خێرا دەڕۆیی. دەتگوت ئەو لەتە جەوالآنەی لە لاقی بەستبوون، وێک دێن. وەك ئەوە وابوو لەبیر لاق، لەسەر دوو تۆپی لاستیکی بخزێ. بڕێك دواتر منداڵەکان و ژنەکەی نەیانتوانی لەگەڵی دەربچن و بەجێ مان. عەلی نوقمی خەیاڵان، وا توند دەڕۆیی ئاگای لە خۆی نەمابوو. بڕێك دواتر ئەلیف عەلیی لەبەرچاو نەما. ئەو زۆر وەپێش کەوتبوو و لە شیوەکە ئاوا ببوو. لە دارەکان و لە بنچکەکان و لە دارستانە ڕەشەکەی یالەکەی ڕووبەڕوو و لە زەوییە خۆڵەمێشییەکەو لە گوڵە ورد و بریقەدارەکانی کوێستان و مژە خۆڵەمێشی و سپیەکەی دەتگوت هەورە هەڵدەستێ و بڵاو دەبێتەوە.

دوای ئەوەی عەلی لەبەر چاوان ون بوو، ئەلیف خۆشییەکی لە دڵ گەڕا، هەر بۆیەش بە شوێن عەلیدا ڕای نەکردبوو و نەیکردبووە قیژەقیژ و وەڕووی خۆی نەهێنابوو. ئێستا دەبوو بگەڕێتەوە و بچێتە لای مرێمۆك. دەست و چاوی ماچ بکا و داوای لێ بکا لە عەلی خۆش بێ. ڕاستە مرێمۆك لاسار بوو و قسەی یەك بوون، بەڵام ژنێکی باش و دڵ نەرم بوو. بنیادەم دەیتوانی لە یەك سات دا لە هەموو خەتاکانی خۆش بێ. کەسی وەك مرێمۆك دەگمەن هەبوون کە ئەوەندە کوڕەکەی و بووکەکەی و نەوەکانی و خەڵکی دیکەشی خۆش بوێن. ئەلیف ئاخێکی هەڵکێشا و بە خۆی گوت:

ــ ئەی دایە گیان کە دڵت دەریای بەزەییە و بە هەزاران دڵ ئێمەت خۆش دەوێ، ئەگەر یەکێك گیانی لێت بوێ ئالێی نا، ئەوە بۆ ئاوات لێ هات؟

چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو:

ــ دەبێ بچم و دەستی ماچ بکەم و دەست بە سەر و قژە خەنەلێدراوەکەیدا بێنم و وەپێکەنینی بخەم. حەسەن دەبێ لە دار کاژەکە بنێشتی بۆ لێ بکاتەوە. ڕاستە ددانی نییە و ناتوانێ بیجوێ، بەڵام بۆن و بەرامەی دارستانەکەی لە گیانی دەگەڕێ، هەموو بۆن و بەرامە و سەوزایی و گەشاییەکەی دارستانەکە.. ڕوخساریشی وەك گوڵ دەپشکوێ.

ڕێك لەو کاتەدا کە دەیویست بگەڕێتەوە، حەسەن ملی بەلارەوە نا و بە ترسەوە گوتی:

ــ بابم ڕۆیی... سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیی..

ئۆمەخان گوتی:

- زۆر تووڕە بوو. ئەمن تا ئێستا بابم ئاوا نەدیبوو. خوێنی لە چاویدا بوو.

ئەلیف بە تووڕەیی ڕاوەستا:

ــ لێی گەڕێن با بڕوا. ڕۆیشت با بڕوا...

بەڵام نەیتوانی بگەڕێتەوە دواوە. عەلی دەڕۆیی. بەبێ ئەوەی سەیری ئەملاوئەولای بکا، بەو تووڕەییەوە هەتا چوکوور دەڕۆیی، هەتا تین و هێزی لەبەردابوو، دەڕۆیشت و جا دادەنیشت

و لێی دەکەوت. لەوانەش بوو وا نەبێ. لەوانەبوو رقەکەشی بنیشێتەوە و دوای ماوەیەك لە شوێنێك رادەوەستاو چاوەڕێیان دەبوو. بەخۆی گوت:"ئەوانە هەمووان رق ئەستوورن. ئەوانە راوەستانیان نییە. ئەوانە ئەگەر بە شتێکەوە نووسان تا مردن لێی نابنەوە."

گەڕایەوە و بەرەو ئەو لایەی عەلی رۆیبوو، غاری دا. ددانی بە جەرگی خۆیدا دەگرت، حاڵی زۆر باش نەبوو. بەلەکەکانی لاقی دەیانزیڕاند. سەریشی ژانی دەکرد. بەڵام چاری نەبوو. کە نیوەڕۆ داهات، وا شەڵاڵی ئارەقە ببوو کراس و پانتۆڵ و سەرو قژی هەمووی خووسابوو. ئەو ئارەقەیەی لە نێوچاوانییەوە دەتکا، دەچووە نێو چاوەکانییەوە و دەیکزاندنەوە. دڵی تەپەتەپ لێی دەدا. دەموچاوی وەك ئاگر بڵێسەی لێ دەبۆوە. زاری داپچڕیبوو و هانکەهانکی بوو. زاری وشك ببوو. ئیدی تین و گوڕی لە ئەژنۆکانیدا نەمابوو. پەیتاپەیتا دەکەوت و هەڵدەستایەوە. منداڵەکان زۆر لە دواوە بەجێ مابوون. دوای نیوەڕۆ بوو کە لە دوورەوە عەلیی وەك خاڵێکی رەش دی لە گردەکە دەچووە خوارێ. ئەگەر نەیدیبا، ئیدی هێزی نەبوو هەنگاوێکی دی بنێ. هەر لەوێ دەکەوت و دەمایەوە.

هەتا هێزی دەبەردابوو،چەند جارێك بانگی عەلیی کرد. عەلی یان نەیبیست یان خۆی لێ گێل کرد و گوێی نەدایێ. دەم و زاری وشك ببوو.

خۆی لە گردەکەوە خلۆر کردەوە. ئەو بایەی لە رووبەروویەوە هەڵیکردبوو، وەخۆی هێنایەوە. کە گەیشتە عەلی، چاوەکانی رەشکەو پێشکەیان دەکرد و دەوروبەری خۆی نەدەدی.

لە ناکاو خۆی بەسەر عەلیدا دا. نووزەیەکی لێوە هات و کەوتە عەرزی. عەلی راوەستا. کە ژنەکەی دی، وەخۆ هاتەوە. رەنگی سپی هەڵگەڕا، تەنانەت رەشێنەی چاویشی سپی هەڵگەڕا. ماوەیەك بەسەرییەوە راوەستا وەك بڵێی هەموو خوێنیان مژیبێ، وشك هەڵات. کە ئەلیف گوتی:"عەلی قومێکم ئاو بدەیە خەریکە دەمرم، ئەو هەروا دەتگوت هیچ نابینێ چاوی لە ژنەکەی بڕیبوو. ئەو بارەی بەکۆڵییەوە بوو، دەتگوت لە خۆوە کەوتە خوارێ. دەستەکانی هەر لەخۆوە جامولکەکەیان لە توورەکەکە دەرهێنا و لاقەکانیشی لەخۆوە بەرەو ئەو کانییە چوون کە لەتەنیشت دارە نارەوەنەکەوە بوو. جامولکەکەی لە ئاوەکە هەڵێنا، بێ ئەوەی ئاگای لێ بێ جامەکە پڕ بوو، لێوەکانی ژنەکەی لەخۆوە بەرەو جامولکەکە چوون و ئاوەکەی خواردەوە. عەلی دیسانیش لەسەر پێ مابۆوە. سەیری دەکرد و نەی دەدی.

بڕێك دواتر ئەلیف وەخۆ هاتەوە. خۆی دایە سەر ئانیشکی راستەی و بە دەنگێکی کز و نیوەزیندوو گوتی:

ـ وەرە عەلی، وەرە تەنیشتم دانیشە.

دەستی لەسەر عەرزەکە دانا وگوتی:

ـ ئەلێرە...

عەلی وەخۆ هاتەوە و دانیشتز

ئەوجار روخساری وردە وردە رەنگێکی وەبەر دەهاتەوە. ئەلیفیش تەواو وەخۆ هاتەوە. خۆی کۆ کردەوە و گوتی:

ـ ئەگەر نەتدەگەیشتمێ ئاوا هەتا چوکوور دەڕۆیشتی. سەیر بکە، گۆنییەکەی بن پێیەکانیشت کەوتوون...

عەلی سەیری لاقەکانی کرد. لاقی وەك جووجەڵەی یەك رۆژە، رووت و قووت بوون. دەلەرزین و چلیان دەدا. داماوە، ئەوە یەکەم جاری بوو لە ژیانیدا بەزەیی بە لاقەکانی خۆیدا دەهاتەوە. سەری لەقاند و گوتی:

ـ وایە. کەوتوون. کەوتوون و منیش نەمزانیوە.

برێك دواتر ئەلیف هەستا و چووە سەر کانییەکە. سەری خستە نێو ئاوی کانییەکەوە. لاقەکانی لە ئاوەکە کێشا. دوایی دەست و دەموچاو و لاملی بە جوانی شوشت و هەرای کرد:

ـ عەلی تۆش وەرە.

عەلی ژانێکی لە سینەیدا هەست پێ کرد و جینگڵی دا. سەیری لاقەکانی کرد. لاقی راستەی بوو دەکزایەوە. بەردە قسڵینەکان پێستەکەیان داماڵیبوو و گۆشتە سوورەکەی هاتبۆ دەریز لە هەموو جێیەك دەکرا بە پیخاوسی بەرێیەدا بڕۆی، بەسەر رەوەزاندا، بەسەر بەردە ئەستێ دا، بەسەر بەردی تیژدا، بە دارستانی دڕکاویدا، بە ئاو و زەلکاواندا، هەموو جێیەك بۆوە دەبوو، بەڵام بەردە قسڵینە بۆوە نەدەبوو بەپێی پێخاوسی بە سەریدا بڕۆی. ئەوی کوڵێکی قورسیشت بە کۆڵەوە بێ... ئەو کاتەیە ئاورت تێ بەردەبێ... تێدا دەچی.

لاقەکانی بەدووی خۆیدا دەخشکاند و هەڵدەبەزییەوە و ئاخ، و ئۆفی " بوو. گەیشتە سەر کانییەکە. سەری خستە بن ئاوەکەوە و هێنایە دەرەوە. پرسی:

ـ منداڵەکانت لە کوێ بە جێ هێشتن و خۆت هاتی؟

ئەلیف:

ـ لە رێگە.

عەلی ویستی بڵێ:"دایکم.." بەڵام نەیتوانی. ئەو دەردەی هاتەوە بیری کە بەیانی پێی دابوو، بۆیە تەریق بۆوە. گوتی:

ـ نازانم چەند رۆژێکە بۆ وام لێ هاتەوە ژنەکە. بۆ وام لێ هاتووە؟ ئەوە بۆ وام کرد؟ چانییە کەس دیار نەبوو.

ئەلیف چاوی لە عەرزی بڕیبوو و نەیدەتوانی سەیری مێردەکەی بکا.

ماوەیەکی دوور و درێژ هەتا دەمەدەمی ئێواریّ یەکیان لەم بەر و ئەویدی لەوبەرەوە دانیشتن. دوایی عەلی هەستا. بارەکەی کردەوە و لەتە جەواڵەکانی دیکە دەرینان. دوو جووت گۆرەویی بەنی هەبوو، جووتێکیانی لە لۆی لێفەکە دەرێنا و لەپێی کرد. لەسەر گۆرەوییەکەشەوە گۆنییەکەی هەڵپێچا و جوان بەستی. بەپەلە بەرەو دواوە و بەرەو لای دایکی وەڕێ کەوت. ئەلیفیش بەشوێنیدا رۆیی. دەبوو دڵی مرێمۆك چاك بکاتەوە. سەعات و نیوێك دواتر، تووشی منداڵەکان بوون. منداڵەکان پێدەکەنین و یارییان دەکرد. حەسەن لە کاژەکان بنێشتی لێ دەکردەوە و کچەش بۆ ئەوەی لیّ بستێنێ، راوی دەنا. ئەلیف لە منداڵەکان کە راوەستابوون و سەیری ئەوانیان دەکرد چووە پێشێ و گوتی:

ــ هەوارگەکەمان برێك لە پێشترەوە لەسەر کانییەکەیە. بچنە ئەوێ، ئاگرێك بکەنەوە. مەنجەڵەکەش پڕ بکەن لە ئاو و وەسەری نێن. ئەگەر زۆرمان پێ چوو، مەترسن. ئەگەر ئاگر بکەنەوە، خێو و پەری لە رووناکایی دەترسن و لێتان نایەنە پێشێ. ئەگەریش بێن کاریان بە منداڵان نییە. ورچ و گورگیش لە ئاگر دەسەڵمێەنەوە. ئەگەر ئاگرەکە بکەنەوە، هیچ شتێك لێتان نایەتە پێشێ. یاڵڵا دەی، خێراکەن...

حەسەن:

ــ ئاگرێکی وا دەکەمەوە... ئەوەندە گەورە. ... هێندەی خەرمانێك.

ئەلیف:

ــ نایەوێ ئەوەندەش گەورە بێ. دارستانەکە دەسووتێ.

ئۆمەخان بە پاڕانەوەوە گوتی:

ـ توخوا دایە زوو بگەڕێنەوە. لە برسانا دەمرین. زۆر ماندوو بووم.

حەسەن سینگی هێنایە پێشێ:

ــ مەیەنەوە. درۆ دەکا. هیچ برسیی نییە.

ئۆمەخان لە پشتی راکێشا و گوتی:

ــ تۆ بێ دەنگ بە، چڵمن.

حەسەن گوتی:

تۆ بێ دەنگ بە. باش،با دایکم بڕوا. لووتت دەشکێنم. وەك لووتی جنۆکان پانی دەکەمەوە. جا جنۆکە وا دەزانن تۆش لە خۆیانی و هەڵتدەگرن و دەتبەن.

ئۆمەخان:

ـ دایه، چاو، کوڕەکەت نایبڕێتەوە.
ئەلیف:
ـ واز بێنە حەسەن. چیت لە گیانی ئەو کچۆڵە دەوێ؟
و وەڕێ کەوت.
شان بە شان لە گردە بچووکەکە وەسەر کەوتن. سیبەرەکان لە سەر زەوییە خۆڵەمێشییەکە دەلەرزینەوە. سیبەرەکان لە نەخشێکی چنراو دەچوون. ئەلیف چاوەکانی زەق زەق لە عەلی بڕیبوو. ژانێکی تاقەتبڕ لە دەموچاوی نیشتبوو. دەمووچاوی چرچ و درێژتر ببۆوە. لایەکی روومەتی چڵی دەدا. دەموچاوی وەك روومەتی ئەوانەی تایان لێ دێ سوور ببۆوە. چاوەکانی قیچ ببوون و لە ئاسۆیەکی دووری بڕیبوون. لاقەکانی بەبێ ئەوەی لە عەرزیان هەڵگرێ، بە دوای خۆیدا دەیخشکاندن و وردە وردە شلتر دەبۆوە. ئەلیف یەك دوو جاران ویستی شتێکی پێ بڵێ، بەڵام کە سەیری دەموچاوی عەلیی کرد، پاشگەز بۆوە.دوایی عەلی وەك سەرخۆشان لەتری دەدا و وەك خەواڵوو لاقەکانی تێك دەئاڵان و بەولاولادا دەکەوت. وابوو ئەلیف پیلی گرت و کێشای و گوتی:
ـ وا باشتر برێك دانیشی و پشووەك بدەی. هێشتا زۆری رۆژ ماوە.
عەلی بە توندی گوتی:
ـ ناتوانم دانیشم.
بەڵام دەنگەکەی نیوەگیان و شەکەت بوو. تەنانەت هێزی ئەوەندەشی نەبوو بە توندی بێتە دەرەوە:
ـ ناتوانم دانیشم ئەلیف. خەڵك ئەمڕۆش دەستیان پێ نەکردبێ، بەیانی دەست دەکەنە لۆکە چنین. لەوانەشە ئەمڕۆ سێ رۆژ بێ دەستیان پێ کردووە. خۆ ناکرێ ئەمساڵ لە نیوەی زستانەوە برسی و رووت و قووت دانیشین، وەڕێ کەوە ژنەکە.
برێك وەخۆ هاتەوە. بەلادا هات و حاڵەتە خەواڵوییەکەی برێك لەسەری رەوییەوە. ئەلیف کە چاوەکانی پڕ ببوون و گریان ئەوکی گرتبوو، خۆشەویستانە سەیری مێردەکەی کرد. لەدڵە خۆیدا گوتی:"منداڵێکی گەورەیە. رۆڵە گیان، گیانی من. خۆزگە قەوەم پێت شکابایە، لەکۆڵم دەکردی و هەتا نێوەڕاستی کێڵگە لۆکەکە دام نەدەنای. پیاو کە پێ دەنێتە سەر ئەو خاکە نەرم ونیانەی چوکووراوا، هەتا گوێزینگان لێی رۆدەچێ. چوکووراوا وەك دیمەنێکی لە خەوندا بیبینی، مژاوییە. رەنگێکی شین لەسەر بەرد و خاك و لۆکە سپییەکان و مرۆڤەکان کە وەك مێروو تێك دەئاڵێن، دەنیشێ. رەنگێکی شینی کە خوا دەزانێ... وەك دەریایەك کە یەکەمجاربێ بیبینی.... دەست و دەموچاو لووت و قژت شین دەبن و ناشتوانی بیانسڕیتەوە، چی دەیشۆیەوە پاك نابنەوە... شینێکی خەیاڵی... سوێر."

لە ناخی دڵەوە گوتی:

ــ ئاخ... ئاخ.. چەندە ماندووم.

بێ ئەوەی بیەوێ ئەو قسەیەی لە زاری دەرچووبوو. وا پەژیوان بۆوە نەیدەزانی چ بکا. جا ئێستا چۆن توانیبای سەیری چاوی عەلی بکا. هەموو باری سەرباری ئەو بوون. کە بە ناڵە ونووزەوە گوتی:"خوا من بکوژێ." عەلی راوەستا، چاوەکانی لە ژێللا هاتبوون. ئەلیف ترسا.

ــ بۆ وەشوێنم کەوتی. بگەڕێوە و برۆ. بگەڕێوە و بە منداڵەکانت رابگە. بگەڕێوە، بگەڕێوە برۆ، هەموو چارەڕەشییەکانی من بۆ ئەنگۆیە. لەبەر ئەنگۆیە. جا ئێستا وەرە و ئەو تووك لێکراوە بدۆزەرەوە. ئەگەر دیسان بەرەو ئاوایی گەڕابێتەوە، وەڵڵاهی وەبیللاهی، خۆ حاشا لە خودا ناکەم، ژنەکەم قەحپە بێ ئەگەر وەدووی کەوم و بیگێڕمەوە. لێیگەڕێ با بڕوا و بمرێ. بڕوا و لە نیوەی رێیە بمرێ. ئەگەر لە چوکوور گەڕامەوە، ئێسك و پرووسکەکەی کۆ دەکەمەوە. ئەگەر هەتا ئەو دەم شتێکی لێ مابۆوە،... لە ئێسك و پرووسکە سپییەکانی.. قەل و داڵ و سیسارکە کەچەڵە گۆشتی دەخۆن و تەواوی دەکەن. هەر وەك چۆن هورووژمیان بۆ ئەسپەکە برد، ئاواش دەڕژێنە سەری و لە چاو ترووکاندنێکدا تەواوی دەکەن.

زاری خەریك بوو کەفی دەکرد و لێوەکانی رەش داگەڕابوون.

ــ ئیشەڵڵا تەواوی دەکەن.

ئەلیف راوەستابوو و چاوی لە عەرزەکە بڕیبوو. رەنگی هەڵبزرکابوو و جووڵەی لێ بڕابوو. شان و پیلی دەتگوت ئیفلیج بوون، بەولاولایدا شۆڕ ببوونەوە.

عەلی کە لەو هات و هاوارەی ماندوو بوو، زانیی زیدەڕۆیی کردووە. بە ئەسپایی و بە زەحمەت یەك دوو هەنگاو لە ژنەکەی چووە پێشەوە و بە دەنگێکی نەرم و نیان گوتی:

ــ ئەلیف... ئەلیف.. تۆ خۆت لەگەڵ من ماندوو مەکە. زۆر دوور نییە. بگەڕێوە لای منداڵەکان. منداڵەکان دەترسێن. ئەمن دەچم و دەیدۆزمەوە. مەترسە، ئەگەر گەڕابێتەوە لای ئاواییش، وەشوێنی دەکەوم، دەچم و دەیهێنمەوە... مەترسە... دەی بگەڕێوە دەی.

بە بێهێزییەوە لەسەر عەرزەکە دانیشت. لە دڵی گران هات کە کەوتە سەر عەرزەکە. خۆی کۆ کردەوە و ویستی هەستێ و خێرا وەڕێ کەوێ... دووسێ جاران هەوڵی دا، بەڵام نەیتوانی هەستێ... تخێڵ بوو و لەجێی خۆی مایەوە. بە بێهێزییەوە دەستی لە عەرزەکە دا و گوتی:

ــ وەرە ئەلیف، تۆش لێرە دانیشە. ئێستا هەڵدەستین. ئەگەر نەشگەینە لۆکە رنینەوە، با نەگەینێ... ئەگەر خودا دەرگایەکی پێوەدا، یەکێکی دی دەکاتەوە، خەفەتی لێ مەخۆ.

ئەمساڵ چارەنووسمان ئاوا بوو. چ بکەین... دیارە دەرگایەك دەکرێتەوە، تا بەندەکانی لێیان نەقەومێ خدری زیندوو فریایان ناکەوێ.

هەوڵی دا پێبکەنێ. بزەیەکی تاڵ و بەژان وەك برووسکە بە گۆشەی لێوەکانییەوە نیشت و تێپەڕی. ئەلیف بێهێز و بەئەسپایی هات و بەترسەترس لە تەنیشتی دانیشت و گوتی:

ـ دەرگایەك دەخرێتە سەر پشت... دڵنیام دەخرێتە سەر پشت. زۆر ماندوو بووم. هەر شتێك بێ پێش تەواوبوونی لۆکە رنینەوەی دەگەینێ. ئەو کات ئیدی شەو و رۆژێ کار دەکەین. لەسەر یەك کار دەکەین و بە قەدرایی ئەوان پارە کۆ دەکەینەوە. ئەمساڵ منداڵەکانیش لۆکە دەڕننەوە.

عەلی جوابی نەدایەوە. خەریك بوو بیری دەکردەوە. لە ناکاو دەرپەڕی و بەرەو رێگەکە رۆیی و گوتی:

ـ نابێ، نابێ. دەبێ بەر لەوەی ئەوان بچنە نێو کێڵگەکەوە، ئەمن بگەمێ. لەوانەشە پێنج رۆژی دیکە بگەنێ. دەبێ بەر لەوەی دەست پێ بکەن، ئەمنیش تەنەکە و سەوەتەی خۆمم گەیاندبێتە ئەوێ...

"جا ئەگەر بگەمێ، گوندییەکان چەندەیان پێ سەیر دەبێ... دەڵێن هەتیو، ئەو "عەلی"یە درێژە دەڵێی باڵی هەیە. حەقی خۆیەتی... سەیری ئەو لۆقە درێژانەی بکەن.... هەر دەڵێی لەگلەگە. هەر شەقاوێکی سێ هێندەی شەقاوی خەڵکییە."

"ئەوان دەبێ ئەو کاتەی پێ دەنێنە نێو کێڵگەکەوە و یەکەم لۆکە لە قۆزاخە دەردەکێشن، ئاوڕ بدەنەوە و چاویان بە من بکەوێ. دیارە دەبێ بگەینێ ئەلیف، ناکرێ راوەستین."

خێرا، وەك بڵێی هیچ ماندوو نییە و یەکەم هەنگاوێتی، وەڕێ کەوت.

"نابێ راوەستین... نابێ... نابێ. هەر دەبێ بگەینێ... نابێ نەگەینێ. ئەلیف نابێ نەگەینێ."

ئەلیفیش هەستا و گورج وەدووی کەوت. بەڵام عەلی وا توند دەڕۆیی کە ئەلیف بە زەحمەت دەیتوانی پێ بە پێی بڕوا.

عەلی دوای ئەوەی مەودایەکی زۆر رۆیبوو، جارێکی دیکە ئاوڕی دایەوە. روخساری نوقمی ئارەقە بوو. بە ژنەکەی کە لە دواوە بەجێ مابوو و هەوڵی دەدا بیگاتێ، گوت:

ـ پێش ئەوەی ئەوان بچنە کێڵگەکەوە... دەبێ بیانگەینێ.

لای کردەوە و هەنگاوەکانی خۆشتر کردن.

## ١٠

لە نێوەڕاستی ڕێگاکە ڕاوەستابوو و چەقیبوو. تووڕەییەکەی وردە وردە دامرکابۆوە و ترسێکی بەتەوژم جێی گرتبۆوە، بەڵام بووکەکەی برێك لە پێشەوە دەڕۆیی و جاربەجار هەنگاوەکانی شلتر دەکردنەوە. ئەلیف کچێکی باش بوو، خۆ ئەگەر ئەو "عەلی"یە کافرەش لەو چۆڵ و چیایەدا بەرەڵڵای کردبایە، بووکەکەی بەجێی نەدەهێشت: "بووکە خانومانەکەم، بمبینە، ڕاوەستا، تەنانەت ئاوڕێکیشی دایەوە. لە دەوری ئەو پرچ و چاوە ڕەشانەی گەڕێم. ئەوە دێ..."

ترسەکەی ڕەوییەوە. هیوایەکی لە دڵی گەڕا. دیسانیش تووڕە بۆوە. "ئەوە بۆچی ئەو دەمەی تازەم ببوو و هێشتا هەر چنگە گۆشتێکی سوور بوو، وەك ژنە شێتەکەی دورمووش قوڕگیم ڕێك نەگوشی و فڕێم نەدا نێو گۆڕستانەکەوە. هێشتا گووەکەی لە بن نینۆکەکانم دایە... حەیف بۆ ئەو هەمووە شەونخوونییەی کێشام... حەیف بۆ ئەو هەمووە زەحمەت و کوێرەوەرییەم... ڕەنج بە خەسار خۆم..."

"چ بوو؟ بووکەکەی ئاوڕی دایەوەو ڕۆیی.... هەی لە دەمی بابی تۆش... ئەتۆم بۆ ئەو سەیە هێنا... دووسەت دراوی کەسکم ژمارد و دامنێ... ئاخر لێرە کێ ئەوەندەی دراو بۆ ژنێك خەرج کردووە؟ خۆزگە قوڕگی تۆ و ئەو "عەلی"یە قەحپەدایکەشم ڕێك دەگوشی و دەخنکاندن... ئاخ... ئاخ... ئاخ... "عەلی"یە درێژ ئاخ. ئەو دەمەی چووبوویە سەربازی، گوتیان شەڕ دەست پێ دەکا، چەند مانگان، بە شەو و ڕۆژ نەخەوتم و سەر و پرچی خۆمم ڕنییەوە. هەموو خەڵکی گوندی بە ناڵە و گریانم هاتن و لە دەورەم کۆوە بوون. هەتا تۆ هاتییەوە "عەلی"یە درێژ، وەك مەلی ئاسمانان هەموو دنیام پڕ کرد لە ناڵە و شین. ئەگەر دەمزانی ئاوام لێ دەکەی، زنگوڵەم لەخۆم دەبەست و سەمام دەکرد...

بەبێ ئەوەی خۆی بیەوێ، وەشوێن بووکەکەی کەوت. وا توند دەڕۆیی خەریك بوو بیگاتێ. منداڵەکان بە دوای دایکیاندا غاریان دەدا. دەیویست هاوار بکا و بە بووکەکەی بڵێ ڕاوەستە. دەیوست هەرا بکا. ترسێك لە دڵی نیشتبوو. ترسی مەرگ. جار و بارە بە مێشکیدا دەهات

دەمرێ و بەرچاوی رەش دەبوون. لە پێشدا ویستی بانگ بکا، بەڵام غیرەتی ئیزنی نەدا. پێی باشتر بوو غار بدا. کە بووکەکەی زۆر دوور کەوتەوە و ئەو نەیتوانی بیگاتێ، هەستی کرد لە تاریکستانی مەرگدا نوقم بووە و دەستی کرد بە هات و هاوار، بەڵام خۆشی نەیدەزانی دەنگی دێتە دەرێ یان نا؟ هەر ئەوەندەی دەزانی کە زاری داپچڕیوە. هەتا بووکەکەی لە چاوان ون بوو، هەم بەدووی دا رای کرد و هەمیش هاواری کرد. کە بووکەکەی و منداڵەکان لە شیوەکە ئاودیو بوون و لە چاوان ون بوون، تین و توانای تێدا نەما و لەسەر رێگەکە لێی درێژ بوو. لەسەر عەرزەکە ماوەیەك جینگڵی دا و مایەوە. جار و بارە بەرچاوی تەواو رەش دەبۆوە. مەرگی بە چاوی خۆی دەدی و هەستی دەکرد تێدا دەچێ. هەر وا کە چنگەفرکەی بوو، لە جێی خۆی هەستا. لە تاریکاییەکە، و لە تاریکەسەلاتی مەرگ کە کەوتبووە ناویەوە و لە مردنیش تۆقیبوو.

جلوبەرگەکانی نوقمی تۆز و خۆڵ ببوون. کراسەکەی بە دەست تەکاند و خاوێنی کردەوە. بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە. لە ناکاو ئەحە شێت وەك برووسکەیەك بە بەر چاویدا هات. بە روویەکی گەشەوە هات و لە بەردمی راوەستا. ددانەکانی سپی سپی بوون. چەندە جوان بوو ئەحە شێت. کچە پەری سەهلە، فریشتەی ئاسمانێش ئاشقی دەبوون. هەر بەراستی ئەوە کاروانێك بێرەدا نایە؟ ئاخۆ کەس نییە بەو رێیەدا بچێتە چوکووراوا بۆ لۆکە چنینێ؟ نەکا هەموو گوندەکان رۆیبێن و هەر ئێمە لە سۆنگەی ئەو پیرەبەرازەوە بەجێ مابین؟ هیچ هاموشۆیەك نییە. گورگ دێن، رەوە رەوە، گورگی برسی، بە کەڵبەی گڕەوە. هەر کامەیان پارچەیەکی لەشی دەدڕن و دەیبەن. ئێسقانە سپییەکانی بەجێ دەمێنن. گورگەکان دێن و سەرەدایان نایە. رەوەرەوە بە غاردان دەهاتن، قەڵەمبازیان دەدا و وەك مێروولە ملیان پێوەنابوو. هاواری کرد:

ـ عەلی ی ی ... رۆڵە عەلی. فریای دایکت بکەوە. چما نامبینی؟ بمگەیە. عەلی ی ی ی... عەلی ی ی رۆڵە... بمگەیە. گورگ، سیسارکە....

کە هاواری دەکرد، گورگەکان ون دەبوون. هەم هاواری دەکرد و هەمیش گێژ و وێژ بوو و نەیدەزانی چ بکا و هەر لەوێ لە دەوری خۆی دەخولایەوە. لەوێ مایەوە و هاواری کرد و لە دەوری خۆی خولایەوە و هەتا ئێوارێ هەر هاواری کرد. ئاخری دەنگی نووسا. سیسارکە کەچەڵەکان بە نووکە تیژەکانیانەوە و بە باڵە رەشە زلەکانیانەوە هەزاران، و دەهەزار دانە، وەك مار و مێروو لە ئاسمانەکاندا لەنگەریان گرتبوو. هاواری دەکرد، بەڵام دەنگی دەرنەدەهات. هیچ دەنگێکی لێوە نەدەهات.

چەند شەمشەمەکوێرەیەك تیژ بەبەرچاویدا تێپەڕین. بوولێڵێکی سامناك بوو. لەسەر عەرزەکە گەوزی. لەگەڵ مەرگ دەستەوئیخە بوو. هەناسەی خۆی بەتاقی کردەوە. هێشتا پشووی نەبڕابوو. بەخۆی گوت:" شوکرت خوایە گیان، هێشتا نەمردوومە."

بایەکی فێنك هەڵی کرد. لە چیاکانەوە دەهات. ئەستێرەی درەوشاوە بە ئاسمانەوە بوون. مریمۆك گورج هەستا. پێیەکانی دەلەرزین. دانیشتەوە، بەڵام لە خۆڕا، جۆرە شادییەك لە دڵی گەڕابوو. ترووسکەی هیوا، وەك ئەوانەی ونبووەکەیان دەدۆزنەوە.

دیسان هەستایەوە پێ. ئیتر لاقەکانی نەلەرزین. لەو جەنگەیەدا دارەکەی بزر کردبوو. لە مێشەڵانەکە دارێکی دۆزییەوە و بەدەستییەوە گرت. قورگی دەبرژایەوە. لە دڵی خۆیدا بە شادی و هیواوە ورتاندی:

"حەسەنی من، بەچکە شێرێکە. چووەتەوە سەر باپیری. کوا لەو "عەلی"یە کافرە دەچێ؟ نەچۆتەوە سەر ئەو دایکە شپرێوەشی. چاوەکانیشی هەر دەڵێی چاوی باپیرەیەتی. بەهێز و لاسارە. بنیادەمی لاسار دڵیشی نەرم دەبێ. خراپەی ناکا. ئەگەر خراپەش بکا، لەگەڵ خۆی دەکا. حەسەنی من لە دەم ڕێگا دادەنیشێ و دەڵێ:"هەتا نەنکم نەهێنن، لێرە نابزووم. هەر لێرە دەبم." بەڵێ وا دەکا. ئەو کافرانە پیلی دەگرن و هەڵی دەستێنن، بەڵام حەسەنی من خۆی لە دەستیان رادەپسکێنێ و را دەکاتە کێوەکان و دەڵێ:"ئیلا و بیلا، ئەمن نەنکم دەوێ." نەنە بە قوربانت بێ حەسەن گیان."

بە سۆز و خۆشەویستییەوە بیری لە حەسەن دەکردەوە:" ئەو کچەتیوەش، ئەویش خراپ نییە. برێك چووەتەوە سەر دایکەکەی."

کە بۆ یەکەم جار هەستی بە برسێتی کرد، پێی سەیر بوو. دڵی لەبوورەوە دەهات:"ئەی ئەگەر دەست و لاقی حەسەن ببەستن چی؟"

ترسێکی زۆر قورستر لە ترسەکەی پێشوو خزییە ناخییەوە. ترسێکی رەش. قورس و دیار. ترسێکی تاریك.

لە ناکاو غاری دا. برێك دەنگی دەردەهات. هەم غاری دەدا و هەمیش هەرای دەکرد:"حەسەن گیان." رای کرد و رای کرد و لە پێ کەوت و هەر لەوێ دانیشت. دەترسا. ئیدی گورگەکان دیار نەبوون. سیسارەکە کەچەڵەکانیش بەو باڵە رەشانەیانەوە کە ئاسمانیان داپۆشیبوو، لە هیچ کوێ دیار نەبوون، بەڵام ترسی مەرگ وەك شینایییەکی تۆخ و خەست و تار خزیبووە دەروونییەوە و راوەستابوو. وا لە مەرگ دەترسا کە سات بە سات زیاتر کرووشمەی دەکرد و بچووکتر دەبۆوە و نەیدەزانی بچێتە کوێ و چ بکا. ترس لە هەر چوار تەنیشتەوە هورووژمی بۆ دێنا و وای لێ دەکرد مریمۆك بلەرزێ.

هەوا وردە وردە فێنکتر دەبۆوە. وەك مێژۆکە دەلەرزی. هەستی دەکرد ئەگەر نەشمرێ و رزگاریشی بێ، ئەو ترسە بەرۆکی بەرنادا. کێ دەیتوانی ئەو ترسە رەشەی لە دڵی

دەربێنێ؟ ترسەکەی نێو دڵی لە دەموچاو و دەستەکانی و زگ و لاقەکانیدا وەك لەرزێك بڵاو دەبۆوە و دەیتەنییەوەو جاربەجار پتر دەبوو و ئەو گرمۆڵەتر دەبۆوە. ئەوەندە گرمۆڵە ببۆوە ئیسقانەکانی قرچەیان دەهات. ئەژنۆی بە سینگییەوە نووساندبوون و سەری لە نێویاندا شاردبۆوە. وڵات نوقمی بێدەنگی بوو. سریوەیەکیش چییە نەدەهات، تەنانەت دەنگی چەقەڵ و فڕندەکانیش نەدەهات. چۆڵ وسارد بوو. موچڕکەی پێدا دەهات و دەلەرزی. وای لیهات هیوای بڕا. ویستی هەستێ ونوێژێك بکا، نەیتوانی. دوایی بەسپایی بەرەو ئەولایەی پێی وابوو باشوورە و قیبلەیە، وەرسووڕا و ویستی دەستەکانی بەرز بکاتەوە، دەستەکانی وەك باڵی مەل دەلەرزین. دەستی بۆ رانەگیران. چەندەی دووعای دەیزانین، نەیتوانیبوو پتر فێر بێ. ئەوانیشی وەبیر نەهاتنەوە: "خودایە گیان، خودا جوانەکەم، خودا باشەکەم، بەقوربانت بم. خودا چاوشینەکەم، چاو رەشەکەم، بەقوربانی سەری نینۆکەکانت بم. کارێك بکە یەکێك لەو نزایانەم بیر بێتەوە و مندارەوە نەبم."

خودای هاتنە پێش چاو. پیرەمێردێك بوو، بە سەر و ردێنێکی نوورانییەوە، ردێنێکی سپیی نوقمی نوور و درەوشاوە. هەر لەو کاتەدا دوعاکەی بیر هاتەوە و خێرا خێرا دەستی کرد بە گوتنەوەیان. لە ناکاو هیچ شتێکی لە پێش چاو نەما. هەموو وڵات چۆڵ بوو. بە دووعا و نزاکانییەوە، بەتەنێ و نوقمی خەیاڵان مایەوە. ئیدی هیچ شتێکی وەبیر نەدەهاتەوە. نە ترس و نە مەرگیش.

بچووکتر و بچووکتر دەبۆوە و چنگێکی لێ مایەوە. ئەوەندە بە توندی دوعای کردبوو زار و لێوی وشك داگەڕابوون و ئیتر دیار نەبوو دووعای دەکرد یان نا.

هەتا رۆژ بۆوە هەر وا مایەوە. هەر وا کرووشمەی کردبوو و گرمۆڵە ببوو. دوایی هەستی کرد لە دوورەوە دەنگێك دێ. لە پێشدا دەنگی پیاوێك لە دوورەوە، لە پشت چیاکانەوە هات و نەما. دواییش هەر وەك ئەو دەنگی ژنێکی بیست. دوایی دیسانەوە بێدەنگی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشایەوە. کە گوێی لە دەنگی ژنەکە بوو، دڵی داخورپا. دووعاکان لە زاریدا وشك هەڵاتن. سەرما کەسیرەی کردبوو. گوێی هەڵخست. ئەگەر توانیبای برێك بەسەر خۆیدا زاڵ بێ، بەرەو لای دەنگەکە غاری دەدا. دەبووە باڵندەیەك و بەرەو لای هەڵدەفڕی. بەخۆی گوت: "لانیکەم دەبێ وەڵامێك بەو دەنگە بدەمەوە." زاری کردەوە، بەڵام دەنگی دەرنەهات. هەرچی زیاتر لەخۆی نووسا، دیسانیش دەنگی هەر دەرنەهات. دەنگەکە وردە وردە نزیکتر دەبۆوە. تا نزیکتر دەبۆوە، وردە وردە جۆرە شادی و هیوایەکی رزگاربوون لە دڵی مرێمۆك دەگەڕایەوە. برێك دواتر تەواو دەنگەکەی ناسییەوە:

ـ دایە، دایە، لە کوێی، وەڵام بدەوە، وەڵام بدەوە با بتدۆزینەوە.

ئەوجار ئەلیف وەدەنگ هات:

ـ کچێ لەسەرت گەڕێم دایە گیان، وەڵام بدەوە.

لەسەر یەك دەپاڕایەوە. جۆرە شەرمەزارییەك بە دەنگەکەیەوە دیار بوو. لەوانەشە وا نەبووبێ و مرێمۆك وای هەست کردبێ. لە دڵەخۆیدا گوتی:

ـ هەی لە دەورت گەڕێم کچم. ئەوە لەمن دەگەڕێی؟ لەو چیا و چۆڵەدا لەمن دەگەڕێی؟...

بە مێشکی دا هات:"دەبێ بچمە نێوەراست ڕێگەکە بۆوەی ببینن. ئەگەر لێرە بم و نەمبینن و تێپەڕن، گورگ و قەل و داڵ دەمخۆن...

هەرچی کردی نەیتوانی بجوولێ، نەیدەتوانی ببزوێ. دیسان هەر وا لە جێی خۆی مابۆوە. دیسان ببۆوە گلۆڵەکەی جاران.

دەنگەکان بێ دەنگ دەبوونەوە و دیسان دەستیان پێ دەکردەوە. نزیك بۆوە و نزیکتر بوونەوە و ڕێك لەو کاتەدا کە بە بەردەمی مرێمۆکدا ڕەت دەبوون لە نێو گیا و بنچکەکانی دەم ڕێگەکە گوێیان لە نیوە نووزەیەك بوو و ڕاوەستان. ماوەیەك گوێیان هەڵخست. هەست و خوست نەدەهات. "عەلی"یەك دوو هەنگاوی نا و ڕاوەستا. چاوەکانی بەتەواوی هەڵنەدەهاتن. مێشکی دەیزریکاند و سەری لە گێژەوە دەهات. خۆی بە سەر پێوە پێ نەدەگیرا. بەلادا دەهات و خەریك بوو هەر لەوێ بکەوێ و لێی بخەوێ. بۆ بەسەرپێوە ڕاوەستابوو؟ بۆخۆشی نەیدەزانی. وەك بڵێی لەو دەوروبەرانە شتێك هەبێ؟ هەر لەوێ دانیشت و لە ئەلیفی پرسی:

ـ ئەلیف تۆ بەجوانی گوێت لە دەنگەکە بوو؟

ـ بیستم. ڕێك لە دەنگی دایە دەچوو. وا باشترە نێو ئەو گیا و گژانەی لێ بگەڕێین.

عەلی گوتی:

ـ بگەڕێ.

ئەلیف چووە نێو بنچك و گیاکانەوە. هەنگاوێکی دەنا و هەرایەکی دەکرد:"دایە".

چاوێکی کردبووە چوار چاو و سەیری بن هەموو پنچکێکی دەکرد. گژ و گیاکە چڕ بوو و تێکئاڵا بوو. زوقمی بەسەردا باریبوو، هەر بۆیەش هەموو لاق و لەتەری خوسا و شێ و تەڕایی بەناخیدا چووە خوارێ و لەرزاندی.

کە خۆر دەرکەوت، لە بن پنچکێکەوە، لە رووتەنێك، تارماییەکی بچووك و گرمۆڵەبووی دی. ڕەشاییەکی گلۆڵەبووی خڕ. نێوکی کەوت. بەرەو لای غاری دا و هەر وا هەرای

دەکرد:"دایە"، خۆی بەسەر کێشا. مرێمۆك ویستی شتێك بڵێ بەڵام تەنیا بڵغەبڵغێکی لە گەرووی هاتەدەر. زمانی لەگۆ چووبوو.

ئەلیف بەنیوەنووزەیەکەوە گوتی:

ـ ئەتۆمان کوشت... ئەتۆمان کوشت دایە، ئێمە تۆمان کوشت.

ماوەیەك بەبێ ئەوەی هیچی لەدەست بێ، بە دەوریدا خولایەوە. وەك ئەوەی لە تەپڵی سەریت راکێشابێ و گێژ بووبێ، بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە. ویستی مرێمۆك بەکۆڵیدا بدا و بیباتە لای عەلی بەڵام پاشگەز بۆوە. دەست وا تێکەڵ هاتبوو، نەیدەزانی چ بکا. بەردێکی هەڵگرت و لە پەنا بەردێکی دیکەی دانا. دیسانیش بەردێکی دیکەی لە پەنایان دانا. لە ناکاو بەبیری کەوتەوە شقارتەیەکی پێیە. دەبوو ئاگرێك بکاتەوە. خێرا برێکی پووش و پەڵاش کۆوە کرد. لە بەردەم مرێمۆك ئاگرێکی کردەوە.

تاوێکی گەرم کەوتبوو. خاك و دار و دەوەنەکە هەڵمی لێ هەڵدەستا و تێکەڵاوی تیشکی تاوەکە دەبوو. لە کوێرەرێیەکەی بەردەمیان مێرووڵە بە ریز وردە وردە بەخەبەر دەهاتن و سەرەتاتکەیان بوو و بەرەو خوار دەبوون. کە گەیشتنە دەم ئاگرەکە، رێگەیان گۆڕی. کە تاوەکە گەرمتر بوو، لە دوورەوە دەنگی مەلان بەرز بۆوە.

ئێستا ئەلیف لە پشت مرێمۆکەوە دانیشتبوو و دەست و لاق و ئەژنۆ و ملی دادەماڵی و دەیگوت:

ــ بووینە خوێنڕێژی تۆ دایە گیان. چاو رەشەکەم. خوێنڕێژی تۆ.

کاتێ تاوەکە باش گەرم داهات، مرێمۆك چاوەکانی هەڵێنان و زمان و زاری کە وشك ببوون و پێکەوە نووسابوون، کردەو وگوتی:

ــ ئاو، کچە جوانەکەم، چۆڕێ ئاو.

کە مرێمۆك وەقسەهات، ئەلیف لە خۆشییان وەك شێتانی لێهات. دەست و دەموچاوی مرێمۆکی ماچباران کرد و دەیگوت:

ــ هەر ئێستا، هەر ئێستا ئاو... دایە گیان.

لە ناکاو مرێمۆکی بەردا و هەرای کرد:

ـ عەلی ی ی ، عەلی ی ، دایکم قسەی کرد. دایکم داوای ئاوی کرد. شوکور باشە. هیچ مەترسە.

دوایی کە بیری کردەوە ئاخۆ لەو دارستانەدا ئاو چۆن دەست دەکەوێ و ئەگەر دەستیش بکەوێ بە چی بۆی بێنێ، دڵی ناخۆش بوو. هەرچی بیری دەکردەوە هیچ رێیەکی پێ شك نەدەهات. پەیتاپەیتا بەولاولادا غاری دەدا و دەگەڕا و دەیپرسی:

ـ باشی؟ شوکوور باشی؟ باشی دایە گیان، دایە گیان.

کە جوابی وەردەگرتەوە:"ئا، باشم. لە خۆشیانا هەڵدەفڕی.

ــ زۆر، زۆر... زۆر باشی؟

ــ ئا، ئا، باشم.

هەستی بە شەکەتییەکی لەرادەبەدەر کرد. دەستەکانی بەولاولایدا شۆڕ بوونەوە. لە بن لێوانەوە گوتی:

ــ جا ئێستا ئاو لە کوێ بێنم دایە؟..

مریەمۆک بە دەنگێکی کزەوە گوتی:

ــ لێو و زارم وشک هەڵاتووە.

ئێستا دەنگی باشتر دەهات. ئەلیف گوتی:

ــ دەبێ بدۆزمەوە.

مریەمۆک زمانی پژا بوو:

ــ یاڕەبی، ئەو "عەلی"یە درێژەی نۆ مانگان لە زگی خۆمدا پەروەردەم کرد و سێ ساڵیش شیرم دایە، ئەو جگەر گۆشەیەم، لەسەر سەری تۆ گەڕێ کچم. یاخوا بە قوربانی تاڵە گەندەموویەکی تۆ بێ کە کچی خەڵکیشی. ئەو ئەمنی بەجێ هیشت و ڕۆیی و ئەوە تۆی دۆزیتمەوە. وا نییە؟

ــ وا مەڵێ دایە. وا مەڵێ. لاقەکانی ماسیون و گۆشتە سوورەیان دەرکەوتووە. لێی قەوماوە. وا مەڵێ دایە. چما تۆ بەجێ دێڵێ و دەڕوا؟ لە پڕ تووڕە بوو. نازانی چەندە پەژیوان بۆوە.

مریەمۆک گوتی:"ئا، نابێتەوە، ئەو پەژیوان نابێتەوە." بە سۆزێکی قووڵی دایکانەوە دەستی بە سەرو قژی ئەلیفدا هێنا و گوتی:"کچەکەم، کچە نازەنینەکەم، حەز دەکەم بتخەمە نێو دڵمەوە."

لەسەری ڕۆیی:

ـ خۆزگە لەبری ئەو یەزیدە تۆم دەبوو. کچە جوانکیلەکەم. بریا وا بایە. چ باش دەبوو.

ئەلیف گوتی:

ـ نا دایەگیان نا.

ــ تۆ ڕزگارت کردم. زیندووت کردمەوە. ڕزگاریدەری منی.

ئەلیف دەستی گرت و بە خۆشییەوە گوتی:

ــ برێک لەولاترەوە کانیلەیەکی لێ بوو. دەڵێی چی لە کۆڵمت کەم و بتبەم؟

مریەمۆک هەوڵی دا هەستێ:

ـ ئەمن بۆخۆم، بەپێی خۆم تا ئەوێ دەچم. ئەمن دەچمە ئەوێ. بـە قوربـانی تـۆ دەبم کـچە جوانەکەم.

بەڵام نەیتوانی هەستێ. جارێکی دیکەش لە خۆی نووسا. دیسانیش نەیتوانی. شتێکی وەك شیلە بزەیەك بە گۆشەی لێـوە چـرچ بووەکانییـەوە نیـشت. بـەڵام دەمودەسـت ون بـوو و لێـو و دەموچاوە خەفەتبارەکەی نوقمی پەژارە بۆوە. هانکەهانکی بوو:

ــ کە واتە تەواو پیر بووم. زۆر ماندوو بوومە کچم. هەر دەڵێی مردووم.

ئەو سکاڵا هێمن و لەسـەرەخۆیە، هـاواری بـێ هیـوایی و مـەرگ بنیادەمێـك بـوو کـە لـە بۆشایی دنیایەکی بێ سەروبندا بە تەنێ ماوەتەوە.

ئەلیف خۆی پێ نەگیرا. هەر لەوێ دانیشت و فرمێسك لە چاوەکانییەوە لـووزەوی بەسـت. مریەمۆك دوایین هەوڵی خۆی دابوو و بەچۆکدا هاتبوو... ئاخۆ بەراستی بە چۆکدا هاتبوو؟...

ئەلیف کە هەستایە پێ بەخۆی گوت:"

ـ خودا ئەو پیرییە بەرێتەوە. خۆزگە پیری نەدەبوو. بریا بنیادەم بەر لەوەی لە دەسـت و پـێ بکەوێ، مردبایە.

دەستی مریەمۆکێی گرت و هەڵیستاند. نەیدەوێرا بە کۆڵی دادا. گوتی:

ـ جارێ ماوتە پیر بی، دایە گیان. چاکە هەرگیز پیر نابێ...

بن باڵی گرت و بەرەو لای عەلیی برد.

مریەمۆك لە دوورەوە چاوی بە عەلی کەوت کە وەك مردووان لە چـەقی رێگەکـە کـەوتووە و خەوی لێ کەوتووە.

گەیشتنە ژوور سەری و راوەستان. عەلی، بێ خەم، وەك منداڵان، وەك یـەکێك کـە هـەر فـڕی بـەم دنیایەوە نەبێ و لە دنیای ئەحە شێت و پەرییەکانەوە هاتبێ، بێ خەبـەر لـە خـۆی و لـە دنیـای دەور و پشتی، لە خەوی شیرین دا بوو. ئەگەر ئەو دەستە زەرد و قەڵشیو و چرچانەی کـە دەتگـوت چـنگوڕکی زەرنەقووتەن و ئەو لاقە کوێرەوەری چێشتووانە کە دەتگوت منداڵێکە و لە منداڵـدانی دایکیـا گرمۆڵـە بوو، لێ کردبانەوە و هەر لەوێ لەسەر یەکت هەڵچنیبان، رۆحیشی پێی نەدەزانی.

ئەلیف مریەمۆکی لە تەنیشت کوڕەکەی دانا. دەتگوت: دەیەوێ بڵێ:

ــ ئەوەتا، خۆ دەیبینی چۆنە...

لە ناخی دڵیدا دەیگوت:"چۆڕێ ئاو، قومێ ئاو، چۆڕێ ئاو... بدەن بەو پیرە ژنە لێقەوماوە. کـچێ لـە تینوێتیـان وشـك بـوو. خەریکـە دەخنکـێ. بـەڵام ئەگـەر بـشمرێ داوا ناکاتـەوە. یەکەمجاریش لە زاری دەرپەڕی... چۆڕێ ئاو."

هیچ ڕێیەکی پێ شك نەدەهات. ئاخۆ دەبوو لە کۆڵی بکا و بیباتە بن کانییەکە؟ ئاخ خۆزگە دەفریکیان پێ بایە. ئەودەم زۆر باش دەبوو. یا لانیکەم خۆزگە تەلاشەدارێکی قووڵی دەست کەوتبایە.

لە تەنیشت پیرەژنەوە دانیشت. نەیدەتوانی چاو لە چاوی هەلگرێ. مرێمۆکی قەت ئاوا نەدیبوو. تەنانەت لە ساڵی گرانییەکەشدا. لە روخساری هیچ کەسیشدا ئەوەندە ئازار و کوێرەوەری بەدی نەکردبوو. تەنانەت لە روخساری مردووانیشدا. دەموچاوی نیسکێکی لێ هاتبۆوە و تەواو چرچ ببوو. چاوەکانی وەك ئاوێکی مەندی رەش، مات و تەماوی بوون. دەستەکانی بەردەوام دەلەرزین. ئەوەی لە هەموو شتێ پتر ئەلیفی دەترساند، ئەو کوێرەوەری و ئازارە بوو کە لە روخساری مرێمۆکدا کەسك دەچۆوە. نە ماندوویەتی و نە بێ هێزییەکە، هیچ کام ئەوەندەیان ترس وەبەر نەنابوو. چونکە هەر مرۆڤێکی سەرەمەرگی دیبوو، روخساری ئاوا ببوو. بەخۆی گوت:

- چ دەبێ با ببێ. خۆ عەلی ئاوا، لینگی بگرم و هەتا چوکووریش بەدوای خۆمدا رایکێشم، هێشتا بەخەبەر نایە. کەوابوو، با پیرەژنە بە کۆڵ خۆم دادەم و بیبەمە سەر کانییەکە.

لەبەردەم مرێمۆك هەڵتووتەکا و بەکۆڵ خۆی دادا. مرێمۆك ئەوەندەی دیکەش قورس ببوو. یەك دوو جاران هەولی دا بەلام نەیتوانی هەستێ. مرێمۆك وەك گلۆڵە قورقوشمێکی لێ هاتبوو. لەوانەشە ئەو خۆی ماندوو بوبێت و تین و هێزی تێدا نەمابێ. بەلام دەبوو هەستێ. چار نەبوو. مرێمۆك هەر تۆزە هێزێکی دەبەردا بایە، نەدەچووە کۆڵی ئەو. بەلام دیار بوو تەواو لە پێ و پەل کەوتووە. دەبوو ئاوێکی بداتێ و برە خواردنێکیش. ئینجا لێی گەرێ لە بەر خۆرەکە لێی بخەوێ. جا برێك وەخۆ دەهاتەوە. دوای ئەوە دەکرا عەلی بەخەبەر بێنێ. جارێکی دیکەش هەتا تینی لەبەردا بوو هەولی دا. لاقی راستەی هێنایە بەرەوە و خۆی دایە سەری. پەراسووەکانی ژانیان کرد بەلام توانی هەستێ. پێی وابوو کانییەکە زۆر دوورە. بەلام برێك لەو لاترەوە کە لە بن دارە چنارێك جۆگەلە ئاوێکی دی و دلی خۆش بوو. قورسایی مرێمۆکی لەسەر کۆڵی لەبیر چۆوە و بەرەو کانیلەکە غاری دا. کانییەکە دە پازدە شەقاو لەولاترەوە، لە بن دارێکی نارەوەن و لە نێو سینگی زیخ و چەوەکانەوە هەڵدەقولی.

پیرەژنەی لە بن دارە نارەوەنەکە دانا. ئاو، خاك، لیك و پۆی نارەوەن، هەر هەمووی بۆنی بنێشتیان لێ دەهات. هەموو شوێنێ... بە پێشدا جوان و زەریف دەموچاوی مرێمۆکی شوشت. دوایی لەپی پر کرد لە ئاو و بە دەمیەوەکرد. مرێمۆك نەیتوانی سەری بێنێتە پێشێ و ئاوەکە بخواتەوە. ئەلیف دەستەکانی لێك کردەوە و ئاوەکە رژایە خوارێ. مرێمۆك چاوی لەو ئاوە بری کە رژا و بزەیەکی تالی نیشتە لێو. بە نیگا شتێکی بە ئەلیف گوت. ئەلیف تێگەیی. ئەوی هێنایە دەم کانییەکە و بەرەو دەم

رایکێشا. مریەمۆك سەری بردە پێشەوە و لێوەکانی گەیاندە ناوەکە و دەستی کرد بە خواردنەوە. تا زیاتری دەخواردەوە باشتر دەبوو. ئەلیف بەر لەوەی ئەو پاراو بێ، پیلی گرت و واوەی هێنا و گوتی:

ـ دایە گیان، زۆر مەخۆوە باش نییە. کەم کەمە، جارێ بڕێك نانی بخۆ.

نانەبەرەکەی لە پشتی کردەوە و لەبەردەم مریەمۆك رایخست. مریەمۆك بە چاوی فرمێسکاوی و بە سۆز و خۆشەویستییەوە سەیری بووکەکەی کرد و گوتی:

ـ ئای سەت بریا تۆ ژنی ئەو کافرە نەبایەی...ئاخ...

ئەوجار دەستی برد و لەتێك نانی بە پەنیری پێستەوە کردە بابۆلەیەك و دەستی کرد بە خواردنی. هەم نانی دەخوارد و هەمیش لە کانییەکەی تەنیشتییەوە لوێچ لوێچ ئاوی هەڵدێنجا و دەیخواردەوە. ماوەیەکی پێ چوو تا پارووە گەورەکەی بە پووکەکانی ورد کرد و قووتی دا:

ـ خودا عەمرت درێژ کا کچم. یاخوا دەست بۆ هەرچی ببەی، ببێتە زێڕ. ئەگەر تۆ نەبای ئەو لەو چیا و چۆڵە بەرەڵڵای دەکردم و دەڕۆیی.

ئەلیف:

ـ کچێ وامەڵێ دایە، وا مەڵێ کوڕتە. نەتدی وەزعی چۆنە؟

مریەمۆك بە توورەییەوە گوتی: دیتم.

جا بەهێزێکەوە کە هیچ لێی چاوەڕوان نەدەکرا گوتی:

ـ دیتم، یاخوا ئەوە نان و رۆنی بێ. ئەگەر تۆ نەبی، ئەو هەر لێرە دەمخنکێنێ و فڕێم دەداتە بەر سەگ و گورگان. تۆ خودا، بەجێم مەهێڵە کچەکەم.

ئەلیف سەری سوور مابوو و نەیدەزانی چ بڵێ. تەنیا لەسەر یەك دەیگوت:

ـ وامەڵێ دایە، وا مەڵێ، کوڕتە. چۆن شتی وا دەبێ. ئەمن هەر شتێك بم بێگانەم. بەڵام ئەو کوڕتە. گۆشتیشت بخوا ئێسکت ناشکێنێ.

هەموو جارێ مریەمۆك بە توورەییەکی پترەوە وەڵامی دەدایەوە:

ـ دەیشکێنێ.

ئەلیف هەستا و گوتی:

ـ دایە تۆ لێرە راکشێ. با ئەمن بچمە لای عەلی. ئەگەر هەستێ و نەمانبینێ....

ـ بڕۆ، بڕۆ جەحەندەمت لێ پڕ بێ، بچۆ لای ئەو درێژە کافرە، بڕۆ....

دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردنەوە:

ـ برۆ کچم، ئیشەڵڵا... ئیشەڵڵا.... ئەی خـودا چـاو رەشـەکە ردێـن سـپییەکەم. لەبەرت دەپاڕێمەوە. ئەتۆ هەموومان دەبینی. گوێ بدەرە قسەکانی من. چاو شینەکەم...

ئیشەڵڵا لەسەر مەیتی ئەو "عەلی"یە درێژە دادەنیشم... ئیشەڵڵا دادەنیشم.

ئەلیف ترسا. رەنگی بزرکا. لێوەکانی کەوتنە لەرزین. بە هەژاوییەوە گوتی:

ـ کچێ دایە تۆبەی بکە.... بڵێ تۆبە، تۆبە، ئەوە تاقانە کوڕتە. چۆن دڵت هات دایە؟...

خێرا لێی دوور کەوتەوە. مرێمۆك کە زانی دڵی شـکاندووە و ترسـاندوویەتی، بـەبێ ئـەوەی دەستەکانی بێنێتە خوارەوە، هەتا ئەلیفی لە پێش چاوی ون بوو، لە بن لێوانەوە هەر وا تووك و نزای لە کوڕەکەی کرد.

ئەو قسانەی لە زاری کوڕەکەی بیستبوونی، پێی قووت نەدەچوون. گوتوویانە قسەی تاڵی منداڵ لـە برینی گوللەش بەئازارترە. جەرگ دەبڕێ. "ئۆھ خودای من، چاو رەشـەکەم، ریـش سـپیەکەم، جـوامێرە نوورانییەکەم، خێرا گیانم لێ بستێنە و لە دەست ئەو "عەلی"یە درێژەم رزگـار بکـە... چـاو شـینەکەم، ئەمن پیرەژنێکی پەککەوتەم. هاتوومەتە دەرگات و لێت دەپاڕێمەوە. رزگارم کە..."

لە ناکاو چاوەکانی پڕ بوون لە ئاو و گریانی ئەوکی گرت. سەیری چـوار دەوری خـۆی کـرد، کە دیتی کەسی بە دەورەوە نییە، کوڵی دڵی هەڵڕشت .... بیست سـاڵ دەبـوو ئـاوا لـە دڵـەوە نەگریابوو. دەیگوت:"چـاو رەشـەکەم، ردێـن هەوریـشمینەکەم... ئـەمنت کـردە بـەڵای گیـانی عەلی. ئەم زستانە ژن و منداڵەکەی لە برسان دەمرن و رووت و قووت دەبن... عادیل ئەفەنیی کافریش وەرهەمی پێ هەڵدێنێ. ژیانی دەشێوێنێ و گوندییە کافرەکان و کوێخـای بـێ دینـیش گاڵتەی پێ دەکەن... چاو شینەکەم، خودا باشەکەم... دەستی عـەلیی من بگرە..."

جەستە ماندووەکەی عەلی کە لە چەقی رێگەکەدا تخێڵ ببوو و لاقەکانیشی کـە دەتگـوت مەلۆتکەن پێچراون، لە پێش چاوی ون نەدەبوون:

" ئەمن ئەوە لە هەموو خراپەی خۆش بووم... ئـەوە گـەردنیم ئـازا کـرد... ئـەقڵم نـەمابوو و زۆرم تووك لێ کرد. خودایە گیان خۆ پێـشتریش پـێم گوتـووی، ئـەو قـسانەی لـە تووڕەیـان دەیانکـەم، تـۆ لەگوێیان مەگرە. پێشتریش پێم گوتووی... لە بیرت بێ، چاو رەشەکەم، یارمەتیی عـەلیی مـن بـدە.. ئەو گیانەش لە من بستێنەوە... ئەگەر تۆ یارمەتیی عەلیی من بـدەی، ئـەو بـەر لـەوەی گوندییـەکان دەست بکەنە لۆکە رنینەوە، بگاتە دەگاتە چوکوور. تۆ "عەلی"یەکەی من، "عـەلی"یـە بەسـتەزمان و میهرەبان و دەم بە پێکەنینەکەی من... دیتت چۆن لـە بـەر شـەمنییەکەی خـۆی ئـەو مـام خەلیلـەی سواری ئەسپەکەی من کرد و لێی کوشتم. چما تۆ هەر ئەو کەسە نی کە ئاگـات لـە هـەموو شـتێکە و

تەنانـەت لـە بـن عەرزیـشەوە گوێـت لـە دەنگـی مێـروو دەبـێ؟ عـەلی بگەیێنـە.. باشـە؟ ئەگـەر "عەلی"یەکەی من بگەیێنی، ئەمن لە گەڕانەوەمدا کەڵـەبابێکی سـووری گـەورە لـە چـوکوور دەکڕم و دەیهێنم لە بن دارە گویزە پیرۆزەکە دەکوژمەوە و دەمیشی لێ نادەم. ئەگەر خواردم بە ژەهرم بێ. چاو شینەکەی خۆم... تۆ هەموو عالەم دەبینی. تەنانەت رەگی ئەو دارەش کە چووەتە بن چینی حەوتـەمی زەوییەوە بانگی تۆ دەکا. وا نییە خودا باشەکەی من؟...

دەستەکانی شل بوون، هێنانییە خوارەوە. بەڵام تا ماوەیەك، هەر وا ورتەی دەهات. دوایـی لەسەر باسکی راستەی لێی راکشا و خەوی لێ کەوت.

عەلی کە بەخەبەر هات، دەمەدەمی زەردەپەڕ بوو. هەموو گیانی ژانی دەکرد. ئـەلیفی لـە تەنیشت خۆی دی کە سەری وەئـەژنۆی کـردووە و خەونووچـکە دەیباتـەوە. ئـازای ئەنـدامی وا دێشا کە وەك بڵێی لە دەستاونگدا کوتاوتە. هیچ کوێی بـۆ هـیچ کـوێی نەدێـشا. دوای ئـەوەی خەواڵووییەکەی تەواو بوو پرسی:

ـ بۆ کوێ چووبووی؟

زاری وەك ژەهر تاڵ بوو. ئەلیف گوتی:

ــ دایکمم دۆزییەوە. بە کۆڵم کرد و بردمە دەم کانییەکە. ئەوەتا لەوێیە. نانیشم دایـێ جـا هاتمەوە لای تۆ.

عەلی لە پێشدا دڵی خۆش بوو، لە ناکاو نێوچاوانی تێك نا. وەبیری هاتەوە کە دیسان دەبێ ئەو بارە قورس و گەورەیە بەکۆڵ هەڵگرێ. دایکەکەی لەبـەر چـاوی هێنـدەی کێوێـك قـورس و گەورە ببۆوە. چاوەکانی ترسابوون. تۆقیبوو. لە ناخیدا هەستی بە شـکان و ناخۆشـییەك کـرد. دەست و لاقەکانی سـست بـوون و تینیـان تێـدا نـەما. چـیی نـەمابوو لـە ترسـانا هەڵـلـەرزێ. چاوەکانی لە ترسانا زەق ببوون و دەنگی پڕ بوو ترس، گوتی:

ـ دۆزیتەوە؟ ها؟ دۆزیتەوە؟

دەتگوت دەیـەوێ هەسـتێ. دەسـتی لەسـەر عەرزەکـە دادا و دیـسان هـاواری کـرد: "دۆزیتـەوە، ها؟... دەبێ هەستم... ناکرێ راوەستین. دەبێ بگـەینێ... نـاکرێ نەگـەینێ... رۆژێکـی رۆیـشت و چواری ماوەتەوە... چوار رۆژی دیکە دەست دەکەن بە لۆکە رنینەوە... ئێمە لـە کـوێین؟ چـیاکەمان بڕیوە. ئێستا لە پێدەشتەکەی رووبەڕووی چـوکوورین. بـە چـوار رۆژان دەگـەینێ، ئەگـەر دیـسانیش لێمان نەقەومێ. ئەگەر ئەو بەلەعنەت بووە دیسان نەگەڕێتەوە و بەرەو ئاوایی نەڕواتەوە و ئاوا هـەتا بەیانی بە شوێن خۆیدا سەرمان لێ نەشێوێنێ و سەرگەردانمان نەکا. دەبێ هەستین.

هـەر وا پـەیتا پـەیتا دووپاتـەی دەکـردەوە  کـە دەبـێ هەسـتین و دەبـێ بگـەینێ. بـەڵام نەیدەتوانی ببزوێ. لەوانەیە ئەو کاتەی بۆ سەدەمین جار گوتی:"دەبێ هەستین، دەبێ بگـەینێ"، ئەلیف خۆی پێ رانەگیرا و کوڵی دڵی خۆی هەڵڕشت.

لە بەیانییەوە پێشی خۆی گرتبوو و هیچ باسی ئەوەی نەکردبوو:

ـ منداڵەکانم. منداڵەکان برسی و تینوو لەو سەر چیایە ماونەتەوە. پێت وانییە لـە برسان مردبێن یان لە ترسانا زراویان چووبێ؟... منداڵەکانمان عەلی، حەسەن و ئۆمەخانی من...

عەلی لە ناکاو دەرپەڕی. چاوەکانی وەك شێتان لە ژێڵـلا هـاتبوون. مـستەکانی قووچـاند و هەتا هێزی هەبوو باسکی راوەشاند:

ـ وەڵڵاهی منداڵم شتێکیان لێ هاتبێ، ئەمنیش گەرووی دەگرم هەتا نەمرێ بەری نادەم.

راوەستا و بە تووڕەیی و هانکەهانك گوتی:

ـ دەیکوژم.

جا وەڕێ کەوت.

تا گەیشتە لای دایکی جاربـەجار تـووڕەتر دەبـوو. چـیی جنێـوی بەسـەر زاریـدا هـاتن بـە دایکیی دا. قەڵافەتیی دایکەکەی دوای خنکاندنی بە روخساری زەرد هەڵگەڕاو و درێژووکـەو و ملێکی باریك و مۆر و زارێکەو کە مێش و مەگەزی کەسك دەچوونە ناوی دەهاتنەوە دەرێ، بۆ ساتێك لەبەر چاوی لا نەدەچوو.

کە لە پشت سەرییەوە گوێی لە دەنگی ئەلیف بوو راوەستا. ئـەلیف گەیـشتێ و پێکـەوە رۆیـین. ئەلیف بە دارستانەکەدا بای دایەوە. بڕێك دواتر کـە عـەلی سـەری بـەرز کـردەوە، چـەند هـەنگاوێك لەولاترەوە دایکی دی کە لاقەکانی بە سینگییەوە نووساندووە و وەك گلۆڵەیـەك خـڕ بۆتـەوە. دایکـە داماوەکەی دەتگوت چنگێك پـەڕۆپاڵی کۆنەیـە کـە لـە قوژبنێـك کۆکرابێتـەوە. دامـا و پەرێـشان. رقەکەی نیشتەوە. پەژیوان بۆوە لـەو هـەمووە جنێـوەی دابـووی. چـیی وای نـەمابوو دەسـت بکاتـە ئەستۆی دایکییەوە و دەست و چاوی ماچ بکـا. بـە سـەر سـەری دایکـەوە پێـی بـە عەرزییـەوە رەق هەڵات و نەیتوانی زاری بکاتەوە و هیچ بڵێ. دەستەکانی بەولاولایدا وەك چۆن دوو وشـکەڵەدار شـۆڕ دەبنەوە، ئاوا بێ جووڵە بوون. ئەلیف بە شەکەتی لە تەنیشت مریمۆکەوە دانیشت.

عەلی بیری کردەوە:

ـ دەبێ بچم و لەبەر دەمی دانیشم.

دەبوو بەکۆڵ خۆیدا بدا و خۆی بگەیێنێتەوە لای منداڵەکانی کە لە جەرگەی خەتەری پەلاماری دز و حیز و درندە وفڕندەدا بەجێی هێشتبوون و دەبوو بەر لەوەی گوندییەکان بگەنە لۆکە رنینەوە، ئەویش دەبوو بگاتێ. نەدەبوو نەگاتێ نا. بەڵام دەترسا. هەموو پشتی داماڵکابوو. ئەوەندە دەترسا دەتگوت چەقۆیەکی تیژ بە نێوەڕاستی ئەو برینەدا دێنن. هەموو گیانی دەلەرزی.. ئەلیفیش چاوی لە چاوی ئەو بوو و لە حاڵێکدا کە بیرە ئاڵۆزەکانی بە روخسارییەوە دیار بوون، هیوابراوانە و سەیر و سەمەرە چاوی لێ کرد. بەڵام هیچ نەدەترسا و چاوی لێ هەڵنەدەگرت.

عەلی نەیدەزانی چ رووی داوە. دەترسا و هۆشی لە خۆی نەدەما و قورسایییەکەی دایکی لەسەر لاقە بریندارەکانی هەست پێ دەکرد و هەموو گیانی دەلەرزی.

"رێگەکە زۆر دوورە. چما تەواو دەبێ؟ جا ئەو رێگەیە چۆن تەواو دەبێ."

چاوەکانی رەشکەوپێشکەیان دەکرد و پێی وابوو قەت پێی تەواو ناکرێ. گەوابوو چۆن بەر لەوە، ئەو هەموو ساڵە ئەو رێگەیەیان سەر بەرەو خوار و خوار بەرەو ژوور بڕیبوو؟ بەخۆی گوت:"ئەگەر گوندی هەمووی پێکەوە بن دەکرێ. بە خۆشی و شادی و شەڕ و چەقە تەواو دەکرێ. رۆحم لەبەر کۆمەڵی گوندییان مرێ، هەر لە شوێنێك بۆنی کۆمەڵێکت بۆ بێ، ئیدی نە پشت ئێشەیەك دەمێنێ و نە لاق برژانەوەیەك. ئەمرۆش نەبێ لانیکەم سبەی دەبێ بگەینە گوندییەکان. هەر دەبێ بگەینێ."

لەگەڵ ئەوەشدا نەیدەتوانی دابێتەوە و دایکی لەکۆڵ بکا. جارێکیان پشتی تێکرد و داهاتەوە، چیی وای نەمابوو لەبەردەم دایکیدا دانیشێ، بەڵام لەپڕ وەك دەرزییەکی تێراکەن، دەرپەڕی. دیسان قیت بۆوە و جووڵەی لێ بڕا. خۆی بە پێوەش رانەدەگرت. بەڵام نەشیدەتوانی دانیشێ. مرێمۆك کە وێدەچوو لێی تێ گەییبێ، دەستەکانی لەسەر عەرزەکە دادا و هەستا:

ـ کچەکەم، دارەدەستێکم بۆ بدۆزەوە با وەڕێ بکەوین. منداڵەکان لای بارگەوبنەکە ماونەتەوە؟ وا نییە؟ نای منداڵە لێقەوماوەکانم. برسی و تینوون.

عەلی بە تووڕەییەوە لە دڵە خۆیدا بۆڵاندی:"هەر لەبەر تۆی تووك لێکراو." دیسان خەریك بوو هەڵدەچوو و پشووی سوار دەبوو. ئەلیف ئاخێکی هەڵکێشا گوتی:

ـ برسی و تینوو.

لقە دارێکی بە زۆری شکاندەوە و لك و گەڵای لێ داماڵی. هێنای و دایە مرێمۆك. کە سەیری دەموچاوی کرد، دڵی خۆش بوو. مرێمۆك رەنگێکی هاتبۆوە بەر. لە پێشدا دارەکەی لەپێش خۆیەوە چەقاند و خۆی دایە سەری و هەنگاوێکی نا.

برێك دواتر، مرێمۆك لە پێشەوە و ئەلیف بە دوایدا وەڕێ کەوتن. ڕێگەکە بە کوچك و چەوی گەورەی هێندەی سێوێك کە لافاو ڕایماڵیبوون و هێنابوونی، داپۆشرابوو. هەر بۆیە ڕۆیشتنەکەیان برێك بە زەحمەت بوو. ئەلیف گوتی:

ـ دایە واباشترە بچینە قەراغ ڕێگەکە و بەسەر گژوگیاکاندا بڕۆین.

دەستی گرت و کێشایە دەم جادەکەوە.

عەلی لەجێی خۆی پێی بە عەرزییەوە وشك ببوو و لە دواوە سەیری دەکردن. بووکێ و خەسوو خێرا خێرا دەڕۆیشتن و ئەوەش دڵی عەلیی خۆش دەکرد. خۆ ئاوا ڕۆیبایەن، بە دڵنیاییەوە دەگەینە چوکوور. ئەو دەیتوانی هەر ئاوا ئەوان بەجێ بێڵێ و خۆی خێراتر بگاتە چوکوور:"ئاخ، خۆ ئەگەر توانیبایان هەر ئاوا بڕۆن." عەلی وردە وردە سووکتر دەبوو و تووڕەییەکەی دەبووە شادی.

عەلی هەر وا دڵی خۆش بوو تا گەیشتنە هەورازەکە. بە هیوا و بە دڵی خۆشەوە بیری لەوە دەکردەوە کە بەر لەوەی گوندییەکان بچنە کێڵگەکانی لۆکەوە، ئەو دەیانگاتێ. لەوانەش بوو دوو ڕۆژیش زووتر. تەنانەت بەر لەوەی ئەوان بگەنە چوکوور، هەر لە ڕێیە.... ئاخ ئەگەر لە ڕێیە بیانگاتێ چەند باش دەبێ. لە بەردەم کوێخا قوت دەبێتەوەو بانگی تاشباش دەکا و هەرچی هەیە بۆ گوندییەکانی باس دەکا:"گوندییش ئەقڵیان هەیە. هەر ئەوەندەی ڕێی ڕاست و باشیان نیشان بدەی و قایلیان بکەی، جا نیدی کارت پێیان نەبێ. گوندییەکان تازە بڕوایان کردووە. هەر ئەو سەگە ماستاوچییانەی دەوروبەری کوێخا و خزم و کەسەکەی ماون. یەکتریان باش گرتووە. دەبێ لێك بڵاو بکرێن. دەبێ بە چاوی فرمێسکاوییەوە قسە بۆ گوندییەکان بکەی بۆوەی.... دەبێ باسی مافی هەتیو و لێقەوماوان و بێوەژنان و هەژارانیان بۆ بکەی. دەبێ پێیان بڵێی ئەو نانەی گوندی دەیخۆن، لەخوێنی خۆیان گوشراوە. دەبێ پێیان بڵێی وەرن ئەو پارەیەی ئاغاکان دەیدەنە کوێخا، لە نێو خۆماندا کۆی بکەینەوە و بیدەینێ و داوای لێ بکەین واز لەو بەکرە شێتە بێنێ و ئەو بەڵایە بەسەر گوندییەکان نەهێنێ. ئەو ژنەی بەکرە شێت بەو کوڵمە سوورانەیەوە، لە هیچ گوندێك ژنی ئاوا دەست ناکەوێ. ژنێك ئاوا خۆش پێبکەنێ و ئاوا قوون بادا." ژنەی لە خەیاڵی خۆیدا ڕووت کردەوە و لە بن لێوەوە گوتی:"شەرت و ئادم لەگەڵ خۆم کردووە... خۆ بەکرە شێتیش بە مفتێ وەچنگی کەوتووە."

"کەیفی بەهەر کەس نەیە لەگەڵی نانوێ. بەڵام ئاخ ئەگەر کەیفی یەکێك بگرێ، کوڕە خۆ لەبەر چاوی بەکرە شێت و بەبەرچاوی هەموو گوندییانەوە دەستی لەگەڵ تێکەڵ دەکا و هەر گوێش ناداتێ. ئەگەر لەیەکێکی هەڵکێڵا، واز ناهێنێ، دەستی لەگەڵ هەر تێکەڵ دەکا. جا پیرەمێردی هەشتا ساڵە بێ یان منداڵێکی پێنج ساڵان. هەك لەبەر ژنی ئاوا سەرەڕۆ مرم."

مریٚمۆك له هەورازەكە پشووی لیٚ برِا و راوەستا. ئەلیف هەولّی دا بیبا. مریٚمۆك لاقـی لـە بەردیٚك هەلّەنگووت و بەرەودەم كەوت. متەقی نەكرد. تەنانەت ئاخیٚكیـشی نەكیٚـشا. ئـەلیف پیٚی وابوو مردووە. چووە پیٚشیٚ و هەولّی دا هەلّیستیٚنیٚ بەلاّم نەیتوانی. لەو جەنگەیەدا عەلی مریٚمۆكی دی كەوتووە. له ناكاو شیٚت بوو و وەك شیٚر هەلّچوو. له داخان شیٚت بوو.

بەرەو مریٚمۆك غاری دا. پیلی گرت و وا قیتی كردەوە و خستییە سەر كۆلّی خۆی، كە هەم مریٚمۆك و هەمیش بۆخۆشی پیٚیـان سـەیر بـوو. مریٚمـۆك بـەهۆی ئـەو راتلّەكاندنـە لـەناكاوە، هەموو ماسوولكەی شل ببوونەوە و وەك تەرمیٚك بەسەر پشتیدا شۆرِ ببۆوە. عەلی باسكی بـیٚ هیٚزی دایكیی گرت و له دەوری ملی خۆی هالاّندن. دەستی خۆشی وەبن لاسمتەكانی دایكـی دا و بەو جۆرە قورساییەكەی بەسەر نیٚوشان و دەستەكانیدا بەش كرد.

تا هەورازەكەیان برِی شەلاّلّی ئارەقە ببوو و كەوتبووە هەناسەبرِكیٚ. لاقـەكانی دەكزانـەوە:"بـۆ چـما پیاو دەكریٚ ئەوەندە قورس بیٚ. هەر دەلّیٚی مردووە. پیٚستی سەرت بە لەعنەت بیٚ ژنەكـە. خـودام لـەو خودایە لەبەر تۆ مندالّەكانم شتیٚكیان بەسەر هاتبیٚ. هەم دەتخنكیٚـنم و هـەم فرِیٚـت دەدەمـە قوونـەبانی ئەشكەوتیٚكەوە. یان هەر لەو دارستانەدا فرِیٚت دەدەمە بەر دەمی قەل و دالّ.

ملی لیٚ دریٚژتر ببوون. تا ماندووتر دەبـوو، پـتر ملـی بـەرەو پیٚـشەوە دریٚـژ دەكـردەوە. پیٚرەژنـەش دەخزییە خوارەوە و قورساییەكەی دەكەوتە سەر دەست و ملی عـەلی. عەلی بۆ ئـەوەی بتـوانیٚ هەناسـە بكیٚشیٚ، جار نە جاریٚك هەلّیداویشتەوە سەریٚ. بەلاّم دیسان دەخزایەوە خوارەوە.

كاتیٚ گەیشتنەوە زەویـیە ریٚكەكە، عـەلی دوو هـەنگاوی داویـشت و رادەوەسـتا. ئـاورِیٚكی دایەوە و له ئەلیفی پرسی:

ــ زۆرمان ماوە بگەینە مندالّەكان؟...

ئەلیف گوتی:

ــ شتیٚكی وای نەماوە. دەلّیٚی چی راوەستین پشوویەكت بیٚتەوە بەر؟

عەلی زۆری حەز لیٚ بوو برِیٚك بحەسیٚتەوە، بەلاّم دەترسا. چون دەیزانی هەر دانیشیٚ، ئیـدی ناتوانیٚ هەستیٚتەوە.

رۆژ ئاوا ببوو و هەوا بەرەو تـاریكی دەچـوو. لـە باشـوورەوە شـیبایەكی شـیدار و بۆنخـۆش هەلّیكردبوو. هیٚشتا زۆری مابوو مانگ هەلّیٚ.

# ١١

ڕێگە چۆڵە. کەس دیار نییە. ساڵان ئەو ڕێگایانە لەو دەمانەی ساڵدا ئاوا چۆڵ و بەتاڵ نەبوون و هەر جمەی دەهات لەو گوندییانەی بەرەو چوکوور بەڕێوە بوون.

"لەوانەیە مام خەلیل بە سەهو چووبێ. بە سەهووچووە و گوندییەکانی زۆر پێش لە پشکووتنی لۆکە وەڕێ خستووە. ئەگەر وا بایە، چ باش دەبوو.

"گوندییەکان دەگەنە چوکوور و لە تەنیشت کێڵگە و مەزرای نەگەییوی لۆکە، کەپرەکانیان ساز دەکەن و چاویان دەبڕنە چڵە لۆکە و چاوەڕێ دەبن. زۆر لەوە پێشیش ئەو کاتەی مام خەلیل نەخۆش بوو، وا ببوو. خەڵکی گوندەکانی دیکە لانیکەم بە دوو ساڵ جارێك بەسەهو دەچوون.

"لە تەنیشت مەزراکە هەڵدەترووشکان و یەك بە یەك قۆزاخە پشکووتووەکانیان دەبژارد. ئەمڕۆ پێنج قۆزاخە، ئەمڕۆ دە، پازدە دانە.. ئەمڕۆ سەد دانە پشکووتوون. قۆزاخەی پشکووتوو ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زیاتر دەبوون. ئاخری ڕۆژێکیان دەبینن، دنیا وەك بەفر باریبێ سپی پۆش دەبوو."

عەلی لاقە بلۆقاوی و هەوکردووەکانی بە ڕۆن چەور کردبوو و لەبەر بەڕۆچکەکە ڕاکشابوو. ردێنە ماش و برنجی و درێژەکەی خۆڵاوی بوو. چاوەکانی لەبەر تیشکی خۆرەکە قیچ کردبوونەوە. ئاوی کانییەکە لووزەوی بەستبوو. برێك لەولاترەوە، لە بەشە سووتاوەکەی دارێکەوە، کە لك و پۆی داهاتبوونەوە، بنێشت شۆڕ ببووەوە. زۆربەی گژ و گیای دەشتە خۆڵەمێشییەکە وشك ببوون. عەلی لەو کاتەوە کە لە خەو هەستابوو، زاری نەکردبۆوە و قسەیەکی نەکردبوو. بیری دەکردەوە و تووڕە دەبوو.

مڕێمۆکە پیریش لەو بەری کانییەکەوە، کرووشمەی کردبوو و نەدەبزووت. تەنانەت بۆ تاقە جارێکیش چییە چاوی نەکردبۆوە سەیری عەلی بکا. ئەلیف برێك لەو لاترەوە پاڵی بە دارە ئیزگیلێکەوە دابوو و جلوبەرگی لەبەر منداڵەکان داکەندبوو و ئەسپێکانی دەکوشتن. هەتاو دەتگوت

تاوی بەهارێیە. هەموو وڵات هێمن و بێ جووڵە بوو. تەنانەت گەڵایەکیش چییە نەدەبزووت. دیـار بـوو بە بەری لای دەریای داوێنی چیاکانی تۆروسدا تێدەپەڕن. ئەلیف هەر وا خەریکی ئەسپێ کوشـتن بـوو و خەفەتی لە خۆی و منداڵەکانی دەخوارد. خەریك بوو ئـاوری تیبـەربێ بـۆ مرێمـۆك. جـارێ دڵـی هـەر نەدەهات سەیری روخساری مێردەکە و لاقە هەوکردووەکانی بکـا. ئەگـەر سـەیری کردبایـە، چـاوی پـڕ دەبوون لە فرمێسك و گریان ئەوکی دەگـرت. ئەگـەر توانیبـای، هـەر هـەمووانی لـەکۆڵ دەکـرد و وەك باڵندەیەك دەفڕی و دەیگەیاندنە چوکوور و لە دەم کێڵگەی لۆکە دایدەنان.

منداڵەکان رووت بوون. رووت رووت. لەسەر عـەرزەکە دانیشتبوون و بێ دەنـگ و خـەمبار ئەو بنێشتیان دەجوی کە لە دارستانەکە دۆزیبوویانەوە.

لە دوورەوە هاشوهووشێك لەئاسمان گەڕا. سەریان هەڵێنا: مرێمۆك هەر نەشـبزووت. منداڵـەکان زیڕاندیان و لە جێی خۆیان دەرپەڕین. عەلی لـە بـن لێوانـەوە پێکـەنی. ئـەلیف هـەر وا کـە شـەکی منداڵەکانی بەدەستەوە بوو، هاتە لای عـەلی. عـەلی چـاوی لـە ئاسمـانێ بڕیبـوو و سـەیری دەکـرد. ئەلیف هەر لەوێ راوەستا و چاوی بڕییە ئاسمـان و مرێمـۆکیش دوای هـەمووان، سـەری هـەڵێنابوو و سەیری ئاسمانی دەکرد. منداڵەکانیش هاتنە لای بابیان. تـرس و شـادییەك لـە روخسـاریاندا تێکـەڵ ببوو. روخساری ئەلیفیش سەرسووڕماویی پێوە دیار بوو. لە دوورەوە، لـەو قـوژبنی ئاسمانـەوە، سـێ فڕۆکەی جێت، کە هێڵێکـی سپی زیوینیـان لـە دووی خۆیانـەوە بـەجێ دەهێـشت، ئەوسەرەوسـەری ئاسمانیان دەپێوا. بڕێك دواتر لەچاوان ون بوون. ئیتر دەنگیشیان بڕایەوە.

عەلی بە پێکەنینەوە سەیری منداڵە ترساوەکانی و ژنە سەرنجڕاکێشەکەی کرد و گوتی:

ـ لە سەربازی بەوانەیان دەگوت:"فڕۆکە". هەر کـام سـەت هـەزار، هـەزار، دوو هـەزار هۆردوویـەك خەلکیان تێدا جێ دەبێتەوە. هەر سەربازەی بـۆمبێکی دەدەنـە دەسـتی و ئـەوانیش بۆمبـەکان بەسـەر گۆندی کافراندا بەردەدەنەوە. بۆمبەکان بەردەمبنەوە و چیی کـافرە لەتوپـەت دەبـن. دار و بـەرد وێـران دەکەن. هەر وەکـی دیتـانن، لـە چـاوترووکانێکا لـە چـاو ون دەبـن و دەڕۆن. لـە سـەربازی بـە ئێمـەیان دەگوت: بەهێزترین لیخوڕ(فڕۆکەوان)ـی ئەوانە تورکن. لە سـەربازی جارێکیـان چاوشـەکەمان گـوتی:" عەلی تۆش وەرە سوار بە و دەورێکی ئاسمانان لێ بدە." گوتم:"ئامان جەناب، دەسـتت مـاچ دەکـەم، بـە نۆکەرت بم، ئـەمن نـازانم و بەردەبمـەوە." چاوشـەکەمان پێکـەنی و گـوتی:"کـوڕە، ئـەوە پێـی دەڵـێن فڕۆکە." حیکمەتی خودایە. پیاو چۆن لێی بەردەبێتەوە." گوتم:"بە خودای بەریش نەبمەوە، هـەر نـاتوانم سوار بم." چاوەشەکە زۆر پێکەنی و گوتی:"عەلی، ئەمن پێم وابوو تۆ کابرایەکی زۆر ئـازا و بەجـەرگی. بەڵام زۆر قزە دەرچووی." گوتم:"پیاو وەختایەك ئازا و نەترسە کە پێی لەسەر زەوییە. کە تۆ وەك باڵنـدە چوویە ئاسمان جا تازە ئازایەتی و چاونەترسی بە کاری چی دێ؟"

ئەلیف هات و لە تەنیشت مێردەکەیەوە دانیشت. منداڵەکانیش هاتن و پاڵیان وەدایکیان دا و دانیشتن. عەلی دەیگێڕایەوە و پێدەکەنی و دڵی خۆی خۆش دەکرد. ئەو باسی فڕۆکە و قسەی چاوەشەکەیانی سەدان جار گێڕابۆوە. بەڵام تا زیاتر دەیگێڕایەوە، گوندییەکانیش هەمووجارێ گوێیان لێ ڕاگرتبوو و هیچ کەس لە حەقایەتی ئەو فڕۆکەیە وەڕز نەببوو. لەو کاتەدا لاقە بلۆق کردووەکانی، دایکە داماوەکەی، لۆکە ڕنینەوە، عادیل ئەفەنی و کوێخا گەوادەکە و بەکرە شێتی ملهوڕ و ڕێگە لەبڕانەوەنەهاتووەکانی، هەر هەمووی لەبیر چووبۆوە.

ـ چاوەشەکە گوتی:" ئەگەر پیاو ئازابێ، هەم لە ئاسمان ئازایە و هەمیش لە هەوا و هەمیش بەسەر بەحرانەوە." گوتم:"پێ دامەگرە. ناتوانم سوار بم. ئەگەر من ئازایەتییەکم هەبێ ئەوە هەر لەسەر عەرزی هەمە. ناتوانم گیانی خۆم بدەمە دەست دوو باڵی فڕۆکەوە." گوت:"بۆ ئەوانەی سوار بوونە بنیادەم نین؟" گوتم:"با، بنیادەمن قوربان." گوتی:"لە لیواکەی ئێمەدا خەڵکی ئاوا زۆرن."

"لەبیرتە ژنەکە؟ لەو جێیە بوو کە لۆکەمان دەڕنییەوە. جێیەکی تەخت و ڕێك بوو. خەڵکی گوندەکەی ئێوەش لەوێ بوون. خوا دەزانێ ئەوێ چەندەی لۆکە هەبوو. دەتگوت هەموو دنیابەفر داپۆشیوە. لەبیرتە؟ شەمەندەفەرێکیش بە نێوەڕاستەکەیدا دەڕۆیی. پێیان دەگوت:"میسیس". ڕووبارێکی گەورەشی بە تەنیشتیدا دەڕۆیی. ئێستا حوکمەت ئەو دەشتەی کردووەتە هێلانەی فڕۆکە. هەموو بەیانیان وەك چۆن مێش هەنگوین بەرەو گوڵەکان باڵ دەگرن، ئەوانیش لە هێلانەکانیان دێنە دەرێ. چنەکە، هەزار، دوو هەزار، سێ هەزار، چوار هەزار... چەندی پێت بژمێردرێ... ئەوەندە زۆرن. وەك هەور بەری ئاسمانێ دەگرن."

سەری هەڵێنا و سەیری ئاسمانی کرد. سێ هێڵی زیوین هێشتاش بە ئاسمانەوە بوون.

"دیوتە ژنەکە؟ ئەوان ئاوا ڕێگا بۆخۆیان ساز دەکەن بۆ ئەوەی ئەگەر جارێکی دیکە هاتنەوە ڕێیان لێ ون نەبێ. ئەگەر لە نزیکەوە بیانبینی سەرت سووڕ دەمێنێ. هەر باڵێکیان لە ڕەنگێکە...مۆر، کەسك، سوور... بە قوربانی خودای بم. وا دەبریسکێنەوە و ڕەنگەکانیان هەر لە ئەرخەوانییەکەوە بگرە هەتا مۆرەکەیان وا دەگۆڕێ چاوت بە شەوارە دەخەن. ئەڵمان گوتوویەتی:"ئافەرم بۆ میللەتی تورك. میللەتی ئازا. میللەتی "دەمیر قیراسی، میللەتی ژیر. جا وەرە ئێمە لە کەیەوە ئاڵمانین، بەڵام تورکان فڕۆکەیان لە ئێمە زیاترە." کچێ ژنەکە، با پێت بڵێم ئەوانە بە شەویش هەڵدەفڕن. چرای سوور و سپی و نارنجی و سەوز وەخۆیان دەخەن. ئاسمان نوقمی ئەستێرەی ڕەنگاوڕەنگی درەوشاوە دەبێ خۆزگە ئەو کاتەی هەمووان پێکەوە هەڵدەفڕن بیانبینی. دەبێ بە شەو بیانبینی." دەبێ بچیتە ئەو شوێنەی پێی دەڵێن "Incirlik" ئینجیرلیك. دەبێ بچی... ئەڵمان گوتوویەتی: ئیدی ئەو میللەتی

تورکەی ئەو هەموو فڕۆکەیەی هەیە، ئیتر ناکرێ قەرە لە قەرەی بدەی. بۆوە نابێ شەڕلەگەڵ ئەو میللەتی تورکە بکەی." گوتوویەتی:"لەمەوپاش میللەتی تورك لە سایەی سەری "دەمیرقیراسی"دا زیندوو بووەتەوە. یەکێك کە رۆژێ سەد دانە فڕۆکە ساز بکا، ئیتر پشتی وەعەرزی ناکەوێ." ئەڵمانیا گوتوویە:"هاوڕێیان، ئیتر هیچ، میللەتی تورك بۆوەی نابێ شەڕی لەگەڵ بکەی." قسەی بۆ میللەتەکەی کردووە و گوتوویەتی:"میللەتە گەورەکەی من، سەیری ئەو تورکانە بکەن، بزانن چەندەیان فڕۆکە هەیە. ئەوانە خەمی شەڕێیان نییە. ئیتر کەس ناتوانێ لێیان نزیك بێتەوە. وەرن تیتۆڵێك لەوان دابڕین." چاوەشەکەی ئێمەش وای دەگوت. دەیگوت:"ئیتر ژنان، نابنە بێوەژن و منداڵمان هەتیو نابن." ژنەکە، ئەو فڕۆکانە هەتا نزیك خۆر دەچن و گوندەکانی خۆریش دەبینن. چاوەشەکەمان کابرایەکی چوارشانە بوو. جوامێر بوو. دەیگوت:"ئیتر ئەم دنیایە بەکار نایە. ئێمە دەبێ بچینە سەر هەسارەکان."

"خۆزگە ئەو فڕۆکانەت دەدی. وەك مێشەنگوین دەگەڕێنەوە هێلانەکانیان. چاوەشەکەمان دەیگوت:"ئەوە سەیری چ دەکەی عەلی؟ تۆ خوا ئەوانەشت پێ فڕۆکەیە؟ کوڕە زەبەلاحەکانیانت نەدیوە. وەك ئەو کێوەن. دەکرێ خەڵکی گوندێکیان تێ کەی و لێرەوە بیانبەیتە "عەدنە." هەموو خەڵکی گوند لە ژن و منداڵ و مانگا و مێگەل و ئەسپ و گوێدرێژەکانییەوە ئەرێ وەڵلا."

بێ دەنگ بوو. حەزی دەکرد زیاتر باسی فڕۆکەکان بکا، بەڵام لەوەی زیاتر نەدەزانی. ئیتر بڵێ چی؟ چۆنی بڵێ؟ ئاخری گوتی:

" ئەوانە لە تاریکایی شەودا هەر خوا دەزانێ چۆن نوور دەپڕێنن. ژنەکە، نوقمی رووناکی و تیشك دەبن. هەر دەڵێی کێوێکی تیشك بە ئاسماندا کەوتۆتە رێ. خوا دەزانێ راست وایە."

بێ دەنگ بوو. ئەلیف سەری بەردابۆوە و دیسان ئەسپێی دەکوشت و بیری دەکردەوە:"گوندی زۆر دەمێکە گەیونەتە چوکوور." منداڵەکان کە چاویان بڕیبووە رێگە زیوییەکەی ئاسمان، لە تەنیشت دایکیانەوە هەستان و بەرەو لای دەوەنەکان بەڕێ کەوتن.

دوای ماوەیەك عەلی باوێشکێکی دا و گوتی: ژنەکە.

هەتاوی شلەتێنی پاییزی وەجۆشی هێنابوو:

- ژنە، چوار رۆژی دیکە دەخایەنێ تا دەگەنە چوکوور. جگە لەمڕۆ چوار رۆژی دیکەمان ماوە. سەیری ئەو گیایانە بکە. دەستی برد قولە گیایەکی لە زەوییەکە هەڵکێشا و نیشانی ئەلیفی دا. ئەلیف سەیری ئەو گیایانە بکە هێشتا وشك نەبوونە. دەزانی مام خەلیل چۆنی دەزانی لۆکە پشکوتووە؟ ئەمن رۆژێك خۆم لێ مات دابوو بزانم چۆن دەزانێ. دیتم

هەڵیاندەکەنێ و سەیری رەگەکانیان دەکا بزانێ وشك بووە یان نا؟ ئەگەر وشك بووبێ یانی ئەوە لە چوکووراوا لۆکە پشکوتووە. مەبەستم رەگی ئیزگلیە.

سەرکەوتووانە ئەو چڵە گیایەی بە دەستیەوە بوو خستە پێش ئەلیف:

ـ ها، بزانە. ئەو رەگە وشك بووە؟ خۆی وشك نەبووە، چ بگا بە رەگەکەی. کەچی دەبێ رەگەکەی وشك بێ. ئەو کات جا لۆکە دەپشکوێ لە چوکووراوا. کەوابوو دیارە ئەگەر گوندییەکان ئێستاش گەیبێنە چوکوور دەبێ لە تەنیشت مەزراکان دانیشن و چاوەڕێی پشکووتنی لۆکەی بن.

جا گوڕاندی:

ـ وانییە ژنەکە؟

ئەلیف بۆی سەلماند:

ـ رێك وایە.

ـ جگە لەمڕۆ چوار رۆژی دیمان ماوە. دە رۆژیش چاوەڕێی پشکووتنی لۆکەی دەبن. دەبێتە چواردە رۆژ. لە ماوەی چواردە رۆژاندا چوکووراوا سەهلە پیاو لێرەوە دەگاتە دەروازەی چاناق قەڵا و گێلی بۆلونیش.

ئەوەش سەرم لێی سوور دەمێنێ... "پێکەنی" ئاخ، خودایە گیان یانی مام خەلیلیش بە سەهو دەچێ؟ هەر خودایە سەهو ناکا. سەیری رەگی ئەو گیایانە بکە. هەر قرچیش نەبوون. لانیکەم مانگێکی پێ دەچێ هەتا وشك دەبن. خودایە ئەوە حیکمەتی تۆیە. ئەی خالقی زەوی و ئاسمانان بە قوربانت بم...

عەلی دیسان بێ دەنگ بۆوە. لەسەر گازەرای پشت لێی راکشا و لە بن لێوەکانییەوە بە ورتە ورت گۆرانییەکی شادی گوتەوە. تاوەکە هەر دەهات و گەرمتر دەبوو. پۆلە مەلێك بە قیژ و قاو بەسەر سەریاندا هاتن و رابردن. برێك دواتر عەلی کە دەموچاوی نوقمی ئارەقە بوو هەستا و گوتی:

ـ ژنەکە، ئەمن چ کەللە کەرێکم. سەیری ئەو ئەقڵەم بکە. کەی نییە پێم بڵێ، ئاخر گەمژە، بۆ بیر ناکەیەوە، ئەمساڵ گوندییەکانمان زووتر کەتنە رێ. بۆ نابینی ئەو رێگایانە چۆڵ چۆڵن. ئەوە بۆ ئەقڵت نەیبڕی کە مام خەلیل خەرەفاوە. هەی گەمژە. ئەقڵت پێی نەشکاوە کە مام خەلیل چیی لێ نەماوەتەوە. ئەگینا ئێستا ئەو رێگایانە وەك مار و مێروو خەلکی پێوە دەبوو و کەسی هەڵنەدەگرت. ئێستا، پێنج شەش رۆژی دیکە سەر و سەکوتی گوندییەکانی دیکەش دەردەکەوێ. گوندییەکان، زۆر زوو رۆیشتن. چ بکا مام خەلیلی داماو، ژنەکە، چ بکا؟ یارەبی خودا کەس لەپێ نەخا. ئەمن شێتێکی سەیرم ئاوا رۆژ و شەو وەك سەگ غار دەدەم. ئەقڵێکی سەیرم هەیە.

ئەلیف چاوەکانی درشت و گەورە بوون. چاوەکانی کردبوونەوە و بەبێ ئەوەی چاو بترووکێنێ سەیری مێردەکەی دەکرد.

ـ تف، خودا تۆزە ئەقڵێك بە من بدا. کوڕە ئەتۆ هیچ بیرت لەوە نەکردەوە کە گیا هێشتا تەڕ و بڕە. ئەو جادەیە کاروانێك و پیرەمێردێك نەبێ کەسی پێدا نەڕۆیوە. کاتێك دەگەمێ گوندی لە دەم کێلگەکە کەپریان هەڵبەستووە. ئەو کات دەستم لە نێوقەدم دەنێم و پێ دەکەنم. قاقا پێیان پێ دەکەنم. دەڵێم" سڵاوتان لێ بێ" و پێ دەکەنم و دەڵێم:" هێشتاش پێنج ڕۆژی ماوە بۆ لۆکە پشکووتن. ئەمن بەوەم دەزانی بۆیە درەنگ هاتم. برادەرینە، ئەمساڵ مام خەلیل وەزعی باش نییە. بیبوورن کە ئێوەی دەرخواردی تەپۆ و مێشوولەی چوکووراوا دا. لەمنیش ببوورن لەوەی پێتانم نەگوت. پێتان وایە کارێکی باشتان کرد برادەرینە ئەمنتان لەو چیا و چۆڵە بەجێ هێشت و ڕۆیشتن؟ شمشاڵەکەم لەبەرپشتوێنم دەردێنم و وای تێ دەتووڕێنم کە کەژ و کۆ ودار و بەرد بکەونە چەقڵە سەما. پازدە ڕۆژی دیکەمان ماوە. هیچ نیگەران مەیە. ڕێگەی چوار ڕۆژمان لە پێشە. سبەی دوانیوەڕۆ دەگەینە چامورلوو. هەوارگەمان دەشتەکەی چامورلوو دەبێ ژنەکە.

شمشاڵەکەی دەرهێنا و تێی توورپان. هەستایە پێ. هەستی بە ژانی لاقەکانی نەدەکرد. دەڕۆیشت و لێی دەدا. منداڵەکان بە غاردان لە دەوەنەکان هاتنە دەرێ. ئەلیف چاوەکانی زەق کردبوون و بڕیبوونییە مێردەکەی. مرێمۆکیش بە دەنگی شمشاڵەکە سەری بەرز کردەوە و سەیری کرد و بەخۆی گوت:"بڕۆ، "عەلی"یەدرێژ، بڕۆ. دوای ئەوەی مرێمۆکت چارەڕەش کرد، لێی دە و بچڕە."

عەلی شمشاڵەکەی لە لێوی کردەوە و بە خۆشییەوە گوتی:"ژنەکە مردم لە برسان. ئەتۆش خۆ هەر دانیشتووی و ئەسپێ دەکوژی. دۆینەیەك لێ نێ با نانێك بخۆین. دەزانم ئێستا دایکیشم برسییەتی."

گورج بەرەو لای دایکی چوو و دەستەکانی گرت و ماچی کرد:"دایە گیان. هەرچی دەیکێشین لەبن سەری من دایە. هێشتا زۆرمان ماوە بۆ لۆکە پشکووتن و بۆوەی گوندی دەست پێ بکەن... " و بە پەنجەکانی دەستی کرد بە ژماردن:"یەك، دوو، سێ، چوار..." و لەسەری ڕۆیی:"یازدە، دوازدە، سیزدە، چواردە... چواردە ڕۆژی دیکەی ماوە. لەو چواردە ڕۆژەدا پیاو دەگاتە دەروازەی چاناق قەڵا و گێلی بۆلوو چ بگا بە چوکووراوا. گوتوویانە: *Canakale Incinde Aynali Carci ئەمن چووزانم، بڕوام بە قسەی ئەو پیرە سەیە کرد. چما بە بیریشم دادەهات ئەوە خەرەفابێ. ئەو مام خەلیلە... لەعنەت لە

---

*"لە چاناق قەڵا، بازاڕی ئاوێنە" تاکە بەیتی یەکێك لە گۆرانییەکانی سەردەمی شەڕی سەربەخۆیی تورکیایە و تاکی دووەمەکەی ئەوەیە "دایە، ئەمن دەچمە شەڕی دوژمن".

مام خەلیل. شوکری خودا زۆر درەنگ نەبوو. هەر بۆیە لە گەڕانەوەدا کەڵەبابێك لە بـن داری چـاکی دەکوژمەوە. خودایە قبووڵی بکەی، ئامین." بە دەوری دایکیـدا دەخولایـەوە و دەسـتێکی بـەردەدا و دەستەکەی دیکەی دەگرت و ماچی دەکرد. شەپۆلێکی شادی هەڵیگرتبوو. مرێمۆك لـە دڵـە خۆیـدا گوتی:"قوربـانی بکـە رۆڵـە... قوربـانی بکـە... ئـەمنیش هـەر کـات گەیـشتینەوە ئاواییەکـەمان، کەڵەبابێك دەکەمە قوربانی. پیاو بڕوا بە قسەی ئەو پیرە سەیە، ئەو کافری بێ دیـن و ئیمانـە دەکـا رۆڵە عەلی گیان؟ ئەتۆ چاکی، پاکی بەڵام..."

ــ هیچ خەمت نەبێ دایە. ئەمسـاڵ لۆکەیەك کۆ دەکەمەوە... منداڵەکانیش گـەورە بـوون. دوو هێندەی ساڵی رابردوو خڕ دەکەینەوە. دوو دانە ئەمن و دووانیش منداڵەکان دەبێتە چوار.

لە دایکی جوێ بۆوە و چووە لای ژنەکەی.

ــ ترخێنەکەت وەسەر نا؟

ژنە گوتی:

ـ ساوارم وەسەر ناوە.

ئەمڕۆش رۆن لە چێشتەکە بکە. با دایکم بیخـوا. دامـاوە زۆر کـز و لاواز بـووە. وەك داوە دەزووی لێ هاتووە. با دایکم بخوا. چەورییەکەی بۆ لای ئەو لادە.

چوو و دیسانەوە لە بەر تاوەکە لێی نووست و لاقەکانی راکێشا.

منداڵەکان دیسانەکە بە دڵێکی خۆشەوە بەرەو نێو دار و دەوەنەکە رایـان کـردەوە. حەسـەن بە چەقۆکەی لك و پۆپی دارە گێلاسەکانی دەبڕی و دارە دەستی ساز دەکرد. "کـە گەیـشتینە چوکووراوا، بە هەر داردەستێك دە دانە شووتی دەکڕم، ئەه." نۆمەخان لیچی لێ هەڵقرچاند.

ــ لەوانەیە بیست دانەشی پێ بکڕم. لە چوکووراوا وەختە بۆ دارە گێلاسێك خۆیان بکـوژن. لەو دەشتە خۆ داری لێ نییە.

نۆمەخان بڕێك لەولاترەوە راوەستابوو و حەسەن هـەر شـتێکی گوتبایـە، ئـەو گاڵتـەی پـێ دەکرد و لیچی لێ هەڵدەقرچاند.

حەسەن:

ـ دەتەوێ شووتییەکیش بەتۆ بدەم؟ خۆ تۆ هەمیشە بە گریانەوە چڵمت هەڵدەلووشییەوە و دەچی بە بابم دەڵێی.

جا لاسایی کردەوە. وەك ئەو گریا. دوایی لاسایی ئەو حاڵەتەی کـردەوە کـە چـۆن شـووتیی دەداتێ و نۆمەخان چۆن لە دەستی دەیڕفێنێ و خێراخێرا دەیخوا.

ئۆمەخان هیچی نەگوت. هەر شانەکانی هەڵتەکاندن و لیچی لێ خوار کردەوە.

ـ تیر و کەوانێکیش دەکڕم و قاژووەکی قەڵەوی پێ دەکوژم...

لێوەکانی لستنەوە و زاری تەقاند:

ـ ئاگرێك دەکەمەوە. گۆشتەکەی خوێ دەکەم و لەسەر ئاورەکە جوان و زەریف دەیبرژێنم. جا رۆنی لێ دەتکێ. جا کاتێ ئەمن دەیخۆم تۆ سەیرم دەکەی و لیکاوت لە زارییەوە دێتە خوارێ. جا ئەودەم بەغاردان دەچیتە لای بابم و پێی دەڵێی...

ئۆمەخان پێکەنی. حەسەن زیاتر قەڵس بوو.

هەر دووکیان رووت و قووت بوون. حەسەن جار بە جار تووڕەتر دەبوو. بە پەلە لك و پۆ درێژەکانی دارە گێلاسەکەی دەبڕییەوە. پێکی دەگرتن و چڵ و گەڵاێ لێ دادەڕنین. چاوی لە کارەکەی نەدەترووکاند. ئۆمەخان هاتبووە لای و لاسایی هەموو جووڵەکانی ئەوی دەکردەوە. نێوچاوانی و هەر هەموو گیانی شەڵاڵی ئارەقە ببوو. حەسەن بە سیلەی چاوان سەیری ئۆمەخانی دەکرد و تووڕەتر دەبوو. ناڕەحەت بوو. ئاخرییەکەی سەری بەرز کردەوە و بە راوێژێکی جیددییەوە گوتی:

ـ کچەتیوە، لاچۆ تووڕەم مەکە. لاچۆ لەبەر چاوم ون بە. خۆت دەزانی خەریکی کارم.

ئۆمەخان لێی دوور کەوتەوە. بەڵام دەستی لە گاڵتەجاڕییەکانی هەڵنەگرت. حەسەن گوتی: زۆر باشە، وەڵلا دەتهاڕم. چاو، چاو ئەو سەر و سەکوتەی. یانی چی.. سەیر کە، لێت دەدەم ها.. بابم تووڕەیە. کەتنم پێ مەکە.

ئۆمەخان لە ناکاو وازی لە گاڵتە و لاساییکردنەوە هێنا و قیژاندی:

ـ هەی بەرازی شێت. ئێمە خۆمان لێ بارە، ئەسپەکەمان مردووە، نەنکم ئاوای لێ هاتووە، لاقەکانی بابم هەویان کردووە، هەموو خەڵکی گەیونەتە چوکوور و خەریکی لۆکە چنینەوەن، بەر لەوەی ئێمە بگەینێ ئەوان کاری خۆیان تەواو دەکەن و دەگەڕێنەوە گوند. ئەتۆی هیچ و پووچ تازە لێرە خەریکی دارە دەست چا دەکەی.

حەسەن بەبێ ئەوەی خۆی تێك بدا گوتی:

ـ ئەمن دارە دەستەکان بە شان و پیلی خۆم هەڵدەگرم.

ئۆمەخان:

ـ جا لە جێی ئەوانە چ دەبێ بارێك لە کۆڵی بابم سووك بکەی؟

حەسەن:

ـ دەی ئەو نامداتێ...

ـ نایدا، جا ئەتۆ داوات کردووە ئەو نەیدا؟

حەسەن تووڕە بوو و گوتی:

ـ کچەتیوە، لاچۆ لەبەر چاوم ون بە.

کاتێ کیژێ دیسان لیچی لێ خوار کردەوە، حەسەن بەردێکی هەڵگرت و ڕێیهاڵاند* و دوایی کە ئۆمەخان رای کرد، لە دارستانەکەدا وەشوێنی کەوت و هاواری کرد:

ــ هەی جندە، تۆ دەبیتە سۆزانی. وەك ژنەکەی بەکرە شێت.

ئۆمەخان گەڕایەوە و لەبەری راوەستا:

ـ دەبمە چی؟ دایەی بیلێوە دەبمە چی؟

حەسەن دەمودەست نەرم بۆوە:

ـ درۆم کرد. بە بابم مەڵێ. بەخودا سێ شووتیت دەدەمێ و قاژووەکی باشیشت بۆ دەکوژم.

ئۆمەخان بە چاوە رەشە درشتەکانی سەیری کرد و وەبیری هێناوە:

ــ باشە ئەتۆش جارێکی دیکە ئەو قسەیە مەکەوە. بە خوای بابم گوێی لێ بێ، هەڵتدەتلیشێنێ. خۆ دەزانی زۆر تووڕەیە.

گەڕانەوە لای داردەستەکان. حەسەن دیسانەوە خەریکی بڕینەوە و تاشین بۆوە و ئۆمەخان سەیری کرد.

هەتا دایکیان بانگی نەکردبوون هەر لەوێ بێ هەست و خوست مانەوە. کە گەیشتنەوە لای دایکیان، دیتیان سفرە راخراوە و نەنە و بابەیان کەوچك لە چێشتەکە وەردەدەن. دایکیان لەسەر کانییەکە خەریکی شوشتنی شتێك بوو. لە ڕێوە دانیشتن و نەلیف کەوچکە شۆراوەکانی دانێ و گوتی:

ـ لەسەرەخۆ بخۆن، زۆر گەرمە. زارتان دەسووتێ.

بۆخۆشی دانیشت و هەموان فوویان لە چێشتەکە دەکرد و دەیانخوارد.

هەلیماوێك بوو، چەور و تیژ بە پیوازەوە. رۆن و پیواز لە هەوای پاکژەکەی بەهاریدا بۆنێکی تایبەتی هەبوو. بڕێك دواتر کە هەلیماوەکە سارد بۆوە، ئەو مەنجەڵە چێشتەیان وا هەڵقوڕاند تەنانەت بنی مەنجەڵەکەشیان لستەوە. حەسەن بە هەردوو دەستان تەپڵی بە ورگی لێ دەدا و گوتی:

ـ زگم هەڵمساوە. وەك دەهۆڵی لێ هاتووە.

ئۆمەخانیش وەك ئەو گوتی:

---

* ڕێی هاڵاند: تێی گرت

ـ وەڵڵاهی ئی منیش، ئی منیش بووەتە دەهۆڵ.
ئەویش دەستی کرد بە تەپڵ لێدان بە ورگی.
مرێمۆک سەیری تەپڵ لێدلنی بە ورگی مندالّەکانی کرد و لە دڵەخۆیدا گوتی:"ئی منیش" و بزەیەکی هاتێ.
عەلی کە بزەی سەر لێوانی دایکی بینی، ئۆخژنی هاتێ. گوتی:"دایە، هەلیماویکی بەتام بوو. وا نییە؟" و دوایی رووی لە ئەلیف کرد و گوتی:"دەستت خۆش بێ." و لەسەری رۆیی:"باش بوو، زۆر باش بوو کە دە رۆژان زووتر وەڕێ کەوتین. دەنا دەبوو ئەمساڵەکە چیمان کردبایە دایە؟ ئەگەر گوندەکەی ئێمە وەك سالآن لە کاتی خۆیدا کەوتبایەتە ڕێ، بەو قوونە خاوێنەمانەوە هەتا دەگەیشتینێ، لۆکەچنینەوە تەواو دەبوو. باش بوو مام خەلیل بە سەهو چوو. خۆ ئەگەر وەك ساڵی سالآن بوایە، ئەمساڵ ژن و منداڵم لێقەوماو و هەناسەسارد دەبوون. لێقەوماو و هەناسە سارد. جا عادیل ئەفەنیش ئەمنی...
ئەلیف دەستەکانی بەرز کردنەوە و بە دڵێکی خۆشەوە گوتی:
ـ خودا گیان زۆر شوکر. مەگەر نەمگوت ئەگەر دەرگایەك دابخا، یەکێکی دی دەکاتەوە.
عەلی دووپاتەی کردەوە:
ـ هەزار و هەزار جار شوکر...
مرێمۆکیش دەستەکانی بەرز کردنەوە و گوتی:
ـ هەزار و هەزار جا شوکر. سەت هەزار جار شوکر خودایە گیان. لەگەڵ کەسم نییە لەگەڵ تۆمە خودایە گیان، هەزار جار شوکر.
حەسەنیش بە پێکەنینەوە گوتی:
ـ سەت هەزار جا شوکر...
ئۆمەخانیش:
ـ سەت هەزار شوکر...
عەلی بە دەنگێکی دڵنیاوە گوتی:
ـ کوڕە خۆ زراوم چوبوو. پێم وا بوو گوندی دەستیان کردووە بە لۆکە رنینەوە و تەواویشیان کردووە. چووزانم هێشتا لۆکە نەپشکووتووە. لە کوێ بزانم مام خەلیل زووتر وەڕێی خستووین. لە کوێ بزانم. خۆ کەراماتم پێ نییە. تەڵحام بۆ کەس نەگرتۆتەوە. بەڵام هەر دەبوو فکرم بۆی

چووبا. ئەمساڵ مام خەلیل زۆر زیانی پێ گەیاندین، بەڵام خێریشی هەبوو. بیری لێ بکەنەوە. ئەگەر زووتر وەڕێ نەکەوتبایەین و ئەسپەکەشمان هەر ئاوا لە نیوەڕێیە مردبایە...

مرێمۆك هاواری لێ هەستا:

- نەدەمرد... نەدەمرد. کچەکەم ئەلیف لەگەڵ تۆمە. کە بە دڵی خۆی نەگرێ.

عەلی:

ــ دیارە نەدەمرد. بەڵام مەبەستم ئەوەیە ئەگەر مردبایە و گوندییش ئاوا بەجێیان هێشتبایەین ماڵوێران دەبووین. لێمان دەقەوما. خۆ عادیل ئەفەنیش وەك سەگ دەیخواردم. لەتوپەتی دەکردم. خودایە زۆر شوکر مام خەلیل خەرەفاوە و دە رۆژ زووتر وەڕێی خستووین. ئیدی پێویست ناکا غار بدەین. وردە وردە دەڕۆین و کاتێك دەگەینێ کە گوندی هێشتا چاوەڕێن... ها ها ها ها.... چاوەڕێن؟...

ئەلیف گوتی:

- با چاوەڕێ بن. ئەوان پێیان وا نییە کە ئێمە ئاگامان لێیە ئێستا ئەوان لە تەنیشت کێڵگە نەپشکوتووەکانی لۆکە چاوەڕوانن... نازانن...

عەلی:

- جا چۆن بزانن؟

مرێمۆك:

- ئەلیف لەگەڵ تۆمە. لەگەڵ کەسی دیکەم نییە. ئێستا گوندییەکان، قسە لەگەڵ ئەو مام خەلیلە مردەلۆخەیە ناکەن. هەمووان تفی لە نێوچاوانی دەکەن. ئاخۆ چۆن دەبێ گوندێکی ئاوا گەورە مانگێك بەر لە لۆکە پشکووتن وەڕێ بخەی. خودا هەڵی ناگرێ ئاخر کابرای کافر؟ تۆ خودات نییە؟ چما پیخۆری و توێشووی گوندی بەشی ئەوەندە دەکا؟ هەموو لە برسان دەمرن.

عەلی بە تووڕەییەوە:

- با بەشیان نەکا.

مرێمۆك نێوچاوانی تێك نا. ئەلیف گوتی:

- با بەشیان نەکا.

حەسەن:

- با نەیکا.

عەلی هەستی کرد هەموو گیان ژان دەکا. وەك بڵێی داوەشابێ. گوتی:

ـ لێرە لە سەر ئەو کانییە دوو ڕۆژ دەمێنینەوە. هەتا باش دەحەسێینەوە. ئەمنیش لاقەکانم چاك دەبنەوە و هەڵدەستمە سەرپێ و لەو دارستانە بنێشتتان بۆ دێنم بیجوون با گیانێکتان بێتەوە بەر و تینێکتان تێ گەڕێتەوە. وا نییە؟ لە بری ئەوەی لە دەم کێلگە لۆکەکانی چوکووراوا بمێنینەوە و پیش بخۆینەوە و مێش و مەگەزان لە خۆ دەرکەین، لەو کوێستانە خۆشە دەمێنینەوە. وا باشتر نییە دایە؟

ـ مرێمۆك:

ـ بووکێ لەگەڵ تۆمە. گوێت لێ بێ، زۆر زۆر باشترە. لەوە باشتر هەر نابێ.

حەسەن دەرپەڕی:

ـ وەڵڵاهی بنێشتێکتان بۆ دێنم هەر مەپرسە...

ئەلیف خەریکی خڕکردنەوەی سفرەکە بوو...

ـ وریا بە دەستت نەبڕی، گوێ بدەیە، بەخودای دەستت بڕی دەتکوژم.

سفرەکەی کۆ کردەوە و مەنجەڵە بەتاڵەکەی برد و وەبەر ئاوی کانییەکەی دا و گەڕایەوە و گوتی:

ئەمنیش بەیانی زوو هەڵدەستم و مەنجەڵە گەورەکە وەسەر ئاور دەنێم و جلوبەرگەکانی تێ داوێم. لە بەیانییەوە ئەسپێ لەو منداڵانە دەکوژم، بەڵام هەر تەواو نەبوون. وەك رووبەر، جلوبەرگەکانی داپۆشیبوون. عەلی لە ناکاو خوروویەکی لە گیانی گەڕا کە خۆی پێی سەیر بوو و گوتی:

ـ کچێ ژنەکە، ئەمنیش ئەسپێم هەڵێناوە و بەخۆم نەزانیوە.

و دەستی کرد بە خۆ هەڵکڕاندن.

ئەلیف گوتی:

هەموومان جوان و زەریف خۆمان دەشۆین. سەر و قژم لە چلکدا وەك پەڵاسی لێ هاتووە.

عەلی:

ـ جارێ خوێواوکێك بۆ ئەو لاقانەی من ساز بکە ژنەکە، دایکیشم بە بنێشتە تاڵە و گیا و گژی ئەو دارستانە مەڵحەمێکم بۆ ساز دەکا. هیچ شتێك ناگاتە ئەو مەڵحەمە. جگە لە دایکیشم کەس نازانێ سازی بکا. ئەو مەڵحەمە برینی فیشەکیش چا دەکاتەوە چ بگا بە لاقی هەوکردوو.

مرێمۆك بە لارەلارە لە جێی خۆی هەستا و گوتی:

ـ بووکێ بە تۆ دەڵێم. برینی گوللە بە پێنج ڕۆژان چا دەکاتەوە، برینی گوللەی چەور.

جا بە منداڵەکانی گوتی:

ـ لوێچێ بنێشتی کاژ و بنێشتی عەرعەر و قولێکیشم پنگە بۆ بێنن.

پەشیمان بۆوە و گوتی:

ــ نا، نا، هەر دەبێ خۆم بچمە دارستانەکە.

بەرەو دارستانەکە بەڕێ کەوت. بە هانکەهانك، دوو شەقاو دەڕۆیشت و رادەوەستا. پشتی کووڕ ببۆوە. لە ناخی خۆیدا ترسێکی قورسی وەك شینایییەکی تاریك و رەش هەبوو. بڕێك دواتر گوێی لە دەنگی گۆرانیی عەلی بوو:"بەخۆی گوت، بچڕە، بیلێ "عەلی"یە درێژ، ئێستا کە شانست هێناوێتی، ئەگەر ئەو مردەلۆخەیە گوندییەکانی وا زوو رانەدابا بەرەو چوکوور، قڕ و قپ دادەنیشتی. ژن و منداڵت هەناسە سارد و برسی دەبوون. هێشتاش هیچ نەبووە لاقەکانت ئەستوور بوون. ئەو کات، تا دەگەیشتیتە چوکوور، گوندی لۆکەیان نەدەهێشت. جا ئەو دەم هەمووت بەستۆی مندا دێنا و شانەکەت لەسەری مندا دەشکاند و دەتگوت: ماتڵت کردووم و ژن و منداڵت قڕ کردم... بیچڕە "عەلی"یە درێژ، بیچڕە. خودا چاوڕەشەکەی من ویستوویەتی تۆ بەرێیەدا بڕۆی. ئەمنیش دەچم مەڵحەمێك بۆ لاقەکانت ساز دەکەم.

هەر ئەمشەو لاقەکان چاك چاك دەبنەوە. بیچڕە "عەلی"یە درێژ، بیچڕە.

ئەمن ئەژنۆم دەلەرزن و خەریکە گیانم دەردەچێ. ئەی خودا چاو رەشەکەی من، یارمەتیم دە."

دەستەکانی بەرز کردنەوە و چەند دوعایەکی کە بە منداڵی فێریان ببوو، کرد. هەرچەندە هەمیشە ئەو دوعایانەی نەدەکرد.

دەنگێ "عەلی"یە درێژ خۆش و بەسۆز بوو.

کە دووعاکە و دەنگی عەلی تێکەڵ بوون، مرێمۆك دڵی توند بوو، چاوی پڕ بوون لە ئەسرین و گریان ئەوکی گرت. گوتی:"ئامین".

جا دەستەکانی هێنانە خوارێ و بە دەموچاویدا خشاندن.:"ئامین، خودا چاو رەشەکەم. بە قوربانی سەری نینۆکێکت بم. ئامین، ئەوە تۆ وات کرد. نەتهێشت لۆکە بپشکوێن. ئامین، ئامین... دەبێ مەڵحەمێکی وا بۆ لاقی "عەلی"یە درێژ ساز بکەم وێنەی نەبێ... جا با ئەو هەر پێم نەڵێ دایە و هەر فلتەفلتی بێ..."

## ١٢

توێژێکی ناسك و سپی وەك کاغەز لە مابەینی دارە کاژ و توێکڵەکەی دایە. کە توێکڵەکەی لێ دەکەیتەوە، ئەو توێژکاڵەشی پێوە دێ، دواتر لە توێکڵەکەی جوێ دەکەنەوە و دەیجوون. بەو توێژکاڵە دەگوترێ بنێشتی کوردی. بنێشتی کوردی کە دەیجووی هەست دەکەی دارستانێکی لێوڕێژ لە گوڵە سوێسنە و جاترە و کانی و گوڵ و پنگە لە ناختدا رواوە. دارستانەکە بە هەموو تام و بۆن و بەرامە و شنەکەیەوە لە گیانتدا دەیکاتە بەزمی خۆی. مرێمۆك ئەو بەزمە دەناسێ. ئەلیف و منداڵەکانیش ئاگایان لێیەتی. بیست ساڵ لەمەوبەر بوو کە عەلی لەو داوێنی تۆرووسە کە بەسەر چوکووراوادا دەڕوانێ، و پێم وایە هەر لەو دەرورووبەرانەش بوو بنێشتی کوردیی هێنابوو.

لەو دەوروبەرانە دوو سێ رۆژێك مابوونەوە. هەر کات ئەو رۆژانەی وەبیر دێتەوە هەست دەکا ئەو دارستانە بە گڤەگڤی با و بۆنی گوڵ و پنگەی کێوی و گوڵی هەمیشە بەهارەی زەردزەرد و سوێسن و خەزەڵی رزیوەوە لە ناخی ئەو دایە. تامەکەی زار شیرین دەکا. لەگەڵ دارستانەکە تێکەڵ دەبێ و سەرخۆش دەبێ و سەری لەگێژەوە دێ. قریوەی لێڕەوارە سەوزەکە بەخوێنیدا دەگەڕێ.

با زارجوویەك بنێشت قووت بدا، چڵك و چەپەری ناخی هەموو پاك دەبێتەوە و وەك منداڵێکی تازە لە دایکبووی لێ دێ و هەست دەکا خۆی بۆتە دارستانەکە و لەگەڵ گڤەگڤی بایەکە، عەتراوی و درەوشاوە پێ دەنێتە دنیایەکی نوێوە.

کەڕەی بەیانی بوو. تاو کەوتبوو. لە خوارەوە، دارستانەکە هەڵمی لێ هەڵدەستا. عەلی بە خەواڵوویییەوە لە نوێنەکەی هاتە دەرێ. لە لك و پۆی دار کاژەکەوە برێك ئاونگ کەوتبووە سەر جێ و بانەکەی. چاوەکانی هەڵگلۆفین. دوایی لاقی راستەی خۆی گرت و ئەو کۆنە پەڕۆیەی تێیەوە پێچابوو، وردە وردە و بە ترسەوە لێی کردەوە. ئەوجارە لاقی چەپەی. بە پاریز و ترسەوە هەستایە پێ. بە سەر دۆشەگەکەدا یەك دوو هەنگاوی نا. پێی سەیر بوو. دڵی خۆش بوو. لاقەکانی هیچ نەیەشان.

نیشتبوونەوە و باش باش ببوونەوە. لە جێیەکەی هاتە دەرێ و چووە سەر کانییەکە. لە پێشدا لاقەکانی جوان جوان شوشت. دوایی دەموچاوی. سێ ڕۆژ بوو نەیتوانیبوو بەرپێیەدا بڕوا. ئەلیف لەو لاوە راوەستابوو و سەیری رۆیشتنەکەی دەکرد. مریمۆك دیسانیش کرووشمەی کردبوو و دیار نەبوو چاوی لە شوێنێك بڕیوە یان خەوتووە. دیار نەبوو کەنگێ لە جێ و بانەکەی هاتووەتە دەرێ و لێرە کرووشمەی کردووە. ئاخۆ بیری دەکردەوە یان تووڕە بوو؟ ئاوا کەس لێی تێ نەدەگەیی. گلۆڵەیەکی شڕوشۆڵ بوو.

عەلی بە دڵێکی خۆشەوە هەرای کرد:

ـ یا خوا دەستی دایکم خۆش بێ ئەلیف. مەڵحەمەکەی یەکاویەك بوو... ئەو مەڵحەمە برینی گوللەش بە یەك رۆژ چاك دەکاتەوە. جا وەرە سەیری لاقەکانم بکە.

یەك دوو جار لاقەکانی لە عەرزەکە کوتا و چەند هەنگاوێك رۆییشت.

ـ هەر دەڵێی ئێستا لە دایك بووم. ماشەڵا وەك بەرد قایم بووە. یاخوا دەستی دایکم خۆش بێ... وەك ئەسپی شەڕێ تەپوتۆز ساز دەکەم و بەرەو خوار دەچم و هەموو وڵات دەتەقێنم*.

چۆوە لای دایکی. بە خۆشییەوە لەبەردەمی هەڵتووتەکا. دەستەکانی خستە نێو لەپی خۆیەوە. مریمۆك سەری هەڵێنا. ڕەنگی بە رووەوە نەمابوو. هەموو چرچ و لۆچ بوو. چاوەکانی بەقووڵدا چووبوون و پەڵەیەکی رەش دەوری گرتبوون. لووتی شۆڕ ببۆوە و دەتگوت دەلەرزێ. عەلی گوتی:

ـ دایە گیان، با چیدی شەڕ نەکەین. لێم خۆش بووی؟... هێشتا چاردە...

قسەکەی هەر لە زاریدا بوو کە هەستا. دەستی دایکی بەردا. منداڵ هاتن و لە دەوری کۆوەبوون. حەسەن گوتی:

ـ بابە ئەدی نەتگوت ئەگەر لاقەکانم چا بوونەوە دەچم دارستان و بنێشتت بۆ دێنم؟ دایکشیم و نەنکیشم داوایان کردووە. ئەمن بەشی خۆم خواردووە.

ئۆمەخان بۆڵاندی:

ـ درۆیە دەکا. زۆری هەوڵ دا نەیتوانی تۆسقاڵێکیش دەربێنێ. وەڵا دەمی لێ نەداوە.

ـ باشە. ئەمن درۆیە دەکەم. هەر چونکە بەشم نەداوە... بابە دێی بچین؟... ئەمن نەقیزەیەکیشم ساز کرد.

عەلی روخساری تێك نابوو و هەر هیچ سەیری کوڕەکەی نەدەکرد. هەر دەهات و ڕەنگی رەش هەڵدەگەڕا. بەڵام ئیشتیاشی چووبووە بنێشت. وەك شێتان دەیویست دارستانەکە لە

---

* هەموو وڵات دەتەقێنم: تەقاندن لێرەدا بە واتای گەڕان دێ. دەڵێن: ئەو شارەم تەقان بە دوویدا نەمدۆزییەوە.

خوێنیدا هەست پێ بکا...." ئەمڕۆ دەبێ تا ئێواریێ لێرە بمێنینەوە....." بەو جۆرە، بەو گڕە بایەی لە کەللەی دابوو و بەو هاشوهوش و گوڕەی تۆفانەی وا لە خوێنیدا بوو و بە هەرای دارستانی نێو رۆحی، وەکو رووناکاییەکی توند هەموو رۆحی دەحەسایەوە.

ـ بابە، لێم خوارد. ئەوەندە بەتام بوو کە...

لە ناکاو تێگەیشت کە تۆسقاڵێکیش لە خۆشییەکەی ساتێك لەمەوبەر لە روخساری باوکیدا نییە. دەستەکانی شۆڕ بوونەوە. ئۆمەخان لێی چووە پێشێ و بەرەورووی راوەستا. حەسەن هەر سەیریشی نەکرد. مریەمۆك و ئەلیفیش پێیان وابوو عەلی دەچێ یالابووکیان بۆ دێنێ. عەلی لە جێی خۆی پێی بە عەرزییەوە رەق ببوو. روخساری جار بە جار رەشتر دادەگەڕا و تووڕەتر دەبوو. لە ناکاو وەك خولخولە بەدەوری خۆیدا سووڕایەوە و گوتی:

ـ ماڵوێران بووم ژنەکە. لێم قەوما. خێرا، خێرا، خێرا خێرابە ژنەکە. خێرابە ماڵم وێران بوو.

بە چاوی زەقەوە بەرەو باروبنەکەی رای کرد و دەست کرد بە کۆکردنەوەیان.

ـ ئامان ژنەکە، زوو بە. بیانپێچەوە. منداڵینە ئێوەش.

ئەلیف دەست و لاقی تێکەڵ دەهاتن. ئەرێ ئەوە ئەو پیاوە شێت دەبوو؟

ئەو شادی و خۆشییەی چەند ساتێك لەوەپێشی لەچی بوو؟ ئەمەی لە چی؟...

ـ کۆ کەوە، کۆی کەوە. نابێ کات بە فیڕۆ بدەین...

ـ ئەلیف کاتێ برێك هاتەوە خۆ، پیلی عەلیی راکێشا و گوتی:

ـ راوەستە بزانم. ئەو پەلەپەلەت لە چییە؟ چ بووە وا کەوتیتە پەلەپەل؟ راوەستە بزانم، ئەوە تێکچووی؟

عەلی گۆڕاندی:

ـ ناکرێ راوەستم. بۆ راوەستان نابێ. زستانێ منداڵەکانم... عادیل ئەفەنی...

بێ دەنگ بوو. ئەلیف نیگای پڕ لە پرسیاری تێوەبڕی. هێندەی پێ سەیر بوو چاوی هەروا زەق کردبوون.

عەلی نەیدەزانی چ دەکا. دیسانەکە گوتی:

ـ دەبێ خێرا بین. پاییز قەت بێ باران نەبووە و بارانی پاییزیش ماڵوێرانکەرە. ئەگەر بەسەرماندا بباریێ ماڵوێرانمان دەکا. لافاو دێ و دەمانبا. لەو چیا و چۆڵە بەسەرماندا بباریێ هەموو کۆخەڕەشە دەگرین و دەمرین. خودا دەستمان بگرێ. دەبێ خێرا بین... زووتر، زووتر، بەر لەوەی باران دابکا.

مریمۆك به قۆنەقۆن هەستا. سەیرێكی ئاسمانیی كرد. تەنانەت چلكەهەورێكیشی پێوە نەبوو. ئاسمان سامالّ و شین و رووناك...

ـ بەخۆی گوت: ئەو سەگبابە بۆ وای لیٚ هاتووە. شێت بووە؟ ئەو كورە بۆ وا دەكا؟... دەبیٚ وەریٚ كەوین.

لە خۆی روانی. باش بوو. هیچ كوێی ژانی نەدەكرد. ئەو حەسانەوەی سیٚ رۆژەی بووژاندبوویەوە.:"هەزار جاران شوكر خودا چاو رەشەكەم كە حەوجێت بە كۆلّی كەس نەكردم و وەك خەلّكی دیكە لاقەكانم بلۆقیان نەكرد . هەزار جاران شوكر. مەلّحەمم لە لاقانم نەدا. ئەگەر ئەو "عەلی"یە درێژە كافری بیٚ دینە زارجوویەكی یالابووك بۆ هێنابام خۆ تینێكم تیٚ دەگەڕا. هەر بە ئانقەست نەچوو. دەزانی ئەمن بیزووی پێوە دەكەم. لە داخی مـن نەچوو. بـا نەچیٚ. ئای ی ی "عەلی"یە درێژ... ئەو رۆژانەش رادەبرن."

دارەكەی هەلّگرت:

ـ كچە جوانەكەم. ئەمن وردە وردە دەڕۆم. ئەتۆش لە دوامەوە دێی و دەمگەیێی.

وەڕیٚ كەوت. لە هەموو جارێك خێراتر دەڕۆیی. پشتیشی زۆر كوور نەببۆوە. ئەوانیش دەمودەست مالّەكەیان كۆ كردەوە و لە بەرەیەكیانەوە پێچا. عەلی گورج وەڕیٚ كەوت. كە بە تەنیشت دایكیدا تێپەڕی گوتی:

ـ هەر كات ماندوو بووی دایە گیان دانیشە. ناهێلّم نێوەڕۆ بیٚ دەگەڕێمەوە و دەتبەم.

ئیدی تێپەڕی و ئاوڕی دایەو و هەرای كرد:

ـ پیٚ هەلّێننەوە، ئەلیف منداڵینە... خێرا بن. ئەگەر بارانمان بەسەردا ببارێ لێمان دەقەومیٚ. دایە ئەتۆش ئەگەر باران دایكرد، بچۆ بن دارێكی گەورە و خۆت مەلاّس دە*. هەر هەوا خۆشی بكاتەوە دەگەڕێمەوە و دەتبەم. خێرا بن. بارانی پاییزیٚ زۆر خراپە. برووسكە و هەورەتریشقەكەی پیاو دەتۆقێنیٚ.

ئەلیف هێشتاش هەر بەسەرسووڕماوییەوە چاوی زەق ببوون. حەسەن بە ئۆمەخانی گوت:

ـ خۆ ئەگەر باران نەبارییا، بابم كۆلّێكی یالابووك دێنا. ئەمنیش دەمخوارد و پێی گەورە دەبووم.

ئۆمەخان:

ـ هەی ی هەی هەی...

ئەلیف گوڕاندی:

---

* خۆمەلاّس دان: خۆ مات كردن. خۆ بە عەرزییەوە نووساندن

ـ دم لە دمی یەکتری مەنێن هەی سەر بەقوڕینە. هەنگاوتان خۆش کەن.

کە بە پەنا مرێمۆکیدا تێپەڕین، ئەلیف راوەستا و گوتی:

ـ باشترە نییە دانیشی و چاوەڕێ بکەی دایە؟... تۆ هێزی رۆینت نییە. عەلی دەگەڕێتەوە و لە کۆڵت دەکا.

مرێمۆك لە چەقی رێگەکە بە تووڕەییەوە راوەستا و بۆڵاندی:

ـ کچەکەم، کچم، تۆ بەکچی خۆم نازانم. ژنەکەی "عەلی"یە درێژ، هەتا ئەو دەمەی دەست و پێم لە دووم دێن، ئیشەڵڵا خودا حەوجێم بە پشتی کەس ناکا. ملی رێگەت بگرە و بڕۆ. منداڵەکانیشت بەرە.

عەلی ئاوڕی دایەوە، دیتی ئەوان راوەستاون گوڕاندی:

ـ خێرا وەرن.

رۆیشتن. دواتر لە شیوێك ئاوا بوون و لە چاوی مرێمۆك ون بوون.

مرێمۆك بووژابۆوە. شادی و خۆشییەکی لەدڵ گەڕابوو. چیا و رەوەز و رێگاکان بەروویەوە پێدەکەنین. نە کەمەری دێشا و نە سەری و نە پشتیشی. ئەژنۆشی نەدەلەرزین خۆ ئەگەر پشتە کۆماوەکەی نەبوایە بەو رێگا رۆیشتنەی دەکرا بڵێی نوێ بووکێکی بیست و پێنج ساڵانەیە. ئەژنۆی وا تینیان تێ گەڕابۆوە بۆخۆشی پێی سەیر بوو. لەسەر یەك گۆرانییەکی دەگوتەوە. هەم دەڕۆیشت و هەم هەنگاوەکانی لەگەڵ هەوای گۆرانییەکەی هەڵدێنانەوە. بۆیە بەخۆی دەگوت: چ خەیاڵێکت کردووە "عەلی"یە درێژ... مرێمۆکت پێ چییە؟... پێت وایە ئەگەر بڕۆی و بەجێی بێڵی ئەو ناتوانێ بەرێیەدا بڕوا؟ بڕۆ "عەلی"یە درێژ. لەو چیا و چۆڵەیدا بە تەنێ جێم بێڵە، بڕۆ و دەستی ژن و منداڵیشت بگرە و بڕۆ. تا دەگەیتە چوکووراوا بڕۆ.

داهاتەوە و بە لەپی دەستەکانی سەر ئەژنۆی گوشین و گوتی:" هەی بەقوربانت بم کەشکەژنۆ. جا ئەتۆ ئاوا بی و وەك شێر نەلەرزی، چۆن ئەمن حەوجێم بەو کەسانە دەبێ کەحێلە خۆش رکێفەکەمیان کوشتووە؟ چۆن حەوجێم بەو کەسە دەبێ ئەسپەکەم، کەحێلەکەم، حودوودەدەم، حودوودە چاوڕەشەکەمی کوشتووە؟... گوێت لێ بوو ئەژنۆکەم؟..."

مرێمۆکیش بەو شیوەدا رۆیشتە خوارێ کە ئەوانی پێدا رۆیبوون. کاتێ گەیشتە دەم ئەو ئاوەی بە نێوەڕاستی شیوەکەدا دەڕۆیی، لەوێ لەسەر تاتە بەردێك دانیشت و پشوویەکی دا. ئەوجار لوێچێ ئاوی خواردەوە و داهاتەوە دەست و دەموچاوی لە ئاوەکەدا شوشت. لامل و سەر و قژ و لاقەکانی تەڕ کردن. نێو شیوەکە زۆر گەرم بوو. گەرمای نیوەڕۆ هەر زیادی دەکرد

و هـەموو جێیـەکی دەتەنییـەوە. تیـشکێکی سـووتێنەر شـیوەکەی داگرتبـوو. لـە دوورەوە تاتەبەردێکی خاڵ خاڵ لە بـن تیـشکی رووناکاییەکـەدا دەبریـسکایەوە. کەسـەری هـەڵێنا، لـە باڵەکە عەلیی بە بار و کۆڵەکەیەوە دی و دڵی خۆش بوو:

"دەگەمێ، دەتگەمێ "عەلی"یە درێژ. دەتگـەمێ و بەجێـشت دێڵـم. ئـەتۆ مرێمۆکت پـێ چییە "عەلی"یە درێژ، کورە رەشیدەکەم. بۆخۆت وات کرد و بشیکێشە...."

سەیرێکی هەورازەکەی کرد. زۆر سامناك بوو. رژد و لووس و پڕ پـڕ لـە وردکەبـەرد. چـیی سەیری هەورازەکەی دەکرد، دڵی توند دەبوو و هیوای نەدەما و هێزی ئەژنۆی لەکەمیی دەدا.

بەخۆی گوت:"ئاخ، قەینا، قەیناکا. لەوانەیە هەزار جارانم ئەو هەورازە بـڕیبێ." چـاوی لـە هەورازەکە هەڵگرت و ئیتر سەری بەرز نەکردەوە بۆ ئەوەی سەیری سەرەوە بکا.

"خۆزگە ئەو رێیە ئەو هەمووە هەوراز و نشیوەی نەبوایە. کێوی نەبوایە، لافـاوی نەبوایـە، باو بۆران و بەفر و بەستەڵەکی نەبوایە... بریا هەموو رێگەکان وەك رێـی چـوکووراوا بوایـەن و هەموو سەردەمەکانیش سەردەمی خدری زیندە بوایەن. ئەو هەورازە لە هەمووان قۆڕترە. یاخوا بەلەعنەت بی هەوراز. باشە نەدەبوو لەو کاتەدا لێرە قوت نەبیتەوە؟ بەر نەفرەتی خودای کەوی باشە؟ هەورازی بەنەفرەت بوو."

هەروا کە چاوەکانی لە عەرز بڕیبوون، هەستایە پـێ. لـە نـاخی و لـە ئەژنۆکانیـشیدا ئـەو هێزەی جاران نەمابوو. گوتی:"ئای بریا سەت بریا ئەو هەورازە کـافر و بـێ دیـن و ئیمانـەم لـە خوارەوە سەیر نەکردبایە."

ملی پێوە نا. هەر لە یەك دوو هەنگاوەکەی یەکەمیدا لاقی خلیـسکا و کـەوت. بـاش بـوو کەوتە سەر دەستەکانی و چنگی لە عەرزەکە گیر کرد و خلۆر نەبۆوە. دەستی کرد بـە جنێـودان بە هەورازەکە:"یاخوا ماڵ کاول بی. هەی کافر، هەی بەرازی پیس."

دەستی راستەی دێشا. خۆڵ وخاکی جلـەکانی تەکانـد، بـە شـوێن دارەدەسـتەکەیدا گـەڕا و نەیدۆزییەوە.

"خۆ بنیادەم بەبێ دارەدەست ناتوانێ لەو هەورازە سەرکەوێ، ئای، بـەبێ دارە دەسـت واتـە لێی قـەوماوە. بنیـادەم دەبـێ هـەنگاوێك بـنێ، هـەنگاوێکی پتـەو، دوایـی خـۆی بداتـە سـەر دارەکەی و پشوویەکی بێتەوە بەر."

راوەستا. ساتێك بێ جووڵە مایەوە و سەیرێکی ئەولاولای خۆی کرد. دوایی خۆی پێ نەگیرا و جارێکی دیکەش سەیرێکی لووتکەی کـردەوە و دەمودەسـت سـەری داخـستەوە، هێزێـك لـە ناخی گەڕا. هێزی ململانێ و گوڕاندی:

ـ ئەمن دەبێ لێت وەسەر کەوم ئەی هەورراز.

کەیفی بە دەنگی خۆی و بەو هاوارەی هات کە کردبووی. جارێکی دیکەش گوڕاندی وگوێی دایە دەنگی خۆی. دیسان گوڕاندییەوە.

ـ ئەمن هەتا لووتکەکەت سەر دەکەوم. هەتا ترۆپکی لووتکەکەت.

کە یەکەمین هەنگاوی دەنا، ئەژنۆکانی دادەماڵین و گوتی:

"شەرمەزارم مەکە ئەژنۆ جوانەکەم، چاو ڕەشەکەم، بە قەرەواشت بم، لەسەرت گەڕێم، یاڵڵا دەی یاڵڵا.

نەیدەویست سەری هەڵێنێ، بەڵام نەشیدەتوانی. سەری بەرز کردەوە. نای لووتکەکە چەندە دوور بوو.

"تۆبە، ئیدی سەیرت ناکەم. ئەگەر بشمرم سەیرت ناکەم. چاوەکانم هەڵنایەنم. ئەگەر سەیریم کرد خودایە گیان، ئەی چاو ڕەشە بەدەسەڵاتەکەم، ئەگەر سەیرم کرد تۆ کافرم بکە و لە جەحەنەمم باوێ و چزەچز بمسووتێنە. باشە، ئێ؟ دەی باشە.

هەر وای دەگوت:"باش. هەر ئەوەندە." و دەڕۆیی. گوتنەوەی ئەو "هەر ئەوەندە"ـیە هێزی پێ دەبەخشی:

ـ ئەگەر لە تۆ وەسەر کەوم هەورازەکە، "هەرئەوەندە"دەچمەوە بن دارە گوێزە نوورانییەکە و کەڵەشێرێکی سووری پۆپەلاری دەکوژمەوە. شەرت بێ دەمی لێ نادەم، "هەر ئەوەندە"، هەمووی بەسەر منداڵە وردکەی گوندیدا بەش دەکەم، "هەرئەوەندە"، بەسەر ئەو منداڵە ڕەشوڕووتانەدا. نایدەمە قەڵەوەکانیان. "هەر ئەوەندە" بەشی گەورەکانیش نادەم، هەر ئەوەندە".

هەتا نیوەی هەورازەکە بە "هەر ئەوەندە" گوتنێ وەسەر کەوت. لە هیچ لایەکەوە سۆزەی بایەکیش نەدەهات. هانکەهانکی بوو. پشووی سوار ببوو. زۆری حەز دەکرد سەرێك هەڵێنێ و بزانێ هەتا لووتکەی چەندی ماوە.... بەڵام سوێندی خواردبوو و نەیدەتوانی سەیری بکا. ماوەیەکی زۆر هەر لەوێ نوقمی گومانی سەیرکردن و نەکردن ڕاوەستا. ئەژنۆکانی دەلەرزین. ئیتر خۆی پێ ڕانەگیرا. بەڵام بیری کردەوە کە نەکا هەر دوو سێ هەنگاوێکی مابێ. ئێستا دەبێ چ بکا. لەسەرەخۆ و بە ئەسپایی بەبێ ئەوەی کەس هەست پێ بکا، سەری بەرز کردەوە. بەبێ ئەوەی کەس بزانێ، بەئەسپایی برۆی هەڵێنا و هەر لەگەڵ ئەوەی چاوی بە لووتکەکە کەوت، دەمودەست چاوی قووچاندنەوە. زۆر دوور بوو. هەر لەوێ دانیشت.

دەدەمی نیوەڕۆیە بوو. ئەو شوێنەی لێ دانیشتبوو خڕکەبەردەکانی سوور ببوونەوە. لەولاترەوە دووور، پێدەشتێکی ڕێکی پاییزە لیدراو، پێدەشتی بە دڕکەوشتر داپۆشراو لە بن خۆرەتاودا

دەدرەوشایەوە. ماوەیەك چاوی لەو پێدەشتە بڕی. وردە وردە ئارەقی لەشی سارد دەبۆوەو هەموو گیانی شل دەبۆوە. ئەو شوێنانەی گیانی کە وەعەرزەکە کەوتبوون، دەبرژانەوە. بەخۆی گوت:

"خودایە، خودایە گیان، ئێرە شوێنەکەی "حەمەدۆك"ـی منە. ئەو درووەجاڕەش کە لەپێش چاومە، هەر ئەو درووەجاڕەیە ئەو سووتاندی. چۆنە بچمە ئەو گوندە و لە دەست ئەو "عەلی"یە درێژە نەجاتم بێ؟ با بچم و ببمە میوانی "دایە حۆری"* و پێی بڵێم:" نەنە حۆری، ئەتۆ شێرەژنی. لە هیچ شتێك ناترسی. ئەگەر تۆ نەبایەی، ئەو هەتیوە، ئەو "حەمەیە" نەدەبووە "حەمەدۆك". ئەوە ئەمن ئاوام." ئەو کات "عەلی"یە درێژ هەر لێم دەگەڕێ و جا نامدۆزێتەوە. دەڵێ "مردووە" و سەری خۆی هەڵدەگرێ و دەڕوا."

ماوەیەك هەروا چاوی لە پێدەشتەکە بڕی، گەڕایەوە رابردوو. رێگەکانی بیر کەوتنەوە، رۆژی جێژنی "خدری زیندە"ی بەبیر هاتەوە:"ئاگرێکی گەورەیان دەکردەوە، هەموو جێیەکیان لە تەپڵی گوڵ دەدا. جێژن بوو، خۆشی بوو. لە دوورەوە، "لە خوراسانەوە" ژەنیارو دەهۆڵ کوت دەهاتن.

هەوڵی دا هەستێ، هەموو ئێسکی گیانی دەیانزریکاند. گوتی:"هەلا هەلا بوومە، ئێسك و پرووسکم لێك بوونەتەوە. بەڵام دەبێ ئەو هەورازە ببڕم. نابێ بێڵم "عەلی"یە درێژم پێ پێبکەنێ. پێبکەنێ، پێبکەنێ. با لە چوکووڕێ بگەڕێمەوە سەرێك لە خوشکە حۆریش دەدەم و پێی دەڵێم:"خوشکێ، "نەنە حۆری"، ئەو کوڕە وردیلەیەی تۆ خۆی بە ئاو و ئاگردا کرد و ئاخرییەکەی تۆڵەی دایکی خۆی کردەوە. گیانی لەسەر لەپی دەستی دانا و... جا وەرە سەیری ئەو هەتیوە لینگ درێژەی من بکە، یاخوا ملی ورد بێ. دە بزانە چۆن رووبەڕووت راوەستاوە و پێ دەکەنێ. ئەو هەمووە بەڵایەی بەسەر من هێنا." ئاوای پێ دەڵێم. نەنە حۆری یەخەی "عەلی"یە درێژ دەگرێ و چاو لە چاوەکانی دەبڕێ. چاوی بڵێسەی لێ دەبنەوە. و عەلی کونە مشکی لێ دەبێتە قەیسەری. لە عەلی دەپرسێ:"یانی ئاوا؟" جا عەلی ناتوانێ یەك قسەش بکا و حۆری تفێك لە نێو چاوەکانی دەکا و دوایی دەڵێ:"ئەوەندە بەسە هەتا دەمری، جا ئێستا برۆ بەغدا نیوەی رێیەت بێ."

"دەبێ هەر بگەمە لووتکەی ئەو گردە ئەگەر بشمرم با هەر لەوێ بمرم. دوایی جا "عەلی"یە درێژ بێ و ببینێ کە هەورازەکەم بڕیوە جا مردووم. با بە مردنەکەم شایی لە دڵ بگەڕێ. بەڵام ئەگەر نەتوانم هەتا ئاخرییەکەی برۆم و ئەو بێ و لێرە ببینێ خۆشحاڵتر دەبێ."

دەستەکانی لەسەر عەرزەکە دادا و هاواری کرد:" یارەبی خودایە بە تەمای تۆ چاو رەشەکەم. ئەی ئەوەی یۆسفت لە قوولایی بیردا هێنایە دەرێ یارمەتیم بدە."

---

* دایە حۆری: دایکی حەمەدۆك، پاڵەوانی رۆمانە بەناوبانگەکەی یاشارکەمال.

هەستا. دەلەرزی. یەك دوو هەنگاوی نا. بەلادا هات. هات بکەوێ و خۆی گرتەوە. دووربوونی لووتکەکەی لەبیر چووبۆوە. لە دەوروبەری خۆی بەشوێن داردەستێکدا گەڕا:"ئاخ، ئەگەر داردەستێك بوایە، خۆ وەسەرکەوتن هیچ نەبوو." بە ئەسپایی لەسەر عەرزەکە دانیشت. بەبێ دار نەیدەتوانی راوەستێ. سەیری خۆری کرد، چاوەکانی برژانەوە. چاوەکانی تەواو کردەوە و جارێکی دیکەش راست سەیری خۆرەکەی کردەوە. نیوەڕۆ ببوو. دیارە "عەلی"یەدرێژ دەگەڕایەوە:"خۆزگە هەر نەگەڕێتەوە. دێ و دەمبینێ ئاوا زەلیل و داماو و پەککەوتە خۆم بەو داوێنەوە مەلاس داوە و کەوتووم. یاخوا هەر نەمبینێ. یاخوا قەڵەمی لاقی بشکێ، هەموو لاقی ببنە بلۆق. بۆ چما دیسان مەلحەمی بۆ ساز دەکەم. حەیف بۆ ئەو مەلحەمە. هەرلەلاقی دا وەك ئەسپی شەڕێی لێ هات. بێ ونەبێ ئێستا دێ، دەگاتێ.

بە گاگۆلکێ وەسەر کەوت. دەیویست بشمرێ لەسەر لووتکەکە بمرێ. "ئەو کات دەڵێن سەرکەوتووە جا گیانی داوە. بە خوای ژنێکی ئازا بوو ئەو مریمۆکە. راست وەك حۆریی دایکی حەمە دۆك. تەنانەت لەویش ئازاتر بوو. دەڵێن چەندی تینی لە دەست پێی دابووە، تەنانەت منەتی کوڕەکەی خۆشی نەکێشاوە. ئافەرم مریمۆك، ئافەرم هەزار ئافەرم."

بە گاگۆلکێ هەڵدەکشا، گیانی گەرم گەرم دایسا و ئارەقەی دەکرد. تا گەرمتر دادەهات خێراتر هەڵدەکشا. بە دەنگێکی بەرز گوتی:" ئیشەڵڵا "عەلی"یە درێژ لاقی دەشکێ و درەنگ دەگاتێ. خودایە گیان کارێك بکە زوو بگەمێ. شەرت بێ ئەگەر درەنگ بگاتێ ئەمن کەڵەبابێك، کەڵەبابێکی بەقەدەر بەرخێك تەنانەت گەورەتریش گەورەتر لە کەڵەبابە لارییەکەی کوێخا دەکەمە قوربانی. دەی خودایە گیان، بە قوربانی ئەو ردێنەت بم، لە دەوری ئەو ردێنە سپییەت گەڕێم. مەهێڵە زوو بگاتێ ئەی خالەقی زەمین و ئاسمان. گومان لە گەورەیی و مەزنیت نییە. یا لێرە بمکوژە یا کارێکی وا بکە درەنگ بگاتێ."

لە خۆی نووسا کە هەستێ. شەلاڵی ئارەقە بوو. نەیتوانی. جارێکی دیکە و جارێکی دیکەش هەوڵی دا. ئاخری توانیی هەستێ. دڵی زۆر بە توندی لێی دەدا. دەتگوت دەیەوێ لە سینگی بێتە دەرێ. بەو شێوەیە ماوەیەك هەڵکشا. لەوانەبوو لە ترۆپکی گردەکەش نزیك بووبێتەوە. خوزگە سوێندی نەخواردبایە: "باشە سوێند خواردن چ قازانجێکی هەبوو؟ ئاواش نەبایە خۆ هەورازەکەی هەر دەبڕی. جا چ بیبینێ یان نەیبینێ، ناچارە دەبێ سەرکەوێ. مریمۆکە شێت. ئەو سوێند خواردنەت لە چ بوو. دەی باشە ئەگەر دەتوانی سەرت هەڵێنە شێتە ژن." بە سیلەی چاو، بەبێ ئەوەی وەڕووی خۆی بێنێ سەیرێکی کرد. شتێکی وای نەمابوو. دەمودەست سەری بەردایەوە:"خۆ سەیرم نەکرد. هەر دیتم، چونکە لێی نزیك بوومەتەوە. بەڵام چۆن

دەوری ئەو گاشەبەردە بدەم، کە هێندەی کێوێك دەبێ و ڕاست سەر ڕێگەکەی لێ گرتووم. باشە ئەوە چ سەگبابێك ئەوەی هێناوە و لێرەی داناوە؟ هەر دەڵێی کاری دیکەیان نییە و دێن یاری بە بەرد دەکەن.

بەوهەمووە گەورەییانەوە بوونەتە خالقی زەوی و ئاسمانان و دیسانیش..." ئاخ، ئاخ، خەریك بوو کفری دەکرد. لەڕێوە تۆبەی دەکرد. گوناحی گەورەی زۆر بوون. لەو ڕێیەدا گوناحی زۆری کردبوو.

سەیرێکی ئاسمانی کردەوە. شین و ساماڵ و بێ بن. دەستەکانی لێك ئاوەڵا کردن:"خودایە گیان، کارێکی وا بکە "عەلی"یە درێژ درەنگ بگاتێ. ئەتۆ لەسەر حەوت ئاسمانانەوە و لە نهۆمی حەوتەمین دانیشتووی و فەرمان بەسەر زەوی و ئاسمان و ئاو و باڵندە و پەلەوەر و مار و مێروودا دەکەی. مەهێڵە زوو بگاتێ."

خێراتر قەڵەمبازی دەدا و هەر بە و خێراییەش بە دەوری بەردەکەدا سووڕایەوە. کە چاوی بە لووتکەکە کەوت، چاوەکانی ڕەشکەوپێشکەیان کرد و سەری لە گێژەوە هات. هاواری کرد:"هەزار شوکر، ئێرە لووتکەکەیە، هەزار شوکر."

ڕێگەیەکی دووروودرێژ وەك تووولەمار بە نێوەڕاستی پێدەشتەکەدا دەڕۆیشت و لە کێوێکی چڕ و لێرەوارِ وەسەر دەکەوت. مرێمۆك لەگەڵ ئەوەی دی، خۆی پێ نەگیرا و کەوتەسەر عەرزەکە. بڕێك دواتر دەنگی "عەلی"یە درێژی بیست کە بەسەر سەرییەوە ڕاوەستابوو. بەڵام ئیتر بڕستی لێ بڕابوو و نەیدەتوانی سەری بەرز بکاتەوە و سەیری بکا. هەرچەندە نەیدەتوانی سەری بەرز بکاتەوە، بەڵام لە دڵیدا پێدەکەنی. عەلی لەوێ ڕاوەستابوو و لەسەر یەك قسەی دەکرد، بەڵام مرێمۆك نوقمی خەیاڵەکانی خۆی بوو:"ئەرێ ئەوە ئەو "عەلی"یە درێژە دەڵێ چی. خۆ ئەو توانیبووی بگاتە سەر لووتکەکە. "عەلی"یە درێژ پێی وایە چییە. دیارە پێی وابووە دەمرێ و ناگاتە سەرێ. جائەوە دەبینێ. بڕۆ جەحەندەمت لێ پڕ بێ تووتکە سەگ. ئامادە بوو هەتا دووا دڵۆپی خوێنی خۆی، بە خشکەخشك بڕوا و سواری کۆڵی ئەو نەبێ. ئاخۆ بە خەڵکی گوتووە چی کردووە یان نەیگوتووە؟ ئەگەر باسی کردبایە، دەبووە وێردی سەر زار و زمانی هەموو پاڵە و گوندییەکان. تەنانەت وێردی زمانی فەڕەنسی و ڕووسییەکانیش. دەیانگوت: پیرەژنێکی هەشتا و پێنج و نەوەد ساڵانە، لەو دیو چیاکانی تۆرووسەوە وەڕێ کەوتووە و هاتووە، کوڕەکەی ئەسپەکەی لێ کوشتووە و ئەویش نەچووەتە کۆڵی کوڕە بێ چاووڕووەکەی و هەر بە پێی خۆی هاتۆتە چوکووراوا. لە هەورازێکی ڕژدی وەك منارە کە لە سەر ڕێگەی بووە، سەرکەوتووە و کوڕەکەی هاتووە و گوتوویەتی:"لەو ماوە کورتەدا بنیادەمێکی هەشتا ساڵانە هیچ بگرە هەڵۆیەکیش ناتوانێ ئەو هەورازە ببڕێ." دەڵێن:"میللەت! هەر بژی دایکی ئاوها. ئەوە لە دایکە حۆریی دایکی حەمەدۆکیش مەزنترە. بەو جۆرە هاتووە و خۆی گەیاندۆتە چوکووراوا و دەستی کردووە بە لۆکە ڕنینەوە. خۆ لە لۆکە ڕنینەوەشدا هێندە لێزانە کەس دەسکی لەدوو ناکا.

بەجۆرێك كەوتووەتە لۆكە چنینەوە هەمووان سەریان لێی سوور ماوە. لێگەڕێ با "عەلی"یە درێژ گوێی لەو قسانە بێ. مرێمۆكی چی، بڵێ دایە حۆریی دایكی حەمەدۆك."

عەلی هەر لێی رست، كە زانی دایكی نابیستێ، یان نەخێر گوێی لێیە و وەڕووی خۆی ناهێنێ، لێی بڕییەوە و لە تەنیشتی دانیشت. ئەو بە غاردان گەڕابۆوە. هەواكەی گەرم بوو و سۆزەی بایەكیش چییە نەدەهات. پشتی ژانی دەكرد. شتێكی لە ژان بەئێشتر بوو بەلام ئەو بەلایەوە ژان بوو. پشتی ترسا بوو. لە ترسی ئەوەی نەكا یەكێك یان شتێكی وێكەوێ، دەلەرزی. جواب نەدانەوەكەی دایكی بەفریای هات و لەڕێوە دانیشت. بەلام كات دەڕۆیی و هێشتا ڕێیەكی دووریان لە پێش بوو تا بگەنە چوكووراوا. دڵی لە كوڵ بوو. دڵە كوتەیەكی تاریك و سامناك گیانی داگرتبوو. هەستی دەكرد بەلایەك بەڕێوەیە، بەلام چ بەلایەك؟

بە نابەدڵی هەستا. لە سەرەوە سەیری دایكی كرد. ئاخۆ ئەوە هەر ئەو ژنە بەهێز و بەكەفوكوڵە بوو؟ كە دەگەیشتنە چوكوور گوندی چییان دەگوت.؟ دەیانگوت هیچی بە دایكییەوە نەهێشتووە. كوڕە چاویان دەرێ، چییان پێ خۆشە با بیڵێن.

بە دەنگێكی نەرم و نیان گوتی:

ـ دایە، دایە گیان وەرە پشتم با بڕۆین. بەر لەوەی تاریك دابێ.

كە گوتی:"پشتم"، ژان و ئازارێكی سامناك و تاقەتبڕی هەست پێ كرد و رشانەوەی هات. هیچ چاوەڕوانی نەدەكرد:"مرێمۆك دەستەكانی لەسەر عەرزەكە دادا و بە زەحمەت هەستایە پێ. لە هەستاندا پنچكە گیایەكی بە دەستیەوە هەلكەندبوو. عەلی بە نابەدڵییەوە، كە دەمرد و زیندوو دەبۆوە و لە ناخیدا لە رادەبەدەر لە مرێمۆك تووڕە بوو، لە پێشی دانیشت و وشەی "سوار بە" وەك با لە زاری هاتە دەرێ. ئەو وشەی "سوار بە"یە وەك ویزەی گوللەیەك تیژ بە مابەینی ددانەكانیدا دەربەڕیبوو.

مرێمۆك:

ـ گیا سەوزەكەی دەستم لەگەڵ تۆمە. لەگەڵ كەسی دیكەم نییە. با كەس بە دڵی نەگرێ. ئەتۆ جوانیی زەوی و گیانی خاكی. لە دایك نابیت و نامری. تێكەلاوی تیشكی خۆر دەبی و كێو بە كێو دەشت بە دەشت دەدرەوشێیتەوە. ئەتۆ چاوی دنیای ئەی گیا شینەكە. هەتا تینم لە دەست و پێی دابێ، ئێستا كە خۆم هەورازەكەم بڕیوە، خۆم وەڕێ دەكەوم و دەڕۆم. با كەس زویر نەبێ. با شاییان لە دڵی بگەڕێ كە من ناچمە كۆڵیان. گیا سەوزەكە، لێرە راوەستە و سەیری قوولایی شیوەكە بكە. چاوت رەشكەوپێشكەی دەكا. ئاخۆ ئەوەی لەتو كێوە سەركەوتووە ناتوانێ بە عەرزێكی ساف و رێكدا بڕوا؟ ئەمن دەڕۆم و ئەتۆش هەر زیندوو بی ئەی گیا سەوزەكە."

گیا سەوزەکەی لە قولیدا سووڕاند و تووڕی دا. پەژیوان بۆوە کە بۆچی فڕێی دا. چاوی بڕییە گیایەکەی سەر عەرزەکە. دەیویست شتێك بڵێ و گێڕایەوە. بڕێك دوورتر مێشەیەك* بەرچاو دەکەوت و بەرەو ئەوێ ڕۆیی. هەوڵی دا لقێك بشکێنێتەوە.

"عەلی"یە درێژ بە غاردان بەرەو مێشەکە چوو. بە چەقۆیەکەی دارێکی درێژی بۆ هەڵ-پەرتاوت* و گورج لك و گەڵای لێ داماڵی و گوتی:

ـ ها دایە گیان.

مریەمۆك هەستا. چاوی لە چاوی عەلی هەڵەنگوت. چاوەکانی دانەخستن و وەك بزمار بڕینییە چاوی عەلی. دوای ئەوەی بە دڕدۆنگییەوە بیری کردەوە:"وەریگرم یان نا." ئاخری لێی وەرگرت و وەڕێ کەوت. ئەوەندەخێرا دەڕۆیی عەلی نەیدەگەیشتێ. "بە قوربانتان بم لاق و ئەژنۆ خۆشەویستەکانم. بە قوربانی ئەوەی بم خولقاندوونی. بڕۆن با "عەلی"یە درێژ بەجێبمێنێ. یائەڵڵا دەی بڕۆن."

کاتی زەردەپەڕ بوو کە مریەمۆك گەییە دارستانەکە و عەلیش توانی بیگاتێ. بە نابەدڵییەوە گوتی:

ـ دایە، تاوێك وەرە کۆڵم. هەر لەو نزیکانەیە بارەکەمان خستووە. هەر لێرانە لەسەر کانییەکە. لەبیرتە دایە، کانییەك بوو بە ناوی "کێچی گووزی واتە چاوە بزن."، و ئێمە لەوێ بەرخێکمان کوشتەوە و برژاندمان.

مریەمۆك لە دڵەخۆیدا گوتی:"ئەی چۆن لەبیرم نییە. چما لەبیرم دەچێتەوە "عەلی"یە درێژ. ئەرێ وەڵڵا ڕانێکی تەواوم بۆ تۆ برژاند و تۆ هەر خواردت و خەوتی و هەستایەوە خواردت. ئەو ڕۆژانەم بیر مەهێنەوە، هیچ بیرم مەهێنەوە، شەرم بتگرێ..."

عەلی:

ـ وەرە دایە.

مریەمۆك دیسان ماندوو ببوو، بەڵام چاوەڕێی بوو دوو سێ جاران لەبەری بپاڕێتەوە، بۆیە وەڵامی نەدایەوە. عەلیش کە جوابی وەرنەگرتەوە بێ دەنگ بوو. چونکە زراوی چووبوو لەوەی مریەمۆك بڵێ:"ڕاوەستە با سوار بم."

مریەمۆك کە زۆر ماندوو دەبوو، پشووی لێ دەبڕا.

هەوا خەریك بوو تاریك دادەهات. سروە بایەك لە باشوورەوە هەڵی کردبوو. بۆنی بنێشتی تواوە و هەزاران گوڵی دیکە تێکەڵ ببوون و لە دارستانەکەوە دەهات.

---

* مێشە: دارستانی دەم چۆم. بەتایبەتی دارستانی بی.

* هەڵپەرتاوتن: بڕینەوە. بڕینی لقی دار. لقی دارەکەم هەموو هەڵپەرتاوتووە. واتە بڕیومەتەوە.

مریمۆك نەیدەتوانی پێ هەڵێنێتەوە، بەڵام نەیدەویست عەلی گاڵتەی پێ بکا. دیسان دانی بە جەرگی خۆیدا گرتبوو و دەستی کرد بە پاڕانەوە لەبەر خودا:"خودایە گیان زوو بمگەیەنی. مەهێڵە بکەوم. ئەی ئەژنۆکان خۆڕاگر بن. چیی وای نەماوە. ماڵ کاولینە خۆ راگرن."

عەلی لە دواوە، بەبێ ئەوەی بزانێ چ بە دڵی مریمۆکدا رادەبرێ، دەیگوت:

ـ نابێ لۆمەی مام خەلیل بکەین. ئەگەر ئەو نەبوایە ئەمسالەکە ماڵ و منداڵم رووت و قووت دەکەوتینەوە. برسی و تینوو. لە برسان دەمردین. جا کە گەیشتمە چوکوور و لۆکەم کۆ کردەوە و پارەکەیم وەرگرت، پێنج پاکەت جگەرە بۆ مام خەلیل دەکرم با هەر پێی سەیر بێ. ئەو دەم دەڵێ:"ئەوە چییە، رۆڵە عەلی؟"و ئەمن پێی دەڵێم:"ئەوە حەقی زەحمەتەکەی تۆیە. لەبەر ئەوەی خەڵکی گوندەکەی ئێمەت زوو خستە رێ و ئەمن توانیم خۆم بگەیێنمە لۆکە رنینەوە. چما تۆ خدری زیندووی پیرەمێرد؟ دیارە دەتزانی ئەسپەکەی من لە نیوەی رێیە دەتۆپێ و هەر بۆیەش گوندییەکانت زووتر وەڕێ خست." مام خەلیل بزەیەکی دێتێ. پێی دەڵێم:"ها، ئەو جگەرانە بکێشە. حەڵاڵت بێ. بیانکێشە و بەو سەری پیرییە خەم و خەفەتان لەبیر خۆت بەرەوە."

مریمۆك لە ناکاو بە تووڕەییەوە گوڕاندی:

ـ دارستانەکە لەگەڵ تۆمە، یاخوا ژەهر بکێشێ.

بە قۆنەقۆن دانیشت. خەریك بوو پشووی دەبڕا. گوتی:

ـ ئاو، ئاو، چۆڕێ ئاوم بگەیەننێ.

بڕێك لەولاترەوە دەنگی حەسەن و ئۆمەخان هات. مریمۆك گوتی:

ـ منداڵە خۆشەویستەکانم، ئاو.

کانییەك بە تەنیشتیاندا دەڕۆیی. عەلی لەپی دەستی پڕ کرد لە ئاو و گوتی:

ـ بخۆوە دایە، بخۆوە.

مریمۆك لێوەکانی تەڕ کردن و عەلی ئاوەکەی دیکەی بە دەموچاوی هەڵپرژاند.

مستێکی دیکەشی ئاو پێدا کرد. ئەلیف و منداڵەکان بە غار هاتن. ئەلیف دەستەکانی مریمۆکی گرت. دڵی پیرەژنە هێندە توند لێی دەدا ئەلیف گوێی لە دەنگی دەبوو. مریمۆك کە بڕێك وەخۆی هاتەوە لەسەری رۆیشت:

ـ بە ژەهری بێ، ژەهری مار بکێشێ ئەو پیرە سەیە. ژەهری کەسك، کەسك، کەسك کەسك... ئەویش پێنج پاکەت، یەکیش نا، دووش نا، پێنج پاکەت. لەو ژەهرە بکێشێ کە ناهێڵێ لە تاوێ بێتە سیبەرێ و رەقی دەکا....

## ١٣

"ئەو ژەهرەی ناهێڵێ لە تاوێ بچێتە سیبەرێ."

"درۆیە، هەموو گیانی درۆیە. بنیادەمێك چل ساڵان لە باوەشی مێردەکەیدا بنوێ و نەزانێ خولق و خووی چۆنە و نەشـزانێ چـیی کـردووە و چـیی نـەکردووە؟ ئـەو پیـاوێکی ئـاوا نـەبوو. هەمووان خراپی لێ تێگەیون. برایم، بابی ئەو "عەلی"یە درێژە سەربەقورە، مێـشی لـە دەمـی خۆی پێ دەرنەدەکرا. ئەوەندە شەرمن و نـەرم و نیـان بـوو پێـی عـەیب بـوو سـەری هـەڵێنێ و سەیرت بکا. بزەیەکی شیرن و وەك لۆکە نەرمی هەبوو. دەم بـە پێکـەنین و کەمـدوو بـوو. وەك منـداڵان. دوورەپـەریز بـوو. نەدەچـووە میـوانی و شـایی و زەماوەنـدانیش. سـەبارەت بـەو گوتوویانە:"لە ئاوی مەند بترسێ و لە ئـاوی خـوڕ مەترسـێ". بـەڵام درۆ بـوو. بـە خـودا و بـە پێغەمبەران، ئەو هەر شەمنییەکەی نەیدەهێشت بچێتە نێو خـەڵکی. لـە ترسـی ئـەوەی نـەکا قسەیەکی قۆڕی پێ بڵێن، زراوی دەچوو و بەردەوام لە قوژبنێك دەگەڕا خۆی تێدا وەشارێ.

"هەرچی بەسەری هات، ئەو مام خەلیلە مردەلۆخەیـە بەسـەری هێنـا. ئـەو مـام خەلیلـە، کابرایەکی گەندەڵە، بەرازە، بێفەڕە، بێ دین و ئیمانـە و بـەپێی هـەر چـوار کتێبەکـە خـوێنی حەڵاڵە. لە هۆزی جنۆکانە. ساڵ ومانگان نەیهێشت ئاوی ئاسوودە لە گـەرووی ئـەو چارەڕەشـە بچێتە خوارێ. کەس بەوە نازانێ، هەر خودا دەیزانێ و ئەو مرێمۆکە هەناوخرابووە.

"ئەوساڵە، لەو ساڵی قاتی وقڕییـەدا، ئـەو دەمـەی خـەڵك لـەبری دەغـڵ و دان، قـەزوانیان دەهاڕی و نانیان لێ ساز دەکرد و لەبری پیخۆر کەنگر و کاردۆیان کۆ دەکـردەوە و دەیـانخوارد. رۆژێك لە رۆژە گەرمەکانی بەهارێ، خەبەریان هێنا "مام خەلیل" گەڕاوەتەوە. هەموو خـەڵکی گوندی لەبەر ئەوەی مام خەلیل لە یەمەنێ رایکردبوو، هاتن و لە دەوری کۆوەبوون. لە گوندیدا

پیاوێکی وای لێ نەمابۆوە بتوانێ دەست بداتە پێمەڕە. بەهێزترین کوڕی گوندی تەمەنیان لە دە و یازدە تێی نەدەپەڕاند.”

مام خەلیل وای لێ هاتبوو لە بنیادەمان نەدەچوو. پێستی گیانی وشك و ڕەش داگەڕابوو و بە ئێسکانێوە نووسابوو. فووت لێ کردبا با دەیبرد. چاوە سەوز و گەورەکانی بەقوولدا چووبوون و پشووی لەبەردا نەمابوو.

دەیپرسی:”ئەوە قاتی و قڕی هاتووە؟ نان نییە؟ خاك وشك و قەڵشیوە؟ زەوی بڵێسەی دێ؟ منداڵ بەنۆبەتێ دەمرن؟ لە ئاواییدا کەس نەماوە گول نەبووبێ؟ ژنان زەوی و زار دەکێڵن؟ ئەو زەوییەی دەیکێڵن هیچ حاسڵی دەبێ؟ دەی بڕۆن شوکری خودای بکەن و بڵێن خودایە ساردتری نەکەی. لەو دیو ئەو چیایانەوە دەریایەکی لمی سووتێنەر هەیە. هەرکەسێکی تێکەوێ گیان دەرنابا. مەحاڵە گیان دەربەرێ. ئەگەر رزگاریشی بێ، وەکی منی لێ دێ. سەیرم بکەن. حەوت ساڵی رەبەق... لەو رۆژەوەی لێرە رۆویوین ئەوە حەوت ساڵە. وا نییە؟ حەوت ساڵ... لەبیرم نییە چەند کەس بووین. هەموو پیاوانی دێ. تەنیا من زیندوو ماوم و براییش. ئەمن بە خشکە خشك خۆم گەیاندە ئێرە، برایم لەو خوارە بەجێ ما. بڕۆن، ئەگەر نەمردبێ بیهێننەوە. دەڵێن کوێ؟ لەسەر کانییە بزنە.

کاتێ گەیشتینێ، ئاوێکی خۆرادەوە و لە هۆش چوو. نەماندەتوانی بە ڕێگایەدا بێینەوە. دەترساین بمانگرنەوە و بمانبەنەوە یەمەنێ. برسیمان بوو، سەرمان لێ شێوا بوو. ئەو لەوێ کەوت و بەجێ ما. ئەمن دانم بە جەرگی خۆم دا گرت و بەخۆم گوت ئەگەر هەر بشمرم وا باشترە لە زیدی باووباپیرانمدا بمرم و دانم بە جەرگی خۆمدا...

دەی بڕۆن ئەگەر نەمردبێ ئەو بلە دەستەوستانە نەجات بدەن. هەر بەراستی پیاوی حوکمەت و شتی وا لێرە نەبن؟... کوڕە دەخیلە، نەهێڵن بە هاتنەوەم بزانن، بە نۆکەرتان بم... یەمەن جەحەندەمە، مەهێڵن پێ بزانن، ئەگینا دەمبەنەوە ئەوێ. ئەمنیش نارۆم، جا یان ئەو دەکوژم یان خۆم. ناچمەوە یەمەنێ. خودایە کەس تووشی یەمەن نەکەی. پەلە مەکەن با برێك بێمەوە سەر خۆ هەموویتان بۆ دەگێڕمەوە. کێ؟ عوسمانی کوڕی کۆرلو؟... دۆران؟ کێ؟... قزقین ئۆغلو؟... بەتاڵ؟ هەر ئەو بەتاڵۆکەکە؟... ها؟ پەلە مەکەن با برێك بێمەوە سەر خۆ. هەمووتان بۆ لە بنی کوولەکەی دەدەم. مووبەموو.. ئێستا خۆم لەسەر پێیان پێ ناگیرێ. گوتتان قاتی و قڕی هاتووە؟... پارووە نانێکیشتان نییە؟ سێ مانگە

لەگەڵ بلە بەرێوەین. هەتا گەیشتینە کانییە بزنە باش بوو. ئیدی لەوێ کەوت. گوتم، کورە بلە شتێکی وامان نەماوە، هەستە با برۆین. گوتم دان بە جەرگی خۆتا بنێ. گوتی، ناتوانم هەستم. هیچ هێزم نییە. ئەتۆ بچۆ ئاوایی و ئاگاداریان بکەوە. خۆت بگەیەنە ئەوێ خەلیل. پاڕایەوە:"خۆت بگەیەنەوە ئاوایی بە نۆکەرت بم. هیچ خەمی منت نەبێ، ئەوە گەیشتمەوە ئێرە و لەو بیابانە، لەو جەحەندەمە سووتێنەرەدا نەمردم. ئەگەر بشمرم با لێرە لە کوێستانەکان و زێدی باووباپیرانی خۆمدا بمرم. رامەوەستە. برۆ بگە ئاوایی. لانیکەم تۆ بگەیە. رامەوەستە براله خەلیل.

خەریك بوو لە برسانا دەمردین. یەکتریمان لە ئامیز گرت. ئەو لەوێ بەجێ ما. ئەمن وەرێ کەوتم. کە گەیشتمە خوارووی گوندی، ئەمنیش وەك برایم لێ هات؟ بەری چاوانم رەش بوون و ئەژنۆم نووشتانەوە. بەخۆمم گوت:"دەی خەلیل، خەلیلی ماڵ کاول، تازە کە گەیشتوویەتەوە ئاوایی و نێو ماڵەکەی خۆت کوا کاتی مردنە؟ رامەوەستە. ئەژنۆکانم تینێکیان تێ گەڕایەوە و وەڕێ کەوتمەوە. لەوانەیە هەر زیندووش بێ. هیچ شتێکی واتان نییە بمدەنێ بیخۆم؟ کورە لەو کێو و چیایانە ئەوەندەم گیا و گژ خواردووە دڵم تێکەڵ دێ. چۆڕێ ئاوی گەرمیشتان نییە؟ لەتێك نانی هەرزنیش؟ هەر هیچ شتێك لە گوندێکی ئاوا گەورەدا؟ لانیکەم چەند دەنکە گەنمێك جۆیەکیش نییە بیخەمە بەر ددانم؟... ئەو گوندە پیاوێکی تێدا نییە فریای برایم بکەوێ؟

گوتیان: نا

"دەی ژنینە، ئەنگۆ بچن. ئەنگۆ بچن. چەندی چەند ساڵە زەویی دەکێڵن. هەر خۆتانیش حاسڵ و بەروبووی هەڵدەگرنەوە. دەی ورێ کەون و بچن برایم بێننەوە. مەهێڵن قەل و داڵ بیخۆن. لەسەر کانییە بزنەیە.. ئەوە کوا ژنەکەی؟ مریەمۆکی ژنی...

گوتیان: هەر هەواڵەکەی بیست کەوتە رێ..

"ها؟ ئەحمەدە شلێ؟. راوەستن... تۆخودا راوەستن. خۆ دەنگم دەرنایە. دوایی مووبەمووتان بۆ دەگێڕمەوە.

ئەو بووکانەی مێردەکانیان لە یەمەنێ بەجێ مابوون، ئەو دایکانەی کوڕیان نەگەڕابوونەوە، ئەو منداڵانەی بابی خۆیانیان نەدیبوو، بە هەر حاڵێك بوو بە هەمووی ئەو گوندە گەورەیە چێشتێکی گەرمیان بۆ مام خەلیل لێ نا و بۆخۆشیان بە گریان و شین بەجێیان هێشت.

مریەمۆك لە سەر کانییە بزنە، برایمی بەبیهۆشی دۆزییەوە. نەیناسییەوە. ئەو چنگە ئێسك و پرووسکە وشکەڵاتووە، ئەو گلۆڵە کۆنە پەڕۆ چڵکن و پیسە، هیچ لەو برایمە نەدەچوو کە دەتگوت داری حەیزەرانە. بەکۆڵی خۆی دادا و بەرەو ئاوایی کەوتە ڕێ. سێ مانگی خایاند هەتا برایم وەخۆ هاتەوە. بێ مانگ دواتر بوو کە توانیی بەو بزە دڵڕفێنەی دیسان پێبکەنێتەوە. ئیتر لەمەودوا مریەمۆك وا نوقمی شادی بوو هەر مەپرسە. دەیگوت:" دۆزیمەوە. بزرم کردبوو، دۆزیمەوە.

چەندی چەند ساڵان چیی لە دەستیان هات کردیان بۆ ئەوەی برایم و مام خەلیل لە پیاوانی حوکمەت بشارنەوە. هەموو ئاوایی وریا بوون. تەنیا دوو پیاوی گوندەکەیان لە یەمەنێ گەڕابوونەوە. چما دەکرا ئەوانیش بدەنە دەست کوێخا یان پیاوی حوکمەت؟ خۆ ئەگەر کوێخاش ئاشکرای کردبایەن، ئەوا هەر بەزیندوویی کەوڵیان دەکرد. چاویان دەردێنا. کوێخا سەهلە ئەگەر پادشاش بوایە. هەموو خەڵکەکە دڵیان لای ئەو دوو راکردووەی یەمەنێ بوو. خەڵك خستبوویاننە بن باڵی خۆیانەوە.

مام خەلیل بێ پسانەوە باسی یەمەنی دەکرد و بەسەرهاتی راکردنەکەی وا دەگێڕایەوە کە جەماعەتێك بگرییێنێ. هەندێکیان پێیان سەیر بێ و هەندێکیش پێبکەنن. برایم متەقی لێوە نەدەهات و بە تاسەوە گوێی دەدایە قسەکانی ئەو. هەر بە ئامازەیەکیش چییە، نەیدەگوت وایە یان وا نییە. مام خەلیل گوێی لەو گۆرانییە کۆن و نوێیانە دەگرت کە لەسەر یەمەن هۆنیبوویاننەوە و "کەل ئاشیق" دەیگوتنەوە. بە بیستنیان هۆڕهۆڕ دەگریا و بە چاوی فرمێسکاوییەوە بە ئاواییدا دەگەڕا. کەل ئاشیق ئیدی هەرچی لەسەر یەمەن بیستبووی، هەر هەموویانی لانیکەم دە جاران بۆ مام خەلیل چڕیبۆوە. هەموو گوندییەکان، گەرچی مێرد و باوکیان لە یەمەنێ بەجێ مابوون، دیسانیش هەر دڵیان خۆش بوو. هاتنەوە مام خەلیل، شادی و خۆشییەکی خستبووە گوندەوە. بەر لەوەی مام خەلیل بێتەوە کوا کەل ئاشیق گۆرانی دەگوت و سازی لێ دەدا؟ لە شیپانەی دەرگاکەیدا و لەبەر تاوەکە دادەنیشت و ردێنی بەردەدایەوە سەر سینگی و هەتا ئێوارێ ئاوا بە گرژ و مۆنی دادەنیشت. لەو کاتەوە مام خەلیل گەڕابۆوە، خەڵك لانیکەم تێر بە دڵیان دەگریان.

تاقە کەسێك، ئەویش مریەمۆك کەیفی بەو تاریف و گێڕانەوانەی مام خەلیل نەدەهات. حەوت ساڵی رەبەق، ئاراوقارای نەبوو و هەر وا چاوەڕێی برایمی بوو لە یەمەنێ بگەڕێتەوە،

بەڵام ئێستا دڵی پێی خۆش نەبوو. شتێك هەبوو کە غورووری ئەوی دەشکاند و پێی قبووڵ نەدەکرا. ئەگەرچی مام خەلیل تاریفی برایی دەکرد، بەڵام پێی وابوو ئەو ماستە بێ موو نییە. برایمیش خۆ زمانی نەدەگەڕا و هەرچی لەسەر ئەو و ئەوانی دیکەش دەگێڕدرایەوە ئەو هەر بزەیەکی دەهاتێ و هیچی دیکە.

"ئەو ژەهرەی ناهێڵێ لە تاوێ بچیتە سیبەرێ..."

هەر هەموو خەڵکی ئاوایی، یەمەنیان، بە لم و چەو و وردکەبەردەوە، بەو سەربازانەوە کە لە تینوێتییان لە هۆش دەچوون یان ئەوەندەیان هاواری ئاو دەکرد شێت دەبوون، ئەوانەی لە بیابانە بێ سنوورەکانی لمدا هەتا ئاسۆگە دوورەکان رایان دەکرد و بزر دەبوون، تۆفانی لم، دارە خورماکان، نۆبەتێ و برسێتییەکان، ئەو عەرەبانەی ورگی سەربازە تێکشکاوەکانیان هەڵدەدڕی و هەر هەموو شتەکانیان وا دەناسی دەتگوت چوون و بەچاوی خۆیان دیتوویانە. بە تایبەتی هەر هەموویان بە جوانی راکردنەکانی ئەوانیان دەزانی و هەر لە ئێستاوە گۆرانی و لاوکیان بۆ ساز کردبوون:

"دوا نیوەڕۆیەك بوو، کە دیسانەکە دەریای لم شەپۆلی دا. لە بیاباندا، لە پێشدا لێرەو لەوێ هەوری رەش گەواڵ گەواڵ لە ئاسماندا دەردەکەون و دوایی یەك دەگرنەوە. پەردەیەکی رەش دەکەوێتە نێوان زەوی و ئاسمان. شەیتان بە لەعنەت. بە رۆژی رووناك وڵات تاریك دادێ، بایەك هەڵ دەکا و لم و خۆڵەکە گێژ دەدا. بایەکە تەپۆڵکەکانی لم لە جێیەکەوە هەڵدەگرێ و دەیانباتە شوێنێکی دیکە. بنیادەم هەر دەڵێی خراوەتە نێو مەنجەڵێکی بەکوڵەوە. لە نێوەڕاستی بیابانەکە، لە گوندێکەوە دەچووینە گوندێکی دیکە. رێگەی یەك حەوتوومان لەبەر بوو. دەفرەکانمان ئاویان تێدا نەمابوو و زمانمان بە مەلاشوومانەوە نووسابوو. هەر هەموو روویان کردبووە ئاسمان و "ئاو، ئاو"یان بوو. بەڵام کە زار و چاوت دەکەیتەوە پڕ دەبن لە لم. لمەکە شەپۆلی دا و راوەستا. کوڕەکەی ساری دۆردۆ هاتە لام. هەر بە لادا دەهات. گوتی:"خەریکە دەمرم. ئیتر ناتوانم لاق هەڵێنمەوە." دەکرا چ بڵێم؟ دیسانەکە داوای ئاوی کردەوە، کەس پێی نەبوو. گوتم:"وەرە کوڵم، خۆ ئاوا ناتوانی بەرێیەدا برۆی." لە نیوەڕۆوە هەتا ئێوارێ ئاوا رۆیشتین. لە ناکاو ئاگام لێ بوو گیانی دەرچوو. چونکە بەسەر پشتمەوە شل بۆوە و قورس ببوو. لەو جەنگەیەدا دیسانەکە دەریای لم شەپۆلی دایەوە. تۆفانەکە هەڵی کرد. دەست و پێی خۆمانمان لێ ون بوو. نەماندەزانی چی بکەین. لم گێژی دەدا و دەسووڕایەوە. لەو جەنگەیەدا مردووەکەی سەر کۆڵم بەربۆوە.

ویستم دیسان بەکۆڵمی دادەمەوە، ئای لەعنەت لە شەیتان، جا وەرە بیدۆزەوە. کەس نەیدەزانی لە کوێ مردووە. لەو تارکییەدا دەستم بە نێو لم و خۆڵەکەدا دێنا و لێی دەگەڕام، هیچ شوێنەواری نەبوو. تۆفانەکە راوەستا. هیچ شوێنەوارێکی هەتیوی ساری دۆردوو دیار نەبوو. خودا دەزانێ وەبن کامە تەپە لم کەوتووە. ئەو برایمە داماوەتان دیتووە، هەر ئەو برایمە پێی چەقاندبوو ئیلا و بیلا دەبێ کوڕەی ساری دۆردوو بدۆزینەوە، زۆر گریا و نووزایەوە. هیچ دەسەڵات نەبوو. دوایی کوڕەکەی گۆدولیش لە نیوەی رێیەدا مرد. ئیدی دوای ئەوە هاوڕێکانمان وەك خەزەڵ* هەڵدەوەرین. ئاخرییەکەی گەیشتینە شوێنێك ئاوێکی لێ بوو و بڕێکیش شین دەچۆوە. گەیشتینێ بەڵام هیچ کاممان هێز و تینمان لەبەردا نەمابوو. جگە لەوەش لە عەرەبەکانیش دەترساین. بەردەوام تۆقیبووین لەوەی پێشمان پێ بگرن و بمانکوژن. لە جێی ئەوەی وردە وردە و یەك بە یەك بمرین وا باشترە هەموومان یەك جێ و پێکەوە بمرین. دەمانگوت خۆزگە بێن و هەموومان بکوژن و رزگارمان بکەن. ئاخرییەکەی پەلاماریان داین. کە گەیشتینە شوێنەکەی خۆمان، لەو سێسەدکەسەمان سی کەس مابۆوە. خۆزگە نەدەمایین. چواردە کەسی گوندەکەی ئێمە لەو دەستەیەدا بوون."

مرێمۆك شەوێ لەسەر جێ برایمۆکی وەڕەز کرد.

ـ باشە ئەی تۆ نەتگوت ئەمن کوڕەکەی "ساری دۆردوو"م بەکۆڵم دادا و لە نێو شەپۆلی لمدا مرد و بەربۆوە؟ لێی گەڕام و نەمدۆزییەوە، دیسانیش دەمویست زیاتری لێ بگەڕێم بەڵام مام خەلیل نەیهێشت؟" ئەوە ئێستا مام خەلیل خۆی پێوە رادەنێ و لە نێو گوندییاندا حەیای ئێمە بردووەو دەڵێ ئەمن لەکۆڵم کردووە. خەلیل درۆیە دەکا یان تۆ؟ خەلیل لە کن خۆت وای گوت. ئەدی بۆ متەقت لێوە نەهات؟

برایم هیچی نەدەگوت.

"لەو چواردەکەسە هەشتیان مردبوون و شەش کەس مابووینەوە. برایم هات و پێی گوتم:"هاوڕێ ئیدی چارەی دیکەمان نییە جگە لەوەی را بکەین. ئەگەر زرگاریمان بوو باشتر، ئەگەر نەشبوو، بە هەر دوو بارەکەیدا دەمرین." ئەمن پێم گوت:"هاوڕێ، ئەوە پێی نالێن خەیانەت؟ خەیانەت بە نیشتیمان؟" گوتی:" با وابێ. بەڵام نیشتیمان جگە لەمەرگ چیی پێ

---

*خەزەڵ: گەڵای وشکبووی پاییزان. دیارە لای شەختەیە ناخۆش خەوەرێ داره خۆی دەرنێ خەزەڵ هەڵدەوەرێ (هەژار)

داوین؟ ئەگەر بمانگرن تیرەبارانمان دەکەن. ئەگەر لە گوندیش بمانگرنەوە، دەماندەنە دیوانی شەڕ و دیسان هەر گوللەبارانمان دەکەن."

برایم کابرایەکی چاونەترسە. زۆر ئازا و بوێرە. گوتی:"باشە، با گوللەبارانمان بکەن. لەوانەیە نەشگیرێین و بەزیندوویی دەرچین و بگەینەوە زیدەکەمان.." ئەمن گوتم:"باشە، ئەمن قایلم، بەڵام ئەدی هاوڕێیانی دیکەمان دەڵێن چی؟ ئاخۆ قەبووڵی دەکەن؟" گوتم:"با پرسێکیان پێ بکەین." چووین و بە ئەسپایی لێیان نزیک بووینەوە و گوتمان:"هاوڕێیان، هاووڵاتییەکان، ئەگەر راستیتان دەوێ بڕیارمان داوە را بکەین. راتان چییە؟" یەکێ گوتی:"ئەوە دامانن رامان کرد، لە ڕێگەش کەس نەیگرتین و ورگیان نەدڕیین، ئاخۆ دەتوانین لێرەوە بگەینەوە زیدەکەی خۆمان." نیشتمان لەکوێ و ئێرە لەکوێ؟ شەش مانگ ڕێیە. کوا دەگەینێ؟" ئەوانی دیکە هەر زاریشیان نەکردەوە و یەك قسەشیان بە چاك و خراپ لە زاری نەهاتە دەرێ. هەرچی من گوتم و برایم رستی، هیچ مێشێکیشان لێ میوان نەبوو. دوو شەو و رۆژان قسەمان لەگەڵ کردن، چەنەمان چوو، نەماتوانی قایلیان بکەین. شەوێکیان ئەمن و برایم لە جێوبانەکەمان هاتینە دەرێ و وەڕێ کەوتین. هەتا کەرەی بەیانی بە لمستانەکەدا رۆیشتین. کاتێ تاو کەوت، لەو لمەدا خۆمان شاردەوە بۆ ئەوەی کەس نەمانبینێ. بە برایم گوت:"کورە، برایم، ئێمە شتێکمان کردووە هیچ لە جوامێران ناوەشێتەوە. هاوڕێکانمان بەجێ هێشتن و بۆی دەرچووین. جا بگەینەوە ئاوایی،چۆن دەتوانین چاو لە چاوی دایك و باب و ژن و منداڵەکانیان بکەین؟ ئەگەر سۆراغیان گرتن و ئێمە بڵێین لە بیابانی یەمەنێ بەجێمان هێشتن و هاتینەوە؟ بڵێین شوکری خودای گیانی خۆمانمان رزگار کرد؟ باشە چ بڵێین برایم؟ برایم متەقی نەکرد. خۆ دەزانن ئەو زمانی لە زاریدا نییە. گوتم:"مادام وایە، ئەتۆ لێرە وەمێنە با من بگەڕێمەوە و دیسان بچم لەبەریان بپاڕێمەوە. بەشکم بێنە رەدایە. ئەتۆ هەر لێرە چاوەڕێم بە برایم." برایم گوتی:"باشە چاوەڕوانت دەبم." لەوێ لە چەقی بیابانە مایەوە. گوتم:"برایم، ئەگەر حەز دەکەی وەرە پێکەوە بچین." گوتی:"ئەمن ناتوانم ئەو هەمووە ڕێگەیە بەو بیابانەدا بگەڕێمەوە، ئەتۆ برۆ، ئەگەر رازیت کردن هەڵیانگرە و بیانهێنە." چووم. ئەو شەوە هەتا کەرەی بەیانی لەبەریاندا شل و کوت بووم. گوتم:"هاوڕێیان، وەرن بابڕۆین. ئەگەر گەیشتینەوە نیشتیمانی خۆمان، و بۆن و بەرامەی کاژەکانی تۆرووسمان بەسەردا هات و لە ئاوە روون و زوڵاڵەکەی

کانیاوەکانی ئەوێمان خواردەوە و یالآبووکێکمان هەڵکەند و خواردمان، ئەوکات چش با بمرین." بەڵام ئەوان بەهیچ شێوەیەك نەدەهاتنە رەدایە.

ئەمن هەرچی بە پێویستم دەزانی گوتم. گوتم هاوڕێیان کەوابوو ئێمە دەڕۆین و ئێوە بمێننەوە. چاوەڕێی تەواوبوونی خزمەتەکەتان بن. ئێستا ئەوە رێك حەوت ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە. حەوت ساڵی دیکەش چاوەڕێی ئەوە بن هەوییەی سەربازیتان بەدەست بگات. دوایی گەڕامەوە لای برایم. برایم هەروا هەتا قوڕقوڕۆچکەی خۆی لە لمەکە گرتبوو. نەبزووتبوو. گوتم:"یالڵا برایم، با بڕۆین..." برایم گورج لە لمەکە هاتە دەرێ و وەڕێ کەوت. دوای ئەوەی برێك رۆیشتین، ئەمن گوتم:"کوڕە برایم ئەوە دروست نییە." برایم گوتی:"دەی چ بکەین هاوڕێ؟" ئەمن گوتم:" دەبێ جارێکی دیکەش بگەڕێمەوە و لەبەر ئەو برادەرانە بپاڕێمەوە. ئەو داماوانە با لە بیابانی یەمەنێ نەمێننەوە. خزمەتی سەربازی قەت تەواو نابێ و ئەوانە لە خۆڕایی چاوەڕێ دەبن. تەنیا یەکێك دەتوانێ لە یەمەن خۆی رزگار بکا کە هەڵێ. ئەگەر لێیان گەڕێین و بگەڕێینەوە نیشتیمان، خەڵك دایك و خوشکمان دەگێن. منداڵەکانیان دەگریێن و دەڵێن ئەدی بابی ئێمەتان لە-کوێ بەجێ هێشت و بۆخۆتان هاتنەوە؟ برایم گوتی:"ئەوانە بەو هەمووە پاڕانەوەیەی تۆ نەهاتوون، پێت وایە ئەمجارەیان دێن؟ کوڕە وەرە خۆ نەجات دەین. ئەگەر لە داو بکەوین، تێدادەچین.." گوتم:"برایم، دەزانم نایەن، بەڵام ئەرکی مرۆییمان با بەجێ بگەیەنین. بالە ئاوایی رووڕەش نەبین." برایم دیسان هەتا قوڕقوڕۆچکەی خزییەوە نێو لمەکە و بە تووڕەییەوە گوتی:"بڕۆ بپاڕێوە. بڕێکیش ئاو بێنە. وریا بە زێرەڤانەکان نەتبینن." ئەمن دیسان گەڕامەوە و دیسانیش لەبەریان پاڕامەوە، هیچ. بەقسەیان نەکردم. دەست و لاقیانم ماچ کرد، دیسان هەر هیچ. چیی وای نەمابوو بگیرێم. بە دوو بوتڵ ئاوەوە گەڕامەوە لای برایم. گوتم:"ماڵ کاول، برایم، بێ سوودە. هەستە با بڕۆین." و وەڕێ کەوتین. ئەمن دیسان دڵم ئۆقرەی نەگرت و بەخۆمم گوت:"خەلیل، ئەوە تۆ رزگار دەبی، بەڵام برادەرەکانت، هاوولاتییەکانت لە بیابانی یەمەنێ لە نێو ئەو لمە داغەدا بەجێ دەمێنن و دەمرن. بگەڕێوە و بە هەر زمانێکی دەتوانی، هەوڵ بدە قایلیان بکەی و بیانهێنی." ترسی برایم هەبوو. دەمزانی ئیدی ئەو جارە گوێی بەوقسانە نابزوێ و ملی رێگە دەگرێ و دەڕوا. دەترسام. بەڵام چارم نەبوو. نەدەکرا برادەرەکانم بەجێ بێنن و بەجێهێشتینان خەیانەت بوو. دانم بە جەرگی خۆمدا نا

و گوتم:"کوڕە برایم... مەسەلە ئەوەیە ئەمن ناتوانم بڕۆم و ئەوان بەجێ بێڵم. لێم دەگەڕێی جارێکی دیکەش بچمەوە و لەبەریان بپاڕێمەوە؟" برایم تووڕە بوو و گوتی:"بڕۆ جەحەندەم پڕکە. ئەمن چیدی ناتوانم چاوەڕێی تۆ بم. دەی بڕۆ." گوتم"کوڕە بە نۆکەرت بم برایم، هەر جارێکی دیم لەسەر راوەستە." برایم گوتی:"ناتوانم براله، ئەتۆش ئەگەر حەزت لێیە بێنەوە، بگەڕێوە و لەگەڵیان بێنەوە." کوڕە سەیری ئەو نەرم و نیانییەی مەکەن، ئەو برایمە دڵی شێری هەیە. بەتاقی تەنێ وەرێ کەوت و من گەڕامەوە. دیسان لەبەر ئەو هاوڕێیانە پاڕامەوە. کەوتمە سەر دەست و پێیان. دیسان بێ سوود بوو. شەو و رۆژێك رێگەم بڕی و لەو بیابانەدا کە لەکەی دەکوڵی، لە بن دارەخورمایەك گەیشتمەوە برایم. برایم گوتی:"تەواو بوو؟" گوتم:" ئیدی تەواو، نەهاتن. ئەوانە بە قەدەر چۆلەکەیەکیش غیرەت و ئازایەتییان نییە برایم. دەڵێن عەرەب لە رێیە پێشمان دەگرن و ورگمان دەدڕن و ئەگەر بشگەینەوە نیشتیمانەکەمان ئەوە کوێخا دەمانگرێ و دەماندادەوە دەست حوکمەت. حوکمەتیش ئیعدامان دەکا. نەهاتن. بەڵام دڵم هەر بەرایی نادا بەجێیان بێڵم. حەز دەکەم چۆنی بووە قایلیان بکەم و بیانهێنم." پێنج رۆژی تەواو هەر چووم و هاتمەوە و لەبەریاندا شل و کوت بووم. پێنج شەو و رۆژی تەواو. کەوتمە داوی زێرەڤانەکانیشەوە. تەقەیان لێ کردم، خۆم بەنێو لمدا کرد و گرتیانمەوە. ئەمنیش کەرەی بەیانی لە دەستیان رام کرد و بۆی دەرچووم. گوتم:" برایم، ئەوان نایەن. خاکی یەمەن نمەك گیری کردوون و لێرە دەمێننەوە. ئەوان لێرە دەمرن. با بڕۆین."

ئەو شەوە دیسان مرێمۆك کردییە قیامەت. تووڕەیی هەموو گیانی تەنیبۆوە:

- تۆ درۆیان دەکەی یان خەلیل؟ تۆ ئەو هەمووە شەوە بە منت گوتووە کە چۆناوچۆن مام خەلیل برادەرەکانی خۆی بەجێ هێشتبوو و هاتبۆوە و ئەتۆ پێنج رۆژ و شەوان لەبەریان پاڕاویتەوە و ئەگەر مام خەلیل نەبوایە، هەتا قایلت نەکردبان نەدەگەڕایەوە، ئێستا کێهەتان درۆ دەکەن؟

برایم وەڵامی نەدەدایەوە و زمانی نەدەگەڕا.

"ئەو مام خەلیلە؟ ئەو مل شکاوە؟ جگەرەی دەدەیتێ؟ باژەهری مار بکێشێ... ژەهرێك کە ناهێڵێ لە تاوێ بگاتە سیبەرێ. ئەی ئای، خۆ دەیەوێ جگەرەی بداتێ، ئەی ئای؟"

قاتی و قڕی لەو پەڕی خۆیدا بوو. برسێتی و لێقەوماوی و بێکاری... پیاوەکان کارێکمان نەبوو لە گوندی بیکەین. هەرچی هەبوو ژنەکان دەیانکرد. وا لەکاروباری وەرزێری راهاتبوون پیاوان دەسکیان لەدوو نەدەکردن. نیر و ئامووریان لە گا دەکرد و وایان لێ دەخوڕی دەغڵ و دانیان وا دەدوورییەوە و خەرمانیان وا جەنجەڕ دەکرد هەر مەپرسە...

مام خەلیل رۆژێکیان بانگی برایمی کرد و گوتی:"کوڕە برایم، کوا وا دەبێ. هەرچی کار و بارە ژنەکان دەیکەن و ئەمن و تۆ هیچمان بەرناکەوێ، مەگەر بخۆین و بنووین. ئەمن بیستوومە لەو خوارە لە دەوروبەری کۆزان ئەسلان خانێك پەیدا بووە و دەستەیەکی پێك هێناوە. ناوبانگی تا ئەو پەڕی ئەنادۆل ڕۆییوە. لە سەرانسەری ئەو خاکەی عوسمانیدا لە هەر کوێیەك ئەسپێکی رەسەن هەبێ، پیاوانی ئەسلان ئاغا دەیدزن و لە عەرەبستان و لە ئەزمیری کافران و لە کوردستان دەیفرۆشن. ئەو ئەسپەی لە ئەزمیرەوە دزیویانە، لە تەرابۆزان و ئەوەی لە قارس دزیویانە لە حەلَب و ئەوەی لە حەلَب دزیویانە لە قەیسەری دەیفرۆشنەوە. ئەمن و تۆ ڕێگەی حەلَب باش شارەزاین. لەو گوندە کار نییە بیکەین. وەرە بڕۆین و بچینە نێو دارودەستەکەی ئاغا. باشە؟"

برایم وەلامی نەدایەوە. خەلیل گوتی:"بەیانی ئامادە بە برالە، با مریەمۆك کەلوپەلی سەفەرەکەت بۆ ئامادە بکا. بەو جۆرە لە چنگی ئەو مریەمۆکە بەلایەش نەجاتت دەبێ. کوڕە مریەمۆك لە یەمەنیش خراپترە. ئەتۆ یەمەن نەیکوشتی بەلام ئەو مریەمۆکە وەرهەمت پێ هەلدێنێ."

چەند رۆژ دواتر، دوو برادەر، خەلیل لە پێشەوە و برایم لە دواوە، گەیشتنە ئاواییەکەی ئەسلان خان و لە سیر تا پیاز بۆیان گێڕایەوە. ئەوی دارودەستەی ئەسلان خان بوو راکردووی یەمەنێ بوون. ئاغا لەڕێوە ئەوانی وەرگرت. چونکە ئەوان ڕێگەی ئوزوون یایلیان باش دەزانی. چەتەیەکی بە ئەزموونیشی لەگەلّ ناردن بۆ ئەوێ. ئەوان دەیانەویست لە ئوزوون یایلا ئەسپەکانی چەرکەزان بدزن.

لەو رۆژەوە چەندین سالان خەلیل و برایم، لە ئوزوون یایلاوە ئەسپیان بردنە حەلَبێ و لەوێوە پارەیان بۆ ئەسلان خان هێنایەوە. پارەی ئەو ئەسپانەی دەیانفرۆشتنەوە، بەبێ ئەوەی دینارێکی لێ هەلگرن، یەکسەر لەدەستی ئاغایان دەکرد و ئەویش مووچەی سالانەی پێیان دەدا. بەلام چ مووچەیەك... مەمرە و مەژی. هەمووشیانی وەك یەك سەیر دەکرد. بەلام ئەوانە بۆچی لەو گرووپەدا دەمانەوە؟ لەبەر ئەوەی هەمووان راکردوو بوون. تەنانەت کەسانێکیان لە بەندیخانە و لە پەتی سیدارە رایانکردبوو. لەو گرووپەدا گیرسابوونەوە و پالپشتێکیان بۆخۆیان دۆزیبۆوە. ئەسلان ئاغا دارودەستەکەی خۆی دەپاراست.

رۆژێکیان "چەرکەزەکان" مام خەلیل و برایمیان لە داو خست و گرتیانن. ئەوەندەیان تیهەلدان وەیانزانی مردوون، و لەسەر کێوەکە فڕێیان دان و بەجێیان هێشتن. گوندییەك دۆزینیەوە وبردنییەوە گوند. بریندار سێ مانگی رەبەق لەجێ کەوتن. لەو هەمووە سالەی چەتەییکردنیاندا قەت ئەوەندە لە

شوێنێك نەمابوونەوە. جار هەبوو هەر شەش مانگ جارێك بۆ ماوەی چەند رۆژێك سەرێكی ئاوایییان دەدا و بەبێ ئەوەی دینارێك خەرج بکەن ملی رێیان دەگرتەوە و دەرۆیین. مرێموك دەیکردە هەللا و دەیگوڕاند:" باشە ئەتۆ نۆکەری مام خەلیلی؟" و هەموو خەلکی ئاوایی وەسەر دەگێڕا. برایم متەقی نەدەکرد و وەك مێشێکیشی لێ میوان نەبێ وەشوێن مام خەلیل دەکەوتەوە و دەرۆیی.

جارێکیان، دوای دەسپێکی کۆماری بوو و رۆژ بە رۆژ ئەسلان ئاغا لە کزیێی دەداو کەم دەسەلاتتر دەبۆوە، شەوێکیان سەرباز لەرێگەی حەلەبێ و لە "گاووران" برایم و مام خەلیل بە رەوەیەك ئەسپەوە دەگرن. خەلیل و دورسوونە کورد و ئیدریس چەرکەز هەرکامەیان دوو سالیان زیندان بۆ دەبڕدرێتەوە و دەنێردرێنە زیندانی ئەدەنە. ئەگەرچی مام خەلیل هەموو گوناحەکەی بەستۆی برایمدا دێنێ، و ئەویش متەقی لێوە نایە، بەلام هەر نەجاتی دەبێ و مام خەلیل و ئەسلان ئاغاو هەموو چەتەکان و تەواوی ئەوانەش کە دیتبوویان و بیستبوویانەوە سەریان لەو رووداوە سوور دەمێنێ، تەنیا برایم پێی سەیر نابێ. هەمووان پێیان وابوو دوای ئەوەی مام خەلیل دەکەوێتە زیندانەوە، ئیدی برایمیش دەگەڕێتەوە گوندەکەی خۆیان و تا مردن کاری وا ناکاتەوە. هەر لەسەر ئەو گریمانەیەش ئەسلان ئاغا ئیدی مەحەلی ناداتێ وەك بلێی قەت لە دەستەکەی ئەودا نەبووە.

برایم نەگەڕایەوە ئاوایی. تەنانەت بۆ جارێکیش چییە سەردانی ژن و منداڵەکەی خۆی نەکردەوە. لە ئەدەنە مایەوە. تەورێکی دەست دایە و گەڕەك بە گەڕەك گەڕا و دار و چرپیی بۆ خەلك شکاندەوە و هەرچی پەیدای کرد بۆ برادەرە بەندییەکەی برد. لە هەموو چاوپێکەوتنێکیدا زەمبیلێکی پڕ لە سەوزە و ئارد و رۆنی بۆ دەبردە زیندانێ و بەبێ ئەوەی قسەیەکی لە زاری بێتە دەرێ، لەگەل چەند دراوێك، بە بزەیەکەوە دەیدایە مام خەلیل و دەگەڕایەوە. خەلیل هەموو جارێ پێی دەگوت:"برالە خەلیل، بچۆوە ئاوایی، بچۆوە لای منداڵەکان و پێیان رابگە. هێشتا ئەمن زۆرم ماوە بەرێم. تۆ لەو ئەدەنەیە لەو شارە گەورەیەدا لێت دەقەومێ."

خەلیل هەموو جارێ ئەو قسەیەی دەکرد و پێی وابوو ئیدی برایم گەڕاوەتە گوندەکەی و دیسان هەموو دوو شەمووان ـ رۆژی دیدار ـ دەیدی هاتۆتەوە دیدەنی و دلی خۆش دەبۆوە.

برایم لە کۆنە کاروانسەرایەکی شیداری پڕ لە پەین و پالدا و پڕ لە بۆنی میزی ئەسپدا دەنووست. زۆر کەم شتی دەخوارد و تێر زگی خۆی نانی نەدەخوارد و برسێتیی دەکێشا و باقی پارەکەی بۆ خەلیل دەبرد. خەلیل لە بەندیخانەدا، لە سایەی سەری ئەسلان ئاغاشەوە وەك شای دەگوزەراند. برایم نەخۆش کەوت، گرانەتای گرت. لە گڕی تادا دەلەرزی و پەلەقاژەی مەرگی

بوو، بەڵام برادەرەکی خۆی لە بەندیخانەدا بەجێ نەهێشت و نەگەڕایەوە ئاوایی. حەفتەیەکی مابوو برایم لە بەندیخانە بێتە دەرێ، برایم وازی لە کارو ژیانی هێنا و هات لەبەر دەرکی زیندانەکە دانیشت. لە سەرما و گەرمادا لە تەپوتۆزدا هەر لەبەیانییەوە هەتا نیوەشەوێ بۆ ماوەی حەفەتەیەك چاوەڕێ بوو.

کە خەلیل هاتە دەرێ و باوەشیان بە یەکتری دا کرد، برایم لە خۆشییان خەریك بوو بفڕێ. خەلیل گوتی:"بەرەو شاخ..." برایم پێی وابوو مەبەستی "ئوزوون یایلایە". بە شەرمەوە گوتی:"خەلیل برایە، لە مێژە ژن و منداڵمان نەدیون. باشتر نییە لە پێشدا بچینەوە سەرێکیان لێ بدەین جا بەرەو ئوزوون یایلا بڕۆینەوە؟"

خەلیل پێکەنی:"کوڕە لەمەودوا هەر لە گوند وەدەر ناکەوین. ئەسلان ئاغا هەرچی تا ئێستا پێی براونە بەسیەتی. لە دووی چووان مەچۆ. دەڵێن ئیتر یەمەن نەماوە. دەڵێن ئەسلان ئاغاش ئیدی دەستی ناڕوا. با بچینەوە ئاوایی و خەڵك چییان کرد ئێمەش بیکەین. لە نێو ژن و منداڵی خۆمان بژیێن.

گەڕانەوە ئاوایی. خەڵك لە دەوری مام خەلیل و برایم کۆ بوونەوە و گوندەکە گیانێکی دیکەی بە بەردا هاتەوە. لەمەودوا ئیدی کەس نەبوو لەو گوندەدا بەسەرهات و سەربردەی داروودەستەکەی ئەسلان ئاغا و ڕێگەی ئوزوون یایلا و حەڵەب نەزانێ. برایم هەروەك جاری جاران، زمانی لە زاریدا نەبوو. مام خەلیل دەیگوت:"هەتیو ئەو برایمەتان دیتووە، ئەو دنیا پان و بەرینە جەردەیەکی ئاوا بە زیپکوزاکوونی تێدا نییە. ڕۆڵە لەبەر دایك هەڵدەگرێ. لە ئوزوون یایلا یەکێك لە ئاغایان چەرکەزان، ئەسپێکی ڕەسەن و بەهێزی هەبوو، هەر دەتگوت ئەسپەکەی کوێرئۆغلوویە. ئەسلان ئاغا چەندی چەند ساڵان پیاوی ناردبوون ئەو ئەسپەی بۆ بێنن، هیچ کامیان نەیانتوانیبوو بیدزن. ئاغای چەرکەزانیش دوو پێوەندی لە لاقی دەبەست و دەرگایەکی ئاسنیشی لەسەر دادەخست. دوو پیاویشی بۆ دادەنا کە هەموو شەوێ کاتی خەوتنێ دەسبێنیان لە ئەسپەکە دەگرتەوە. ئەو برایمەتان دیتووە؟ هەر ئەو برایمە ئەسپی گۆرینی دزی و هێنای."

مرێمۆك شەوێ لە جیدا دیسان کردییەوە هەڵلا:

ـ یان تۆ درۆزنی یان ئەومام خەلیلە. باشە تۆ کە هاتیتەوە گوند، نەتگوت مام خەلیل ئەسپەکەی ئاغای چەرکەزانی بە پیاوەکانییەوە دزی و هێنانی."

برایم متەقی لەخۆی دەبڕی.

مام خەلیل دەیگوت:"ئەو برایمەتان دیوە؟ ئاخ، ئەو برایمە، دەزانیٚ ریٚگەی حەلەب چەند بەردی لیٚیە. دەزانیٚ شاری میٚرووان چەند میٚرووی تیٚدایە. چۆن دەخۆن و چۆن دەنوون و چۆن دلٚداریٚ دەکەن و چییان هەیە شیاوی دزینیٚ بیٚ. ئەو برایمە دنیا لە سەر پەنجەیەکی دەخولیٚنیٚتەوە و ناشهیٚلیٚ کەس بزانیٚ. ئەو برایمە رەوە ئەسپیٚکی سیٚسەت سەری، بەرۆژی رووناك لە بازاری ئەدەنە دیٚنیٚتە دەریٚ و نایەلیٚ کەس بیانبینیٚ. کەس نازانیٚ خۆی دەکاتە جنۆکە و پەری یان شەیتان، مەسەلە ئەوەیە کەس نایبینیٚ. ئەو برایمە پیاویٚکی ئاوایە. ئەمنیش قەدری باش دەزانم لە لای ئەو سەرم پیٚوە نییە. هەموو کەس لیٚی دەقەومیٚ. برایمیش لیٚی قەوما. ئەو دەمەی رەوە ئەسپیٚکی دەبردە حەلەبیٚ، لەگەلٚ برادەرەکانی گیران. ئەمن و هاوریٚیانی دیکەمان بەربووین. بەلاٚم چونکە برایم سەردەستەمان بوو، دوو سالٚیان زیندان بۆی بریبەوە. برادەرەکانی دیکە بلاٚوەیان کرد و وەشویٚن کاری خۆیان کەوتن. بەلاٚم چما ئەمن دەمتوانی برۆم؟ برادەری گیانی بە گیانیی من لەویٚ لە زینداندا دلٚی دەتۆقی. پیٚویستیی بە شت دەبوو. ئەمن تەوریٚکم کری و دەستم کرد بە دار شکاندنەوە. دەمم لە هیچ نەدا و زەوادم نەشکاند و هەرچی پەیدام کرد دوو شەمووان کاتی دیدەنی هەموویم لە دەستی برایم کرد. لە زیندانیٚش، هاو ژوورەکانی برایم، پیٚیان دەگوت:"کورە برایم ئەوە برادەر نییە، لە برای دایی و بابیش زیاترە." وا نییە برایم؟"

برایمیش وەك بلٚیٚی قسەکەیان پشتراست بکاتەوە، سەری بەردەدایەوە و دلٚی خۆش دەبوو.

"حەوتووەکی مابوو برایم بەربیٚ، ئەمن ئیدی دەستم بۆ کار نەدەچوو چونکە برادەری گیانی بە گیانیم لە زیندانیٚ بەردەبوو. چوومە بەر دەرکی زیندانیٚ و یەك حەوتوو شەو و رۆژ چاوم لە دەرگای بەندیخانەکە بری و چاوەریٚی بووم. لە بن لیزمەی باران و تەپوتۆز و گەرمای سووتیٚنەردا لەویٚ مامەوە ونەبزووتم. دەتگوت بە چل گوریس لە دەرگای بەندیخانەکەیان شەتەك داوم. ئاخری رۆژیٚکیان لای نیوەرۆیە بوو هاتە دەریٚ. وەختابوو هەلٚفرم لە خۆشییان. برایم چاوی لە چاوەکانم بری و گوتی:"هەر بژی خەلیل، ئەو برادەرەی دەبیٚ گیانی بەقوربان بکەی ئەتۆی." وا نییە برایم؟"

برایم بە پیٚکەنینەوە بە سەر لەقاندنیٚك بۆی سەلماند.

مریٚمۆك گوتی:"

ـ تۆ درۆزنی. مەگەر نەتگوت ئەمن چاوەریٚی مام خەلیل بووم؟ لەمەودوا باوەر بە یەك قسەشت ناکەم.

برایم سەری بەردایەوە و هەڵینەهێنا.

"یاخوا ئەو مام خەلیلە بە قوربانی سمی ئەسپەکەم بێ. یاخوا بە قوربانی گەندەموویەکی گوندییەکانی من بێ. برایم بەستەزمان و شەرمنەکەی منی لەبەر چاوی ئەو خەڵکە کردە پیاوکوژێکی خوێنمژ. یاخوا بە قوربانی پاکەتە جگەرەیەك بێ."

داروودەستە چەتەکەی ئەسلان ئاغا وردە وردە کەم بوونەوە. پێم وایە هەر تێدا چوون. ئەوەی دیارە ئەوەیە کە خەلیل و برایم ببڕای بڕ نەچوونەوە ریزی ئەو کافرانە. کاری لۆکە چنینەوە لە چوکووراوا دەستی پێ کردبوو. دوو سێ ساڵ بوو گوندییەکان دەچوونە لۆکە چنینێ. چیی ژن و منداڵ و ئەسپ و گوێدرێژ و سەگ و پشیلە بوو لەگەڵ خۆیان دەیانبرد و زیندەوەریان لە ئاواییدا نەدەهێشتەوە. خەلیل و برایمیش لەگەڵ ئەوان دەچوونە چوکووراوا. بەڵام یا زۆر زووتر یان دوای هەموو گوندییەکان هەتا دوای لۆکە رنینەوە و گەڕانەوەیان بۆ گوند لە هیچ کوێ نەیاندەدیتن. ئەوان بەرەو خوارەوە دەڕۆیین و دەچوونە وڵاتی یورێیەر و تەنانەت دوورتریش دەچوونە تەرسوس و، خەلیل دەیگوت: برایم دزیی دەکرد، ئەو لۆکەیەی دەیاندزی، سواری عارەبانەی تایە چێوییان دەکردن و دەیانبردە بازاڕی ئەدەنە بۆ فرۆشتنێ. دەیانفرۆشت و باغەڵێك پارەیان پێ وەردەگرت و هەر هەمووشیان خەرج دەکرد جا دەگەڕانەوە ئاوایی. هەتا دوو ساڵ پێش مەرگی برایمیش هەر وا بوو.

ئەو شەوە خەلیل جەواڵێکی پڕ کردبوو لە لۆکە و لە کێڵگەکانەوە و بە نێو خەندەکێکی پڕ لە ئاودا بەرەو تەرەسۆسی دەبرد. قەرار بوو دەمەدەمی بەیانی بچێتە دەم ڕێگەکە و جەواڵە لۆکەکە سواری یەکێك لەو عارەبانانە بکا کە بەوێدا تێدەپەڕین و بیباتە گوندی. دەستکەوتێکی باش بوو. تا ئێستا بەسەر مەزرای ئەوا بەپیت و بەرەکەتدا نەکەوتبوو. سووك و ئاسان جەواڵەکەی لەو خەرمانە لۆکەی هیچ کەسی لا نەبوو داگرتبوو و وەڕێ کەوتبوو. بەڵام لە بەدبەختی نیو سەعات دوای ئەوەی لە مەزراکە دوور کەوتبۆوە، تووشی گوندی و خاوەن لۆکە دەبێ و دەیگرن. لە چوکووراوا سزای لۆکە دزین قورس بوو. دزیان نەدەدایە دادگا و شتی وا. پەتێکیان لە ئەستۆی دەکرد و هەر بە کۆڵەبارەکەیەوە گونداوگوند دەیانگێڕا و لەهەر گوندەی دەیانبردە گۆڕەپانی دێیەکە و هەموو خەڵکەکەیان بە منداڵ و گەنج و پیرەوە لێ کۆدەکردەوە و تفیان لە رووی دەکرد.

ئەو دەمەی مام خەلیلیان گرت، ئەوەندەیان پێ خۆش بوو هەر مەپرسە... شاگەشکە ببوون. ئەو دزە کۆڵێکی گەورەی بە کۆڵەوە بوو. کەس شتی وای پێ هەڵنەدەگیرا. دزەش چوارشانە و بەخۆوە و ئەوجار بەتەمەنیش بوو. برادەرێکیشی بە دواوە بوو، شەرمن و بەستەزمان. هەر لەوێ پەتەکەیان لە

ئەستۆی مام خەلیل کرد و لەرێوە بردیانە نزیکترین گوند. لەوێ بە تف سواغیان دا. کوڕە ئەو خەڵکەی چوکووراواش تفێکی سەیریان هەیە، شەیتان بە لەعنەت بێ. سەر و چاو و جلوبەرگەکەی بە تف خووسا. دوایی بردیانە گوندێکی دیکە، دیسان یەکێکی دیش... لەوێشەوە بۆ دێیەکی تر...
خەلیل ئەژنۆکانی تەزین و خەریك بوو بشکێن. گیانی دەبەردا نەمابوو بەڵام هەر بەرەڵلایان نەدەکرد. چوار رۆژان خەڵکیان لێ دەنگدا تفی پێدا بکەن. خەلیل خەریك بوو گیانی دەدا و ئیدی لە بنیادەمان نەدەچوو. کۆڵەکەیان لە پشتی کردەوە و بەرەڵلایان کرد. مام خەلیل کە لە گوندەکە هاتە دەرێ، دەستی برایمی گرت و گوتی:
- براڵە، تۆبە لە لۆکە دزینێ. ئەو گووە بە ئێمە ناخورێ. تۆبە، تۆبە، تۆبە براڵە.
برایم گوتی:
- تۆبە.
کە گەیشتنەوە ئاوایی، بەرەبەری زستانێ بوو. ئیزگیل رزیبوو و نەمابوو.
مام خەلیل دەیگوت:
- ئیدی دوای ئەوە برایم تۆبەی لە لۆکە دزینێ کرد. جا دەیتوانی تۆبەی نەکا؟ پەنجا پووت لۆکەی بە کۆڵەوە بوو، پەتیان لە ملی کرد و گوند بە گوند گێڕایان و بە تف سواغیان دا. ئەوەندەیان تف پێدا کردبوو، خەریك بوو بخنکێ. حەوتووەکی تەواو خەڵکی پەنجا گوند بە هەموو ئەسپ و ئێستر و سەگ و پشیلەیانەوە و بە هەموو پیاوەکانیانەوە تفیان بە برایمدا کرد. خودا بەسەر کەسی نەهێنێ.
ئەو جارە مرێمۆك پرسی:
- خەڵکی پەنجا دێ تفیان لە چڕ و چاوی خەلیل کرد؟ حەوتووەکی تەواو تفیان پێدا کرد؟ ئەی لەو داماوە، ئەی چییان لەتۆ کرد؟
برایم بێ دەنگ بوو.
بەو جۆرە بوو کە هەمووان برایمیان وەك چەتەیەکی بە زیپك و زاکوون دەناسیو پێشیان وابوو مام خەلیل مێشی لە زاری خۆی پێ دەرناکرێ.
"ئەمرد ئەو بەرازە چاو شینە. ئاخ نەتەقی. لەبری جگەرە با ژەهری مار بکێشێ، ئەو ژەهرەی ناهێڵێ لە تاوێ بچیتە سیبەرێ...؟

# ١٤

دەمێك بوو لە خەوێ هەستابوو و بە دڵەكوتەوە چاوەڕێی تاوهەڵاتن  و لەخەو هەستانی مێردەكەی بوو. دڵەخورپە و هەڵڵا و ژانێكی لە ناخیدا بوو. پانێی قەڵیشیبوون و پڕ ببوون لە خۆڵ و دەبرژانەوە. لاقەكانی كۆكردبوونەوە ولە چیلكەیەك خۆڵ و وردكە زیخی لە قەڵشتی لاقەكانی دێنایە دەرێ. جارویارەش دادەهاتەوە و سەیرێكی دەموچاوی مێردەكەی دەكرد كە لە نزیكییەوە نوستبوو.

عەلی ملێكی درێژی هەبوو و هەر دەهات و درێژتریش دەبۆوە. چاوەكانیشی وردە وردە زەقتر و گەورەتر دەبوونەوە. هەركەس چاوی بە چاوە زەقانەی كەوتبایە زەندقی دەچوو.

بیری كردەوە:"مندالەكانم لە پێ كەوتوون. ئەگەرنەخۆش كەون و نەتوانن بە ڕێیەدا بڕۆن دەبێ قوڕی كوێ وەسەر كەین؟

"مریەمۆكیش تۆزێكی لێ ماوەتەوە، هەركەسی دیكە لە جێی ئەو بایە، لەمێژ بوو مردبوو. جارێ هەر ململانێیەتی. بەلام ئەی ئەگەر لەوە پتر خۆ ڕانەگرێ؟...

"هێشتا هەورازەكەی "سولەیمانلی"مان لە پێشە. هەورازێكی رژد و قیت. لە خوارێوە كە سەیری دەكەی ناتوانی لوتكەكەی ببینی. وەسەركەوتن لەو هەورازە رۆژێك هەتا ئێوارێ دەخایەنێ. هەر كاتێك كاروانەكە دەگەیشتە ئەو هەورازە، هەمووان لە خوارەوە دەستەوئەژنۆ دادەمان. نەخۆش و پیروپەككەوتە بۆ ئەو هەورازە بەلای لابەلا بوون.

"ئەو هەوارزە ببڕێ وەك ئەوە وایە گەیشتبێیتە چوكورر. ئیدی دوای ئەوە نشێوە و رۆژێك پتر ناخایەنێ.

"دوای ئەو هەموو ماندوویەتی و چارەڕەشییە چۆن دەكرێ لەو هەورازە وەسەر كەوی؟ بنیادەمی ساغ و سلامەت و گەنج ناتوانێ بە ئاسانی لێی سەركەوێ، چ بگا بە عەلی كە هەم كۆڵێكی بە پشتەوەیە و هەم دەبێ دایكیشی لەكۆڵ بكا."

چاوێکی دیکەی لە عەلی کرد. ڕەنج و تێکسمڕاویی روخساری لە بوولێڵ و تەنانەت لە خەویشدا بەدی دەکرا. روخسارێکی ببووە یەکپارچە ژان و ئازار.

"ئەگەر نەتوانین هەورازەکە ببڕین و هەر لەو خوارە بکەوین و بمێنینەوە؟... عەلی بیری لە هەورازەکە نەکردووەتەوە. دەی باشە با لەو حاڵەدا وەبیری نەیەتەوە... بەخوای خۆی دەکوژێ. خوا نەکا یەکێك سولەیمانلیی وەبیر بێنێتەوە."

بۆنێکی شلەتێنی بەرلووتی کەوت:"بۆنی خاك. هەر ئەو بۆنەی بە دوای ڕێژنە بارانێکدا لە خاك هەڵدەستێ. ئەلیف تەنیا لە چوکووراوا ئەو بۆنەی بۆ دەهات.

"ئەگەر ئەو هەورازە تووکلێراوە نەبایە، ئیتر شتێکی وامان نەدەما بۆ چوکوور. ئەگەر ئەوەندە بخایەنێ، خواردن و پێخۆریشمان لێ دەبڕێ. ئەویش لەو چیا و چۆڵەدا کە چۆلەکەکوژی لێ دیار نییە.

"عەلی بۆ ئەوەی لابڕ بڕوات، ئاوا لای دا. خۆ ئەو ڕێگا لابڕەش تاقە ریبوارێکیشی پێدا نایە. بشمرین لێرە کەس نییە چۆڕێ ئاومان بە دەمەوە بکا. ئێستا خەڵك وەك خێز و خۆڵ بە راستە ڕێیەکەدا دەڕۆن. ئەمساڵ نەهاتمان بوو. بەڵا نەما بەسەرمان نەیە."

تاو رمبێك هاتبۆ سەرێ. گژوگیا زەرد و تەڕەکان دەبریسکانەوە. تیرۆژە خۆرێکیش کەوتبووە سەر نێوچاوانی عەلی. ئەلیف کە تیشکە تاوەکەی لەسەر نێوچاوانی عەلی دی ترسا:"ئێستا هەڵدەستێ و دەیکاتە رۆژی حەشر و دەنەڕێنێ و دەڵێ دەبارێ و جا وەك شێتان بەرەو چوکوور غار دەدا."

هەستا. چوو و بەر تاوەکەی گرت و سیبەری لە روخساری عەلی کرد.

مرێمۆك بڕێك لەولاترەوە، لە بن دار بەڕوویەك لە نێوەڕاستی منداڵەکان گرمۆڵە ببوو و وەك گلۆڵە بەنێك کۆ ببۆوە. جووڵەی نەبوو. دموچاوی بە بالیفەکەدا رۆچوبوو و دەتگوت پشوو ناکێشێ.

ئەلیف بیری کردەوە:"هەر بەراستی نەکا هەناسەی نەیە." دەرپەڕی و چووە لای. داهاتەوە و سەیری دموچاوی کرد و دیتی بەسپایی هەناسەی دێ. گوتی:"دامـاوە." گەڕایەوە و دیسان سیبەری لە دموچاوی عەلی کردەوە.

"ئەو کابرایە لە خۆوە خۆی ماندوو دەکا. لە خۆڕا خۆی دەکوژێ. تازە کوا دەگەینە چوکوور و پەمۆ رنینەوە؟ ئەویش بەو قوونە خاوێنەوە".

لەسەر ڕەوەزەکانی لای راستییەوە دەنگی خشەخشێك بەرز بۆوە. باشوویەك پەلاماری پۆلە کۆترێکی دابوو و بەولاولادا راوی دەنان. ئەو ململانێیە ماوەیەکی خایاند. کۆترەکان ماوەیەکی

زۆر بە حەواوە مانەوە و تەقڵەیان لێدل. باشووەکە دوای ئـەوەی کـۆترێکی گـرت، ملـی ڕێیـەی گرت و ڕۆیی و کۆترەکانیش ماندوو شەکەت لە چاوان ون بوون.

لەو جەنگەیـەدا عـەلی لـە ناکـاو لـە جـێ دەرپـەڕی. ماوەیـەك گێـژ و وێـژ، وەك شـێتان، بەلاداهات و ئەوجار راوەستا. چاوەکانی هەڵگلۆفین و بەسەرسووڕماوییەوە سـەیری دەوروبـەری خۆی کرد. کە ئەلیفی بینی وەخۆی هاتەوە. بەرەو کانییەکە رای کرد و بە پەلەپەل چەند شـڵپە ئاوی بە دەموچاوی خۆیدا کرد و گوتی:" یاڵلا ژنەکە، بارگەوبنەکە بپێچەوە. نا، نا، تۆ خرپـان مەکەوە تۆ ئاگرەکە بکەوە و ترخێنەیەك وەسەر بنێ. ئەمن ئەمجارەیان دایکم بەجێ ناهێڵم. لـە پێشدا ئەو دەبەم و لە پێشەوە دایدەنێم و دەگەڕێمەوە. ئەدی ئەوە کوا؟

ـ ئەلیف گوتی:

ـ بێ دەنگ بە، خەوتووە. بێ دەنگ بە.

ـ عەلی گوڕاندی:

ـ ئەو خەوە سەری بخوا... با هەستێ.ماڵوێرانی کردم. ئەمساڵ منداڵەکانی قڕ کرد. تـازە خەوتووە! با هەستێ.

ئەلیف چووە لای و پیلی گرت و گوتی:

ـ لە دەورت گەڕێم عەلی، تۆخودا بێ دەنگ بە. دایکتە. ئەو ژنە داماوە هەتا بەیانی هـەر نالاندی. بەرەبەری بەیانی خەوی لێ کەوتووە. بێ دەنگ بە. لە سەرت گەڕێم عەلی.

ـ چ بێ دەنگ بە بێ دەنگ بەیەك؟ دەی بێ دەنگ بە! ئەو ژنەتیوە مـاڵمی وێـران کـردووە. جا ئەوجار راوەستم و چاوەڕێی لەخەو هەستانی بم. ناتوان تا ئێواری چاوەڕێی ئەو بم. دەچم هەر دوو پەلی دەگرم و...

پیلی لە دەست ئەلیف راپسکاندن. بە خێرایی بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیی کە مرێمۆك لێی خەوتبوو. ددانی لە چێرەوە بردن. ئامادە بـوو هـەر دوو پـەلی بگرێـت و لـە جێوبانەکـەی بیکێـشێتە دەرەوە و فڕێی بدا. رێك لەو کاتەدا کە ئەو کارە پڕ لە تووڕەییـەی بـە مێـشیکدا دەهـات، چـاوی بـە دایکـی کەوت کە لە نێوان منداڵەکاندا خۆی گرمۆڵە کـردووە و ژاکـاوە و وەك تووڕەکەیـەك کـۆ بووەتـەوە و نیوەی دموچاوی بـە بالیفەکـەدا رۆچـووە، هـەر لەگـەڵ چـاوی پێـی کـەوت، گریـان ئـەوکی گـرت و گەڕایەوە و لەولاوە خۆی بەسەر تاتەبەردێکدا شۆڕ کردەوەو سەری بەردایەوە.

خۆر تەواو بە ئاسمانەوە بەرز ببۆوە و هەموو وڵاتی گەرمدا هێنابوو. گیا زەردهەڵگەڕاوەکان وا درەوشانەوە کە دەتگوت ئەوێ چوکووراوایە. خاك وەك خاکەکـەی چـوکووراوا قـەڵش قـەڵش

ببوو. عەلی ڕێك چوکووراوای هاتەوە پێش چاو:لەم سەرەوە بۆ ئەو سەری، زەوییەکە ڕێك و ساف و سپی وەك دنیایەك. پاڵەی پەمۆ ڕنینەوە، وەك مار و مێروو بەو سپیاییەوە خۆیان مەڵاس داوە و خێراخێرا لۆکە کۆ دەکەنەوە.

بە دەنگێکی بەرز گوتی:

ـ ماڵم وێران بوو.ئاگری گرت و بووە قەقنەس.

چەند جارێك هەوڵی دا هەستێ و نەیتوانی. نێو شان و پشتی و نێوقەدی تەواو هەستیار ببوون. خۆ ئەگەر بەو کەفوکوڵەی هەوەڵییەوە دایکی بەخەبەرهێنابایە، لەکۆڵی دەکرد و دەڕۆیی. بەڵام ئێستا گیانی هەر بەخاو دەکەوت و شل دەبۆوە. ئەگەر خۆی دابایەتە دەست ئەو ژان وئازارانە، بەو لاقە بەژان و کون کونانەوە، ڕاکشابایە، هەتا سێ شەو و ڕۆژان بەخەبەر نەدەهات.

"بۆ چەندی ماوە بۆ چوکووراوا؟ زۆر زۆری مابێ سێ ڕۆژ، نەخێر چوار ڕۆژ. گوندییەکانیش زۆر بەپەلە و خێرا ڕۆیبێن، چوار ڕۆژی دیکە دەگەنە چوکوور. دوو ڕۆژیش لە سۆیوتلۆ ڕادەوەستن و چاوەڕێی بەکرە شێتی گەووادی زۆڵ و تووتکە سەگ دەبن. ئەوەش شەش ڕۆژ... هەر شەش ڕۆژمان ماوە. دەبێ بگەینێ.

و بانگی ژنەکەی کرد کە خەریك بوو مەنجەڵەکە وەسەر ئاگرەکە بنێ:

ـ ئەلیف وەرە ئێرە. وەرە و ئەوەم بۆ هەستێنە دەڵێی خەوی مردنێیەتی. هەر شەش ڕۆژمان ماوە. گوندییەکان ڕێك ڕۆژی شەشەم لە چوکووراوان.

دیسان دەرپەڕییەوە:

ـ هەڵیستێنە ئەلیف، هەڵیستێنە...

ئەلیف پێی بە عەرزییەوە ڕەق ببوو و دیسان چاوەکانی لە ترسان زەق ببوونەوە.

ـ چییە بۆ ڕاوەستاوی کافر؟ برۆ بەخەبەری بێنە دەبی.

بە تووڕەییەوە پەلاماری لای مرێمۆکێی دا.

ـ جا بزانە بنیادەم چۆن بەخەبەر دێنن. سەیر کە.

هەر وا بەو تووڕەییەوە بەلای مرێمۆکدا داهاتەوە بەڵام خێرا کشایەوە. دیسانیش دایکی بە ڕوخسارە ژاکاو و پڕ لەچرچ و لۆچەکەیەوە دیتبوو کە بە بالیفەکەدا ڕۆچووە و وەك مندالێکی پاك و بێ گەرد لێی خەوتووە.

بە گوڕەگوڕ لە ژنەکەی چووە پێش:

ـ هەڵیستێنە، هەڵیستێنە دەی، ئەوەم بۆ هەستێنە...

ئەلیف چاوە گەورەکانی زەق ببوون و نە جووڵەی کرد و نە قسەیەکیشی کرد...

ـ ئەوە چیتە؟... هەڵیستێنە. منداڵەکانم لەبرسان مردن. نافامی؟ لای گوندییەکان حەیام چوو. ئەوە هەستێنە...

لە ناکاو گەڕایەوە.

ــ خودا ئەتۆش بەرێتەوە. کوڕە خۆ هەمووان کلکیان لێك گریداوە سەری من بخۆن و بمکوژن.

گەیشتە ژوور سەری دایکی، دیسان ڕاوەستا. لەو کاتەدا منداڵەکان لەولاولای دایکییەوە بەخەبەر هاتبوون و دانیشتبوون. چاوەکانیان هەڵدەگلۆفین و خۆیان هەڵدەکڕاند.

پیلی منداڵەکانی گرت و هەریەکەی بۆ لایەکی فڕێ دان.

ـ ئەنگۆ سەری من دەخۆن.

منداڵ نەیانزانی چ باسە. دایانە گریان. دوایی عەلی بەهەموو هێزی خۆیەوە دەستی کرد بە گوڕاندن. زۆر ترسناك دەیگوڕاند و دەنگەکەی لە ڕەوەزانەوە دەگەڕایەوە:

ـ هەڵناستێ، هەڵناستێ، هەڵناستێ.

و هات و دیسان هەر لەسەر تەختەبەردەکە لێی دانیشتەوە.

ـ هەڵناستێ، ئەلیف بچۆ سەیرێکی بکە.

و بە دەنگێکی گریاناویوە لەسەری ڕۆیی:

ـ بزانە هەناسەی دێ؟ نەکا شتێکی لێ هاتبێ.

ئەلیف سارد و سەرسووڕماو تەکانێکی لەخۆی دا و بەرەو مرێمۆك ڕۆیی و بەسەریدا نوشتایەوە و گوێی هەڵخست.

عەلی خۆشییەکی لەدڵی گەڕابوو و دەتگوت بارێکی قورسیان لەسەر شانی لابردووە، هەستی بە هێمنییەك کرد و چاوەڕێی جوابی ئەلیف بوو.

ئەلیف گوتی:

ـ جوان هەناسەی دێ. بەستەزمانە بێ خەویی چاشتووە. بۆیە بەخەبەر نایە. دوێنێش هەر وەك خۆت گوتت لە بەیانییەوە تا شەوێ بە پێیان ڕۆیوە. ئەو لێقەوماوە کوا توانای ڕێگە ڕۆییشتنی.

عەلی، وەك چەقۆیەکیان لێ دابێ، هاوارێکی هیوابڕاوانەی کرد:

- کچیێ ماڵم وێران بوو ئەلیف، تێدا چووم. مردم. ژن و منداڵەکانیشم تێدا چوون.

چێشتەکە ئامادە بوو. دانیشتن و خواردیان و بەشی مریەمۆکێشیان بەلاوە نا. مریەمۆک هەڵنەستا. نیوەڕۆ داهات، عەسر داهات و مریەمۆک هەر بەخەبەر نەهات. عەلی هەر جینگڵی دا، شێتانە جینگڵی دەدا و هاواری دەکرد و جوێنی دەدا بەڵام مریەمۆک هەر هەڵنەستا. عەلی لە داخان پشووی سوار ببوو. دەست و پێی دەلەرزین: گوتی:

- ژنەکە، بچۆ ئەوە هەستێنە. ئەگەر هەڵینەستێنی، سەری خۆم هەڵدەگرم و لێ دەدەم دەڕۆم.

لە ناکاو شتێك بە مێشکی داهات و بە بێ تاقەتییەوە رووی لە ژنەکەی کرد و گوتی:

- کوڕە ئەمن زۆر گەوجم ها. باشە بۆ لە بەیانییەوە بە مێشکمدا نەهاتووە؟

هیور بۆوە، تووڕەییەکەی نەما و بزەیەکی هاتێ:

- با ئەو پیرەژنە چۆنی لێی خەوتووە با هەر وابێ. ئەتۆ بارگەوبنەکە بپێچەوە با هەلگرین و بڕۆین و ئەو بخەوێ. ئەمن ئێوە لە هەوارگەکەی دوایی دادەنێم و دەگەڕێمەوە و دەیهێنم. بۆ نابێ؟ بارگەوبنەکە بپێچەوە.

ئەلیف پیلی مێردەکەی گرت و لەبەری پاڕایەوە:

- عەلی نەکەی، کاری وا نەکەی، لەسەرت گەڕێم، ئەگەر هەستێ و پێی وابێ بەجێمان هێشتووە، دیق دەکا. ئەی ئەگەر شەوێ خەبەری بۆوە؟ وا نەکەی عەلی.

عەلی کە گیانێکی وەبەر هاتبۆوە، سەیرێکی ژنەکەی کرد و هاواری کرد:

- کۆی کەوە، کۆی کەوە. باروبنەکەت خڕ کەوە بزانم.

چاوی لە ژێللا هاتبوون. ئەلیف ترسا. دەستی کرد بە کۆکردنەوەی باروبنە و کەلوپەلەکەی. منداڵیش یاریدەی دایکەکەیان دەکرد. عەلیش لە لایەکی دیکەوە، بەپەلەپەل وردەشتەکانی کۆ دەکردەوە تێکی دەنان. کۆڵەکەی بە پشتی خۆیدا دا. هەموو گیانی زریکاندی بەڵام وەسەر خۆی نەهێنا و گوتی:

- وەڕێ کەون.

ئەلیف لەسەر سەری مریەمۆک وێستابوو. لە ناکاو دایە گریان. نووشتایەوە و لە تەنیشتی هەڵترووشکا و بە میهرەبانییەوە دەستی لەسەر نێوچاوانی پیرەژنەکە دانا:

- هەستە دایە. هەستە چارەڕەشە بێ کەسەکەم. هەستە بزانە خەریکین بەجێت دەهێڵین و دەڕۆین. هەستە، مەرگت بە ئاوات دەخوازین. تووك و دووعای مردنێت لێ دەکەین و دەپاڕێینەوە لە دەستت نەجاتمان بێ، هەستە.

عەلی بە تووڕەییەوە ئاوڕی دایەوە و حەزی دەکرد شەقێك لـە کەلەکـەی ژنەکـەی هەڵبـدا، دیسان چاوی بە نێوچاوانی ئارەقەکردووی دایکی کەوت. روخساری مرێمۆك درێژ ببۆوە.

ئەلیف دیسان نووزایەوە:

ـ عەلی مەڕۆ. ئێستا بەخەبەری دێنم... دایە، دایە، هەسـتە، دایـە گیـان، ئێوارەیـە، رۆژ ئەوە ئاوا دەبێ.

بە ئەسپایی رایدەوەشاند، لە ناکاو هەڵیستاند و داینیشاند:

ـ هەستە دایە گیان، کاتی رۆیینە.

مرێمۆك چاوەکانی کردەوە و چاوی لە چاوەکانی ئەلیف بڕی و وڕ ما.

ـ دایە گیان، ئێوارەیە.

مرێمۆك پرسی:

ـ ئێوارە؟

سەیری خۆری کرد و دیسان پرسییەوە:

ـ رۆژ ئاوا بووە؟...

ئەلیف ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ بەڵێ!

مرێمۆك هەوڵی دا هەستێ. ئەلیف بن پیلی گرت و هەڵیستاند و بەرەو دەوەنەکان رۆیشتن. مرێمۆك لەوێ خۆی بەتاڵ کردەوە. ئەلیف دڵی خۆش بوو. هەرای کرد:

ـ دایە، لەتە پەنیرێکم دۆزییەوە و بۆم داناى. پیوازێکی سووریشمان هەیە. بە دەردی بەکرە شێت پیوازی سوور شیفایە. ترخێنەشم بۆ دانابووی حەسەن لێی خواردی.

مرێمۆك کە لەسەر کانییەکە دەموچاوی دەشوشت، لەبەرخۆیەوە بیری کردەوە:" ئـاخۆ ئـەو دەمـەی براییش لە یەمەنێ دەگەڕایەوە و گەیشتبووە ئێرە، وەك من پشووی لێ بڕابوو و ئاوا داما بوو؟"

ئەوجار هاتو لەسەر ئەو سفرەیەی بووکەکەی بۆی راخستبوو دانیشت. بە زارە بێ ددانەکەی وردە وردە پاڕووەکانی جوی و بە دووی هەر پاڕووەکـدا چـۆڕێ ئـاوی خـواردەوە و خواردنەکـەی تەواو کرد و هەستا و بەبێ ئەوەی لەبزی دەلەبزی کەس بگەڕێ بە لارە لار وەڕێ کەوت. ئەلیف و عەلی لە دواوە سەیریان دەکرد.

مرێمۆك لە نواڵەکە تێپەڕی و رۆیی. عەلی شـەپۆلێکی شـادیی لـە دڵـی گـەڕا. چیی وای نەمابوو شمشاڵەکەی دەربێنێ و تێی تووڕێنێ و هەوایەکی هەڵپەڕینێ لێ بدا و سەمایەك بکـا.

خۆشەویستیی دایکی لە دڵیدا زیندوو بۆوە... حەزی دەکرد دەستی لە ئەستۆی بکات و سەروچاوی ماچ بکا:

- ژنەکە، ئێوە لێرە راوەستن. با ئەمن لەگەڵی برۆم. نیوەشەوێ دەگەڕێمەوە.

خێرا خۆی گەیاندە دایکی و لە پێشی هەڵتووتەکاو گوتی:

- وەرە دایە گیان، وەرە کۆڵم با برۆین. شەش رۆژی ماوە گوندی بچنە نێو کێڵگەکانەوە و چاردە رۆژیشی ماوە بۆ لۆکە پشکووتنێ... بەوەندەیە دەگەینە بوغازچاناقیش... تەنانەت گوڵی بۆلۆش...

مرێمۆك دارەکەی سووڕاندەوە و لێی لادا و بێ ئەوەی سەیری بکا لێی تێپەڕی و بەبێ ئاوڕدانەوە ملی رێیەی گرت. عەلی ماوەیەك هەروا بە هەڵتووتەکاوی لە چەقی رێیەکەدا مابۆوە. پشتی ترسابوو و لەو ساتەدا کە لەبەردەم داکیدا هەڵترووشکابوو، هەموو گیانی لەخۆوە زریکاندبووی. کە دایکی نەچووە کۆڵی، دڵی خۆشتر بۆوە. هەستا و گوتی:

- دایکی دایکا، دایکی دایکان، هەرچی دایکە بە قوربانت بێ. ئەتۆ زۆر باشی، بێ وێنەی. ئەمن قەدری تۆم نەزانی. ئەو مام خەلیلە بەرازەم نازانم بۆ سواری ئەسپەکەی تۆ کرد ئەو ئەسپەم لێ کوشتی کە دەتگوت گوڵە و ساغ و سەلیم بوو و دە ساڵی دیکەش دەژیا...

لە دوایدا غاری دا و لەسەری رۆیی:

- دایە، خاتوونی خاتوونەکان، دایکە رەسەنەکەی من، من خراپەم زۆر لەگەڵ کردووی. ئێستا باش دەزانم ئەمن ئەسپەکەتم کوشت. ئەمن ئەتۆم ئاوارە کرد. ئەگەر مام خەلیلی بێفەڕی چاو ماری پێڕەشم سواری ئەسپەکەت نەکردبا، ئەسپەکەت نەدەمرد و ئێمەش ئاوا ئاوارەی چیاوچۆڵان نەدەبووین. لەگەڵ ئەوانیتر دەگەیشتینێ و دەستمان دەکردە لۆکە رنینەوەی. ئەو مام خەلیلە بوو بە سەبەب.

مرێمۆك گورگ ئاوڕێکی دایەوە و سەیرێکی عەلیی کرد. لەوەتا ئەسپەکەی مردبوو، ئەوە یەکەم جاری بوو سەیری عەلیی دەکرد و یەکەم جاری بوو دەیدی. لەوانەشە یەکەم جاری بوبێ لە ژیانیدا عەلی دەدی. وای هەست کرد:

"باشە "عەلی"یەدرێژ، ئاخرییەکەی تێگەیشتی؟ گوێ نادەیە قسەی گەوران و لاڕێ دەچی. خۆ تێگەیشتی "عەلی"یە درێژ؟ ئاخری هاتییە سەر قسەی من؟ چما پێتم نەگوت ئەوە پێڕەشە؟ نەمگوت بێفەڕە؟ نەمگوت ئەوە پیس و چەپەڵە؟ وەك مڵە وایە. بچێتە سەر دەریای سپی، وشکی دەکا و تۆزی لێ هەڵدەستێنێ. ئەگەر بە تەنیشت لێڕەوارەکانی تۆرووسدا تێپەڕێ، دارستانەکەی ئاگر دەگرێ. ئەگەر

بچێتە نێو شاری ئەدەنەوە، بوولەرزە دێ و داروبەردی بەسەر یەکەوە ناهێڵێ. نەمگوت؟ هاتیە سەر قسەکەم؟ لەخۆڕا خۆت ماندوو مەکە. قسەت لەگەڵ ناکەم."

عەلی زانی ئەو جارەیان دایکی بە رقێکی کەمتر و سۆز و خۆشەویستییەکی پترەوە سەیری کردووە. دڵی خۆش بوو. روخساری ژنە بۆ ساتێك روون ببۆوە. عەلی گوتی:

ـ لەمەودوا لقە شقارتەیەکیش چییە نادەمە ئەو مام خەلیلە. ئەگەر سەت رەوە ئەسپم هەبێ و لە خاکی چوکووراواو کەناری دەریای سپی بلەوەڕێن و مام خەلیلیش لەپەل و پۆ کەوتبێ و لاقی لێ بنەوە، دیسانیش سواری ئەسپێکمی ناکەم و دەیکەم بە قوربانی سمی ئەسپێکم. ئەگەر عەنبار بە عەنبار گەنم هەبێ و مێگەل مێگەل پەزەکانم شیر بدەن و کووپە کووپە هەنگوینەکانم لێیان بڕژێ و کووپە کووپەش زێڕم بتریسکێنەوە و مام خەلیلیش لە برسان چاوی دەرپەڕیبێ، دیسان پاروو نانێك چییە نایدەمێ بیخوا. ناتوانم بیدەمێ دایە گیان، نا.

مرێمۆك راوەستا. خۆی قیت کردەوە و سەری هەڵێنا و چاوەکانی لە ئاسۆی دوورەدەست بڕی و ساتێك ئاوا مایەوە و دوایی بە ئەسپایی وەڕێ کەوتووە:

ـ دارەکەی من، دارەدەستە جەفاکێشەکەی دەستم، لەگەڵ کەسم نییە لەگەڵ تۆمە، باکەس بە دڵی خۆی نەگرێ، دارە جوانەکەم، بێشکەی منداڵی پاك و بێ گەرد لە تۆساز دەکرێ، بۆن و بەرامەی کێوەکان لە تۆدایە، نێر و ئاموور گەنمەجاڕان و نیری کەڵ و گا لە تۆ ساز دەکەن. لەگەڵ هاتنی پاییز گەڵات دەوەرن و رووت دەبیتەوە و کە بەهاریش دێ بە گەڵای کەسك و ناسك خۆت دادەپۆشی. ئەگەر تۆ نەبای، کوا دەمتوانی ئەوەندە بڕۆم. هەتا تۆم هەی خودا حەوجێ بە کوڵی کەسم نەکا. هەر بژی دارە ئازاکەی من. ئەتۆ پشت و پەنا و هاوڕێی پیرەژنی کوێر و بێکەس و لێقەوماو و پەککەوتووی دارەکەی من. پێ بە پێی ئەوان رێگا بێ بنەکانی چوکووراوا دەبڕی و قەت نالێی ئاخ. کەس چاکەی تۆی پێ نادرێتەوە. من قەرەواشی تۆم داردەستەکەم. دەبێ تۆ لە ئاوی زێڕ بگیردرێی و لە نێوەڕاستی ماڵێ هەڵتواسن. لەگەڵ تۆمە. جوان و زەریفە گوێ بگرە و بزانە دەڵێم چی دارە جوامێرەکەم. کابرایەك ئاقڵ بووە بەڵام تازە درەنگە. وەختێك تێگەیوە کە ئیتر کار لە کار ترازاوە. دڵی مرۆڤ وەك کۆشکێکی بلوورین وایە. ئێستا کە ورد و خاش بووە و بۆتە تۆزی بانان، تازە ئەو تێگەیوە. ئەی دارەکەی من، جوان و زەریف گوێت لێ بوو و قسەکانمت بیست؟

عەلی گوتی:

ـ بیستم دایە. هەرچی بیلێی حەقتە. هەمووی سووچ و خەتای منە. گەردنم ئازا کە. ئەوە هات ئیدی. گەردنم ئازا کە نەمزانی.

مرێمۆك بە دەستی ڕاستەی چەند دانەیەکی بە دارەکەیدا کەبەدەستی چەپییەوە بوو کێشا و گوتی:

ـ دارەدەستە جوانەکەم، پادشای دارەکان، نوێنەری داران، کوێخای داران، جوان گوێت لـە قسەکانم بوو. ئەتۆ لە بنیادەم ئاقڵتر و هەستیارتری و جوان تێگەیشتی. ئەو کۆشکە بلوورینەی ورد و خاش بووە، ئیتر کامە وەستاکار سـەرلەنوێ پێـی چـا دەکرێتـەوە و دایدەڕێژێتـەوە، خـۆ ئەگەر بکەومە سەر دەست و پێیانیشی و لەبەریشی بپاڕێمەوە؟ ئەوە دامانینا چاکیشی کردەوە، پێت وانییە چرژ و درزێك لە قوژبنێکیدا هەر دەمێنێتەوە؟ جوان و زەریف گوێت لێ بێ و بیکە ئاڵقەی گوێت، دارە ئازاکەی من.

هەنگاوێکی هـەڵگرت و ڕاوەسـتایەوە. ویـستی شـتێك بڵـێ و گێڕایـەوە و وەڕێ کەوتـەوە. دیسان ڕۆیشتنەکەی بۆ زەحمەت بۆوە. قسەکانی تینیان تێدا نەهێـشتبۆوە. دوای ئـەوەی پـازدە هەنگاوێکی نا، دیسان ڕاوەستا.

ـ ئەمامەکەی من. دارەکەی من. جوانترین لقە داری من. ئەگەر لە قـسەم تـێ بگـەی، تـا مردن بەستە. ئەتۆ دەتوانی شووشەی وردوپرد پێکەوە بنێیتەوە؟ دەبیستی دارەکە؟

عەلی لێی نزیك بۆوە و گوتی:

ـ دەبیستم دایە گیان.

مرێمۆك گوتی:

ـ ئەدی دارەکە گیان، ئەوەی حاڵ و ڕۆژی ئێمە...

عەلی پێشی گرت و گوتی:

ـ لاسارێ مەکە، وەرە کۆڵم.

مرێمۆك بە گاڵتەوە و بە دەنگێکی ماندووی کەسێکەوە کە ئیدی بیر لـە هـیچ نەکاتـەوە و ملی بۆ مەرگ ڕاکێشابێ گوتی:

ـ دارە جوانەکەی من، ئەمن هەتا دەمرم لەگەڵ تۆ دەڕۆم. لە تەنیشت تـۆ دەمـرم و ناچمە کۆڵی کەس. مەرگ زۆر دوور نییە. نزیك و نزیکتر بۆتەوە وهـەتا ئێـرە هـاتووە. دەیبیـنم. تـۆ بمپاریزە چاوڕەشەکەی من...

کە دەستەکانی بەرەو ئاسمان هەڵێنان، دارەکەی لێ کەوت، عـەلی لەڕێوە بـۆی هەڵگرتـەوەو دایەوە دەستی. مرێمۆك دیسان کەوتەوە ڕێ. عـەلی:

ـ خەتای من نییە. خـەتای ئـەو مـام خەلیلـە بەرازەیـە. ئەگـەر مـام خـەلیلم وەدەسـت بکـەوێ وەڵڵاهی دەیکوژم. دەیتۆپێنم و وەك کەروێشکێك لێـرەوە بـۆ هـۆوێ فـڕێ دەدەم. وەڵڵاهـی زۆرم زگ

پێی سووتا... زگم بەو لەڕ و لاوازی و پیرییەی سووتا... ئەو مام خەلیلە کافرە هەر بۆوە دەبێ ئاو| جوێنی پێ بدەی. هەرچی چارەڕەشیی ئەو گوندەیە خەتای ئەوە. کافرە و خوێنی حەڵاڵە.

مرێمۆك راوەستا و وەڕێ کەوتەوە. جار و بارە رادەوەستا، دەیوست، شتێك بڵێ و دیسانەوە دەکەوتەوە رێ.

هەتا ئێواری هەر وا رۆیشتن. چەند هەنگاوێك رۆیشتن و راوەستان و دیسانەوە وەڕێکەوتنەوە عەلیی ماندوو کردبوو. مرێمۆك کە دوایین جار راوەستا، ئیدی تینی لەبەردا نەمابوو. لاقەکانی تێك-دەئاڵان. بەڵام بەهەمووی تینی خۆی هەوڵی دەدا نەکەوێ و هەموو قورساییەکەی دەدایە سەر دارەکەی کە بە سینگییەوە نووساندبوو. چاوەڕێ بوو عەلی بڵێ:"وەرە کۆڵم."

ـ ئەو مام خەلیلە؟ ئەو کافری چوار مەزەبە؟ ئەو راکردووەی یەمەنێ؟ ئەو سەردەستەی دز و رێگرانە؟ ئەو کەمتیارە خودا نەناسە یاخوا ماڵی بەقوڕ بگیرێ و بایەقۆش لە ماڵی بخوێنێ.*

دارە جەفاکێشەکەم لەگەڵ تۆمە. هەر لەبەر ئەو؟... کۆشکی بلوورین... ئەو...

عەلی کە دایکی بە شپرزەیی دی، دەمودەست لەبەردەمی هەڵترووشکاو بەکۆڵی خۆیدا دا و دارەکەشی کە کەوتبوو بۆ هەڵگرتەوە و دایەوە دەستیو هەستا و گورج وەڕێ کەوت. خۆریش ئاوا بوو. هەتا گەیشتنە شوێنێك کە دارەکانی وەك دەریا هاشوهوشیان بوو و لە دوورەوە وەك دەریایەکی رەش و تۆفانی شەپۆلیان دەدا، ئیدی ورتەیان لێوە نەهات. لەوێ بۆن و بەرامەی شیلەی دار کاژ و سەدیر شەوەکەیان ئاخنیبوو. هەوا وەك هەورێشم و بای پاییزیش نەرم و نیان بوو.

عەلی لەدەم ئەو کانییەی خوڕەی ئاوەکەی دەهات و لەسەر گیاوگژەکەی کە هەتا ئەژنۆ هەستابوون دانا. بۆنی گیایەکە هەستا:

ـ دایە، هەوا خۆشی کردووە. دیارە لە چوکووراوا نزیك بووینەتەوە.

دەیزانی ئەگەر دابنیشێ ئیدی ناتوانێ ببزوێ. بەسەر پێوە بەلادا دەهات و خەونووچکە دەیبردەوە. دەشیزانی باشنییە بەر لەوەی قسەیەك لە دایکییەوە ببیستێ بگەڕێتەوە و بڕوا. ساتێك دواتر مرێمۆك کە وەخۆی هاتبۆوە دەستی پێکرد:

---

*دەقە فارسییەکەی دەڵێ: دارە هەنجیر لە جێی ماڵەکەی بڕوێ. لە کوردییەکەی خۆماندا کوندەبوو یان هەمان بایەقۆش هێمای شوومی و بێفەڕییە و لە کاولاشەکۆنان دەخوێنێ. دووعای پیرەژنانە کە بە یەکێك دەڵێن یاخودا ماڵت وێران بێ دەڵێن یاخوا کوندە بوو لە ماڵی بخوێنێ.

ـ دارستانەکە، دارستانەکە، دارستانە بەختەوەرکە، ئێوە سەد هەزار دارن پێکەوە. ناتوانن ببزوون و لێك جوێ ببنەوە. کاتی نەراندن هەموو پێکەوە دەنەڕێنن، هەمووتان پێکەوە گەڵاتان دەوەرێ و پێکەوە ڕەگ دادەکوتن و پێکەوە گوڵ دەکەن و پێکەوەش خۆتان دەرازێننەوە. بارانێك هەمووتان تەڕ دەکا و تاوێك هەمووتان گەرم دەکاتەوە. هەمووتان عەتر دەپڕژێنن و لە سووتمانیشدا هەمووتان پێکەوە دەسووتێن. لەگەڵ ئێوەمە. دارەکان لەگەڵ ئێوەمە نەك کەسی دیکە. شوکری خودای بکەن بنیادەم نین. ڕاستە نازانن گۆرانی بڵێن و بنوون و هەست و ماچ بکەن و بۆن بەشتی خۆشەوە بکەن و دڵداری بکەن، بەڵام دیسان شوکرانەبژێر بن. ئەی کانییەکەی تەنیشتم...

عەلی دیتی مرێمۆك دەستی پێکردۆتەوە و دیارە وا زووش لێی نابڕێتەوە. کە چەنەی گەرم دادێ، کەس باشاری ناکا. بەبێ ئەوەی چاوەڕێ جواب بێ و بەبێ ئەوەی تێی بگەیەنێ، بە ئەسپایی گەڕایەوە و وەڕێ کەوتەوە."

ـ ئاوە زوڵاڵەکان، کانییەکە لە بن تیشکی خۆردا دەدرەوشێتەوە، لە چیا بەرزەکانەوە دێ و بە ڕێگاکاندا تێدەپەڕی و دەدرەوشێتەوە و دەچێتە بن عەرزی و بە سەر زەویدا دەگەڕێی، نە ژن و منداڵت هەیە و نە هیچ... ئەتۆش شوکرانەبژێر بە کە بنیادەم نیت.

"ئەی ئەستێرە بچکۆڵەکەی ژوور سەرم، ئەتۆ ئەستێرەی کێی؟ کەس نازانێ خاوەنەکەت لە کوێیە؟ بە کام چیا و چۆڵەوانییەوەیە؟ لەوانەشە بەبێ خەم و خەفەت لە جێوبانە گەرم و نەرمەکەیدا نوستبێ، لەوانەشە خەو نەیەتە چاوانی و بە هەزاران ژان و ئازار و کۆنەبرینەوە جینگڵ بدا. دەزانم کاتێك بمرێ تۆش لە ئاسمانێ بەردەبیتەوە، تۆ دەمری؟ بەڵام تۆ چ خەمتە، بە ڕۆژ دەکوژێیەوە و شەوانیش هەڵدەبیەوە. بە پێچەوانەی خاوەنەکەت نە نانت دەوێ و نە ئاو، هەموو کاروبارت هەر درەوشانەوە و کوژانەوەیە. ئەتۆش شوکرانەبژێر بە کە مرۆڤ نی...

"گیا شلکەکەی تەنیشتم، ئەگەر دەستت لێ بدەم دەشکێی و ژان دەتگرێ. ئەتۆ بەهارانە سەر دەردێنی و پاییزان شەختە دەتبا. تەمەن کورتی بەڵام ژانی پیری ناچێژی. ئەتۆش شوکرانە بژێر بە کە مرۆڤ نی.

"ئەی خاکە ڕەشەکەی بن من، ئەتۆ سەرەتا و کۆتای هەموو شتێکی. زۆر ئازار دەدرێی و زۆر دەکێڵدرێی. بەڵا نییە بەسەرت نەهێنن. هەزار ئاین و ئۆینت پێ دەکەن بەڵام تۆ دڵت نایەشێ و بەدڵییەوە ناگری. دڵت گەورەیە، وەك کوێستان فێنکی، ئەوی بوونەوەرە بە تۆوە دەژێین و لە پەنای تۆدا دەحەوێنەوە. دارەکان ڕەگ لە سینەت دادەکوتن و ئاوەکان دادڕدادڕت دەکەن و برووسکە لێت دەدا و چیی بەڵایە بەسەرت دێ. بەڵام دیسان شوکرانە بژێر بە کە مرۆڤ نی.

" لەگەڵ هەر هەمووتانمە. ئەمن لە هیچ شتێ ناترسم. لە مەرگ لە سەرما لە هیچ شتێ..."

کە قسەی بڕا، سەیرێکی کرد و دیتی سیبەری عەلیی بە دەورەوە نییە. ساتێك هەستی بە تەنیایی کرد و دوایی بێدەنگ بوو و گوتی:

ـ ڕۆیی، لێی گەڕێن با بڕوا. شوکرانەبژێر بن.

دیسان دووپاتەی کردەوە:

ـ شوکرانە بژێر بن، شوکرانە بژێر بن.

لەسەر پشت ڕاکشا. بە نێو چڵ و پۆپی دارەکاندا چەند ئەستێرەی گەورە و درشت دیار بوون:

"لەو ئاسمانەدا، هەر مەخلوقێك ئەستێرەیەکی هەیە: گورگ، مێروو، ماسیی بەحران، مێش هەنگوین... هەموو گیانلەبەرێك ئەستێرەیەکی گەشی هەیە. چما وانەبایە ئەو ئاسمانە ئاوا پڕ لە ئەستێرە دەبوو؟ ئاسمان عەمباری ئەستێرانە. مام خەلیلیش ئەستێرەیەکی هەیە یاخوا بەرییتەوە. "عەلی"یە درێژیش هەیەتی. ئەسپەکەی منیش هەیبوو. ئەو کەحێلەی من. بەڵام ئێستا خوشیوە. خودا دەزانێ کەوتووەتە کوێ؟ کەوتووەتە کامە بەحر و دەریاچەوە یان کەوتووەتە سەر کامە بستۆکە زەوی؟ ئەو ئەستێرەیەی لەسەر سەرمە، لەوانەیە ئەستێرەی خۆم بێ. هەر بۆیەشە لایەکی ڕەش داگەڕاوە. کە بەختی خاوەن ئەستێرەکە ڕەش دەبێ، ئەستێرەکەش لایەکی ڕەش هەڵدەگەڕێ. کە لە خوشینێ نزیك دەبێتەوە لە ئاسمانێ دەلەرزێ. وەك ئەوەی بە داوە دەزوویەك بەسترابێتەوە.

"یانی ئەستێرەکەی من ئێستا بە موو بەندە؟"

هەموو گیانی لەرزی. هەستا و دانیشت. سەرتاپای شەڵاڵی ئارەقە بوو. هەتا دانیشت، چاوی بە بەشێك لە ئاسمانی پڕ لە ئەستێرە کەوت. لە ناکاو ئەستێرەیەك خوشی و ماوەیەك پاناوکی ئاسمانی پێوا.

مرێمۆك ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:

ـ خودا دەزانێ کێ مرد؟ ئاخ ئاخ...خ!

"ئای دنیای بێ وەفا، هێشتا لێت تێر نەبوومە."

دیسان ڕاکشایەوە، بیری لەو ئەستێرانە دەکردەوە کە پێڵووەکانی قورس بوون:

"هەر بەراست، ئەو ئەستێرەیەی خوشی هی کێ بوو؟ گەنج بوو؟ منداڵ بوو؟ تازە لە دایك ببوو؟"

خەوی لێ کەوت.

***

کە عەلی گەیشتەوە ئەو شوێنەی لەوێوە ژنەکەی بەجێ هێشتبوو، خەریك بوو بەیان دەنگووت.* لە دوورەوە ئاورگەکەی دی. ژنەکەی لە دەم ئاگرەکە کروشمەی کردبوو و دانیشتبوو. هەر گوێی لە ترپەی پێی عەلی بوو سەری هەڵێنا. عەلی لێی چووە پێشێ و پرسی:

ـ ئەوە نەخەوتووی؟

ئەلیف سەری لەقاند. چاوەکانی خەواڵوو بوون. لە دەم ئاگرەکە و لە تاریك و روونەکەدا وەك کچۆڵەیەکی جوان هاتە پێش چاوی عەلی. دڵی ختوورەیەکی کرد. دەتگوت شتێکی شلەتێن لەهەموو گیانی دەگەڕێ. جۆرە خۆشی و هێمنییەك خزییە ناخییەوە. لێی چووە پێشێ و لە پشتەوەڕا باوەشی پێدا کرد و ماچی کرد. لە تەنیشتی دانیشت. دیسانەوە باوەشی پێدا کردەوە و رایموسی. تا ماچی دەکرد و لە باوەشی دەکرد زیاتر دەحەسایەوە. وا هاتەوە سەر خۆ دەتگوت تازە لە دایك بووە. خۆی پێ نەگیرا. دیسان لە باوەشی گرتەوە. وای رێك گوشی قرچەقرچی لە ئێسقانی هێنا. هەڵیگرت و بردییە نێو دەوەنەکانی پشت کانییەکە. وا ورووژابوو پشووی سوار ببوو. تەنانەت منداڵەکانی نەدی کە خەوتبوون.

کە لە نێو دەوەنەکان هاتنە دەرێ بەسەرپێوە خۆیان بۆ نەدەگیرا. خۆریش بەقەد منارەیەك هاتبووە سەرێ. لە کانییە بزنەدا خۆیان شوشت و دوایی لە بن دارە کاژێك راکشان و دەمودەست خەویان لێ کەوت.

***

خۆر گەییە نێوەندی ئاسمانێ و هەموو وڵاتی تەواو گەرم کرد. مرێمۆك کە نیوەی گیانی کەوتبووە بەر تاوەکە، شەلاڵی ئارەقە ببوو. بە چاوە خەواڵووەکانی سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و لە ناکاو ترسا، مووی لێ بوونە نەشتەر و بە لەپی دەستەکانی دەموچاوی خۆی گرت. رێك لە نێوەڕاستی کۆنە گۆڕستانەکە بوو. ئەو شەوە تا بەیانی لەگەڵ مردووی ئەو گۆڕستانە خەوتبوو. بە لەرزەلەرز لە جێی خۆی هەستا. رێگاکە برێك دوورتر بوو. هەر وا کە لاقی لە چڵە گیا و پنچکەکان هەڵدەنگووتن، وەرێ کەوت و بە هەموو تینەوە غاری دا. تا زیاتر رای دەکرد پتر دەترسا و تا پتر دەترسا خێراتر غاری دەدا. لە نێوەڕاستی رێیە، چاوی بە گۆڕێك تەنیا کەوت کە دار بەڕوویەکی وشکی لەسەر بوو، هەر زەندەقی چوو. کە گەیشتە تەنیشت گۆڕەکە، لاقی هەڵخلیسکا و تلپ وە عەرزی کەوت. "ئەی خودایە

---

*بەیان دەنگووت: کورتکراوەی بەیان دەئەنگووت. رۆژ دەبۆوە. بەیان ئەنگووتن: رۆژبوونەوە. هێمن دەڵێ: بەیان ئەنگووت و شەو رابرد و من هێشتا خەوم نایە....

گیان، چاو ڕەشەکەم، تۆ کۆمەگم بکە، تۆ نەجاتم بدە." ماوەیەك دەستەکوتەی کرد و هەوڵی دا لەبەر خودای پاڕایەوە. چاوەکانی قووچاندبوون و وەك بیی نێو ئاوێ دەلەرزی. چونکە لەو حاڵەتەدا بڕێك حەسابۆوە، پشوویەکی هاتەوە بەر، هەوڵی دا هەستێ. هەستا. ئیتر نەیدەتوانی را بکا، بەڵام هەموو تینی دابووە خۆی کە لە گۆڕستانەکە دەرباز بێ:"ئەی ئەو گۆڕستانە چەندە دووروودرێژە، هێندەی ڕێگەکە دێژە." چەند جارێکی دیکەش لاقی هەڵەنگووتن و کەوت. ئیدی هەڵنەستایەوە. هەوڵی دا بە گاگۆڵکێ بڕوا. پشووی سوار دەبوو، لەهۆش خۆی دەچوو و بە پاڕانەوە دەیگوت:"فریام کەوە، چاوڕەشەکەم." کە وەخۆ دەهاتەوە، دیسان بەخشکەخشك دەچووە پێشێ. هەموو سەروچاوی خۆڵاوی ببوو، خۆڵ و خاکەکە و ئارەقە تێکەڵاو ببوون و دەست و دەموچاوی سواغ درابوو. تەنیا چاوی دەبریسکایەوە. لەپی دەستەکانی و ئەژنۆی خویناوی ببوون و کراس و بەرهەڵبێنەکەی دڕابوون.

بەڵام مرێمۆك وەك کیسەڵێك ئەسپایی دەڕۆیشت و ڕادەوەستا و دیسانەوە دەڕۆیشتەوە، یا باشترە بڵێین بە خشکەخشك دەڕۆیی. دەمەدەمی نیوەڕۆیە بوو. شتێکی بە دڵیدا هات. سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد و لە پێش خۆیەوە نە بەرد و کێلە خواروخێچەکانی گۆڕەکان مابوون و نە دار بەڕووە ڕەشەکانیش و نە ئەو کۆنە پەڕۆیانەی لە دار بەڕووەکانیان بەستبوون. ئاوڕێکی لە داوەی دایەوە. دیتی زۆر لە گۆڕستانەکە دوور کەوتووەتەوە، دەتگوت هەر نایبینێ. خۆی پێ ڕانەدەگیرا. دوو سێ هەنگاو ڕۆیی. گەیشتە لقی وشکەڵە دارێك کە لە دەم ڕێیەکە کەوتبوو. داهاتەوە و لقەکەی هەڵگرتەوە:"چەندە باش بوو توانیبام بڕێکی لێ بشکێنمەوە. بەڵام زۆر درێژە." دیسان بە ئەسپای وەڕێ کەوتەوە. بەردەوام ئاوڕی دەدایەوە و سەیری دواوەی دەکرد. کاتێ تەواو دڵنیا بوو لەوەی باش دوور کەوتووەتەوە، هەستی کرد ئیدی تین و توانای لەبەردا نەماوە. لە تەنیشا دارە کاژێك خۆی بەعەرزی دادا. دەم و لێوی وشك ببوون. برینەکانی دەست و لاقی هەر دەهات و پتر دەبرژانەوە و سەری جەرگی پێیانەوە دێشا. تا پتر پشووی دەدا زیاتر گیانی شل دەبۆوە و باشتر دەیزانی چەندە ماندووە.

بەخۆی دەگوت:"خەریکە دەمرم. ئەوە دەمرم برادەرینە. تۆ فریام کەوە چاو ڕەشەکەم. بەخودای خەریکە دەمرم. فریام کەوە با "عەلی"یە درێژ تەرمەکەی بدۆزێتەوە. با قەل و داڵ و جڕ و جانەوەر مەیتەکەم لەتوکوت نەکەن. مەیتکەم با لەسەر ئەو شاخە بەجێ نەمێنێ، خودایە گیان. خۆت گۆڕ و کفنم بە قسمەت بکەی. خەریکە دەمرم، دەمرم، ئەوە گیانم دەردەچێ. تۆ یارمەتیدەرم بە چاوڕەشەکەم."

* * *

ماوەیەك بوو لە خەو هەستابوون. ئەلیف ترخێنەی وەسەر ئاورێ نابوو. عەلی نەیتوانیبوو بجوولێ. هەر لەوێوە سەیری دەکرد و هیچ شتێکی نەدەدی. نەشیدەتوانی بیر لە هیچ شتێکیش بکاتەوە. مێشکی بەتاڵ بوو. منداڵەکان لەسەر کانییەکە بوون. دانیشتبوون و کڕ وبێ دەنگ بێ نەشە سەیری دەوروبەری خۆیانیان دەکرد. خەم و خەفەت و پەژاریەك بە روخسارە زەردەکەیانەوە نیشتبوو. دەتگوت دوو بنیادەمی بەتەمەنن ئاوا خەفەتبارن. چاوە شەکەتەکانیشیان، درشت و رەش و تۆزاوی دەرپەڕیبوون. ئەلیف کە لە دەم ئاورەکە نوقمی ئارەقەی بوو، بڕێك رۆنی بە قرچەقرچ لە تاوەی ترخێنەکە کرد و بانگی کردن:"یاڵلا دەی وەرن."

عەلی دیسان نەبزووت. منداڵەکان ماندوو شەکەت هەستان و هاتن. برسێتی بە روخسارییانەوە دیار بوو. ئەلیف دیسان بە لەبزێکی سۆزدارانەوە گوتی:

ـ دەی هەستە عەلی، هەستە وەرە.

عەلی هەوڵی دا هەستێ، نەیتوانی. بە لەبزێکی فەرماندەرانەوە گوتی:

ـ تۆ سفرەکە بێنە ئێرە.

ئەلیف بەبێ ئەوەی شتێك بڵێ سفرەکەی بردە لای و لەوێ رایخست. عەلی بۆ یەکەم جار پریاسکەی دڵی کردەوە:

ـ " وێرانم ژنەکە، هێندە ماندووم وەختە بمرم. ئیدی هێوام بە گەیشتنە چوکوور نەماوە. ئیدی ناتوان بەڕێیەدا بڕۆم.

ئەلیف رەنگی گۆڕا. چاوە درشتەکانی زەقتر بوونەوە. ساتێك لەفکرەوە چوو. دڵۆپە فرمێسکێك لە چاویدا قەتیس مایەوە. دەموچاوی وشك هەڵگەڕا. دڵی هاتە کوڵ و بە دەنگێکی گڕ و بە دڵنیاییەوە گوڕاندی:

ـ خەمت نەبێ. ئەتۆ و دایکیشم و باروبنەکەشت بەباشی هەتا ئێرە هێناوە. باشت خۆ راگرتووە. ئەوجار نۆرەی منە. ئیدی چمان نەماوە. دوای ئەوە دایکیشم و باروبنەکەش لە ئەستۆی من تا چوکوور، ئاخ...

مات بوو. دەیویست بڵێ:"ئاخ، خۆزگە هەورازەکەی سولەیمانلیمان لەپێش نەبایە، گەیشتنە چوکوور وەك ئاوخواردنەوە وابوو." بەلام نەیتوانی بیڵێ و لەوێی کردەوە:

ـ ئەمن ساغ و سەلیمم. نە ماندووم و نە بارم لە کۆڵم ناوە. لەو ماوەیەشدا بە دەستی بەتاڵ و ئاسوودە رێم بڕیوە.

توند کەوچکەکەی لە ترخێنەکە هەڵێنا و خواردی.

عەلی هەستی کرد پشووی سوار دەبێ. لەبەرچاوی ژن و منداڵەکانی خەریك بوو بداتە کڵپەی گریان. پارووەکەی دەستی پێ قووت نەدەدرا. دەستە کە دەلەرزین، درێژی کردن و بە هێمنی و تاسەبارانە لەسەردەستی ئەلیفی دانان.

کە نانەکەیان خوارد، ئەلیف هەستا. باروبنەکەی دەپێچایەوە کە عەلی هاتە لای:

ـ جارێ هەر بۆخۆم هەڵیاندەگرم. هێشتا لەپێ نەکەوتوومە. ئەگەر پەکم کەوت جا ئەتۆ هەڵیانگرە. باشە ئەلیف؟

ئەلیف دەیزانی نابێ قسەی بشکێنێ. جەواڵە ساوارەکەی لە بارەکە دەرینا و لە لاوە داینا. گوتی با لانیکەم خۆی ئەوەیان هەڵگرێ و بارێك لە عەلی سووك بکا. میزی مێرووەکیش شتێك لە دەریا زیاد دەکا.

عەلی کە چاوی بە جەواڵە ساوارەکە کەوت، بەبێ دەنگی هەڵیگرت و لە تەنیشت باروبنەکەی دانایەوە و ملی لە پێچانەوەیان نا. ئەلیفیش هەڵیگرت و ختییەوە سەر شتەکان. کە لیبوونەوە، عەلی هەڵترووشکا و ئەلیف بە کۆڵی دادا. عەلی لە هەستانیدا خۆشی گۆشەیەکی بارەکەی گرت و بەرزی کردەوە. لایەکی بەڕە گوڵ گوڵییەکە، خۆڵاوی ببوو. عەلی وەڕێ کەوت و ئەلیف خۆڵی بەڕەکەی تەکاند.

کە عەلی بە بارەکەوە هەڵدەستایە پێ، ئەلیف تێگەیشت کە زۆر لە جاران بە زەحمەتتر هەڵدەستێ. بیری کردەوە:"چمان نەماوە بۆ چوکوور. گەیشتووینێ.ئاخ، خۆزگە ئەو هەورازە بە نەفرەتبووەی سولەیمانلی نەبوایە. پرسی:

ـ دایەت زۆر دوور بردووە؟ خودای نەخواستە تا دەگەینێ لە برسان نەمرێ. ئەوە رۆژ ئاوا دەبێ.

عەلی بە دەنگێکی کز جوابی دایەوە:

لە کۆنە گۆڕستانەکە دامنا. ئێستا دەگەینێ.

ئەو لەتە جەواڵە کۆنەی لە لاقەکانی بەستبوون، شڕ ببوون و لە رۆیشتنیدا عەرزیان دەماڵی. منداڵەکانیش نەشەی جارانیان نەمابوو. نەیاندەتوانی غار بدەن. نە تاقەتی غاردانیان هەبوو نە یاریکردن و نە پێکەنینیش. ماندوو شەکەت و کز، لە تەنیشت یەکترەوە لاقیان دەخشکاند. زۆر بەجێ مابوون. چاوەکانی ئۆمەخان ریبۆقیان کردبوو. بەیانی کە هەستابوو، ماوەیەك چاوەکانی پێکەوە نووسابوون و هیچ کوێی نەدەدی. چاوەکانی برژانەوە. حەسەنیش چڵمی شۆڕ ببۆوە و چەندی پێی دەکرا بە تووڕەییەوە هەڵیدەلووشییەوە.

## ١٥

گوند ماوەیەك بوو هاتبوو و لە سویتلۆ باری خستبوو و چاوەڕێ بوو. ئێرە دوایین هەوارگـە بوو. لەو خوارووە، زەوییەکەی چوکووراوا بە دارستان و گیشە و ئاوی رووبارەکانییەوە لە بن مژ و هالاّوی هەتاودا پان ببۆوە.

هەر لە کۆنەوە ئەوەندەی خەڵك وەبیریان دەهات، پتر لە رۆژێك لەو هەوارگەیە نەدەمانەوە. شەوێ دەگەیشتنێ و کەرەی بەیانی هەڵدەستان و بەرەو چوکووراوا خلۆر دەبوونەوە و راستەوڕێ دەچوونە نێو کێڵگەکان و دەستیان دەکرد بە رنینەوەی لۆکە.

رۆژ بە دوای یەکدا دەهاتن و رادەبـردن و گونـدی ئۆقرەیـان لـێ دەبـڕا. تۆخـوا ئـەوە کـاتی ئەوەیە بنیادەم بێ و رێك لەسەر چـوکوور دایکـوتێ و لێـی دانیـشێ و چـاوەڕوان بـێ، کەچـی خەڵکی دیکە لەو خوارەوە بە کەفوکوڵـەوە خـەریکی کـارن؟ لـە هـەموو لاوە دەنگـی هـەڵلاّ و نارەزایەتی بەرز دەبۆوە بەلاّم کوێخا مێشێکیشی لێ میوان نەبوو و دەیگوت:"لێیـان گـەڕێ بـا بەکەیفی خۆیان بزەڕێنن. کاکە خۆ ئێمە گیامان بە کێوییەوە نەخواردووە."

ئاخرییەکەی تاشباش ئۆغلو خۆی پـێ نـەگیرا. تۆسـکۆز دۆرانـی هـەڵگرت و لەگـەڵ خـۆی چوونە لای کوێخا و هەر گەیشتنێ و گوتی:"ئاوا نابێ کاکی من، ئـەتۆ بـۆت نییـە دوای لۆکـە چنینەوە خەڵك بەریتە نێو چوکووراوا. کاکە ئێمەش بنیادەمین. سەیر کە بە ژن و منداڵەوە بـە پێیان چیمان لێ هاتووە. سەیری ئەو خەڵکە بکە براله."

کوێخا داینواند. لەبزێکی دڵسۆزانەی بوو، بەلاّم خەمسارد و تەوساوی و ئاغایانە گوتی:

ـ هاوڕێ، تاشباش ئۆغلو مەمەد ئەفەنی، ئێمە کوێخای ئەو گوندەین، لە سـایەی خـودا و حوکمەتەکەمان و هەر وەها لە سایەی سەری حیزبەکەشمانەوە و دیسان لەسایەی سـەری خـزم و

هۆز و کەس و کار و گوندییەکانمانەوە، ئێمە لە خۆمان و دایك و ژن و منداڵمان پتر لە خەمی گوندییەکانمان داین. ناشهێڵین هێندێ کەسی لەخودا بێ خەبەر، بەلاڕێیاندا بەرن. ناهێڵین گوندییەکانمان یەخسیری ئەو دڕندانە بن. لەو بارەوە تەواو خاترجەم بن.

بەرپرسیارەتیی ئەو گوندییانە لێرە لە ئەستۆی منە. ئەوە من دەیزانم. ئێوە لەگەڵ ئەو مام خەلیلە خەرەفاوە پاڵ وەیەکتری دەدەن و ئیزگیلەکە درەنگ دێننە لای من و لە سایەی سەرتانەوە گوندی درەنگ وەڕێ دەکەون. بۆیە گوندییەکانی دیکە پێشتر دەچنە نێو چوکووراوا و هەموو مەزراکان دەگرن و هیچ بۆ ئێوە ناهێڵنەوە و ئەو کاك بەکرە شێتە لێقەوماوەش بە هیوای دۆزینەوەی مەزرایەك بۆ گوندەکەی ئێمە هەموو ئەو چوکووراوایە سەنگ و سووژن دەدا. ئێمە چارمان نییە لە سویتلی دەبێ چاوەڕوان بین، جا ئێوەش دێن و بەربینگ بە من دەگرن و پێم دەڵێن "کاکی من". هاوڕێ، ئەتۆ تاشباش ئۆغلو مەمەد ئەفەندیت، لەو گوندەدا خزم و کەست لە من زیاترە. زۆربەی خزم و کەسەکەی منیش لایەنگری تۆن. وەك ئەو "عەلی"یە درێژە ئەستۆ وردبووە. خۆ بەچاوی خۆتان بینیتان ئەوی خەیانەت لە خزم و کەسی خۆی بکا چیی بەسەر دێ. ئەسپەکەی نەخۆش کەوت و لەو چیا و چۆڵە سەرگەردان بوون. ئەمن لە بنەوبنەچەکەوە کوێخام. ئەمن بە دەنگی ئێوە نەبوومەتە کوێخا هاوڕێ. بابی بابیشم کوێخا بووە، بابەگەورەی ئەویش. کوێخایەتی خودا بە بەژنی بنەچەکەی منی بڕیوە. ئەو دەمیر قیراسییە قوت بۆوە و یەکێکی وەك ئەنگۆی کە خزم و تڕ و تایەفەیان زۆرە، لەسەر ئێمە کردە پیاو. دێن و سینگتان دەردەپەڕێنن و جوابتان دەوێ. با ئەو هەڵبژاردنە بێتەوە، چما ئەمن دەبمەوە کوێخای ئەنگۆ؟ لەوەتەی بنەماڵەی من هەیە چیی قایمەقام و جەندەرمە و سەربازێکی حوکمەت ڕووی لەو گوندە کردبێ، میوانداریتیی کردوون و نانی داون. قەتیش وا نەبووە گوندەکەی خۆم شەرمەزار و ڕووڕەشی حوکمەت بکەم. هەتا ئێستاش نەمانهێشتووە شەرەف و حەیا و نامووسی گوندەکەمان بە بادا بڕوا. خۆ بێت و ئەنگۆ دەست هەڵنەگرن، ئیدی منیش کوێخایەتییەکە قەبووڵ ناکەمەوە. سەرەڕای ئەوەش ئەنگۆ دەچن، لەماڵەکەی ئۆکسوزدۆران کۆبوونەوەم لەسەر پێك دێنن و چیی بەسەر زارتاندا دێ نایگێڕنەوە. ئەنگۆ چ لە یاسای خۆ پێشاندان و ڕێپێوان دەزانن؟ هەرهەمووتان بە تاوانبار لەقەڵەم دەدرێن و دەچنە پای سیدارە. دەزانن؟...

- ئێمە لە هیچ کوێ کۆ نەبووینەتەوە. هیچ کەسیش ناتوانێ بیسەلمێنێ.

کوێخا گوڕاندی:

- بۆت دەسەلمێنم تاشباش ئۆغلو ئەفەندی. ئەمن دەیسەلمێنم. بەڵام دڵم نایە زیان بە گوندەکەمان بگەیێنم و نیوەی خەڵکەکەی کە وەك تۆن بەسەر دارەوە ببینم.

تاشباش:

ـ نا! کوڕە ئەتۆ زیانی خۆت بدە، قەیناکا بە حوکمەت ئیمە لە داریٚ بدا.

کوێخا مستێکی لە سینگی خۆی دا و گوتی:

ـ ئەمن دڵم هەیە تاشباش ئەفەندی. ئێرە دڵێکی تێدایە وەك سندانی ئاسنگەران. بەڵام بێت و خوێن لە لووتی گوندییەکی رەسەنم بیٚ، ئەو دڵەم دەبێتە خوێن. کوڕە ئەمن نینۆکی منداڵۆچکەیەکی چڵمنی ئەو گوندە هەڵدەنگویٚ، وەك ئەوە وایە خەنجەرێکم لە دڵی رابکەن. ئەمن کوا وەك ئەنگۆم کاکی من. ئەمن وا نیم تاشباش ئەفەنی. ئەمن ناتوانم بڕۆم و ئەوەی ئێوە دەیکەن نەغد و پوخت لە دەستی حوکمەتی بکەم و هەر هەموو گوندییەکان بە تاوانبار لە قەڵەم بدەم و هەموشیان بنێرمە سەر سێدارە.

مستێکی دیکەی لە سینگی خۆی دا:

ــ ئێرە دڵێکی تێدایە وەك گەوهەر کاکی من، کە تەنانەت بۆ مەرگی دوژمنە قەستەسەرەکەشم ""عەلی"یە درێژ" دەسووتیٚ. واش دەسووتیٚ وەك دەشتەکەی چوکووراوا لە قرچەی هاوینیدا ئاگر بگریٚ و ببێتە خۆڵەمێش. ئەتۆ دەڵێی چی تاشباش ئەفەنی؟

تاشباش ئۆغڵو بە هێمنی دەستی لەسەر ئەژنۆی داناو گوتی:

ـ بەو ئەفەنی ئەفەنییەت گاڵتەم پیٚ مەکە کاکی من. ئەمن ئەفەنی نیم سەفەر ئەفەنی خان. ئەمن نەشهاتووم لێرە شەڕت لەگەڵ بکەم. قسەم ئەوەیە، باشە هەر هەموو گوندییەکانی دیکە ئەوە دە رۆژە لە کێڵگەکانی چوکووراوادا خەریکی کارن، ئێمە لێرە چاوەڕێی چین؟ ئەمن هاتووم ئەوەت لیٚ بپرسم. خەڵك ئەوەندە بیٚ ئۆقرەن خەریکن وەگیان دێن.

کوێخا دەنگی هێورتر کردەوە. ئەویش دەستی لەسەر شانی تاشباش دانا و گوشی:

ــ تۆ خەمت نەبیٚ براڵە، کوێخا دیارە مشووری هەموو گوندییە خۆشەویستەکانی خواردووە. با پێت بڵێم ئەو مام خەلیلە مردەلۆخەیە بووە هۆی ئەوەی ئەمساڵ گوندەکەی ئێمە درەنگ بگاتە چوکوور. هەر لەگەڵ گەیشتینە چوکوور بە تاوانی ئەو درۆیەی کە ئیزگیلی درەنگ بۆ کوێخاکەی هێناوە و بە تاوانی سەرگەردانکردنی گوندێکی ئاوا گەورە دەیدەمە دەست عەداڵەتەوە. ئەوە تاوانێکی گەلێك گەورەیە.

هاوریٚ، ئێمە درەنگ گەیشتین بۆیەش چاوەڕێین. ئەگەر وەك هەموو ساڵێك زووتر گەیبایەین، بەکراغا لەو خواروەوە، پێشتر مەزرایەکی بۆ گرتبووین و پێش ئەوەی ئێمە بار بخەین، دەهات و مزگێنییەکەی دێنا. ئێستا چونکە ئێمە وەدرەنگی کەوتووین، بەکراغاش لە چوکوور سەرگەردانە و بەشوێن مەزرادا دەگەڕیٚ. ئەگەر بدۆزێتەوە لەڕێوە دیٚ. هەر

دەشـدۆزێتەوە. قـسەی مـن ئـەوەی هـاورێ. ئەگـەر کارەکـانی منـیش خـراپ لێـك دەدەنـەوە، ئەوپەڕەکەی ئەوەیە کە لە هەڵبژاردنەکەی داهاتوودا دەنگم مەدەنێ و تـەواو. ئـەمنیش دیـارە لەو کارە ماندوو بوومە. لە هەڵبژاردنەکەی داهاتوودا ئیشەڵڵا یەکێکی باشتر لەمن دەدۆزنەوە. یەکێك کە سپیتر بکاتەوە.

تاشباش ئۆغڵو:

ـ کەواتە ئێمە دەبێ هەر چاوەڕێ بین؟

کوێخا:

ـ دەسەڵات چییە؟ ئەو پیرە بەرازە ماڵوێرانی کردین. لە سۆنگەی ئەوەوە درەنگ گەیشتین. لەمەودوا قەت بڕوا بە قسەی ناکەم.

تاشباش ئۆغڵو تەزبێحە کارەباییەکەی لە گیرفـانی دەرینـا و هەسـتا. سـەری بەردایـەوە و گەڕایەوە. ئۆکسوز دۆرانیش هەستا. کوێخا وای لێ مۆڕ بۆوە، مۆڕەیەکی ئاوای لە منـداڵێکی دەساڵانە کردبایە لەخۆی دەمیزت و زراوی دەچوو. ئۆکسوز دۆران بـۆ ئـەوەی چاوی لـە چاوی کوێخا هەڵنەنگوێ، رووی وەرسووڕاند و وەپێش تاشباش کەوت و گورج دوور کەوتەوە.

هەموو خەڵکی گوندی راوەستابوون و گوێیـان لـەو قـسانە ببـوو و لـە مـام خـەلیل تـووڕە ببوون. پیرەمێردەش لە شەرمان ببوە دڵۆپەیەك ئاو و نەیدەتوانی سەیری کەس بکا. ئەو داماوە کە ماندوو و شەکەتیش بوو، لاقی راستەشی تەزیبوو و نەدەجوولا.

خەتای بوو. گومانی لەوە نەبوو کە لە سۆنگەی ئـەوەوە گونـدی وەدرەنگـی کـەوتبوون. خۆ ئەگـەر گوندی لەتوپەتیشیان کردبایە و فڕێیاندابایە بەر سەگەلیش حەقیان بوو. بەڵام زۆر شـپرزە بـوو. ئـەو بـە ئانقەست وای نەکردبوو. مام خەلیل لە پشت هەوارگەکەوە، لە نێو دەوەنەکاندا خۆی حەشـاردابوو و لـە ترس و شەرمەزارییا هەر جینگڵی دەدا. هەتا شەوی بەسەردا هات نیوەعومر بوو.

جاروبارە بە ترسەترس هەڵدەستا و سەیرێکی خۆری دەکـرد کـە خـەریك بـوو ئـاوا دەبـوو و دیسان خۆی مات دەکردەوە. کە خۆر ئاوابوو و تاریك داهات، دڵـی خـۆش بـوو. بـەبێ ئـەوەی خۆی نیشانی کەس بدا چووە لای تاشـباش ئۆغڵـو. پیـاوێکی وا مردەلۆخـە دنیـای لـێ ببـووە چەرمەچۆلەکە. پێی وابوو لە جەحەندەم دایە گوتی:

ـ کوڕەکەی تاشباشی جوامێر پەنام بۆ تۆ هێناوە.

بە هەردوو دەستە لەرزۆکەکەی دەستەکانی ئەوی گرتن:

ـ وای دانێ پیاوم کوشتووە و خۆم لەماڵت هاویشتووە. نەجاتم بدە. ئەو گوندییانە لەتوپـەتم دەکـەن. حەقیشیانە. ئەمن لەمەودوا رووم نییە سەیری چاویان بکەم. ئاخ لەکوێی تاشباش حوسێن خـان، رۆڵـە،

ئەو بابەی تۆ زۆر پیاو بوو. لە نێو لەشکرێکدا دیـار بـوو، دوور دەتگـوت ئـەو بـەژن و بالاّیـەی دەڵێـی غەڵفی چنارە ئەوە تاشباش حوسێن خانە." کابرایـەکی سـەر و رووخـۆش بـوو. هـەنگوینی لـە زمـانی دەچۆڕا. پێی دەگوتم:"کاکە خەلیل"، ئەتۆ برامی. ئەگەر پـێش تـۆ بمـرم، وەسـیەت دەکـەم بـۆ حەمـەی کوڕم، لە جێی من بە تۆ بڵێ بابە. ئێستاش حەمە گیان رۆڵە، بزانـە بابـت وای دەگـوت. حوسـێن خـان تاشباش گۆڕەکەی پڕ بێ لە نوور، وای دەگوت. لە سەرەمەگدا وای پێ نەگوتی؟... ئەو زۆری چاکە بـۆ من هەبوو. ئـەمنیش بـۆ ئـەو. زۆر دەوڵەمەنـد بـوو. کـشتوکاڵی باشـی هـەبوو. خـۆی هـەمووی پـێ نەدەدوورایەوە و داوای لەمن دەکرد بچمە یاریدەی. ئـەمنیش کـە هۆگـانم لـێ دادەبەسـت، لەوسـەرێوە دەهاتم و لەم سەریەوە دەچوومە دەر. لـە چاوترووکاندنێکدا هـەموویم دەدرووەوەز تاشـباش ئاغـا پێـی دەگوتم:"خـەلیل، ئـەتۆ شـانۆباهۆی حـەزرەتی عـەلیت پێوەیـە." ئیـدی ئێـستا پـیر بـووین، مـردووین. یارمەتیم دە حەمە. کوڕەکەی تاشباشـە جوامێرەکـەم. باپیرەت لـەبیرە؟ کـە لـە دوورەوە پەیـدا دەبـوو دەتگوت وەزیری مەزن دێ. لە لای حوکمەت زۆر قسەی دەڕۆیی. ئەو کوێخا خدرە یەزیـدە، ئـەوە بابـە گەورەت کردییە بەلاّی سەرمان. ئـەو کـە دەهاتـە ئـەو گونـدە حـاکم جـووت پـێ لەبـەری هەڵدەسـتا و دەیگوت:" فەرموو تاشباش ئاغا."

"کوڕم، ئەمن درۆم لەگەڵ تۆ پێ ناکرێ. ئەمن ئیزگیلەکەم درەنگ بردە لای کوێخا. بـڕوات بێ لە رقەوە نەبوو. لە پیری و پەککەوتەیم بوو. بە ئانقەست درەنـگ بـردم و گوندییـەکانم ئـاوا سەرگەردان کرد و بێ لۆکەم هێشتنەوە. فریام کەوە رۆڵە.

تاشباش ئۆغلو دەمی بردە بن گوێی و پێکەنی و بە دەنگێکی نەرم گوتی:

ـ مەترسە مام خەلیل. تۆ لەهیچ مەترسە. درەنگ هاتنی ئێمە خەتای تۆ نییە. ئەگەر ئەو کەڵەکێکی لە بن سەری دا نەبایە، چما چاوەڕێی ئیزگلیەکەی تۆ دەبوو؟ چما ئـەو نـازانێ کـەی لۆکە دەپشکوێ؟

مام خەلیل بە تووڕەییەوە گوتی:

ـــنەخێر نـازانێ. جگـە لـەمن کـەس نـازانێ کـەی لۆکـە دەپـشکوێ. ئـەمن گوندییـەکانم وەدرەنگی خست.

تاشباش ئۆغلو:

ـ ئەرێ ئەوە شێت بووی مام خەلیل؟ مێشکت تێك چووە؟ ئەگەر ئـەو بەئانقەسـت درەنـگ نەیهێناوین، ئەدی بۆ لێرە رایگرتووین؟ پێت وایە ئەونازانێ کەنگێ لۆکە دەپشکوێ؟

مام خەلیل بە تووڕەییەوە گوڕاندی:

ـ نەخێر نازانێ. نەوەڵا نازانێ. ئەو ئاگای لە هینی ژنەکەشی نییە. بۆ ئەو کێیە. کوڕی خلە چڵمنە ئیدی. هێشتا بۆنی شیری خاوی لە زاری دێ.

تاشباش ئۆغڵو:

ـ سەیرکە مام خەلیل. تووڕە مەبە و گوێ بدە من. ئەمن لە یەکی جێ متمانەم بیستووە:"لە ژنە چکۆڵەکەی کوێخا. بە خیزانەکەمی گوتبوو، گوێی لە قسەکانی سەفەر و بەکرە شێت بووە ئەو دەمەی پێکەوە قسەیان کردووە. کوێخا بە بەکرە شێتی گوتووە:"بەکراغا، ئەمساڵ دڵم زۆر لەو گوندییانە ناو ناخواتەوە. ئەگەر ئەمساڵ زووتر بگەینە چوکوور، دیارە زۆرن ئەو مەزرایانەی چاوەڕێی پاڵەن و ئەو دەم گوندی کوێیان کەیف بێنێ دەچن. ئێمەش دەست لە گونان درێژتر چمان پێ نابڕدرێ. ئەمن متمانەم بەو گوندییانە نییە. گوندی وەك مێگەل وان. یەکێکیان روو لەلایەك بکا، ئەویدی هەمووی وەدووی دەکەون و شوانیش پێیان ناوەستێ. بۆیە ئێمە ئەمساڵ دەبێ درەنگتر بگەینە چوکووراوا، بۆ ئەوەی دیهاتەکانی دیکە پێش ئێمە بگەنێ و مەزراکان بگرنەوە و هیچ شوێنێ نەمێنێ." و گوتوویەتی:"جا کە مەزرای دیکە نەمایەوە، گوندی ناچارن هەر بچنەوە ئەو مەزرایەی تۆ دیاری دەکەی." و فەرمانی بە بەکرە شێت دابوو:"ئەتۆ زووتر بچۆ چوکوور و مەزرایەك بگرە و هەتا هەموو مەزراکانی دیکە نەگیرێن مەیەوە لای ئێمە. کە دڵنیا بووی ئیدی مەزرایەکی بەتاڵ نەماوەتەوە، ئەو دەم دێیەوە لای خۆمان و بە گوندییەوە دادەگەڕێین و دەڵێین: ئەوەش مەزرا ئەگەر دەتانەوێ کار بکەن، ئەگەر ناشتانەوێ، خواتان لەگەڵ بێ."

ئەی مامە، بۆیەشە ئەوەندە رۆژە ئێمەی لێرە چاوەڕێ کردووە. جوان تێگەیشتی مام خەلیل؟ چما تۆ سەفەرناناسی چەندە فێڵەزانە. کەس بەنی ئەوی پێ با نادرێ... و داهاتەوە بە سرتە پێی گوت:

ـ تۆ دەزانی ژنە چکۆڵەکەی سەفەر کچە خاڵی منە؟ ئەوشتانە ئەو بە خیزانەکەی منی گوتوون. نەکەی دەنگێ بکەی. تێگەیشتی؟

جا بێ دەنگ بوو. هەروا بەبێ دەنگی راوەستابوون. دوایی تاشباش لەسەری رۆیی:

ـ ئەگەر ئەمساڵیش نەبوو، ساڵی دادێ پشتی دەشکێنم، مام خەلیل. بەڵام گوندی دەترسن. وای چاوترسێن کردوون کە لە پشتەملێی ئەو لەگەڵم هاودەنگن و لە لای ئەویش لای ئەو دەگرن. ناوێرن قسەیەك بکەن. خۆ جوان تێگەیشتی مام خەلیل؟ ئەو کابرایە بە حیزبەکەی پشت ئەستوورە و هەر دەڵێ:"دەتانکوژم، دەتاندەم لە دارتان بدەن. گەلەکۆمەگیتان لێ دەکەن." و ئەو خەڵکەش بڕوا دەکەن، ئەمن ئاخری توانیم بۆیان روون بکەمەوە کە ئەو سەردەم بەسەر چوو. سەیرکە،ـ تەنانەت تۆش دەترسی مام خەلیل. ئەوە دەلەرزێی.

مام خەلیل ئاخێکی قووڵی کێشا و گوتی:

ـ ئەو دەمداتە دەست گوندی بۆوەی لەتوپەتم بکەن. حەقیشیانە. کوڕەکەی تاشباشی خۆم. حەقیشیانە. ئەو نازانێ کەی لۆکە دەپشکوێ. نازانێ نا. هەر شتێکیشی کردبێ خەڵکەکە من دەناسن. ئەمن وەدرەنگیم خستن.

دەستەکانی لە دەستی تاشباش دەرینان و پیلی گرت:

ـ تکایەکم لێت هەیە. بۆ رزگارکردنی من درۆیان مەکە. مەڵێ ئەو هەتیوە سەفەرە دەزانێ کەی لۆکە گوڵ دەکا. ئەو قەت شتی وا نازانێ. ئەمن بە ئانقەست وەدرەنگیم خستن. مەحاڵە ئیزگلیل بە سەهوو بچێ. ئەمنیش بە سەهو ناچم. رۆژ و سەعاتیش هەڵە دەکەن بەڵام من هەڵە ناکەم و بەسەهو ناچم. ئێستا دەتوانی بەبێ ئەوەی ئابڕووم بەری لە چنگی گوندییانم رزگار بکەی؟ دەتوانی ئەمن کە پێیەکم لەسەر لێوی گۆڕە، بەبێ ئەوەی حەیا و ناموسم بەری، رزگارم بکەی؟ بەبێ پێچ و پەنا بڵێ مام خەلیل بە ئانقەست ئەو کارەی کردووە...

ئەو دەمداتە دەستیان لەتوپەتم بکەن. هەرنەبێ دەمدا لە دارم بدەن. ئەو درۆزنانییە، فێڵبازە. هەزار و یەك فرت و فێڵان دەکار دێنێ. ئێستاش ئەوە ژنەکەی خەڵەتاندووە و پێی گوتووە کە کاتی لۆکە پشکوتنێ دەزانێ. دەیەوێ ئەوەندە کارەش لە من زەوت بکا. خۆ تێگەیشتی، کوڕە ساویلکەکەی تاشباشە قارەمانەکەی من؟ جوان و زەریف گوێت لە قسەی من بوو؟ ئەو بەزەیی پێمدا نایە.

تاشباش هیوابڕاوانە و بە تووڕەییەوە گوڕاندی:

ـ خۆ دیتت. تەنانەت ناتوانم ترسی ئەو لە دڵی کابرایەکی ساردوگەرمی رۆژگار چاشتووی یەمەن دیتووی وەك تۆش بڕەوێنمەوە. مام خەلیل؟ ئەو تازە ناتوانێ کەس لە دار بدا. لە خۆڕایی ناشتوانێ دەست و پێی کەس ببەستێ و بینێرێتە سەربازی. ناشتوانێ گەلەکۆمەگی لەکەس بکا. ناشتوانێ کەس بنێرێتە یەمەنێ. ئیتر یەمەن و شتی وا لە گۆڕێ نییە مام خەلیل مەترسە.

مام خەلیل ئاخێکی هیوابڕاوانەی هەڵکێشا و گوتی:

ـ خەتای منە رۆڵە. گوناحەکەم گەورەیە. کوڕە ژیرەکەم. گوندییەکانم ماڵ وێران کرد. مەهێڵە لەتوپەتم بکەن.

تاشباش بە دڵسۆزییەوە، دەستی بە سەرو ردێنی دا دەهێنا و خەفەتی ئەوەی دەخوارد کە نەیتوانیوە تێی بگەیەنێ بەناچارییەوە گوتی:

ـ مام خەلیل، پێت وایە ئەو چاوەڕێی ئیزگیلەکەی تۆ دەبوو؟ کوڕە وای بەقازانج بوو کە چاوەڕێ بێ. مەترسە مام خەلیل خەتای تۆ نییە.

مام خەلیل زۆر چاوەڕواننەکراو پاڵێکی پێوە نا و لەخۆی دوور خستەوە. دەنگی بەرز کردەوە:

ـ ئەو قسانەم بە مێشکیدا ناچن. ئەو هەموو ساڵێ چاوەڕێی ئیزگلیەکەی من دەبوو. لای هەموو گوندییەکانیش وای گوت.

لە ناکاو هەڵچوو و نەرم و نیانی و پاڕانەوەی پێوە نەما:

ـ ئەوە دەڵێی چی؟ دەتەوێ بڵێی مام خەلیل تێکچووە و قسەکانی پوولێکی رەش ناژێن؟ یانی ئەو وای لیهاتووە چاوەڕێی ئیزگیلەکەی من نەبێ؟ ئەتۆ پێت وایە ئەمن ئەویش و بابی ئەویش بە پیاو دەزانم؟ ئەو چووزانێ لۆکە پشکووتن چییە؟ هەر ئێوەش چیی لێ دەزانن:؟ هەی سپڵەیینە؟ چەندی چەند ساڵان کێ ئێوەی بردۆتە چوکوور بەبێ ئەوەی چووکەترین هەڵە بکا؟

بەبۆڵەبۆڵ لەسەری رۆیی:

ـ جا وەرن بمکوژن. بمکوژن و نەجاتم دەن. وەك سەگ بمخۆن.

جا بە جوێندان و بە لارەلار و بە پەلە لە تاشباش دوور کەوتەوە و رۆیی.

بە تووڕەییەوە لە ماڵەکەی خۆی چووە ژوورێ.

ـ هەر بەیانی دەچمە ئەو گۆڕەپانە و هاوار دەکەم، خەلکینە، گوندییە بێ ناموسەکان، خەلکی سپڵە، ئەوە منم. لەو گۆڕەپانەدا راوەستاوم. چاوەڕێی چین دەی وەرن لەتوپەتم بکەن دەی.

بەبێ ئەوە وەڵامی پرسیارەکانی کوڕ و بووکە سەرسوورماوەکەی بداتەوە، هەر بە جل و پێڵاوەوە چووە نێو جێوبانەکەی و لێفەکەی بەسەر خۆی کێشا. لە نیوەشەویش لای دابوو کە ئەو بە ترسەوە لە جێیەکەیدا گوێی هەڵخستبوو. لە بن لێوانەوە ورتە ورتی بوو:

ـ کوڕە چاو، هەتیوی تاشباشە گول. ئەو گەوادە، من نەبم کێ دەزانێ لۆکەی چوکووراوا کەنگێ گوڵ دەکا...؟ جا ئەتۆ هەر بڵێ هەتیوی سەفەر دەزانێ. دەی بچۆ وا بکە گوندیش بڕوا بکەن. ئەگەر دەتوانی وا بکە و رزگارم بکە. جا هەتیوە کێ بڕوات پێ دەکا؟ ئەو تووڕەهاتانەی تۆ چما منداڵیش بڕوایان پێ دەکا؟ هەتیوە گون ئەسپێونەی تاشباش؟ هەر بچۆ منداڵێکی سەر لانکان هەستێنە و لێی بپرسەو بڵێ:"منداڵەکە گیان، کێ دەزانێ لۆکە لە چوکوور کەنگێ دەپشکوێ؟" دەزانی چیت پێ دەڵێ؟ لەرێوە وەزمان دێ و دەڵێ:"مام خەلیل دەزانێ." قەشمەریت پێ دەکا، ئەدی هەیتووە گەوجەکەی تاشباش.

- هەتیو خۆت پێ چییە؟ پێت وایە دەڵێم بە سەهوو چوومە؟ نەخێر، ئەمن بە ئانقەست و لە ناچارییان گوندییەکانم وەدرەنگی خست. کوێخای گەورەی گوندیش هەر وای گوت:"لە نەزانییەوە نەبوو، بەڵکو بە ئانقەست دەیویست زەرەر لە گوندییەکان بدا." کێ بڕوا بە قسەی تۆ دەکا هەتیوی تاشباش؟ ئەتۆ لە کوێ وکوێخا لە کوێ؟ ئەتۆ هەر بە پەنجەیەکیشی نابی."

شادی و هیوایەکی لە دڵی گەڕا. شەوگار شەق ببوو. جگە لە دەنگی هەناسە و پرخە پرخی نووستووان هەست و خوست نەدەهات.

بە ئەسپایی لە جێوبانەکەی هاتە دەرێ. بە گاگۆڵکێ لە کەپرەکەی هاتە دەرێ. هەستا. چەند هەنگاوێك رۆیشت و راوەستا و لەجێی خۆی چەقی:

"دەبێ بچم و کوێخاکەی خۆم، سەفەرەکەی خۆم هەستێنم و پێی بڵێم:"لێم خۆش بە کوڕەکەی کوێخا خدر. هەموو "ماراش" و "قەیسەری" بگەڕێی پیاوێکی وەك تۆی لێ نییە. نەك کەس هێندەی تۆ ژیرە و نە کەسیش هێندە لیزان و زیرەك و بە تەگبیرە. لە دونیادا کەست لە گوێن نییە، کوڕەکەی کوێخا سەفەر. کوڕی براکەی من. ئەمن بە ئانقەست ئەوەم کرد. تۆش باش دەزانی. ئەتۆ ئاگات لە راز و نهێنیی دڵی هەمووان هەیە. تەنانەت ئەوەندە ژیر و تێگەیتشووی کە دەشزانی ئەو باڵندەی بە ئاسمانەوەیە بیر لە چی دەکاتەوە. ئەوەی کردم، هیچ خراپیم نەبوو، لە ناچاری وام کرد. ئێستاش بەو پیرییەم، بەو ردێنە سپییەمەوە، پیر و پەککەوتە، لەو شەوەدا کە خشۆك و خزۆك لە خەودان هاتووم و لە خەوم هەستاندووی. لەخەوم کردووی و پەنام بۆهێناوی. ئەتۆش بنیادەمیش دەناسی و سەگیش. ئەو تاشباشە خۆ مرۆڤ و گوو لێك ناکاتەوە. ئەوە ئەو تاشباشە تووتکە سەگە گڕوێیە ئەوانەی پێ گوتم. جا ئێستا ئەوە پشتی من و داری تۆ. حەز دەکەی بەیانی کە لە خەو هەستای هەر بەو دارەم دابکە و دواییش گوندی بەخەبەر بێنە و بڵێ، هەموو خەتای ئەو پیرە کافرەیە کە وەدرەنگی کەوتووین و لێمان قەوماوە بۆیە لە دارم داوە. جا بشڵێ لەسەر ئیزنی عوسمانی و لە سایەی سەری دەمیر فیراتەوە لە دارم داوە. حەقتە کوڕم. ئەتۆ کوڕی کوێخا خدری. تاجی سەری عوسمانی و دەمیرقیراتی. ناوبانگی تۆ گەیوەتە یەمەن و فەرەنگستانیش و بەهەموو دونیادا بڵاو بۆتەوە. ئەتۆ کڵاوە نۆپەڕەکە و جلوبەرگەکانی وەزیری مەزنت قابیلە. هەرکەس سەیرت بکا، لەجێی خۆی وشك دەبێو پێی وایە ئەتۆ پادشای یان وەزیری. ئەی پاتشا سیفەت، ئەتۆ وەزیرە تایبەتییەکەی ئەو گوندەی. لە خاکی عوسمانیدا تاقانەی. هەر بەراستیش وایە. ئەتۆ گلێنەی چاوی دەمیرقیراتی. ئەو

کابرایەی هاتە گوندەکەمان و هەموو پەنجەکانی پڕبوون لە ئەموستیلەی زێڕ چیی پێ وتی؟ گوتی تۆ دەستە راستی دەمیرقیراتی. گووی خوارد. ئەتۆ هەر خۆت دەمیرقیراتی و بەراستیش وایە."

"زەرنەقووتە پەنا دەباتە بن پنچکان و دڵە بچووکەکەی تریەترپ لێ دەدا. ئەو پنچکەش جووجەڵەکە ناداتە باڵندە راوکەرەکان. ئەمن ئەو زەرنەقووتەیەم و ئەتۆش ئەو پنچکە گەورەیەی. مەمدەرە دەست باز و باشوو. ئەمن دژی تۆ قسەم کردووە. جوێنیشم داوێ. جوێنم بە دایك و باب و باپیرانیشت داوە. وەڵڵا بە ئێسك و پرووسکەکانی کوێخا خەریش. یاخوا مووم لەسەری زمانی بێ. ئەمن تازە زانیومە لەم گوندەدا کێ پیاوە. لەمەودوا مام خەلیل بەو تەمەنەوە کە پێیەکی لەسەر لێوی گۆڕە، بەری پێیانت ماچ دەکا. گوێڕایەڵت دەبێ. هەر بڵێی بمرە دەمرێ."

"خودای گەورە، لە موڵکی عوسمانیدا و لە بەردەم دەمیرقیراتی جوانمدا، شمشێرەکەت تیژتر و قسەت بەبڕشتتر بکات. لەم شەو بەدواوە ئەو دوعایە دەکەم:

خودایە گیان، ئەو کوڕەی کوێخا دەست بۆ هەر شتێك بەرێ ببێتە زێڕ و دوژمنی وەبەر غەززەبی تۆ کەون."

ئەو هەتیوەی تاشباشیش بەو نێوگەڵە گڕوێیەوە لەهەمبەر تۆدا خۆی کردووەتە بنیادەم و بە پشتیوانیی حەوت هەشت کەسی خزم و کەسی چڵمنی خۆی دەنازێ. هەر باکیشت پێی نەبێ. ئەمن بە دووعا و نزاکانمەوە لە پشتتم.

"ئیشەڵڵا خودا لای دەمیرقیراتەکەمان خۆشەویست و ئازیزترت دەکا. ئەمنیش لەمەودوا هەر دەنگ بە دەمیرقیرات دەدەم. گوندییەکان لە دەوری خۆم کۆ دەکەمەوە و دەڵێم، برادەرینە، ئەمن زۆر ژیاوم، لە یەمەنێ هەرمن بە زیندوویی دەرچووم. سارد و گەرمی رۆژگارم چێشتووە و گەلێ دەرگام بە قوون کردووەتەوە. بڕوا بە قسەی من بکەن و لە ریبازی ئەو کوێخا دەمیرقیراتەمان لا مەدەن. رێگەی دەمیرقیرات رێیەکی گەورەیە، رێی خودایە. مەچنە سەر رێگەی ئەو هەتیوە عیسمەتە. ئەو موڵکی عوسمانیی بەبادا دا. خاکەکەی ئێمەشی وەك خاکەکەی بابی هەڵگرت و بە کافرانی بەخشی. هەر ئەو پادشایانە بوون وا میللەتی ئێمەیان بۆ یەمەنێ دوور خستەوە و لە سۆنگەی ئەوانەوە لە یەمەنێ ئەو خەڵکەی، کە ئێسك و پرووسکیشیان رزین و نەهاتنەوە. هەر ئەو عیسمەت پاشایە، سەردەستەی ئەوان بوو. دەڵێم هەر خۆم بەو چاوانەی خۆم دیتم برادەرینە. ئەگەر بڕوا بە قسەکانی من نەکەن، ئەدی بڕوا بە کێ دەکەن؟ ئەو میللەتی برد لە یۆنانێ بە کوشتنی

دان. له شەڕی یۆنان خوێن سەرانی دەبرد. لەسەر کێ؟ جا ئێستاش دەڵێن وەڵا عیسمەت پاشا کەیفی بە شەڕێ نایە. ئەی خەڵکینە، ئەی دەرو دراوسێ ژیرەکانی من، ئەگەر ئەو شەڕانی نەبوایە، ئەدی چۆن بوو بە پاشا. ئەگەر ئەو عیسمەتە خۆڕییە لە دەستی هاتبایە، لەو وڵاتە جگە لە خۆی نەیدەهێشت نێرەوەزێك* بە زیندوویی بمێنێتەوە. جووقەواری لە هەرهەمووومان دەبڕی. شوکری خودا دەمیرقیراتەکەی ئێمە، ئەسپی خۆی لینگ دا و فریای میللەت کەوت. دەڵێم ئێوە چۆن ئێستا دەتوانن لای عیسمەت گرن؟ هەرهەمووتان وەرنە ریزی دەمیرقیراتەوە. میللەتیش قسەی من لە گوێ دەگرن و ریز لەو ردێنە سپییەم دەگرن و بەو قسانەی من شان و شکۆی تۆش لای دەمیرقیرات بەرز دەبێتەوە. دەگاتە تەشقی ئاسمانێ. دەمیرقیراتیش قسەت لە قسەیدا ناکاتەوە... رزگارم بکە رۆڵەم. ئەگەر ئەتۆ لەو بەڵایەم رزگار بکەی بەڵێن و ئاد بێ لەمەودوا هەتا هەم گوندی درەنگ نەبەمە چوکوور.»

«خۆ گوێت لە قسەم بوو. جوان و زەریف گوێت لێ بوو کوێخای خۆم، سەفەراغای خۆم، یاخوا بە نۆکەرت بم.»

بە بێهێزی و بە ترس و لەرەزەوە، لە حاڵێکدا هەنگاێك دەڕۆیی و رادەوەستا سەیرێکی دەورویشتی خۆی دەکرد رۆیی هەتا گەیشتە بن ئەو دارەی کوێخا لە بنی خەوتبوو.

بەبێ ئەوەی وستەی بێ، برێك لەو لای دارەکەوە راوەستا. لە لایەکەوە گوێدرێژەکەی کوێخا بە دارێکەوە بەسترابۆوە و سەری بەردابۆوە و جووڵەی نەدەکرد. کوێخاش بێ و نەبێ لە نێوان هەر دوو ژنەکەیدا نوستبوو. چاوەکانی بچووك کردنەوەی و روانیی. توانیی ئەو جێوبانەی لە نزیك دارەکەوە راخرابوو، بناسێتەوە. لە جێوبانەکەدا دیار بوو سێ کەس خەوتبوون. پشووی لە سینگیدا قەتیس کرد و دوو شەقاوی دیکەش چووە پێشێ. ئەوجار بە پاریزەوە بە دەوری دارەکەدا خولایەوە و چووە ژوور سەریان. کوێخا بەحاڵ هەناسەی دەکێشا.

مام خەلیل شانی وەدارەکەوە دا و چاوی بڕییە جێوبانەکە. وردە وردە ئەوانەی لە نوێنەکەدا نوستبوون لێکی دەکردنەوە و باشتر دەیدیتن. سەروقژە چرویرەکەی ژنە گچکەی کوێخا هەموو سەرینەکە و بەشێك لە دەموچاوی کوێخاشی داپۆشیبوو. مام خەلیل چیی سەیریانی دەکرد هەموو گیانی دەلەرزی. بۆ ئەوەی بەخەبەری بێنێ، دووجاران بە زۆری کۆخی بەڵام کۆخینەکان

---

*نێرەودز: نێرینە. پیاو و گەنجی نێر

وەك خۆی دەیویست توند نەبوون. هەر دەتگوت لە گەرووی ئەوەوە نەهاتوونە دەرێ. بەڵام هەر لەو کۆخینە کزەوە وا ترسا هەمووگیانی مچوڕکەی کرد.

ترسەکە وردە وردە هەموو گیانی دەتەنی. لە دڵیدا گوتی:"خۆزگە ئەتۆش وەك خەڵکی پیاوێکی باش و بەبەزەیی بای و ئەوەندە بەدفەڕ و نارەسەن نەبوای. جا ئەو دەم ئەتۆش وەك خەڵکی دیکە قسەت لەگەڵ دەهات و دڵتم دەکردە دڵی فریشتە."

ویستی جارێکی دیکەش بکۆخێ، بەڵام کۆخینەکە لە گەروویدا قەتیس بوو:"ئەگەر ئێستا بەخەبەر بێ و هاوار بکا و بڵێ ئەو مام خەلیلەی ئێسك و پرووسکی بابمی لە گۆڕدا وەنامان هێناوە و گوندەکەی منی درەنگ هێناوەتە ئێرە، ئەوەتا بە پێی خۆی هاتووە. گزیر، هەستە، دەستەکانی لە پشتەوە شەتەك بدە و بیبە بیدە دەستی دەمیرقیرات... تەنانەت نەهێڵێ تاقە قسەیەکیش بکەم، جا قوڕی کوێ وەسەر بکەم؟"

بە دەستی راستەی لقێکی شکاوەی توند کرد. هەستی کرد کوێخا لە جێیەکەیدا تەنیشتاوتەنیشتێکی کرد:"خوایە، خەریکە بەخەبەر دێ. ئەی ماڵی وێران، ئەوە هەڵدەستێ."

لەسەر عەرزەکە چۆکی دادا. نەیدەتوانی چاو لە جێوبانەکە هەڵگرێ. لە پشت دارەکە مات بوو. دوایی بەسپایی خۆی خزاندە نێو تاریکایی و دار و دەوەنەکانی پشتەوەیان. تەواو هەستی راگرتبوو نەکا خشپەیەکی بێ، بەڵام کە قاچی لە پنچکێ هەڵدەنگوت، پێی وابوو دەنگێکی سامناك بەرز بۆتەوە.

گیانی گەییە سەر لێوی هەتا بە نێو دار و دەوەنەکەدا خۆی دوورتر خستەوە. لەوێوە بەرەودەم راکشا. گوێی بە عەرزەکەوە نووساندبوو بۆوەی بزانێ بەو دەنگەدەنگەی خۆی کوێخای بەخەبەر هێناوە یان نا؟ بەخۆی گوت:"ئاخ دەروجیران، خەریکە رۆژ دەبێتەوە. فریام کەون."

هەستا. بە کووڕەکووڕ بە نێو دەوەنجارەکەدا کە هەر هەوڵیشی بوو کەس نەیبینێ ئاوەژووی نێو چەمەکە بۆوە. کە گەیشتە نێوماڵی چۆمەکە، خۆی قیت کردەوە. ئیتر دەرباز ببوو. بەسەر چەوەکەدا دەڕۆیی بەڵام لەو بێدەنگییەی شەوێدا چەوەکان لە بن پێی ئەو دەنگێکی سەیریان هەبوو. دوورتر کەوتەوە.

ژانێك لە هەناوی گەڕابوو. هەر لەوێ دانیشت، دۆخینەکەی کردەوە و هەڵترووشکا. خۆی پێ سووك نەدەکرا. بەخۆی گوت:"کوڕە خۆ ترس نایەڵێ پیاو خۆشی بەتاڵ بکاتەوە. باشە ئەگەر هەستابایە و کەوتبامە دەستی، بەو نیوەشەوە چ قەرەچی ئۆینێکی وەڕێ دەخست. جا چا نەبوو ئەو مێشکە بۆشەی من ئاخری ئەقڵێکی وەبەر هاتەوە و توانیم گیانی شیرینم رزگار بکەم."

ئاخرییەکەی توانیی هەڵیڕێژێ. بە چەند وردکە دار و بەرد خۆی خاوێن کردەوە و خۆشییەکی لەدڵی

گەڕابوو کە رزگاری ببوو. خەریك بوو دەست بنێتە بن گوێی و تێی چریکێنێ لە هەوایەك. دوایی بەرەو ئەو ئاوەی بە نێوەڕاستی رووبارەکەدا دەڕۆیی وەڕێ و ئەو چەند هەنگاوێك تێیداچووبووە پێشێ، داهاتەوە و چەند مست ئاوی بە دەموچاوی خۆی داکرد و جوان شوشتی.

دیسان برێك باشتر بۆوە.

ئەستێرەکان بە ئاسمانەوە شەبەنگیان داویشت:"ئەو ئاسمانەی چوکووراواش چەندە پڕ ئەستێرەیە. چەندەش دوورن. لەو سەری دنیان. ئای مالۆێران. ئەی لەو ئەستێرانە..."

هەتا رۆژ بۆوە، بە ئەسپایی و بە شـ...ـەل لە نێومالّی چۆمەکە چووە دەرێ. گوێی بە زەوییەوە نا و بەجوانی گوێی لە هەر چوار تەنیشت هەڵخست. ئیدی زۆر لە گوندییەکان دوور کەوتبۆوە. قوونی دایە سەر بەردێك و دەستی بە ردێنیدا هێنا. دڵخۆشییەکەی پتر بوو. شادی و گەشییەك بوو لە گوێن سەردەمی لاوەتییەکەی. تاو کە تازە هەلاّتبوو، لە نێومالّی چۆمەکەی دا و رووناکایی خستە تەرکی ئەو تەنکاوەی بە ناوەڕاستەکەیدا دەڕۆیی. ساتێك دواتر هەموو ولاّت نوقمی تیشکی خۆرەتاو بوو. هەوا خەریك بوو گەرم دەبوو:

"خوایە گیان هەزار جاران شوکرت، نەجاتت دام. دەنا ئەو کوێخا بێ دین وئیمانە بە دەستی بەستراوەوە دەیهاویشتمە بەردەستی ئەو گوندییانە و ئەوانیش لەتوپەتیان دەکردم... ئەی دەلیلی داماوان و دەست و پێی بێ دەست و پێ و لێقەوماوان... ئەتۆ ژێرت کردمەوە و هێزت نایە بەر ئەژنۆم و رزگارت کردم... هەزاران جار شوکرت..."

دەستەکانی بەرەو ئاسمان هەڵێنان و بە زاری داپچڕاوەوە، ماوەیەك لێوەکانی لەرینەوە و دوعای کرد. دوایش وردە وردە دەستەکانی بە ردێنیدا هاتنە خوارێ، ردێنی خۆی دامالّی و دوایش دەستە بێهێزەکانی بەولاولایدا شۆڕ بوونەوە، روخساری هەر دەهات و خەفەتبارتر دەبوو، شادی و گەشییەکەی سەردەمی لاوەتیی سڕابۆوە و ترسێکی قورس و بەژان، ترسی کەسێك کە بە تاقی تەنێ لە نێوەڕاستی دنیایەکدا مابێتەوە و نوقمی تەنیایی و داماوی بێت و کەسی لێ دیار نەبێ، جێی ئەو شادییەی گرتەوە.

ئێستا دوور لە خەڵکی ئاوایی، دوور لە مرۆڤەکان، بەبێ هیچ ئاشنا و رۆشنایەك، لە چەقی ئەو چیا و چۆڵەدا ماوەتەوە و پارووە نانێك نییە بیهاوێتە بەر دڵی. ئێستا بەو جەستە پیر و کەنفت و پەککەوتەیە دەتوانێ بچێتە کوێ و چیی پێ دەکرێ؟...

# ١٦

تاشباش ئۆغڵو بەر لە تاوهەڵاتێ لە خەو هەستا. داوای لە ژنەکەی کرد ئەو پانتۆڵەی بداتێ کە لە قاچاغچییەکانی کڕیبوو و تەنیا لە شایی و زەماوەند و جێژناندا لەبەری دەکرد و دەوراندەوری گیرفانەکانی دوورابوو. لەبەری کرد. کراسێکی خاوێن و بێ پینەی هەڵبژارد، تەپوتۆزی کڵاشەکانیی تەکاند و وەبریقەبریقی خستنەوە. گۆرییەوە گولگولییەکانیشی لە بوخچەکە هێنا دەرێ. بۆ یەکەمین جار لەم سەفەرەدا، بە سابوون دەموچاوی شوشت. بە هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر گۆشە لوول بووەکەی کڵاوەکەی راست کردەوە. تەزبیحەکەشی بە کۆنەپەڕۆیەك جوان و زەریف خاوێن کردەوە و وەبریقەی خست. دەبوایە ردێنیشی تیف تیفە بدا بەڵام کات نەبوو. لە بەردەم ئاوێنەیەکی بچووکی گیرفانیدا، ماوەیەك زۆر هەتا بەیان ئەنگووت، هەر سمێڵانی بادا. لە ئاوێنەکەدا خۆی مرچ و مۆڕ دەکردەوە. نێوچاوانی تێك نا و بەبێ چاوترووکاندنێك، ماوەیەك راستەوخۆ و بە غروورەوە سەیری ئاوێنەکەی کرد. ئاخریەکەی بۆ ئەوەی رێگارۆیشتنەکەی لە رۆیشتنی سەربازان بچێ، ماوەیەك پیاسەی کرد. کە قایل بوو بەوەی قەڵافەتێکی بەهەیبەتی بەخۆوە گرتووە، بانگی ئۆکسووز دۆرانی کرد.

"کوڕە هۆی ئۆکسوز ئۆغلان، دراوسێیێکەم. عوسمانۆك و کەل ئاشیق و ویجی ویجی مچەش بانگ بکە. بانگی قیرسمایلیش بکە با بێ. گۆملوکسیزئۆغلووش با بێ. "هەوا گۆڕ" و نەنە زەڵەجە و بوکلۆ حوسێنیش با بێن. هەرچی تۆزە پیاوەتییەك لەخۆیدا شك دەبا بێ."

ئۆکسوز دۆران گوتی:

- پێم گوتن، دێن.

بڕێك دواتر لە نێومالی چۆمەکە جەماوەرێك بە ژن و منداڵەوە کۆ بوونەوە. پشتیان بە کەنداڵەکەوە دا و دانیشتن. تاشباش ئۆغڵو لە بێدەنگییەکی قووڵدا ماوەیەك بە تەزبێحە درشتەکەی تەقەتەقی کرد و دوایی هەستا و دەستی پێ کرد:

ـ ئەمن لە داخی ئەنگۆ وەزگم دا.

جموجۆڵێك كەوتە نێو خەڵكەكەوە وهەر كەسەو ورتەیەكی لێوە هات. تاشباش هەر وا تەزبێحی خست و چاوەڕێی كرد هەتا هەمووان بێدەنگ بوون.

ـ كوڕە لە داخی ئێوە فججەم كرد. لە رووبەڕووم هاودەنگی منن و جنێوان بە سەفەری دەدەن و دەڵێن تەڵاقمان بكەوێ ئەگەر رەگەڵی بكەوین. دوایی ئەو دێ و لە بەردەمتان قوت دەبێتەوە و دوو قسان دەكا، دەستبەجێ بەبێ بیركردنەوە دەچنە سەر قسەی ئەو و بڵاوەی دەكەن. ئەوە چەندی چەند رۆژە ئەنگۆی لێرە سەرگەردان راگرتووە. ئەو لە پێشدا وەدرەنگیی خستین. زۆر دوای گوندەكانی دیكە هێنیاینی، دواییش تاوانەكەی خستە ئەستۆی مام خەلیل. ئەو پیرەمێردە داماوە.

دەنگێكی تێكەڵ بە شادی و گاڵتە هەستا:

ـ مام خەلیل لە ترسان رای كردووە و وەكێوان كەوتووە. بووكەكەی بەیانی كە هەڵدەستێ دەبینێ مام خەلیل لە جێیەكەی خۆیدا نییە. وەك دەشڵێن شەوی پێشوو هەر ورتەورتی بووە. هەرچی لێی گەڕاون و وڵاتیان سەنگ و سووژن داوە نەیاندۆزیوەتەوە.

تاشباش ئۆغڵو ئاخێكی هەڵكێشا و لەسەری رۆیی:

ـ ئەو پیرە داماوە لە دەستی زوڵم و زۆر رای كردووە. وەكێوان كەوتووە. خۆ دیتان چیی لێ هات. جارێ چیتان دیتووە. پیرەمێردە لە بیابانەكانی چوكووردا سەری لێ شێواوە. هیچ دووریش نییە بمرێ و لەناو بچێ. ئێستا ئەمن پێتان دەڵێم سەفەر بۆچی ئێمەی وەدرەنگی خست.

جا ئەوجار بە تێروتەسەلی و بێ پسانەوە و بەبێ پشوودان بە هەڵچوونەوە، چۆنی بۆ مام خەلیلی روون كردبۆوە، ئاواش بۆ گوندییەكانی روون كردەوە كە بۆچی كوێخا لێرە چاوەڕێی كردوون و دواییش ئاوا كۆتایی بە قسەكانی هێنا:

ـ بڕواتان بە قسەكانم بێ. ئەمن لە جێیەكی باوەڕپێكراوم بیستووە. لەگەڵ بەكرە شێت كلكیان تێكاڵاندووە. بە هاودەستیی یەكتری ئەو درۆیەیان بۆ گوندییەكان بەسەر یەكەوە ناوە. جا با بڵێین ئەوە درۆیە، ئەدی بۆچی ئێمەی لێرە چاوەڕێ كردووە؟ هیچ بیرتان لێ كردووەتەوە؟

كەس سەری بەرز نەكردەوە و وەڵامی نەدایەوە. تاشباش ئۆغڵو هەر وا بە هەژاوی و لیبڕاوییەوە گوتی:

ـ برادەرینە، ئەمن بەیانی خزم و كەسوكاری خۆم و ئەو دەرودراوسێیانەم كە متمانەیان پێمە هەڵدەگرم و ئاودیوی چوكوور دەبم. دەبێ بچین مەزرایەكی بۆخۆمان بگرین. ئەگەرچی تا

ئێستا مەزرا نەماوە نەگیرابێتەوە، بەڵام ئێمە بەختی خۆمان تاقی دەکەینەوە. خۆ ناکرێ هەر ئاوا بین. زۆر لەمێژە ئەو کابرایە خوێنی ئێمە دەمژێ. هەرکەس پێی خۆشە لەگەڵ من بێ. هەرکەسیش نایە خودای لەگەڵ بێ. جوان و زەریف گوێتان لێ بوو؟

بێدەنگییەك باڵی بەسەردا کێشان. لە ناکاو ورتەورت و جموجۆڵێکیان تێ کەوت. نیگای تیژ و هیوادارانەی تاشباش ئۆغڵو لە نیگای یەك بە یەکیان ئاڵقا. ئەو جموجۆڵ و دەنگەدەنگە هەر وا هەبوو تا تاو هەڵات. تاشباش ئۆغڵو هەر وەکی بەسەرپێوە راوەستابوو، بەبێ ئەوەی قسەیەك بکا، تەزبێحی دەخست و جگەرەی دادەگیرساند. دوایی ڤیرسمایل هاتە لای و گوتی:

ـ هاورێ، ئەمن زۆر لە مێژ بوو لایەنگری کوێخای بووم، بەڵام لەمەودوا لای تۆ دەگرم. ئەتۆ راست دەکەی. خودا پشت و پەنات بێ، تۆراست دەکەی.

لەو جەنگەیەدا دیسانەکە بێدەنگییەکەی زاڵ بۆوە و خەڵك چاویان لە تاشباش و ڤیرسمایل بڕی. کە قسەکانی ڤیرسمایل تەواو بوون، هەموو خەڵکەکە هاودەنگ گوتیان:

ـ بەیانی هەموومان پێکەوە دەڕۆین. کوێخاش چ ڕێیەکی سەختە بیگرێ. حەزدەکا با بماندا هەموومان لەدار بدەن. هەر دەڕۆین.

ـ چەقۆ گەیوەتە ئێسقانمان. ئیدی بەسە.

ـ گوندیی دیکە ئەوە دە ڕۆژە لە پەمۆ ڕنینەوەن.

ـ کات بەسەر چوو. ئێمە تازە دەمانەوێ لەمەودوا بچین و لۆکەی بڕنینەوە.

ـ ئەدی،... دەپسێین.

ـ ئاه و هەناسەی ئەو گوندە داوێنی دەگرێ....

ـ ئاه و ناڵەی بێوەژن و هەتیو و هەتیوباران داوێنی ئەو کافری بیدینە دەگرێ...

ـ هەم حەقی خەڵکی خواردووە و هەم خوێنی مژیون...

ـ بۆخۆی دەست بۆ قۆزاخەلۆکەیەك نابا، بەڵام ئەوی پارەی ئێمەیە لێمانی دەستێنێ و دەیباتەوە.

ـ پارەی خۆمان...

ـ ئەوکابرایە چەندی چەند ساڵە ماڵوێرانی کردووین..

ـ یاخودا بیدا بە داوودەرمان.

ـ یاخودا بەقوزەڵقۆرتی بێ.

ـ یاخوا سیبەرۆ بگرێ...

- یاخودا زەلیلی سەر جێ بێ...
- یاخودا کەوتوویی بگرێ و حەوت ساڵ نەتوانێ سەر هەڵێنێ...
- یاخودا پێ لە هەرکوێ دابنێ ببێتە سەهۆڵبەندان و باو بۆران...
- یاخودا گۆج و ئیفلیج بێ...
- کورە وا مەڵێن... وا مەڵێن خزمینە، پیاوێکی باشە هەر ئەو کارانەی خراپن.
- لای حوکمەت قسەی دەڕوا، بەڵام جگە لە خۆی بیر لە کەس ناکاتەوە.
- یاخودا سوورە کوانی لێ بێ و زەلیلی سەر جێ بێ... هەموو گیانی دابڕزێ و وەك گەڵای داران هەڵوەرێ. یاخوا گول بێ وسەگ بیزی نەیە سەیری بکا.

بەو پەڕی توورەییەوە، ماوەیەکی زۆر تووك و نەفرەتیان لە کوێخا کرد و بڕیاریاندا بەیانی هەمووان بەرەو چوکووراوا داگەڕێن. یەك یەك و دووان دووان بڵاوەیان کرد.

تاشباش ئۆغلۆ گوێی لەو تووك و نەفرەتانە پڕ ببوو، بەڵام کە ئەمجارەیان دیتی قیرسمایل لای ئەوی گرتووە هیوایەکی لەدڵی گەڕا. خۆ ئەگەر یەك نەفەریشی لەگەڵ نەڕۆیبایە، دیسان ئەو بڕیاری خۆی دابوو لە کوێخا جوێ ببێتەوە، ئەگەر هیچیشی لەدەست نەهاتبایە، دەچوو لەگەڵ خەڵکی گوندەکانی دیکە کاری دەکرد. دیارە ئەوەش زۆر خۆش نەبوو. بۆ ئەویش سەرکزی بوو. هەمیشە لەسەر ئەو جۆرە کەسانە دەیانگوت:"ئەوە خەڵکی گوندەکەیان وەخۆیان نەکردوون و دێ بەدەریان کردووە.... پیاوی ئاوا هیچی لێ هەڵناوەرێ. کەس نازانێ چ کارەیە... ئاخۆ دزە، حیزە، یاغییە؟یا... ئیتر کەس بەقای پێ نەدەکرد. بەڵام چش.

ڕێك لەو دەمەیدا ئەو قسانە دەکا کوێخا دەستبەجێ زانیبووی قیرسمایل لای تاشباشی گرتووە، بۆیە خەریك بوو لە توورەییان شێت بێ:

- خۆڕی، دەزانی کێ کچەکەتی لە دەست ئەو نێرەکەرانە ڕزگار کرد؟... کێ لە بن جەندرمەی هێنا دەرێ؟... ئەگەر نەمدەهێنایە دەرێ، دێ بە دێیان دەگێڕا و لە هەموو کوێستانی تۆرووسدا پیاو نەدەما دەستی نەگەیەنێتێ... خۆڕی، وەڵڵا من نەبایەم ئەو کچەتیوەت ڕێی دەکەوتە قەحپەخانەکانی ئەدەنە یان لە بن بەردێك مەیتەکەیت دەدۆزییەوە. کچێکی پێنج مانگان بە دەشت و کێوانەوە هەر ساتەی لەبن یەکێکدا بوویێ، ساڵێك، تەنانەت ساڵ و ئێستاش هەر وایە. جارێ ئەوە بە زۆڵێکەوە گەڕاوەتەوە، وەڵڵاهی ئەگەر من نەدەبووم، بە پێنج زۆڵەوە دەگەڕایەوە کە هەر زۆڵەی لە بابێك بوایەن. کورە قیر سمایلی خۆڕی ئەتۆش؟ دا ئەو خۆڕیەم بۆ بانگ بکەنە ئێرە و سەری شۆڕکەن. چڵ بە چڵ ردێنی دەرکێشن. با وەك گا بهۆڕێنێ. حەقی خۆیەتی ئەو گەوادە.

وەك شیر هەڵچووبوو. گۆڕاندی:

- گزیر.

گزیر کە هات و لەبەردەمی دەستەونەزەر راوەستا، یەکسەر رقەکەی نیشتەوە. هاتەوە سەرخۆ: سرکەی تیژ، گۆزەکەی خۆی دەخواتەوە. رق ماڵ وێرانکەرە. بنیادەم نابێ بە تووڕەیی بەڵکو دەبێ بە سیاسەت کاران راپەڕێنێ. بابی کوێخا خدر هەمیشە پێی دەگوت:"رۆڵە، بیکە ئاڵقەی گوێت، بەتووڕەیی وەڵامی تووڕەیی مەدەرەوە، مار بە زاری خۆش لە کون دێتە دەرێ." و گوتبووشی:"تووڕەیی بۆ کوێخایان نەهاتووە و تایبەتی ئاغاوات و عوسمانییەکانە." راستی دەکرد.

پاشگەز بۆوە وگزیری نەنارده شوێن قیرسمایل.

- گزیرباشی،

- ئەمرکە گەورەم.

- ئێستا دەبێ باڵ بگری و بفڕی، لەهیچ کوێ مەحتەل نەبی و راستەوڕێ بچیتە خواروو، خۆت بگەیێنیتە مەزراکەی "میرالای" و بەکرە شێت ببینی و پێی بڵێی:"کار لە کاریێ ترازاوە، خۆت بگەیەنەوە لامان." پێی بڵێ ئەگەر لایەکی ردێنی تاشیوە لایەکەی دیکەی لێرە بتاشێ، ئەگەر کێلگەی بەتاڵیش مابێ هەر بێتەوە. بەر لەوەی رۆژ بێتەوە خۆی بگەیێنێتەوە ئێرە. ئەسپێك لە ئاغا وەرگرێ و خۆی بگەیێنێتەوە. یاڵڵا وەڕێ کەوە.

"گوو بە گۆڕی بابت قیر سمایل، کوڕە خۆ بنیادەم جێی بەقایە نین."

ئەو رۆیشتبا ئیدی کەسی وا نەدەما کوێخا متمانەی پێیان بێ. هەموو گوندییەکان سەهلە، بگرە نیوەشیان، تەنانەت یەك لەسەر سێشیان، ئەگەر برۆن، ئەو لە مەزرای میرالای سەگ و شوانی دێتەوە. تەنانەت یەك کەسیشی لێ جوێ بێتەوە، لای ئاغاکان حەیای دەچێ. ئێستا هەموان وادەزانن ئەو لای گوندییەکان وەك بابێکی باش خۆشەویستە و سەرۆکێکە کەس لە قسەی دەرناچێ. :"جا باشە چار چییە؟ هەی دایك و بابت بە لەعنەت بن، گوو بە گۆڕی ئابا و ئەژدادت تاشباش ئۆغلۆ. ئاخ "عەلی"یە درێژی هەتیوی بلە، یاخوا قەت نەگەیە ئێرە، هەتیوی ئەو دزە خوێڕییەی هەموو چوکووراوای رووت کرد. هەتیوی ئەو قەسابی بنیادەمانە، ئەو ئاوری بن کایە، ئەو هیچ و پووچە فێڵەزانەی پێی عەیب بوو سەر هەڵێنێ و سەیری چاوی خەڵکی بکا، هەتیوی ئەو بلەیە، ئەو راکردووەی یەمەنێ، خیانەتکاری نیشتمان... هەموو ئەو ئاورانەی لە گۆڕی تۆ هەڵدابیسێن، ئەوە گووی تۆیە دەیشێلم. ئەوە تۆی ئەو قسانەت لە گوێیان خوێندووە و ئەگینا ئەو دیهاتییە بەستەزمانانە چووزانن سەگ و سەگبابێتی بکەن؟ خودا ئەسپەکەتی کوشت. گیانیشت لێ

دەستێنێ. دەبێ سزاکەی ببینی. خودا بکا بەو دایکە قەحپەیەتەوە بگەیە ئێرە، شەرت بێ بەلآیەکت بەسەر دێنم با بە دەواری شڕی نەکردبێ و وا دەربەدەرت دەکەم بۆ ئەژدادت تەمبێ بی... جا راوەستە دەیبینی. ئەو خودایە کێوان دەبینێ بەفریان تێ دەکا. ئەمنیش کەری خۆم باش دەناسم. ئەتۆ دەبێ گوللەیەکی گەرمت لێ بدرێ، رێك لە گۆی مەمك. هەلاهەلا بی. هەر ئەوەت قابیلە. راوەستە کەنگر وماست بە وەختی خۆی."

"ئەو کارە بە کۆ کردنەوەی گوندی و قسە و وتاردان جێبەجێ نابێ. دەبێ رێو شوێنێکی دیکەی بۆ بکێشی. نابێ ئیزن بدەی تەنانەت یەك کەسیشیان لێ جوێ بێتەوە. دەنا چ بە کوڕی میرالای بلێم و چۆن چاو لە چاوی بکەم. بە تایبەتی ئەو باوەڕپێکراوی دەمیرقیراتە. حوکمەت قسەی لە قسەیدا ناکاتەوە. بەلآم لەگەڵ هەموو ئەو قسانەشدا، زەوی و زارەکەی ئەو هیچی پێوە نییە. چۆنە بەو هەمووە ساڵە نەیتوانیوە زەوییەکی باش بۆخۆی دەستەبەر بکا. ئەگەر زەوییەکەی بێ حاسڵ نەبوایە، خۆ کەر نەبوو ئەو هەمووە پارەیە بدا. گوندی بۆ لۆکەچنینەوە لە کێڵگەی باشدا ملی خۆیان دەشکێنن."

بەردەوام قەپی بە لەپی دەستیدا دەگرت. بەشوێن رێگە چارەیەکەوە بوو بەلآم نەیدەزانی چ بکا. دیسان وەك شێر هەڵچۆوە. جار هەڵدەچوو و جار دەنیشتەوە:"چارەئەوەیە سەردەستەی ئەو گەوادانە بێنی لێرە لە بەر چاوی گەورە و چووکە دارکارییەکی باشیان بکەی و ئاخ و ئۆخیان لێ ببڕی. بەلآم ناکرێ. گوندی هەمیشە بۆ ئەوە نابێ ترسیان وەبەر بنێی. بە تایبەتی کە هەوسار دەپسێنن، ئیدی لەهیچ ناپرینگێنەوە. هەر ئەوەندەیە شتێك بچێتە مێشکیانەوە، ئیدی سەریشیان بچێ گەڕانەوەیان نییە."

"دەبێ بە کوڕەکەی میرالای بلێم و هەمووان بدەمە دەست پۆلیس... گوندی هێندەی لە حوکمەت دەترسن هێندە لە خودای ناترسن. بەلآم پیاوەکانی عیسمەت* کوا دەهێڵن. دەسبەجێ هەر بە درۆ و بە سیاسەتیش، لای گوندییەکان دەگرن. وەك بلێی گوندییەکانی ئێمە برای دایی و بابیی ئەو گەوادانە بن. سیاسەت کە تێکەڵی کاروبار بوو ئیدی هیچ."

"کوڕە ئەو گوندییانە هەر ئەوەندەیە خوێن بەرچاویان بگرێ، ئیدی لە هیچ شتێ سڵ ناکەنەوە. تا لێواری مەرگیش دەچن. سەیری ئەو قەلآفەتەیان... تۆخودا سەیریان کە، ئەو نێوچاوانەیان گووی لێ دەبارێ... ئاخ، ئاخ، ئەگەر کاتێکی دیکە وەدەستم دەکەوتن، ئەودەم پێم دەگوتن... سەگی سەگبابینە..."

---

*عیسمەت: مەبەست "عیسمەت ئینۆنۆ"ی رێبەری ئەو کاتی حیزبی کۆماریخوازی گەلە.

"ئەگەر بتەوێ شوولکێك بشکێنی، زۆر ئاسان دەشکێ، بەڵام پۆلە شولکێك پێکەوە بن بە فیلەنتەریش ناشکێ. ئەگەر دووسەت دانە پێکەوەبنێی هەر محاڵە بتوانی بیانشکێنی. ئێستا ئەوانە کۆبوونەتەوە و پشتیان پێکەوە ناوە. تێکناشکێن. ئێستا دەبێ یەك بە یەك بیانگری و رازییان بکەی. ئاوا باشتر نییە؟..."

"مار بە زمانی خۆش لە کونێ دێتە دەرێ. ئەوە قسەیەکی جوانە. دەبێ مێو نەرم بی. توندوتیژییەکە بۆ دوایی. نۆرەی ئەویش دێ. دەبێ تۆڵەی هەموو ئەو شتانەیان لێ بکەمەوە و لە کونەلووتیانەوە دەری بێنمەوە. جارێ دەبێ خۆمانە بی، وایان خۆ لەگەڵ رێکخەی، هەر کەس بتبینێ و قسەت لەگەڵ بکا، فرمێسکی بێتەخوارێ. فەخری بەگی دەمیرقیرات دەڵێ:"بەرێوەبردن واتە هەڵسوکەوتی بەجێ و رێ." بیبەزەیی و خوێنمژی و دڕندەیی بەکاتی خۆی و میهرەبانی و بەخشندەییش وەك فریشتان لەکاتی خۆیدا. بە دەردی مەلا کاراتۆپاکلی دەڵێ: ئەوە رازێکە هەموو کەس ئەقڵی پێی ناشکێ."

بانگی ژنە گچکەکەی کرد:

ـ ژنەکە، برێك دۆشاو بێنە و کێکێك ساز بکە. چێشتەکەش گەرم کەوە. با جارێ زگم تێر بکەم. دوایی دەبێ جلوبەرگی شەڕی حەزرەتی عەلی بپۆشم و وەك گەورە و سەروەری خۆم حەزرەتی عەلی لێی سواری دولدولێ ببم و شمشێری لەکالان دەرکێشم. دوژمن لە چوار لاوە گەمارۆی داوین. دەبێ پێشیان بگرین. دەبێتە جەنگی مەغلوبە. قوڕ بەسەر ئەوەی لەو شەڕەدا بدۆڕێ... قوڕی بەسەری بێ ژنە جوانەکەم..."

ژنەکەی پێی سەیر بوو. لەوەتا هاتبووە ئەو ماڵە، قەت نەیدیبوو مێردەکەی ئاوا گەرم و نەرم و نیان بیدوێنێ. ساتێك راوەستا دوایی چاوەکانی لە خۆشییان درەوشانەوە. بزەیەکی هاتێ و چاڵی کولمەی دەرکەوت.

ـ برێك خێرا بە سوڵتان، کارمان زۆرە. نانەکەش باش ببرژێنە. نانی برژاو وزە بە مرۆڤ دەبەخشێ و نانی سووتاویش شانس و بەختی پێوەیە. وا نییە گوڵەکەم، ئەوە بۆ وەستاوی؟

سوڵتان راوەستابوو و بزەی دەهاتێ. خۆشەویستییەکی شیرن لە ناخیدا چەکەرەی دەکرد و بەرەو هەستێکی نامۆی دەبرد. لەدەڵەخۆیدا گوتی:

ـ قسەکانی هەر قسەکانی جارانن. هیچ نەگۆڕاوە. بەڵام بۆ وا شیرن بووە؟ ئەو سیحرە چییە گیانم دەتەنێتەوە و وردە وردە هەموو گیانم دادەگرێ؟

حەزی دەکرد مێردەکەی قسەی زیاتر بکا و لێی نەبڕێتەوە. بۆ ئەوەی چێژی ئەو دەنگە تەواو نەبێ و سیحرەکەی بەتاڵ نەبێتەوە، لەجێی خۆی نەدەبزووت. هەر وا کە راوەستابوو

دەستی درێژ کرد و تاوەکەی هەڵگرت. لە پێستەکە، دۆشاوی بەتاڵ کرد و تێی کرد و وەسەر ئاگری نا. کە رۆن و دۆشاوەکە توانەوە، تاوەکەی کێشایە قەراغ ئاگرەکە و نانەکەی تێکوشی.

کوێخا قسەکانی ئاوا تەواو کرد:

ـ ئای لەو بۆنە خۆشەی، یاخوا دەستت خۆش بێ.

ژنە هێشتا لە خەیاڵی خۆیدا بوو و بیری دەکردەوە لەو خەیاڵە خۆشانەدا بزەی دەهاتێ:"قەت قەت، تەنانەت لە کاتی سەرجێیشدا، لەبزی ئاوا خۆش نەبوو. نەکا ئەشقێکی تازە لە دڵیان پشکووتبێ."

خواردنەکەی لەسەر سینییەك هێنا و لە پێشی دانا و خۆشی هات و رووبەرووی ئەو دانیشت و چاوی لە زاری بڕی. حەزی دەکرد مێردەکەی دیسانیش قسەی بۆ کا. لێی نەبڕێتەوە. کە ئەو قسەی دەکرد، ئەزوویەکی نوێ و نامۆ لەشی ژنە گەنجەکەی دادەگرت."خۆزگە دەرفەتی ئاوا لە شەودا رەخسابایە..."

ئۆقرەی لێ بڕابوو و هەر جووڵەی بوو. چاڵەکەی کولمەی هەر قووڵتر دەبۆوە.

کوێخا کە نانەکەی خواردبوو هەستا و ژنەکەش لەگەڵی هەستا. کابرا کە نوقمی خەیاڵی خۆی بوو و رێوشوێنی دەکێشا، وردە وردە بەرەو لای خێوەتەکە وەڕێ کەوت. ژنە لە پشتەوەی بە تاسەباری و بە عیشق و شەهوەتەوە سەیری دەکرد. دوایی لە بن لێوانەوە گوتی:

"باشە، ئەتۆ ئاوا خۆش ئەخلاقی، ئەتۆ کە ئاوا زمانخۆشی و دڵت ئاوا باشە، ئەدی بۆچی لەگەڵ ژنەکەی خۆت و داکی منداڵەکەت وانی؟ یاخوا لەسەرت گەڕێم..."

کوێخا بیری دەکردەوە:

" لە پێشدا دەبێ بنێرم مام خەلیل کە لە ترسان رای کردووە و ئاوارەی کێو و چۆڵانە، بیدۆزنەوە و لە پێش چاوی هەموو گوندییەکان پێی بڵێم:"مام خەلیل، مەلای مزگەوتیش بەهەڵە دەچێ. مرۆڤ بە نەزانی، نەخێر هەر وایدانێین بە ئانقەستیش کارێکی وا دەکا." دوایی ئەو گەوادە توورە دەبێ. دەبێ پێی بڵێم:"ئێستا وای دانێین ئەتۆ هەڵەت کردووە، قەیناکا. باشە ئێمە چیمان پێ گوتووی هەستاوی وەکێوان کەوتووی؟ ئەویش بەو تەمەنەوە و بەو قوونە خاوێنەوە کە چنگێك ئێسك و پێستت لێ ماوەتەوە. مەترسە، گوندی کاریان بەسەرتەوە نییە. ئەمنیش لە گوڵ کاڵترت پێ ناڵێم. تۆ تاقە ردێن سپی گوندەکەمانی. ئاواڵی باپیرەی ئێمەی. زۆرت زەحمەت بۆ ئەو دێیە کێشاوە. جا ئەوە داماننا جارێکیش گوندەکەمانت وەدرەنگی خستووە، بە قوربانی چاوت بێ. کێ دەتوانێ پێت بڵێ پشتی چاوت برۆیە."

"کوڕە خەڵکی گوندی چیان لە دڵی دا نییە. وەك منداڵ وان. ئەگەر وا بکەی، مام خەلیل خۆشحاڵ دەبیێ. بەڵام ئەو پیرە بەرازە چۆن بدۆزینەوە؟ خۆی وا دەشارێتەوە مەحاڵە بیدۆزیتەوە." بە دەنگێکی بەرز وەك ئەوەی خۆی بیەوێ جاڕ بکێشێ بانگی کوڕەکەی مام خەلیلی کرد:

- هەستە، دوو گەنج هەڵگرە و بڕۆ بابت بدۆزەوە و بیهێنەوە. پێی بڵێ، ئەنجوومەنی ئاوایی و هەروەها کوێخاشمان لێت خۆش بوون. لە هەموو شتێکت خۆش بوون و خەڵکێ دێش لێت خۆش بوون. پێشی بڵێ گوتوویانە ئەوە خودایە سەهوو ناکا. بەڵێنم دا. بیدۆزەوە و بیهێنەوە. دەبێ هەتا ئێوارێ بیهێنیتەوە.

دەنگی دیسان هەروا خۆمانە و کاریگەر بوو.

کوڕەکەی مام خەلیل کە دیتی ئاوا ریز لە بابی دەگیردرێ، چاوی پڕ بوون لە فرمێسك و گوتی:

- بەسەر چاو گەورەم، بەسەر چاو. وەشوێنی دەکەوم و دەیدۆزمەوە.

کوێخا:

- ئەو پیرەمێردە لێقەوماوە دیارە ماندووش بووە. دوو گەنجیش لەگەڵ خۆت بەرە با بەنۆرە لەکۆڵیانی بکەن. نەچن ئەو پیرەمێردە بە پێیان بێننەوە.

- کوڕە بەسەر چاو.

گوندییەکان بڕێك لەولاترەوە راوەستابوون و سەیری لەبزی میهرەبانانە و دەنگی گۆڕا و و قەڵافەتی بارکانەی کوێخایان دەکرد و مەزەنەیان دەکرد موویەك لەو ماستەدا هەیە و چاوەڕێ بوون.

کوێخاش دەیزانی گوندییەکان وردورد ئاگایان لە هەڵسوکەوتەکانێتی و دەشیزانی بیر لەچی دەکەنەوە دەیانەوێ چی بکەن. هەر بۆیەش هیچ شتێکی لەخۆڕایی و بەبێ مانا نەدەکرد.

کە ئاوڕی دایەوە، کچۆڵەیەکی چلکنی پیسی لە دواوەی خۆی بینی کە چڵمی بەلووتیدا تا سەر دەمی شۆڕ ببۆوە. بۆخۆی گوت:"یەع چەند پیسە. هەك دایك و بابت بە لەعنەت بن رۆڵە. کوڕە ئەو گوندییانە قەت نابنە بەشەر."

ئەو منداڵە کچی "مچە ساری" بوو. مچە ساری چەندی چەند ساڵان بە ئاواتی منداڵێکەوە بوو، ئاخری خودا ئەو کچەی دایێ:"ئای خودایە گیان، هیچ شتێکت بێ حیکمەت نییە. مچە ساری کە زانیی منداڵەکەی کچە، لە پێشدا رەنگی هەڵبزرکا و زمانی لەگۆ چوو و دوایی دڵی زۆر خۆش بوو. دەڵێن لەم دنیایەدا هیچ پیاوێك ئەوەندە بۆ لە دایکبوونی کچێك دڵی خۆش

نەبووە. کچ چلکی دەستە. دەشۆی و دەڕوا. دەڕوا، و وەجاغی کوڕی خەڵکی روون دەکاتەوە. بەڵام کوڕ شتێکی تایبەتە. جوانترین بڵێسەی وەجاغەکانە. تا رۆژی قیامەتێ وەجاغی بابی خۆی روون دەکاتەوە."

بیرێك وەك برووسکە بە مێشیکدا هات. دەسبەجێ کچەی هەڵگرت و بەسەر سەری خۆیدا دوو دەوری خولاندەوەو لەسەر قەڵاندۆشی خۆی دانا و بەرەوماڵی مچە ساری وەڕێ کەوت. کۆمەڵێك کووژەکە و قۆپچە و مت و مووری شووشەیی بە تیسك و کراسە جاوەکەی کچەکەوە بەسترابوونەوە. شانی بە نووشتە و نەزران داپۆشرابوو.

کووژەکەیەك و دووپشکێکی پوولەکەچن، جیقنەمریشکێك کە لە پەڕۆیەکی رەشدا وەك نوشتوو پێچرابۆوە، جووتێك ئێسکی شەویلکەی رەشەمار... ئێسکێکی باریکی دیکەی کە پێیاندەگوت شاخی شاری ماران... ئەوجار ریزێك دووگمەی گۆشەدار و چەند گوێ ماسیلکەی رەنگکراو... کە گەیشتە کەپرەکەی مچە ساری، کچەی لە قەڵاندۆشان داگرت و لە باوەشی کرد. روومەتە پیس و چلکنەکانی بە قیز و بیزەوە ماچ کرد. چیی نەمابوو بڕشێتەوە. چاوەکانی نووقاندن و کچەی دایەوە دەست دایکی و پشوویەکی ئاسوودەی کێشا. رزگاری ببوو:

ـ ئەو کچەتان شاجوانی دنیایە. جاریێ پەلە مەکەن با گەورە بێ، ئاورێك لە دڵی کوڕەگەلی نێودێ بەردەدا هەر مەپرسە، جا بزانە چ گۆنگەلێك بۆ بابی خۆی دەنێتەوە.

چووە پێشتر و دەستی کرد بە لاواندنەوە و داهێنانی قژی کچە:

ـ زووتر گەورە بە و، ئاگرەکە هەڵایسێنە... باشە ئەوە چۆنە کچی مچە ساری ئاوا جوانە، هەر دەڵێی لەودایك و بابەش نییە. ماشەڵا لە کاری خودا... موعجزەی خودایە گیانەکەم، جوانییەکەی چووەتەوە سەر ماڵە خاڵوانی.

مچە ساری دانیشتبوو و پاڵی وەدارێکی بچووك دابوو. کە کوێخای دی، لەجێی خۆی هەستا و دڵی خۆش بوو و لە خۆشییان زاری وێك نەدەهاتەوە. بە سۆزێکەوە سەیری کوێخای دەکرد و لەدڵی خۆیدا دەیگوت:"هەی کافر، بەخوای دیسان کلکت بەتەڵەیەکەوە بووە. دەنا ئەتۆ و لە باوەشکردنی کچی من؟ هەتا ماڵەوەشی بێنییەوە! کوڕە تۆ هەر دەعیەت نەدەهێنا سەیریشی بکەی."

بەڵام دیسانیش دڵخۆشییەکەی لە تامدا نەبوو و لەخۆیایی ببوو کوێخا هاتبووە لای. بە لەبزێکی خۆمانە و دۆستانەوە دەیگوت:"فەرموو، فەرموو جەنابی کوێخا." کوێخا دانەنیشت. بزەیەکی شیرنی هاتێ و تێپەڕی. مچەساری ئەوەندەشی لێ سەر و زیاد بوو. دەسرۆکەکەی دەرهێنا

و جوان و زەریف دەم و لێوی سرپییەوە. لە سەری ڕێگەی خۆی تووشی هەرکام لە گوندییەکان دەبوو. پیاو بوایە یان ژن، گەورە یان بچووك، بە گەرم و رووخۆشییەوە لێی دەپرسی و دەستی بەسەریاندا دێنا و ماچی دەکردن. ئەوانەی ئەوەیان لێ دەدی، لە دڵەخۆیاندا دەیانگوت:"هەی لامەزەب، دیسان گووی لەقوونی گێراوە. خۆی لێ کردووینەتە مەلایکەتی ئاسمانێ."

دوای ئەوەی دوو سەعات بەو شێوەیە بەنێو گوندییەکاندا گەڕا، گەڕایەوە رەشماڵەکەی خۆی. تەنانەت بە رووی ژنە گەورەکەشییەوە پێدەکەنی. لە چەند ساڵی رابردوودا شتی وای نەکردبوو. ئەمڕۆ تەنانەت دەستی لە دەستیشی دەنا. دیارە وەك پشیلە چاوەچاوی بوو نەکا ژنە چکۆڵەکەی ببینێ.

ژنە چکۆڵەی منداڵە ساواکەی لە بێشکەدا نواندبوو و هەستابوو، لەو کاتەدا سەفەر گەیشتێ و منداڵەکەی لە بێشکەدا هەڵگرت و دەستی کرد بە لاواندنەوە و بۆن پێوەکردنی. ماوەیەك ئەو کارەی کرد... ئەوەش یەکێك بوو لەو کارانەی کە دەگمەن دەیکرد.

کە دیتی دەوروپشتی چۆڵ بووە و خەڵکەکە هەر کەسە و وەشوێن کاری خۆی کەوتووە، بە پەلەپەل خۆی گەیاندە ماڵی قیرسمایل. قیرسمایل کە چاوی پێی کەوت، دەستی تێکەڵ هاتن و رەنگی بزرکا. زمانی لەگۆ چوو. تەنانەت نەیتوانی فەرمووشی بکا. کوێخا تێی گەیشت. بەبێ ئەوەی چاوەڕێی فەرمووی ئەو بێ، وەژوور کەوت و لەسەر دەستەنوێنەکە دانیشت:

ـ ئەو قەڵافەتەت بۆ وایە قیرسمایل. باشە بۆ لێمان لالووتی؟ خۆ بابتمان نەکوشتووە رۆڵە. گوتم با بچم بزانم ئەو سمایلاغایەی ئێمە چ دەکا؟ گوتم با بچم پێی بڵێم هیچ خەم نەخوا، لە چوکووراوا مەزرایان بۆ گرتووین، هەر بەکرە شێت بگاتێ، دەسبەجێ دەچینە چوکوور و دەست دەکەین بە لۆکە رنینەوە. کوڕە خۆ گوندی جیکڵدانەیان نییە. نازانن هەرکەس لەسەر سەبران بێ لەسەر خێرانە. بەکرە شێت ئەمڕۆش نەگاتەوە بەیانی دەگاتێ. کێڵگەیەکی وا پڕ پیت و بەرەکەتمان بۆ دەگرێ کە باخەڵی هەموومان بەرەکەتی حەزرتی ئیبراهیمی تێکەوێ... ئای لەو بەرەکەتەی، رۆژێ هەرکەسەی پەنجا کیلۆ تەنانەت زیاتریش لۆکە دەڕنێتەوە. ئەدی سمایلاغا، پوورزا گەورەکەی من، دیهاتی بە کەوچە ئاوێك دەکەونە مەلە.

قیرسمایل هەر لە سەروسەموچاویڕا دیار بوو هەر وا خەجڵاوە. نەیدەتوانی سەیری چاوی کوێخا بکا و تەنانەت سەریشی هەڵێنێ. هەردوو کوڕەکەی و ژنەکەی و کچەکەشی کە لەو لاترەوە راوەستابوون، سەریان داخستبوو.

کوێخا لە ناکاو قسەکانی خۆی بڕی و بەرەو کچە وەرسووڕایەوە و بە دەست بانگی کرد:

ـ وەرە لای خۆم کچە جوانەکەم. وەرە پێشتر. لەبەرخاتری تۆ هاتم. ئەگینا سەریشیان بڕیبایەم، هەتا دنیا بە دنیایە، چاوم لە چاوی ئەو کوڕە پوورەی خۆم نەدەکردەوە. بەڵام تۆ سەرت پێ دانواندم. وەرە لای خۆم دانیشە بزانە دەڵێم چی. ئەوانەی ئەو بەڵایەیان بەسەر تۆ هێنا، لە چنگی من دەرناچن. ڕۆح بۆ کوێ دەبەن. ساڵ ومانگ تێدەپەڕن، بەڵام ئەمن خراپەم لەبیر ناچێتەوە. لەبیرم ناچێتەوە. ئەمن ئەوانەم لەبیر نەچوونەتەوە. ئەوانە سزای خۆیان دەبیننەوە. ئەمن بۆ هەموو کارێك چاوەڕێ دەبم هەلم بۆ بڕەخسێ. کاری ناوەخت وەك پیازی بێ سەلك وایە، هەر چڵەکەیت بە دەستەوە دەمێنێتەوە. جا ئەوە ئەمڕۆ کاتی خۆی گەیوە. دیارە پێت وایە لەبیرم چۆتەوە و دڵیشت لێم یەشاوە. نا، خەم مەخۆ. ئەمن لەوانە نیمە کاران پشت گوێ دەخەن. ئەمن شەرەفم هەیە کچی خۆم. ئەمن دڵم هەیە کچم، دڵم هێندەی کێوێکە. گەرم و بەتین. ئەوانەی دەستدرێژی دەکەنە سەر نامووسی گوندی من، وەك مێروولە دەیانپلیشێنمەوە... وەڵڵاهی دەیانهاڕم. ئەمن چۆن دەتوانم خەڵکی گوندەکەم، نامووسی گوندییەکانم و کچە جوانەکانیان وەك سەولە بە دەمی سەگەلە بەرەڵڵاوە بێ. وەڵڵاهی هەتا تۆڵەیان لێ نەکەمەوە دڵم ناو ناخواتەوە. جا ئێستا وەرە لێرە بەرەوڕووی مامی خۆت دانیشە کارم پێتە. بابیشت پێی وا نەبێ هاتووم لەبەری بپاڕێمەوە. ئەمن لەبەر خودا نەبێ لەبەر کەس ناپاڕێمەوە کچم. بۆیەش لەو دەپاڕێمەوە چونکە ئینس و جن و فریشتە و زەوی و ئاسمانی خولقاندووە. ئەویش چونکە لە نهۆمی نۆیەمی ئاسمانەوە راوەستاوە لە کائینات دەڕوانێ، دەتوانم برێکی لەبەر بپاڕێمەوە. دەنا کەس پێی وانەبێ ئەمن لەبەر بەندەی خودای دەپاڕێمەوە... ئەدی ڕۆڵە گیان... با بابت هیچ نەترسێ. کوێی پێ خۆشە با بچێ. ئەمن گوێم بەو شتانە نابزوێ. ئەتۆ وەرە ئێرە لە کنم دانیشە، ئاوەتا، ئاوەها...

کچەکە، هەر وا ڕەنگی دێنا و دەبرد، هاتبووە پێشێ و بەرەوڕووی ئەو لەسەر عەرزەکەوە دانیشتبوو و سەری داخستبوو.

ـ کچم، ئەوانەی تۆیان وا لێ کرد، شەرت بێ بەڵایەکیان بەسەر بێنم هەموو دنیایان پێوە تەمبێ بکەم. ئەو چوکووراوایە دەمیرقیرات و خاوەن پلە و پایە و بەرپرسی ژێر و گەورەی زۆری لێیە کە هیچکامیان بەرتیلخۆر نین. ئەمن بۆتۆ ئاگرم تیبەربووە. بەخوای هەتا لە تەویلەیان توند نەکەم، خەو ناچێتە چاوانمەوە. جا کەیفی خۆیەتی قیرسمایل با هەر گوێ نەداتێ. خۆ نامووس نامووسی ئەو نییە، نامووسی منە، نامووسی گوندەکەمە. ئەمن لە هەموو شتی ئەو گوندە بەرپرسیارم. کچم ئەتۆ کارت بەسەر بابتەوە نەبێ.

خودا غەززەبی لەو گرتووە. ئەو گوێشی پێ نابزوێ. شانی ئەو هەڵیدەگرێ، بەڵام مـن نـا. ئەمن شتی وام پێ قەبووڵ ناکرێ خەڵك بڵێن:"کچێکی گوندەکەی کوێخا سەفەرمان برد و پێنج مانگ کەیف و نەهەنگی خۆمان لەگەڵ کرد و کەسیش نەیتوانی گوێمان بگرێ."

رۆڵە گیان، شتی وا قبووڵ ناکرێ. سبەی دوو سبەی کاروان کاروان دێن و ژنەکانیشمان لەبن خۆمان دەردێنن و دەیانبەنە ئەو چیا و چۆڵە. ئەوەیان پێنج مانگ برد و ئەو لەوی وەردەگرت، ئەوانەی دیکە دە مانگ دەبەن. ژن و کچمان پێ ناهێڵن. خودا بە نەسیبی کەسی نەکا. هەر بۆیە ناتوانم لێیانگەڕێم قیت و قنج بسووڕێنەوە. ئەوە هاتووم هەرچییەکی بەسەرت هاتووە، هەر وەکی یەکەم رۆژ بۆت گێڕامەوە، ورد ورد بەبێ ئەوەی هیچی لێ بقرتێنێ، بۆم لە بنی کوولەکەی بدەیەوە. ئەمنیش ئەو قسانەی تۆ بەپانەوە بۆ حوکمەتی بەرزی چوکووراوا دەکەمە سکاڵانامەیەك. سکاڵانامەیەك کە هەر کەس بیخوێنێتەوە، وەك ژن و منداڵ هۆڕ هۆڕ بگریێ. هەر چۆنی تۆ دەیگێڕیتەوە، دیاندەمێ لە دەفتەردا بینووسنەوە، وابێ هەرچی خوێندییەوە دڵی ببێتە بریانی. بۆ ئەوەی بتوانی کارێك بکەی، دەبێ خەڵکی شارێك بخەیە گریان. ئەو ماڵوێرانانە دڵیان زۆر ناسکە. لێیانگەڕێ با زگیان پێت بسووتێ و بێن و ئەو کافرانە بە گون و ژن و منداڵ و کچەکانیانەوە بگرن وبیانخەنە زیندانە سامناکەکەی کۆژان و تێیانهەڵدەن و لەوێدا بیانرزێنن. جا قیرسمایل چ خەمێتی کچم، کە تۆیان بردووە و لەسەر ئەو چیایە نیوەگیانیان کردووی؟ ئەوە دڵی ئەو نییە دەسووتێ، ئەو کابرایەکی بێ دەمار و بێ غیرەتە کچم. ئەگەر دەماری بوایە، چۆن کوڕە پووری خۆی بەجێ دەهێشت و جنێوی پێ دەدا و دەکەوتە گەڵ خەڵکێکی غەوارە و خۆی دەدایە دەست ئەوان.... ئای ی کچم، ئەگەر ئەو غیرەتی بوایە چۆن کاری وای دەکرد.

دەچوو دوژمنەکانی تۆی دەکوشت و... ئێستاش ئەتۆ دەست پێ بکە کچی خۆم. دەی بڵێ. موو بە موو بیگێڕەوە... با ئەو قیرسمایلە پەژیوان بکەمەوە لەوەی لەگەڵ من کردوویە.

کچە سوور سوور هەڵگەڕابوو. سەری داخستبوو و بۆی هەڵنەدەهات. دیسان ئەو ئەشکەنجە نەبڕاوەیە دەستی پێ دەکردەوە. دڵی لە سینگیدا وەك چۆلەکەیەك لێی دەدا.

کوێخا بێ بڕانەوە قسەی دەکرد و سوور بوو لەسەر داواکەی. کچە لەخۆی دەنووسا قسان بکا و نەیدەتوانی. هەموو گیانی وەسەر ئارەقەی کەوتبوو.

ئاخرییەکەی کوێخا بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ هەر مەیڵێ. ئاخر تۆش لەو قیرسمایلە نەبووی. ئەنگۆ هیچتان غیرەتتان نییە. ئەتۆش هەرچی بەسەرت هاتووە، ئەگەر مووبەمووم بۆ نەگێڕیتەوە، ئەمن چۆن بتوانم بۆ دەمیرقیراتی چوکووراوایان بگێڕمەوە و وەگریانیان بخەم؟

لە ناکاو دایکی کچە خۆی تێوەردا. هات و لە تەنیشت کچەکەیەوە دانیشت. بە تووڕەییەوە شانی راوەشاند. هەر جارێکی کوێخا دەهات بۆوەی کچەکە ناچار بکا ئەو بەسەرهاتە سەرلەبەر بگێڕێتەوە، ئەو بەزمە دووپاتە دەبۆوە. گوڕاندی:

ـ کچەتیوە مل بە کوێنە. بۆ مامە سەفەرتی بگێڕەوە. موو بە موو.... هەر هەمووی...

دەنگی دەگەیشتە ئەو سەری هەوارگەکە...

ـ دەی بیڵێ با ئەو کافرانە کۆت و بەند بکا. با بە دەمیرقیراتی گەورە بڵێ جووقەواریان بېڕێتەوە. لە مەحکەمەیان توند بکا. بیڵێ بە مامە سەفەرتی بڵێ. کەس بە کردنەوەی پرێسکەی دڵی نەمردووە... سەیری بابت مەکە. ئەو دوژمنی ئەوماڵەیە. دەستەوستانە. ئەگەر کارێکی پێ کرابایە، ئەویش وەك پیاوی خەڵکی دەبوو، ئێستا هەمووانی دابێژدابێژ دەکرد و دەچووە زیندان. ئەوکات ئەمنیش ئاوا سەرشۆڕ نەدەبووم. با سەربەرزییەوە وەك گوڵ لە زیندانیدا ئاگام لێی دەبوو. دەی هەرچیت بەسەرهاتووە بیڵێوە. جا ئێستا کە لێرە حوکمەتی دەمیرقیراتە و بەرتیل ناخوا و حەقی کەس پێ شێل ناکا، دەی بیڵێ.

سەفەر:

ـ بیڵێ کچم. هەروەك ئەو رۆژەی رزگارم کردی و هێنامییەوە چۆن گێڕاتەوە. لەبیرتە ئەو رۆژەی جەندەرمەکان هاتبوون چەندە بە جوانی گێڕاتەوە و چۆن لە کاتی گێڕانەوەیدا دەگریای و دەلەرزیت؟ رێك وەك ئەو رۆژە بیگێڕەوە. حەیف ئەمن هیچم وەبیر نایەتەوە... ئەگەر قسەکانی ئەو رۆژەتم لەبیر مابایە و بە ئاغاکانی چوکووراوام گوتبایە، ئەوانیش دەیانزانی چ بکەن. ئەوکات تۆ دەتگێڕایەوە و ئەمن هەڵدەلەرزیم و دەگریام. ئێستاش وەك ئەو رۆژەی بگێڕەوە.

کچە سەری هەڵێنا و بە چاوی فرمێسکاوی و پڕ لە پاڕانەوە سەیرێکی کرد. دوایش سەیرێکی دایکی و بابی کرد و دوای ئەوانیش چاوی بڕییە هەردوو برا گەنجەکەی کە لەولاترەوە راوەستابوون.

کە چاوی بەسەر ئەوانەوە گیرسایەوە، ئەوان بەسپایی دوور کەوتنەوە، دایکە هەر جینگڵی دەدا و دەیشیڕاند:

ـ کچێ دە بیگێڕەوە سەر بەقوڕی رەشکن. ئەوە چۆنە شەرمێ دەکەی؟ جارێك بەسەرت هاتووە، تازە چار چییە؟

کوێخا دیسان دەنگی خۆی نەرمتر کردەوە و بەنەرمی گوتی:

ـ خۆ منداڵەکەش مرد. بە مردوویی بووت وایە؟ وەیش ئەو منداڵە بێ تاوانە.

کچە بەسەر بۆی سەلماند.

- ئاخ، ئاخ تف لەم دنیایە. ئەمن وەختە ئاورم تیبەربێ بۆ ئەو منداڵە بێ بابانە، ئەوانەی کەس نازانێ کێ بابیانە و بۆ ئەو منداڵانەش کە بە مردوویی لە دایك دەبن. وەیش ئاورم بۆیان تیبەردەبێ.

دایکی لە دین دەهری بوو و بە گوڕەو هەراوە دەیگوت:"کچێ سەربەهەش..." پیلی کچەی وا راوەشاند چیی نەمابوو دەریبێنێ. مستەکۆڵەیەکی توندی لە نێوشانی راکێشا:

- کچێ پیاوی ئاوا گەورە، پیاوێکی هێندەی دنیا، هاتووە و چاوی لە زاری تۆ بڕیوە. چیت بەسەر هاتووە بیڵێ. دەی بیڵێ با دەمیرقیراتەکانی چوکووراوا بچن زگیان بدڕن. بە تایبەتی نێستا کە ئەوان لەنێو چنگی چوکووراواییەکان دان. لە کێڵگە و مەزرایاندا کۆیان دەکەنەوە و دەیانبەن و ناهێڵن لۆکەی بچننەوە.

کوێخا نێوچاوانی تێك نا و بە دەنگێکی گڕ و توند کوتی:

- ناهێڵن... نەخێر نە دێڵن لۆکە بچننەوە و ننە کاری دیکەشیان پێ دەدەن. کۆیان دەکەنەوە و کۆت و بەندیان دەکەن و لە تەویلەیان دەکەن. ژن و منداڵیان ئاوارە و سەرگەردان دەبن و لەو دەشتەی چوکووراوادا لێیان دەقەومێ. کچەکانیشان دەگرم و دەیاندەمە دەست هەتیومەتیوی چوکووراوا. جا دەیانگێڕن و هەڵیاندەپەڕێنن. خۆ زانیت بۆچی هاتوومەتە ماڵتان؟ هەر بۆ ئەوە. پیاوێکی بیری تۆڵەی نەبێ قەت پیاو نییە. ئەمن ئەوەی ئاگری تۆڵە لە سینگیدا بلێسە نەدا بە پیاوی نازانم. ئەوەی ناموسی خۆی و خزم و کەسی و خەڵکی گوندەکەی نەپارێزێ شەرەفی نییە و کەس بەپیاوی نازانێ. دەی بڵێ کچی خۆم، بڵێ با دڵی دەمیرقیراتەکانی چوکووراوا هەڵقرچێ. دەی بڵێ، ناز مەکە... ئەوە هەمووی بە خاتری تۆیە...

قیرسمایل لەسەر جێی خۆی وشك هەڵاتبوو و بەردەوام رەنگی دێنا و دەبرد. هەستێکی سەیری هەبوو. تووڕەییەکەی لەوەڕا دیار بوو کە لە خۆڕایی دەستی راستەی رادەوەشاند. داهاتەوە و لەسەر عەرزەکە دانیشت.

کچە دیسانەکە سەری بەرز کردەوە. لەپێشدا سەیری کوێخا و دوایی سەیری داکیی کرد و ئەوجار بەچاوی پڕ لە پاڕانەوەی سەیری باوکی کرد. سوور سوور هەڵگەڕابوو. ئارەقەی کردبوو. بە قۆڵی کراسەکەی ئارەقەی نێوچاوانی سڕییەوە. سمتەکەی لەنێو پانتۆڵە فش و رەشەکەیدا لەسەر عەرزەکە پان ببۆوە. لەچکەکەی رێك کردەوە دەستی پێ کرد:

- شتەکە ئاوا بوو... لە کێڵگە بووین. بابم بۆ جەنجەڕکردنی خەرمانەکە چووبووە لای مامە نۆککەشم. چووبوو و زۆری پێچووبوو. راستییەکەی ئاوا بوو....

لە پێشدا بڕگەبڕگە قسەی دەکرد دوایی وەکوڵ هات:

ـ بەو جۆرە بوو... کە بابم ڕۆیی من دەستم کرد بە گسکدانی جێ خەرمانەکە. "خۆ کا عوسمانی ئەو گوندەی دەناسی... برایەکەی کوڕی هەر بە دەوری ماڵێماندا دەهات. ساڵی ڕابردووش ئەوان لە تەنیشت ئەو مەزرایە کاریان دەکرد کە ئێمە لۆکەمان لێ دەڕنییەوە. بەڵێ... بەو جۆرە بوو... ئەمنیش ئەم دیتبوو... جارێکیان گوتی:"کچێ، بابم دەوڵەمەندە. مێردم پێ دەکەی؟" ئەمنیش هیچ وەڵامیم نەدایەوە. ئەو ڕۆژە کە جێ خەرمانەکەم دەماڵی، دوو کەس لە نێو دارەکانەوە هاتنە دەرێ. یەکێکیان هەر ئەو سەگبابە بوو. هیچیان پێ نەگوتم. پیلیان گرتم و ڕفاندیانم. نەمزانی بۆکوێیان بردم. شەو داهات...

خەریك بوو بخنکێ. لێرەدا بێدەنگ بوو. کە بێدەنگ بوو دایکەکەی نقورچێکی تێ کوتا. کوێخاش دەموچاوی وێك هاتبوو و چاوەکانی زیتە زیتیان بوو و لیکاوی زاری قوت دەدایەوە.

ـ کە شەو داهات، بردیانمە نێو دووکانێکی تەسەك و تاریکەوە، پڕ پڕ بوو لە شەمشەمە کوێرە. لە پێشدا ئەو سەگبابە هاتە زگم. ئەمن هاوارم کرد و پەلەقاژەم بوو...

کوێخا تەزوویەکی پێدا هات و هەژا. خۆی بەلای کچەدا نوشتاندبۆوە و چاوی تێوەبڕیبوو.

گوتی:

ـ دەی ی ی دوایی؟.. جا ئێرەی جوان بگێڕەوە. هیچ کوێت لەبیر نەچێ. شەرمیش مەکە. ئەوە بابتە و ئەوەش دایکتە. ئەمنیش لە جێی بابتم. لە بابیشت لێت نزیکترم. دەی بڵێ، بیگێڕەوە. ئێرەی زۆر زۆر پێویستە. لە یاسادا بەوە دەڵێن:"کچێنی بردن". بەلای دەمیرقیراتەوە ئەوە تاوانێکی گەلێك گەورەیە. ئەوە لە یاسادا نووسراوە. دەی رامەوەستە بیگێڕەوە.

ــ هاوارم کرد. قیژاندم. دوای ئەویش برادەرەکەی هاتە زگم. من هەتا بەیانی خۆم بەدەستەوە نەدان. کە ڕۆژ بۆوە، ئەو کافرە چەقۆی لێ دەرینام و گوتی:"قەحپە، حەق وایە بتکوژم." چەقۆکەی دەبەر تنۆکە و کراسەکەم ناو هەڵیدڕی. ڕووت ڕووتی کردمەوە. ڕووت و قووت. لەتوکوتی جلەکانیشمی کۆ کردەوە و لەبەردەم دووکانەکە سووتاندنی. خۆم بەسەر ناگرەکە دادا بەڵام نەمتوانی هەڵیانگرمەوە.

کوێخا کە لەرزینەکەی پتر ببوو گوتی:

ـ ئێرەی زۆر باشە. دەبێ ئێرەی بۆ حوکمەت بگێڕیتەوە. یاسا ئەلێرەیە کە بەرۆکی بنیادەم دەگرێ و ئیتر... خودا هەر خۆی دەزانێ... خودا دەزانێ کە ئیتر مەحاڵە بەریان بدا...

تاوانێکی گەلێك گەورەیە. سووتاندنی جلوبەرگی کچۆڵەیەك و رووتکردنەوەی... دەی بڵێ، دەی رۆڵە.. رامەوەستە، بیگێڕەوە، دەی رۆڵە دەی، رامەوەستە...

کچە تا زیاتر دەیگێڕایەوەن شەرمەکەی کەمتر دەبۆوە و تووڕەییەکەشی دەنیشتەوە و نوقمی بەسەرهاتەکەی خۆی دەبوو:

- ئیدی کە نەمتوانی جلوبەرگەکانم لە ئاگرەکە دەربێنمەوە، رامکردە قوژبنی دووکانەکە. خۆم مەڵاس دا. ئەو کافرە پێم پێ کەنی.

کوێخا:

- ئەی لەو کافرە.. جا چۆن کاری وای کردووە؟ هەی کافر...

- دوای ئەوەی پێم پێ کەنی، پێمی گوت:"هۆی کچەتیوە، ئێمە دەڕۆین. جا ئەتۆش کە خۆت بەدەستمانەوە نەدا، هەر ئاوا بەرووت و قووتی بڕۆوە گوندەکەتان." ئیتر لێیاندا و رۆیشتن. دەنگە دەنگەکەیان نەما. ئەمنیش کە پێموا بوو رۆیشتوون، لە دووکانەکە هاتمە دەرێ. خەریك بوو بەرەو گوندەکەمان غارم دەدا کە دیتم لە پشت دەوەنەکانەوە مات بوون و پێم پێ دەکەنن. من رام کرد. گرتیانمەوە. بە چەقۆوە. دیسان رایانکێشامەوە نێو دووکانەکە. ئەو کافرە بە برادەرەکەی گوت: "ئەوە لەتۆ دەترسێ بۆیە خۆ بەدەستەوە نادا دەنا ئەمن بۆیەم هەڵگرت بیکەمە ژنی خۆم. بۆ دەبێ خۆی بەدەستەوە نەدا. چما ئەو کچەتیوە شێتە؟ ئەتۆ بڕۆوە نان و خواردنمان بۆ بێنە." برادەرەکەی رۆیی. ئێمە ماینەوە. لەبەرم پاڕایەوە. ئەمن دیسانیش خۆم بەدەستیەوە نەدا. دوایی وەك شێتان چاوی زەق کردنەوە. کە سەیری چاویم کرد ترسام. سوێندی خوارد کە دەمهێنێ... ئەمنیش....

تفی نێو زاری قووت دا و قسەی بۆ نەکرا.

کوێخا کە هەستا بوو، دانیشتەوە. رەنگی هەڵبزرکابوو. بە دەنگێکی کز گوتی:

- ئەتۆش بۆی راکشای؟

- لە چاوی ترسام. چاکەتەکەی دەرینا و رایخست و بەزۆری لەسەری ئەو رایکێشام.

کوێخا:

- گریای؟ پەلەقاژەشت کرد؟

- گریام و پەلەقاژەم کرد. گوتم نابێ وا بکەی. گوتم بڕۆ داوام بکە لە دایکم و بابم. بەڵام گوێی پێ نەبزووت.

- ئەی چی گوت...

ـ وەك شێتانی لێ هاتبوو. قسەی نەدەبیست. لە چاوەکانی تۆقیم.

ـ دوای ئەوە؟... ئیدی ئێرەی زۆر قەباحەتە. نەتگەست؟ هیچت نەکرد؟ هەروا خۆت بۆ شل کرد؟

ـ کچە سەری بەردایەوە. روخسارە سوورهەڵگەڕاوەکەی لەو کاتەدا زەرد هەڵگەڕا.

ـ دەی، بڵێ، رامەوەستە، بڵێ بزانین چ بوو.

کوێخا هۆشی لەسەر خۆی نەمابوو. جۆرێك دەیگوت:"دەی دەی بڵێ:، کچە دەلەرزی.

ئیتر دەست و پێم سڕ بوون و نەمتوانی بجووڵێم.

ـ هیچ نەجووڵی؟ هیچ؟

ـ هەر ئەوەندەم لەبیرە چاوەکانم قووچاندن و قیژاندم.

ـ ئەی دوایی؟ ئێرەیم جارێکی دیکەش بۆ بگێڕەوە. هەر جارێکی دیکە. ئێرەی زۆر گرنگە.

ـ ئیدی هەستا و لە تەنیشتم دانیشت. هانکەهانکی بوو. ئەمن دەست و پێم سڕ ببوو.

کوێخا گوڕاندی:

ـ ئێرەی نا. ئێرەی نا. جارێکی دیکەش خەوتنەکەت بگێڕەوە. لەوێ دایە کە یاسا بەرۆکی دەگرێ.

کچە چاوەکانی هەڵێنان و بە سەرسووڕماوییەوە سەیری کرد و مات بوو.

کوێخا چەند جارێك هەستا و دانیشتەوە. ئۆقرەی لێ بڕابوو.

ـ کە دەست و پێت بێهێز بوون، ئیدی سوارت بوو؟... ها؟ ئەتۆش رووت و قووت لەسەر پشت راکشابووی؟ تەنانەت مەمکەکانیشتت بە دەست دانەپۆشین؟

کچە ئیدی وەڵامی پرسیارەکانی ئەوی نەدەدایەوە. دایکی دیسانیش نقورچێکی تێ کوتا:

ـ بیگێڕەوە، سەر بەهەش. کارەو کراوە. ئیدی لە چ شەرم دەکەی؟ بنیادەم شەرم لە حوکمەت دەکا؟ دەبێ لە بنی کوولەکەی بدەی بۆ ئەوەی ئەو کافرانە سزا بدرێن.

کوێخا:

ـ راست دەکا، وایە راست دەکا. دەی کچم... بیڵێ با..

هۆشی بەسەرخۆیەوە نەمابوو:

ـ بیڵێ با...

کچە بە ترس و لەرز و بە خەفەتەوە سەری هەڵێنا. دەتگوت کەسێکە لە پای سێدارە راوەستاوە. نیگایەکی ماندووی هەبوو لە گوێن ئەوانەی ئەشکەنجە دراون.

دایکەکەی نقورچێکی دیکەشی تێ وەژاند:

کچە بە دەنگێکی کز و لێڵ گوتی:

- خۆی بەسەر کێشام. هەناسەکەی هەموو گیانمی سووتاند و ئاگری دام. نەمتوانی بجوولێم. تەنانەت دەستیشمم پێ نەجوولا. دواییش ئەوەندەم ئێشا، کە...

زریکاندم. لەسەرم هەستا. کە چاوم کردەوە دیتم لە تەنیشتمەوە دانیشتووە و هانکەهانکێتی.

- ئەویش رووت بوو؟...

کچە چاوی شۆڕ کردنەوە:

- بەڵێ رووت رووت.

کوێخا دەمی ببووە تەڵەی تەقیو. کچەی ناچار کرد چەند جارێك ئەو بەشە بگێڕێتەوە.

پرسی:

- ئارەقەی کردبوو؟ هەموو گیانی؟... ئەتۆش ئارەقەت کردبوو؟ کە سەیرت کرد نوقمی ئارەقە بووی؟ وایە؟

کچە بەسەر بۆی سەلماند.

کوێخا کە هەژان و شەهوەتەکەی بڕێك دامرکابۆوە، لەسەر دەستەنوێنەکە قوونی جوولاند، لاقی راستەی وەبن خۆی دا و گوتی:

- ئەی دوایی؟ دوایی چی؟... ئەمن ئێرەییم نەدەزانی. یا لەوانەشە لەبیرم چووبێتەوە. ئێستا جا دەزانم چییان لێ بکەم. ئەوانە دەبێ لە دار بدرێن... لە سێدارە. نابێ ئاوا لێیان گەڕێین.

دایکەکەی بە ئاخ و ناڵەوە گوتی:

- ئەدی سەفەراغا، نابێ لێیان بنەوە. خوا بزانێ چییان بەسەر ئەو کچەم هێناوە. دەی کچم بڵێ.

قیرسمایل لە شوێنەکەی خۆی کرووشمەی کردبوو و وشك هەڵاتبوو. دەتگوت هیچ نابیستێ. وەك بەردێك رەق هەڵاتبوو.

کوێخا بە لەبزێکی نەرم گوتی: دەی؟ دەی؟ دوایی؟ دەی ی ی ؟...

دایکە گوتی:" ئەگەر شەو بوایە کچەکەم باشتری دەگێڕاوە. مامە سەفەر گیان ئەتۆش جوان و زەریف گوێت دەدایە و جەرگ بۆی دەبووە بریان. دەچووی هەمووانت دەکوشت.

کوێخا:

ـ دەی کچم.. کارم هەیە. دەبێ جوان و زەریف بیزانم.

کچە بە دەنگێکی کزەوە بە ئاستەم و دووبەڵڵا لە گەروویەوە دەهاتە دەرێ و دەتگوت دێ بخنکێ، لەسەری رۆیی:

ـ ئیدی دوای ئەو برادەرەکەی هات. دەست و پێم دەتگوت بەخۆمەوە نین. نەمدەتوانی جووڵە بکەم. کە برادەرەکەی هات، ئەو کافرە رای کرد و رۆیی.

کوێخا قسەکەی پێ بڕی:

ـ ئێرەت لە بیر چوو. جاری پێشوو گوتت:"بەر لەوەی برادەرەکەی بێ، جارێکی دیکەش هاتەوە زگم." گوتبووشت:"دوای ئەوەی ئیدی وەك مردووانم لێ هات و نەمتوانی بجووڵێم." نەکا درۆت کردبێ. نەکەی لەبیرت بچێتەوە. ئەگەر قسەکانت ببنە دووان، نابێ. ئەوان رزگارییان دەبێ و دەشڵێن تۆ درۆزنی و بوختانت پێ کردوون.

کچە نەرمتر لەسەری رۆیی:

ـ ئەدی وابوو. وەك مردووان کەوتبووم. کە ئەو کافرە رای کرد و رۆیی، برادەرەکەی هاتە سەرم. گوتم:"وامەکە." گریام. گوتم:" ئەمن بوومە ژنی ئەو. وام لێ مەکە." بەزەیی پێمدا نەهاتەوە. گوێی بە گریانەکەم نەبزووت. ئەویش لەگەڵم جووت بوو. دواتر، پتر لە مانگێك هەر لەو دووکانەدا مامەمەوە. جێویانیشیان بۆم هێنا. مانگێکی رەبەق، هەر دووکیان پێکەوە... جلوبەرگم نەبوو رابکەم و نەجاتم بێ. شەوانە یەکێکیان لەگەڵم جووت دەبوو ئەویتر پاسەوان دەبوو.

کوێخا وردە وردە دیسان گەرووی وشك دەبۆوە:

ـ کە چاوت کردەوە دیتت برادەرەکەشی رووت و قووت لە تەنیشتتەوەیە؟ ها؟...

ـ بەڵێ، رووت و قووت.

ـ ئەی دوای ئەوە؟...

ـ مامە سەفەر، دوای مانگێك دیتم چوار گەنجی دیکە هاتن. کراسێکیان کردە بەرم. هەڵیانگرتم و بردمیانە لێرەوارەکەی ئالاکۆمەج. لەوێ لە داوێنی کێوەکە، بردیانمە نێو کۆخێکەوە. دیسان رووت رووتیان کردمەوە. ئەوانیش ماوەیەکی زۆر لەوێیان راگرتم. دوایی پێنج کەسی دیکە هاتن و لەوانیان وەرگرتم. نەمدەتوانی ببزووم. نەمدەتوانی بەرێیەدا برۆم. لە کۆڵیان کردم و بردیانمە کورت کۆیاغی. لەوێ بە زەبری دار لە دانگەیەکی مەڕاندا هەڵیانپەڕاندم. لەوێوە بردیانمە گوندی "چیتیل ئۆغلانلی. لەوێ گەنجەکانی گوندەکە تێك

بەربوون و دوای ئەوەی یەکێکیان ئەویتری بریندار کرد، ئەمنیان دایە دەستی جەندەرمان. مانگێکیش بە دەست جەندەرمانەوە بووم. لەوێ ئەو کافرە هاتە سۆراغم و گوتی ژنی منە و وەریگرتمەوە. دیسان بردمیەوە نێو دووکانەکە. زۆرم بەزەیی پێمدا هات. گریا. زۆری ئاگا لێم بوو. هەنگوین و کەرەی بۆ هێنام. لە ماوەی مانگێکدا برێك باشتر بوومەوە. بەڵام دیسانیش جلوبەرگی پێ نەدام. رووت و قووت بووم. پێنج مانگ لەشی من شمەکی بەخۆوە نەدی. دوای ئەوەی چا بوومەوە، ئیدی گەنجی دیهات دەهاتنە لام. رۆژێکیان بەیانییەکەی دیتم تۆ هاتی مامە سەفەر گیان. هەر تۆم دی، کەوتمە سەر دەست و پێیانت. لەبیرتە؟

کوێخا بە خەمێکی قووڵەوە کە لە روخساریدا دەرکەوتبوو گوتی:

ـ کە لە بەردەم دووکانەکە رووت و قووت کەوتیتە سەر لاقەکانم من چم کرد؟

کچە سەری هەڵێنا و بە چاوی پڕ لە سوپاسەوە سەیری کوێخای کرد و گوتی:

ـ ئەتۆ عاباکەت دەرینا و پێت دادام و لەبەرمت کرد.

ـ ئەی دوایی؟..

ـ هەتا شەوێ لەو چیایە چاوەڕێ بووی... دەمانچەکەت هەڵکێشا و ئاگات لێم بوو. هیچ کەس نەیتوانی لێمان بێتەپێشێ. کە شەو داهات هەڵتگرتم و هێنامەوە ماڵێ.

ـ دەی کچم، ئەو دەمەی تۆ رووت بووی، هەر دەستیشم وێت کەوت؟ هیچم لێ کردی؟...

کچە دیسان بە نیگای پڕ لە فرمێسك و سوپاسەوە سەیری کردەوە و گوتی:

ـ نا، دەستت وێم نەکەوت.

ـ باشە ئەگەر ئەمن نەهاتبام و نەمدۆزیبایتەوە چت بەسەر دەهات؟ بەومنداڵەوە کە لە زگت دابوو؟...

کچە گوتی:

ـ هەر دەمردم، کوڕە خەریك بوو لە سەرمان رەقەڵدەهاتم.

کوێخا هەستا. چووە لای قیرسمایل. قیرسمایل سەری هەڵێنا و سەیری کرد. روخساری هیچی پێوە دیار نەبوو. وشك و بێ گیان. هەر تنۆکە فرمێسکێك لە گۆشەی چاویدا قەتیس مابوو.

کوێخا داهاتەوە و دەستی لەسەر شانی دانا. قیر سمایل ویستی هەستێ. نەیتوانی. دوایی دەستەکانی لەسەر عەرزەکە دادا و هەستا.

کوێخا چاوی لە چاوەکانی بڕی:

ـ چۆنی کچەکەتم لە چنگیان دەرهێناوە، ئاواش خۆیان بۆ عالەم تەمبێ دەکەم. دەیانکەمە پەندی عالەمێ. وایان لێ دەکەم هەموو دنیا بڵێن کوێخا دەبێ ئاوا بێ، دەبێ ئاوا بۆ

گوندەکەی و بۆ خزم و کەسی خۆی وەك باب و برا وابێ و پشتیان بەرنەدا. خەڵك بڵـێن ئەوەیـە ئینسانییەت. باشە، خۆ گوێت لە قسەی کچەکەت بوو، جا هەستە و بڕۆ ڕەگەڵ خەڵکی دیکـە بکەوە. لای کوڕە پووری خۆت بەردە و بە تەنیای بەجێ بێڵە.

جارێکی دیکەش بـە قورسـی دەسـتی لـە سـەر شـانی دانـا و هەڵیگرتـەوە و بـەبێ ئـەوەی قیرسمایل دەرفەتی تاقە قسەیەکیشی هەبێ، کوێخا بەجێی هێشت و ڕۆیی.

ژنەکەشی لە جێی خۆی هەستابوو و هاتبووە لای مێردەکەی و دەیگوت:

ـ جا ئەتۆش هەر بـچۆ لای تاشـباش بگـرە. ئـەمن منـداڵی خـۆم هەڵـدەگرم و دەچـمە لای سەفەرەفەنی. کابرا، ئەو تۆڵەیەی تۆ پێت نەکرایەوە، ئەو دەیکاتەوە.

جا گۆڕاندی:

ـ بەو هەمووە چاکەیەی لەگەڵی کردووین، ئەگەر سەریشم بـبڕن خوێنەکـەم بـەرەو لای ئـەو لووزەو دەبەستێ. گوێت لیبوو سمایل؟...

کوێخا گوێی لێ بـوو و شاگەشـکە بـوو. گوندییـەکانی دیکـەش کـە لێیانـەوە نزیـك بـوون بیستیان. کوێخا ڕاستەوڕێ بەرەو ماڵەکـەی ئۆیـۆز ئـۆغلان* ڕۆیـی. ئۆیـوز ئـۆغلان هەمیـشە کەپرەکەی خۆی دوور لە هەوارگەو گوندییەکان ساز دەکرد. کوێخا بڕیاری دابوو لە ڕۆژدا سەری ئەو کۆخ و کەپرانە بدا کە دوور لـە هەوارگەکـە بـوون و شـەوانەش بـچتە لای ئـەوانی دیکـە و ئەوانەی دەستڕۆیشتووترن. هەر لە دوورەوە بانگی کرد:

ـ هۆی مەحموو! لەوێی. ئەوە دێمە لات.

مەحموود بە خۆشحاڵییەوە هەستا. کوێخای گەورەی گوند بە پێی خۆی دەچووە مـاڵی. بـە پیرییەوە هات و گوتی:

ـ لێرەم مامە. فەرموو.

کوێخا هەستی بە پیخۆشبوونەکەی مەحموود کرد:

ـ دەی، مەحموو، ڕۆڵە بزانم چۆنی؟ ئەتۆش چوویە کۆبوونەوەکەی تاشباش ئۆغلو؟...

مەحموود هەژابوو و گوتی:

---

* ئۆیوز: واتە گەڕ، گرویێ: ئۆیوز ئۆغلان واتە کوڕە کرویێ. ناوی خۆی مەحموودە و ئەو ناتۆرەیەیان بەستۆیدا بڕیوە.

ـ نەخێر، نەخێر، تۆبە گەورەم، ئەمن لە مامە کوێخای خۆم بەولاوە کەس ناناسم. پێڵاوی تۆ لە کوێ بێ سەری منیش لەوێیە. ئەگەر ئەمر بکەی و بڵێی بمرە دەمرم.ژن و منداڵیشم هەروا.

هەر خۆشی هەڵدەکڕاند.

ئیدی کاری بە نۆیوز مەحموود نەما. بەڵام ناچاریش بوو قەننەکێشێك لەلای بێنێتەوە. ئەو داماوە دڵی بەوەندە خۆش دەبوو. خەڵکی هەژار هەر ئەوەندەی بەسە لەگەڵی بڕێك رووخۆش بی. وادەزانن دنیات بەناو کردوون.

چووە نێو کەپرەکەوە. جگە لە قازان و شووشەیەکی ئارەقە کە پڕ بوو لە رۆن هیچی لە ماڵیدا نەبوو. ئەو رووت و قووت لە ماڵێ وەدەر کەوتبوو. لەماڵەوەش هیچی نەبوو... ئەو ماڵەشی بەتاڵ و حەتاڵ بوو.

کوێخا بیری کردەوە:"ئەو هەژارە داماوانە چەندە باشن. بەڵام خوا نەکا دەستیان بە شتێك رابگا و ئەسپێیان قەڵەو بێ. ئەو کاتە ئیدی بە قەڵانگ گوویان ناگاتە لووتی. ئەوانە بۆ ئەوەی هەمیشە ئاوا پاك و باش و وەك منداڵان بێ گەرد بێننەوە، نابێ خۆشی ببینن، هەر بۆیەش خودا هیچیان ناداتێ. دەیەوێ تێك نەچن."

ژنەکەی نۆیوز وەخۆ کەوت. تەنانەت لەتە بەڕەیەکیشان نەبوو لە بن ئەو کوێخا گەورەیەی راخەن کە هاتبووە ماڵیان. بە دەستەوستانییەوە بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە. کوێخا گوتی:

ـ دانانیشم خوشکێ. هەر گوتم بێم و سەرێکتان لێ بدەم بزانم ئەو هەتیوە شێت و شوورەمان چۆنە. ئەو دەرد و بەڵایە هەر بەری نەداوی؟

ژنە بە سەر لەقاندنێکەوە بۆی سەلماند. کوێخا لەسەری رۆیی:

ـ وەك بیستوومە منداڵەکانیش گرتوویانەتەوە، وایە؟

ژنە دیسانیش بە نیشانەی سەلماندن سەری لەقاند. جلوبەرگەکەی تیتۆڵ تیتۆڵ و شڕ بوو. لاقە زلەکانی رەش و قەڵش قەڵش بوون. منداڵەکانیشی رووت و قووت.

کوێخا:

ئەوە هاتم پێت بڵێم ئەم زستانە کە گەڕاینەوە گوند، دەچمە لای سەرۆکی لق و لەبەر دەپاڕێمەوە کە هەرچۆنێکی بووە بتنێرێتە سەربازی. ئەو بابە ماڵ کاولەت تەمەنەکەتی کەم نووسیوە. ئەگەر پێویست بوو، بە تەمەنی گەورە تەسکەرەت بۆ وەردەگرمەوە. ئەتۆ ئەم زستانە بێ ئەولا و ئەملا دەبێ بچیتە سەربازی. کە بوویە سەرباز لەوێ لە سەربازخانە دەتخەن و وات

چارەسەر دەکەن وەك تـازە لـەدایك بـووبێ. خـۆ میـستیك دەناسـی. کوڕەکـەی کەلجەش دەناسـی. یەکێکیان دە ساڵ و ئەویتر پازدە ساڵ بوو گـڕوێ ببـوو. کوڕەکـەی پیرێـژن و "وەلـی" کولوسـتووریش تووش ببوون. جا ئەو دەم زۆر کەسی دیکە گڕوێ بوون. دیتم چار نییە و ئەوانە هەروا بە ئاسانی چـا نابنەوە. ناردمنە سەربازی. گڕوێییەکەیان چا بۆوە و ساغ و سەلیم لە سەربازی هاتنەوە. ئـەو گـڕوێ بوونە دەردێکی بێ دەرمانە و بە سەربازی نەبێ چاك نابێتەوە. ئەمسـاڵ لۆکـەی بـاش کـۆ بکـەرەوە. ئەگەر نەمردم و ژیام، ئەوا هەر ئەم زسـتانە دەتنێرمـە سـەربازی، دوایـیش کـە ویـستت بێیـەوە بـۆ سەردان، دەچیتە لای فەرماندەکەت و باسی خۆتی بۆ دەکـەی و دەڵێـی مـاڵ و منداڵەکـەم لـە خـۆم خراترن. فەرماندەش شووشەیەکی گەورەت دەرمان دەداتێ. لەگەڵ خۆت دەیهێنییەوە و لە گیانی ژن و منداڵەکەشتی هەڵدەسووی و ئەوانیش چا دەبنەوە. ئەمن ئەو چاکەیەت لەگەڵ دەکـەم. تـۆ ئێـستا ئەوە بۆ شەش ساڵان دەچێ ئاوای. وا نییە؟...

مەحموود بە دڵخۆشییەوە پێکەنی و گوتی:

- زیاتریشە...

دوایی لە کوێخا چووە پێشێ و گوتی:

- تۆبـە مامـە کوێخـا تۆبـە، چـۆن پـشتی تـۆ بـەردەدەم؟ ... ئـەتۆ ئەمـساڵ دەمنێریتـە سەربازی... هەتا زوووە... نۆکەرتم....

کوێخا سەری بۆ لەقاند و بە دەنگێکـی گـڕەوە گـوتی:"دڵنیابـە، ئـا، ئـا". ئیـدی بـەجێی هێشت.

ئەو دیوی ماڵەکەی ئۆیوز ماڵی نەنە زەڵەجەی لێ بوو. ئەو پیرەژنە نێـوانی لەگـەڵ کوێخـا زۆر خۆش بوو. خەریك بوو شیووکوڵی* دەکرد. چاوی پێی کەوت. زەڵەجـە ژنێکـی کەللـە ڕەق بـوو. کەسـی بـە پیـاو دانـەدەنا و قـسەی کەسـی نەدەچـووە گوێیـەوە. یـەکێك لـە کوڵەکـە بنچینەییەکانی ئەو قەڵایە بوو کە دەبوو بگیردرێ. ماڵ و مڵك و زەوی وزاریشی هەبوو. مێـرد و منداڵ و کەسوکاریشی نەبوو. مانگێـك دوای زەماوەندەکـەیان مێردەکـەیان بـەرێی یەمـەنێ کردبوو و ئیتر کەس بەسۆراغی نەزانیبوو. ئەویش مێردی نـەکردبۆوە و خـۆی زەوی و زارەکـەی کێڵابوو و ڕەعەمەلی هێنابوو و مانگای خۆی دۆشیبوو و ئەو ڕۆن و پەنیر و لۆرکەی دەیگـرت، دەیفرۆشت و پارەکـەی لەسـەر یـەك دانـابوو. لـە هـەموو خـەڵکی ئـاوایی دەوڵەمەنـدتر بـوو.

---

*شیووکوڵ: شوشتنی جلوبەرگ.

دەیانگوت پارەی لە بن عەرزی ناوە. کەس نەیدەزانی لە کوێی شاردووەتەوە. برازا و خوشکەزای هەبوون بەڵام نیشانی ئەوانیشی نەدەدا. ئەگەر مردبایە لە بن عەرزدا هەمووی دەرزی.

هەتا حەوتوویەك لەوەپێش لایەنگری تۆخی کوێخا بوو. بەڵام ئێستا لای تاشباشی دەگرت.

نەنە زەڵەجە شەو و رۆژ خەونی دەدی. ئەوە پەنجا ساڵ دەبوو، تووشی هەرکەس بوایە، خەونەکەی بۆ وی دەگێڕایەوە و داوای لێ دەکرد بۆی لێك داتەوە. کوێخا هەر بۆ ئەوەی شتێکی لێ دەرکێشێ، کتیبێکی قۆڕپاتی خەون لێکدانەوەی لە گوندێ کڕیبوو و داوای لە یانیك حەقیی سکاڵانووس کردبوو بۆی بخوێنێتەوە و دەکرێ بڵێی نزیك بە نیوەی ئەو کتیبە گەورەیەی لەبەر کردبوو.

نەنە زەڵەجە هەر کاتێك پێویستیی بە لێکدانەوەی خەونێك دەبوو، چەند هێلکە و برێك دراو و هێندێکیش رۆن و ماستی هەڵدەگرت و وەك سەرقەڵەمانە دەیدایە کوێخا و کوێخاش هەمیشە ئەو خەونانەی بە خێر و خۆشییەوە بۆ لێك دەدایەوە.

ئەگەر خەونەکە جۆرێك بوایە کە بکرابا باشتر لێك بدرێتەوە، ئەوە داوای هێلکە و رۆنی زیاتری لێ دەکرد. گوندییەکان لە پاشەملەی هەر دەیانگوت: هەرچی ئەو ژنەتیوە هەیەتی لە دەستی کوێخای دەکا.

کوێخا گەیشتێ. زەڵەجە سەری هەڵنەهێنا. کوێخا دەیزانی پیرەژنە هەر لە دوورەوە دیتوویەتی. رۆیشت و لەبەردەمی هەڵترووشکا. نەنە زەڵەجە دیسانیش هەر خۆی خەریك کرد و سەری هەڵنەهێنا. کوێخا گوتی:

ـ کچێ زەڵەجە/ ئەوە چ بووە لووت وپووتت لێ تێك ناوین؟ چما بابتمان کوشتووە؟ خراپەی چیمان بۆت هەبووە؟

زەڵەجە سەری بەرز کردەوە و بەساردو سرییەوە گوتی:

ـ نا کاکە، رووم بۆ گرژ بکەم؟ مەگین تۆ چیت لێ کردووین؟

دیسان سەری بەردایەوە.

کوێخا بە زۆری خۆی هێنایە پێکەنینێ و گوتی:

ـ گوندییەکان تینیان داوی. باش لە دژی من هانیان داوی. ئەمن ئەو کتیبەی خەون لێکدانەوەیەم تایبەت لەبەر تۆ کڕی و گوتم نەکا خەونە جوانەکانت بە فیڕۆ بڕۆن. ئەوە کابرایەك لە کابەتوڵاوە ئەو کتیبەی لەگەڵ خۆی هێنابوو. دەستی حەزرەتی پێغەمبەری وێکەوتووە. هەر کتیبێکی خەون لێکدانەوەی دەستی مومبارەکی حەزرەتی پێغەمبەرمانی وێنەکەوێ، هیچ

خەونێکی بە خۆشی پێ لێك نادرێتەوە. گوندییەکان پێت دەڵێن کوێخا دەتدۆشێ و ئەتۆش بڕوایان پێ دەکەی. کچێ خوشکە خاتوونەکەی خۆم، ئەتۆ بۆخۆشت باش دەزانی ئەمن ئەو کتێبەم بە دە سکە (دراو)ی زێڕ کڕیوە. دوو سکەی زێڕیشم دایە ئەو سکاڵانووسە بۆ ئەوەی مانگێك لەسەریەك بۆمی بخوێنێتەوە. هەر لەبەر تۆ، لەبەر خاتری تۆ هەموویم لەبەر کرد. ئەتۆ دوو هێلکە چەند قەرەپوولێکم دەدەیتێ. بەڵام... گیانی خۆت رزگار دەکەی. ئەگەر من خەونەکەی تۆم لێك نەدابایەوە، لەو ساڵەی بەفروبۆرانەکەدا ئەتۆش لەگەڵ ئەو خەڵکە وەڕێ دەکەوتی و وەك ئەوان وەبن رنووە بەفران دەکەوتی. ئەگەر ئەمن خەونی تۆم لێك نەدابایەوە، لە بوومەلەرزەکەدا ئەتۆش وەك ئەوانیتر لەوماڵەدا دەنووستی و وەبن داروپەردووان دەکەوتی و دەمردی. ئەگەر من نەبوایەم ئەو لافاوە تۆشی دەبرد و دەیخنکاندی. تۆخودا بەوەندە ساڵە توانیومە ئەوەندە پارەیەت لێ وەرگرمەوە؟ خۆ لەتۆش زیاتر خەونم بۆ کەس لێك نەداوەتەوە. لەبەر ئەوەی کتێبەکە شەقڵی نەشکێ و بەتاڵ نەبێتەوە ئەمن هەر خەونی تۆم پێ لێك داوەتەوە. وا نییە؟ ئەو خودایەی لە ژوور سەرمانە دەزانێ کە تەنیا خەونەکانی تۆم لێك داوەتەوە. ئێستاش ئەتۆ نێوچاوان لەمن تێك دەنێی وەك کۆشك و تەلارت پێ بەخشیبێتم. ئەمنیش لەمەودوا ئیتر خەونەکانی تۆ لێك نادەمەوە دایکەکەم. دەچم و خەونی گوندییەکانی دیکە لێك دەدەمەوە و کۆش کۆش پارە وەردەگرم.

زەڵەجە دەستەکانی راوەستان. سەری بەرز کردەوە و چاوی لە چاوەکانی کوێخا بڕی. کوێخا تێگەیی کە بە هێنانەگۆڕێی خەون لێکدانەوە بۆ گوندییەکانی دیکە نێچیری خۆی ئەنگاوتووە و لەسەری رۆیی:

- بەڵام ئیدی ئەو کات کتێبەکە بەتاڵ دەبێتەوە و کار ناکا. لەوانەشە ئیتر چاری هیچ شتێ نەکا. ئێستا باشە بچم خەونی خەڵك لێك بدەمەوە؟

زەڵەجە لە بن لێوانەوە گوتی:

- بچۆ لێکی دەوە برا.

- دەی باشە ئەوە دەچم وا دەکەم. وا دیارە ئەتۆ تازە خەون نابینی. لێ گەڕێ با کتێبەکەش بەتاڵ بێتەوە. ئای حەیف بۆ ئەو کتێبە، زۆر حەیف. پازدە ساڵان خەونەکانی تۆی بەخێر و خۆشییەوە لێك دانەوە و هیچ کاتێکیش بەسەهو نەچوو. ئای بنیادەم حەیف بۆ ئەو هەموو زەحمەتەی تۆ کتێبەکە. ئاخر ئەمن پێم نەگوتی، بنیادەم شیری خاوی خواردووەتەوە و بۆوەی

نابیّ پشتی پیّ ببەستی؟ پازدە ساڵان چاوساغی ئەو بووی و ریّ نیشاندەری بووی. ئاخر پێم نەگوتی ئاخرییەکەی رۆژێك لە رۆژان پشتەملت دەگرن و فڕێت دەدەنە دەرەوە؟ چما پێم نەگوتی هەر کات لە خەون چوونەوە ئیدی بیزیشیان نایە سەیرت بکەن؟ ئەی کتیبەکە، کوڕەکەی "قوشچوو ئۆغلۆ" چل دراوی زێری دامیّ و نەمفرۆشتی. هەرلەبەر ئەو گوندییانەی خۆم. گوتم با ئەگەر کێشە و نەهامەتییەك بەرۆکیانی گرت، ریّگەیەکی دەربازبوونیان هەبیّ. ئێستا دەتبەم و دەتفرۆشم. وەباڵەکەی بە ئەستۆی ئەوان. بەئەستۆی ئەوانەی ئیدی کە لە خەون چوونەوە کاریان پێت نابیّ. رۆژێك دادێتەوە خەون ببیننەوە،بەڵام ئیتر جاریّ کەس کاری پێت نییە. ئەو کات کاڵەك بە ئەژنۆیان دەشکێنن بەڵام ئیدی ئەوکات تۆ لە شەقەی باڵت داوە و رۆیوی.

کتیبەکەی لە بن باڵی دەرینا و ماوەیەك سەیری بەروپشتی کرد و سەرێکی لەقاند و بە دەنگێکی خەفەتبارانەوە گوتی:

- حەیف بۆ تۆ کتیبەکە، حەیف.

کتیبەکەی دایە دەستە راستەی و بە سینگییەوە نا:

- تۆ خودا خوشکیّ هەر بە راست، یانی ئەتۆ ئیدی خەون نابینی؟....

دوای ئەو قسەیە بیّ دەنگ مایەوە و بێدەنگییەکی قورس و قووڵ باڵی بەسەردا کێشان.

زەڵەجە دەستەکانی ررەق راگرتبوون و روخساری هەر رەنگی دێنا و دەبرد و نەرم دەبۆوە. ئەو گۆڕانە لە چاوەکانی کوێخا شاراوە نەبوو. بزەیەکی هاتیّ و گوتی:

- چما دەکریّ ئەتۆ خەون نەبینی؟... ئەتۆ بە خەونەوە زیندووی. بەڵام خۆ تازە کتیبەکە هەر دەفرۆشم. لانیکەم ئاخرین خەونی دیوتە بۆم بگێڕەوە....

زەڵەجە وازی لە تەشتەکە هێنا و لە کوێخای چووە پێشیّ:

- کوڕە لە دەوری سەرت گەڕێم سەفەراغا. مەیفرۆشە. بۆچی دەیفرۆشی. خۆ نان و ئاوی لێت ناویّ؟....

کوێخا:

- جا ئەگەر هیچ کارم پێی نەبیّ بۆچمە.چیی لیّ بکەم؟

دیار بوو تاقەتی لیّ بڕابوو. حەوتووەك بوو خەونەکانی نەگێڕابوونەوە و خەریك بوو دەتەقی.

- دەی باشە بیڵیّ، خەونەکەی دویّ شەوێتم بۆ بگێڕەوە با خێر و خۆشییەوە بۆتی لێك بدەمەوە.

زەڵەجە تفەکەی نێوزاری قووت دا و گوتی:

ـ دویّ شەویّ لە من وابوو...

بیّ دەنگ بوو. کویّخا گوتی:

ـ خیّر دەبیّ ئیشەڵلاّ.

ـ دویّ شەویّ لە سەر لوتکەی کیّویّك بووم. چیایەکی رژدی نووك تیژ.

ـ کچیّ چما دەکریّ تۆ خەون نەبینی. بەڵاّم من دەزانم. ئەتۆ بەو گوندیانە هەڵخەڵەتاوی. لە پیّشدا برۆ تۆزیّکم خویّ بۆ بیّنە جا خەونەکەت بۆ لیّك دەدەمەوە.

زەڵجە هەستا و لە توورەکەیەکدا بڕیّکی خویّ هەڵگرت و دایە کویّخا:

کویّخا کردییە زارییەوە:

ئاخر بەبیّ سەرقەڵەمانە نەدەکرا خەونی کەس لیّك بدریّتەوە. هەر بۆیەش بوو کویّخا داوای خویّی کرد.دەبوایە پارەیەك، رۆنیّك ساواریّك شتیّکی هەر وەرگرتبایە جا بە دروستی خەونەکەی لیّك دابایەوە.

زەڵجە لە دڵیّکی خۆشەوە بەرامبەری دانیشت. تۆزیّکیش چییە لەو تووڕەییەی پیّشووی لە دڵیا نەمبابوو. هەر وەك جاری جاران دەستی پیّ کرد:

ـ لەسەر لووتکەی کیّوەکە گوڵیّکی زۆر گەروەم دی، هیّندەی دنیایەك. بزنە کیّوییەك هات و لە بن ئەو گوڵە لیّی خەوت. گەنجیّك لە تەنیشت بزنەکیّوییەکەوە دەرکەوت. لیّم هاتە پیّشیّ و دەستمی گرت. نەمدەتوانی سەیری روخساری بکەم. دوایی ون بوو. بزنە کیّوییەکە سەیریّکی منی کرد. چاوەکانی هەر لە چاوی بنیادەم دەچوون. لەو بەرەوە ماریّك هاتە دەرەوە. ئەو مارە بزنە کیّوییەکەی هەڵلووشی. ترسام و قیژاندم. مارەکە گوتی:"مەقیژیّنە". جیّوبانیّکی نەرمی بۆ راخستم و گوتی:"دەی بنوو." خەوتم. جیّوبانەکە نەرم بوو. هەتاو لیّی دا. دوایی مارەکە هاتە سەرم. خەریك بوو بخنکیّم. هەستام دیتم نوقمی ئارەقەم.

بە لارەملی چاوی لە کویّخا بڕی. کویّخا بە سەرسووڕماوییەوە گوتی:

ـ هەر ئەوەندە بوو؟...

زەڵجە:

ـ زۆری دیکەشە. ئەتۆ جاریّ ئەوەندەم بۆ لیّك دەوە...

کویّخا دەستی چەپەی لەسەر کتیبەکەی کە بە دەستەراستی گرتبووی، هەڵگرت و چاند جاریّك خۆی بەولاولادا سووڕاند و گوتی:

- دیتنی چیا لە خەونـدا و چوونەسـەر کێـو مانـای ئەوەیـە دەبیتـە خـاوەنی ملکێکـی زۆر گەورەی هێندەی ئەوەی چـوکووراوا، یـان ئـەوەی بـە پـشتیوانیی کابرایـەکی زۆر گـەورەی وەك دەمیرقـیرات یـان کوێخایـەك، مـاڵ و سـامانێکی زۆرت دەسـت دەکـەوێ. چـوونە سـەر کێـوی "عەرەفات" یانی ئەوەی تۆ لە خودای گەورە نزیك دەبیتەوە و لای ئەو ئازیز دەبی.

ئەگەر بە دارەکەت لە بەردێك بدەی و ئاوی لێ بچۆڕیچ، یـانی ئـەوەی دەوڵەمەنـد دەبـی و ئەگەر دەوڵەمەندیشی، بەرەکەتی تێ دەکەوێ و ئەوەندەی دیکەت بەسەردا دەبـارێ. ئێـستا بـا بێینە سەر بزنە کێوییەکە. بزنە کێوی حەیوانێکی پێ بـەخێرە. جـا ئێـستا بـا بـزانین کتیبەکـە لەسەر بزنە کێوی چیی وتووە و ئێمە چۆنمان لێك داوەتەوە.

زەڵەجە وای گـوێ راگرتبـوو گۆشـتت لـێ کردبایـەوە هەسـتی پـێ نـەدەکرد و لـە خۆشـیان شاگەشکە ببوو و کوێخاش هەستی بەوەی کردبوو.

دیسان دەنگی خۆی نەرمتر کردەوە و بە لـەبزێکی کاریگـەرترەوە لەسـەری ڕۆیـی. ئەوەنـدە بەسۆزەوە قسەی دەکرد دەتگوت گۆرانی دەڵێ:

ــ دیـتنی ئاسـکی خوتـەن، مانـای ژنێکـی زان و دڵبـەرە. وەك حـۆری وایـە، ئەگەرچـی بەتەمنیشە بەڵام خودا دیسانیش وای لێ کردووە پیاوان هەربۆی شێت بن. بـڕینی سـەری بزنـە کێوی یانی ئەوەی ئەو ژنە سەرجێیی کوڕێکی گەنج دەکا و ئـەو گەنجـەش خەریکـە لـە ئـاگری عەشقی ئەو ژنەدا دەسووتێ. ئەوە یانی ژوانێکی گەلێك خۆشیان دەبێ و تا هەتایـە تامەکـەی هەر وا لە بنی ددانیاندا دەمێنێتەوە. کەوڵ کردنی بزنەکێوی یـانی ئەوەیکـە بـە ڕۆژی ڕوونـاك لەگەڵ کوڕە گـەنجێکی نـامۆ ڕادەبـوێرێ و دەکەوێتـە ڕامووسـان و مـاچ و مووچـان. خـواردنی گۆشتی بزنەکێوی یانی ئـەوەی سـەروەت و سـامانێکی زۆر زۆرت لـە مێردێکـی هەژدەسـاڵانی دەوڵەمەندەوە بە میرات پێ دەگا. ئـەو بەشـەی هـەر زۆر دڵخۆشـکەرەیە. بنیـادەم نـابێ هـیچ کاتێك لە خودای خۆی بێ هیوا بێ زەڵەجە. هەمووی ئەوانە نیشانەی پێشهاتی باشـن. دیـتنی مار و ئەوەیکە مارێك بزنە کێوییەکی گەورەی قووت داوە، هـەمووی یـانی ئـەوەی لۆکەیـەکی زۆر دەچنیتەوە و ئەو پارەیەی لە بری ئەوە وەریدەگری، لە بـن بـەردێك دەیـشاریتەوە و ڕۆژ بـە ڕۆژ پتری دێتە سەری. ئەگەر مارەکە هاتووەتە سـەرت و جێویـانێکی نـەرمی بـۆ ڕاخـستووی، ئەوەش یانی ئەوەی تۆ دەست لەگەڵ کابرایەکی زۆر گەورە تێکەڵ دەکەیت. لەگـەڵ یـەکێك لـە ئاغاکانی چوکووراوا. دوایی یانی ئەوەی کـە تـۆ بـە هـەڵفڕینێ دەچیتە بەهەشـت. ئەگـەر لـە خەونتدا مارێك لە زارتـەوە هاتـە دەرێ یـان ئـەوەی خـۆی بەسـەرتا کێـشا، یـان جێویـانی بـۆ

راخستی، یانی ئەوەی تۆ لە پاشەملە خراپەی ئەو کەسەت وتووە کە متمانەی پێتە و خۆشی دەوێی. ئەگەر هەر واش بەردەوام بی لەسەر دژایەتیکردنی، دڵنیابە تێدا دەچی. ئەکەی جارێکی دیکە خراپەی ئەو کەسە بڵێ. بە گیانی ئارقاویشەوە بەخەبەرهاتن هەر ئەوەیە و مانای ئەوەشی هەیە کە تۆ بوویتە دوژمنی موسوڵمانێك. هەروەها ئەو مانایەش دەگەیەنێ کە تۆ زۆر زوو دەست لەو دوژمنایەتییەی هەڵدەگریت و دەگەڕێیەوە سەر ڕێی ڕاست. دیتنی هەژدیهاش یانی ئەوەی تۆ بەقسەی کابرایەکی خراپ دەکەی. ئەو ڕێك ئەو هەژدیهایەیە کە هاتۆتە خەونت و خەونەکەش بەو مانایەیە کە ئەو هەژدیهایە هیچ خێرێکی بۆ ئەو خەڵکە نییە. ئەوەش دەگەیەنێ کە ئەو کابرایە دوژمنی گوندییەکانە و گوندییەکان ماڵوێران و دەستەشکاو دەکا. بەڵام هەر هەمووی ئەوانەش بەو مانایەن کە ئاخری و ئاقیبەتی هەموو شتەکان وەخێر و خۆشی دەگەڕێ. ئەو مارەی هاتۆتە خەونی تۆوە، لایەکی سوور بوو، بەڵام چون کەوتبووە تاریکییەوە تۆ نەتتوانی بیبینی. سووربوونی ماریش یانی ئەوەی گەنجێکی بە زیپکوزاکوون و بەهێز رۆژ و شەو لە عیشقی تۆ دەسووتێ و دەناڵێ و لە خەیاڵی باوەشتا دەتلێتەوە. مانایەکیشی ئەوەیە کە ئەو دەستی لەگەڵ تۆ تێکەڵ کردووە و تۆ بەخۆت نەزانیوە.

کوێخا ئارەقەی کردبوو. دەستی لەسەر کتیبەکە هەڵگرت. کتیبەکەی ماچ کرد و خستییەوە باغەڵی و هەستا. زەڵەجەش لەگەڵی هەستا و گوتی:"یاخوا لەسەرت گەڕێم، خەونم زۆر دیتبوون. خۆ هەر یەکێکیشیانم پێ گوتی."

کوێخا:

ـ ئیدی دەمەوێ کتیبەکەم بفرۆشم. ئیدی لەمەودوا خەون لێکدانەوەیەك لەگۆڕێ نییە. ویستم بۆ دوایین جار چاکەیەکم لەگەڵ کردبێ.

روخسارە گەشەکەی زەڵەجە لەناکاو سیس بوو:"وەك یەکێك کە ئازیزێکیان لێ دابڕیبێ:

ـ کوڕە لە دەورت گەڕێم سەفەراغا، کاری کردنێ نییە نەیفرۆشی. من کردم تۆ نەیکەی. دوژمن هەڵیخەڵەتاندم و نەهاتمە لای تۆ. ئەو رۆژانەی نەدەهاتم نەمدەزانی چ بکەم؟ وەك شێتانم لێ هاتبوو خەریك بوو شێت بم. هەر ئاورم تیبەر ببوو. خەریك بوو بخنکێم. ئەوە حەسامەوە. بارێکی قورسم لەسەر شانی لاچوو. کتیبەکەمان مەدە دەستی بێگانان. بێت و کاری وا بکەی، ئەمن خۆڵی کوێ وەسەر خۆ بکەم؟ ئەگەر جارێکی دیکە هات و فریوی قسەی ناحەزانم خوارد یاخوا چاوەکانم کوێر بن. خەڵەتاندیانم.

کوێخا دەیزانی زەڵەجە باشاری ناکا، بەڵام نەشیدەزانی ئاوا سووك و سانا شل دەبێ. گوتی:

ـ مەترسە، خوشکێ، خەمت نەبێ. ئەمن لە داخان وام گوت. ئەگینا هەزار ئەشرەفیشم بدەنێ کتێبەکەمان نافرۆشم. چما تۆ دەزانی ئەوە کێ نووسیویێتی؟... "ئەلحاجی حەزرەتی کامیل ئەفەنیی میسری" لە یەمەنەوە... لە کابەتولاوە هێناویێتی، چما شێت بوومە دەیفرۆشم؟ چما ئەوە پەیدا دەبێتەوە؟... بەلام ئەتۆش ئیدی نەخەلەتێی جارێکی دیکە فریوی ئەو سەگە بەرەللایانە بخۆی. ئەگینا وەبالەکەی وەستۆی خۆت. خەونەکانی دیکەشت لەو خوارە لە چوکووراوا بۆ لێك دەدەمەوە. جارێ بچۆ و لە نێو گوندییەکاندا خەونەکەتیان بۆ بگێڕەوە و بشلێ تاشباش ئەو خەلکە سەرگەردان و مالوێران دەکا. ئەو هەژدیهایەی هاتۆتە خەونت، ئەوە. دەیەوێ گوندییەکان هەللووشێ. گوندییەکانیش بزنەکێوییەکەن. تێگەیشتی؟ هەمووی ئەو شتانەیان تێبگەیەنە. با هەمووان لێیان روون بێتەوە... مەترسە کتێبەکەش هی خۆمانە.

کە زەلەجەی بەجێ هێشت، لە بن لێوانەوە بەخۆی دەگوت:" راوەستە تاشباشی لێقەوماو لە کوێتە. هەتیو تۆ ملانێ لەگەلّ من دەکەی؟ ئەگەر هێشتم جگە لەو ئەو نۆکسوزە چلمنە، کەسی دیکەت بە دەورەوە بمێنێتەوە، ناوی خۆم دەگۆرم."

چۆوە خێوەتەکەی و بانگی یەکێك لە گەنجەکانی دراوسێیانی کرد و پێی گوت:

ـ دەی برۆ ئەو کستۆ ئۆغلوە گەوادەم بۆ بانگ بکە بێتە ئێرە.

کۆستوئۆغلو لەرێوە هات.

کوێخا کە چاوی پێی کەوت، بە توورەییەوە قیت بۆوە و هەر دوو قامکی بەرەو چاوی راداشت، دەتگوت دەیەوێ لە چاوەکانی رۆبکا. بەسەریدا گوراند:

ـ گەوووواد... بەو دوو پەنجەیەم چاوت لە پشتەسەرتەوە دەردێنم.

بەرەلا، ئەتۆ هەتا سەربازیت تەواو کرد پێلاوت لە پێ نەکرد و بەبێ پێلاو سەربازییەکەتت تەواو کرد. ئەوە لە سایەی سەری کێوە بوو؟ دەی بلێ کافر بزانم! ئەگەر ئەمن عەریزەم بۆ حوکمەت نەنووسیبایە و نەمگوتبایە ئەوە هەر لە منداڵییەوە پێی نەچۆتە پێلاوەوە و گوندییەکانی ئێمە هەر نازانن پێلاو چییە، ئاخۆ بە زۆر لە پێیان نەدەکردی؟ تۆ پێت وایە هەویەی (تەسکەرە)ی تەواوکردنی سەربازییان پێ دەدای؟ هەی سپلە. برۆ لە پێش چاوم ون بە دەی. وستەت نەیە ها؟

وەك شێر هەلچوو بوو. لە توورەییان گیانی دەلەرزی.

کۆستو ئۆغلو سەری شۆر کردبۆوە و بە ترسەوە بەبێ ئەوەی وستەی لێوە بێ دوور کەوتەوە.

دیسان هەر بەتوورەییەوە ئەمری بە گەنجەکە کرد:

ـ برۆ ئەو "هەوا گۆرە" بانگ بکە با بێ.

هەوا گۆڕ لەو دەوروبەرانە بوو. هەر لەگەڵ دەنگی کوێخای بیست هات. گوندییەکان دوورت راوەستابوون و بەوردی سەیری هەڵسوکەوتەکانی کوێخایان دەکرد و بە نیگەرانییەوە دەیانەویست بزانن ئاخرییەکەی دەبێتە چی. "تۆیوز" "زەڵەجە"، "کۆستۆ ئۆغلۆ" و قیرسمایل" و ئێستاش هەوا گۆڕ.... تاشباشیش هەر چاوەڕێ بوو و خەریك بوو دەتەقی. بەخۆی گوت:"کەس داوی ئەو گەوادەی پێ با نادرێ*." هەر ئەوەندە قۆڵی هەڵماڵێ و دەست پێ بکا، کەس دەسکی لە دوو ناکا. ئەو کابرایە شەیتان دەرس دادەدا.

زمانی بگاتە هەر کەس دەیخەڵەتێنێ."

هەوا گۆڕ هات. بە قەلافەتێکی تووڕەوە پرسی:

ـ ها، چیت دەوێ مام کوێخا؟...

کوێخا هیچ تووڕەییەکەی ساتێك لەوەپێشی پێوە نەمابوو. دامرکابۆوە. بە روویەکی گەشەوە و لەبزێکی باوکانەوە گوتی:

ـ جارێ وەرە تۆزێك دانیشە. لە تەنیشتم دانیشە.

جێیەکەشی بۆ دیاری کرد.

هەواگۆڕ هەر وا بەپێوە دڕدۆنگ بوو. دانیشێ یان نا؟

ـ وەرە رۆڵە دانیشە. خۆ ناتخۆم کورم وەرە. سەیر کە، ئەوە دەگەینە چوکووراوا. لەوانەیە بتوانین کارێکت بۆ بکەین و ئەو نەهامەتییەش لە کۆڵ تۆ بکەینەوە و نەجاتت بێ لەو سەرگەردانییەی چەند ساڵە لە رێگەی هاتوچۆی سەربازخانە دای.

هەواگۆڕ وەك لە کۆت و بەند دابێ هەناسەی دەرنەدەهات، و هات بەبێ تاقەتی دانیشت. رەنگی بەروخسارییەوە نەمابوو و هەر چنگە ئێسك و پێستێك بوو. دیسانیش هەر وا بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ ئەگەر وا دەزانی بۆچی تا ئێستا مشوورێکت نەخواردوومە؟

ـ کوڕە ئەو دەم ئێمە دەسەلاتمان نەبوو. لایەنگرەکانی ئێمە هیچیان بە دەست نەبوو. ئێمە ئەوە تازە بە دەسەڵات گەیشتووین. چما رۆڵە تۆ نازانی؟ هەر بگەینە چوکووراوا سەرگەورەکان لەو حاڵەی تۆ ئاگادار دەکەمەوە و دەڵێم ئەو کوڕە دەربەدەر و لێقەوماوە. یان لە سەربازی

---

*داو بادان: دەرەقەتهاتن بە فێڵ. هەژار لە وەرگێڕانەکەی خەیامدا دەڵێ:"خوا داوی دەناوە داوی ئەو با نادەم......

رایگرن و هەر ئاوا بە نەخۆشی سەربازییەکەی پێ تەواو بکەن، یان بینێرنە نەخۆشخانە و چارەسەری بکەن یان لە سەربازییەکەی خۆش بن. دەڵێم خودا هەڵێناگرێ. ئەو کوڕەتان ئەوەندە بۆ گۆڕینی هەوا لە سەربازخانەوە ناردەوە  گوند، هەتا هەموو گوندییەکان ناویان نا "هەوا گۆڕ". لەسەر داواکەش سوور دەبم. چەند مانگت سەربازی ماوە؟

هەواگۆڕ گوتی:

- پێنج مانگ.

- کەوابوو زۆرت ماوە.

- دیسانیش دەبێ بچم. دوای ئەوەی دوو ڕۆژ لە نەخۆشخانە دەتخەن، دیسان دەڵێن بگەڕێوە ئاوایی.

- هەئم، هئم، هئم، نابێ ئەو جارە بێڵم وا بکەن. دەبێ حەقت بستێنم. بەیانی دەچمە خوارێ. وەرە لەگەڵ خۆم دەتبەمە ئەدەنە و پێشانی گەورەبەرپرسەکانت دەدەم. هەر بۆیەشم بانگ کردی، لەبیرت نەچێ. ڕۆژێك دوای ئەوەی چوونە نێو کێڵگەی لۆکەوە و جێ قوونی خۆتان خۆش کرد، وەرە لام تا لەگەڵ خۆم بتبەمە ئەدەنە، باشە؟

هەواگۆڕ دیسانیش بە تووڕەییەوە گوتی:

- باشە.

جا هەستا.

خەریك بوو ئێوارە دادەهات. کوێخا بیری کردەوە کە دەبێ خۆڕاگر بێ و ئەمشەو هەتا بەیانی هەڵسووڕێ بۆ ئەوەی ئەو تاشباشە لێی روون بێتەوە حیزب بازی یانی چی؟

"گوملکسیز کۆنە یاغی و پیاوکوژە. هەر ئەوەندە و شتێکی قبووڵ کرد، سەریشی تێدابچێ پاشگەز نابێتەوە. لە هیچ کەس و هیچ شتێکیش ناترسێ. گەرچی بۆرە خزمایەتییەکمان هەیە بەڵام گووی سەگ لەو خزمایەتییەش. کابرایەکی کەللەرەق و لاسارە. ئەو جۆرە کەسانە بۆوە نابن دەمیان لە دەمی بنێی. دەبێ چارێکی بکەم. زیاتر لە سێ کەسی لە دەوری خۆی کۆ کردووەتەوە. ئەگەر بچێتە لای تاشباش جێ بەتاڵەکەی پڕ ناکرێتەوە. ئەوە بۆوەی نابێ بەرۆژی رووناکی بیدوێنی. حەیای پیاوی دەبا، پیاو لە ماڵەکەی دەکاتە دەرەوە. دەبێ لێی گەڕێی شەوی بەسەردا بێ و هاموشۆ نەمێنێ."

شڵەژابوو.

"گوندی بۆ چاکەی نابن. هەرچی بۆیانی بکەی بێ سوودە. خۆیان بۆ بکووژی، ئابرووی خۆت ببەی، هەزار دەرکەیان بۆ بکەی بۆ ئەوەی تاڵەموویەکیان لەسەری کەم نەبێتەوە، گیانی شیرنتیان بەقوربانی بکەی، دیسانیش بەلایانەوە پووشێکە. هەر ئەوەندە شتێکت پێوە ببینن، وەك گورگی برسی هەڵدەکوتنە سەرت. دەبێ هەر خۆت لە کەمایەسییەکانیان* بزانی و سواریان بی و گوێت بە ناڵە نووزانەوەیان نەبزووێ. هەمووی خەتای حوکمەتە. حوکمەت رووی پێ داون. خەتای کەس نییە حوکمەت نەبێ."

"ئەوانە دێنێ دەنگ بدەن و حوکمەت هەڵبژێرن. ئەوانەن حوکمەت دروست دەکەن. هەی ترحێو، رەحمەت لە دایکی، ئەو حوکمەتەی خولە پێکی دێنێ قوونی خاوێن دەبێ. چەندەشیان قسەی ئۆیوز مەحموو بۆ گرنگە. لە کاتی هەڵبژاردنیدا حسیب بۆ خوداش ناکا. دەبێ دوو رۆژان بچیە دەرگای ماڵی و لەبەری بپاڕێیتەوە بۆوەی دەنگ بداتە ئەو کەسەی تۆ دەتەوێ. دەی باشە، دەنگ بدەن و نەیدەن چییە؟ کوڕە خۆ ئەو حوکمەتەش کەس نازانێ چ دەکا. هەرچی دەیکا پووشێك ناهێنێ. ئەوانە چووزانن حوکمەت یانی چی؟ ئاخر چۆن دەکرێ ئەو حوکمەتە تیبگەیەنی و بڵێی بابە ئەوانە سێ سەر بزنیان پێ ناژمێردرێ و بۆیان بەخێو ناکرێ.

"ئاگری ئەو فیتنەیە لە گۆڕی عیسمەت ئینۆنۆوە هەڵدایسێ. کوێخایەکی گەورە کە بنە و بنەچەکی کوێخا بووە دەبێ بێت و لەبەریان بپاڕێتەوە بۆ ئەوەی لای بگرن. ئەگەر لە دەستیان بێ و یەکێکی دیکە بدۆزنەوە کە بتوانێ کوێخایەتییەکەیان بکا، خوا دەزانێ دەچن دەنگ دەدەنە ئەو. تەنانەت ئەو ئۆکسوزە چڵمنەش کوێخایەتییەکەیان بۆ بکا دەنگی دەدەنێ. بەڵام ئەو گوندە کەسی تێدا نییە میواندارێتیی حوکمەت بکا و دەرگای لەسەر پشت بێ و قسەی باشی بۆ بکا. ئەگەر یەکێکیان دەست بکەوێ، ئەو کوێخا رەسەنەی خۆیان فڕێ دەدەن و هەر چاویشمان لێ ناکەنەوە.

"ئەگەر ئەو فەرتەنەیەی عیسمەت نەبوایە، چما تاشباش ئۆغلو دەیتوانی خۆی لە من جوێ بکاتەوە؟ هەر هەمووی خەتای عیسمەتە. ئاخ عیسمەت. چما دەهێڵم جارێکی دیکە بێیەوە سەر حوکم؟ چۆن دەهێڵم تاقە دەنگێکیش لەو خەڵکە وەرگری کە خەریکن سواری سەرمان دەبن؟ هەتا ئەمن زیندووم، ناهێڵم تاقە دەنگێکی رەشیشت پێ بدەن. ئەو خۆڵە خۆت بەسەر خۆتا کردووە. جا بیخۆ. ئەوە گووی تۆیە ئێمە دەیشێلین. جا بزانە ئەو پێ پەتییانەی سواری

---

*کەمایەسی: کەموکورتی. مامۆستا هەژار لە وەرگێڕانی خەیامدا دەڵێ:.....

ئێمەش کە نەهاتبووین وەکو خۆی وابوو..... لێشی دەردەچین <u>*کەمایەسی*</u> ناهێنێ

سەری ئێمەت کردن و بە دەردی خۆت حوکمەتت دایە دەستیان، تاقە دەنگێکیش چییە پێتی دەدەن؟ ئاخ عیسمەت، ئەگەر تۆسقاڵێك ئەقڵت لە مێشکیدا هەبێ شەرتە ئەو سمێڵانەم بتاشم. بوویە پاشا، بوویە سەرکۆمار، بەڵام فایدەی چی. چما پیاو بە دەستی خۆی گۆڕی خۆی هەڵدەکەنێ؟ دەڵێن عومری پیرە مەرێکت ماوە. دوای ئەوە چاوت بە پشتەسەری خۆت دەکەوێتەوە و چاوت بە سەرکۆماری ناکەوێتەوە. ئەوە تاشباش نۆغڵوت لەسەرم کردووەتە کەڵەگا، وەڵڵاهی بشمرم، لە بابیشمم خۆشتر ویستبێتی، شەرتە لایەنت نەگرم. کابرایەکی پۆستی گرنگی سەرکۆماری بە دەنگی چەند کەسێکی پێ پەتی بداتە دەستی یەکێکی دیکە، چۆن دەتوانێ نەتەوەیەکی ئاوا گەورە بەرێوە بەرێ. هاوڕێ، ئەمن ئەوەی پاتشایەتییەکەی بداتە یەکێکی دیکە، بە پیاوێکی ژیری نازانم. جا چ ناوبانگت تا ئەو پەڕی فەرەنگستانیش رۆیبێ و چ سیاسەتوانێکی گەورەش بی، ئەتۆ بەکاری هیچ نایەی هاوڕێ. جوان تێ بگە. بنیادەم کە دەیەوێ کارێکی ئاوا بکا، چۆن نایە لەگەڵ دەوروبەرەکەی خۆی، لەگەڵ کوێخا وەفادارەکانی خۆی، راوێژ بکا؟ چیی ئەمابوو لە سۆنگەی تۆدا چارەڕەش بین و حەیا و ناموسمان بچێ. باش بوو زوو دەستەوداوێنی کابرای باڵەکەی دیکە بووین. میللەت هەمیشە دەبێ پێملی حوکمەتەکەی بێ. ئەتۆ ئەوە نازانی؟ خۆ ئەگەر نەشتزانیبێ ئەوە فێری بووی. فێر بووی بەڵام کار لە کارێ ترازاوە. جا ئێستا کاڵەك بە چۆکت بشکێنە. دەوڵەت باڵندەیەکە ئەگەر لێت هەڵفڕی و ئیدی بۆت ناگیرێتەوە هاوڕێ. جا هەر خۆت بکوژە. هەر پەلە قاژە بکە، ئیدی ناهێڵن تەنانەت بەلاشیدا بڕۆیتەوە. جا ئێستا ئەگەر تەنانەت هەموو خەڵکیشت لە پشت بن، چما ئەوان بە دەنگی دوو سێ رەشووڕووت سەرکۆماری دەدەنەوە بە تۆ؟ تاشباش نۆغڵو کەری نێر بە گون دەناسێ و بنیادەم و نێرەکەر لێك جوێ ناکاتەوە. ئێستا لە ئێمەت کردووەتە بنیادەم و لە منت کردووەتە پیاو، ئەمن تەنانەت ناهێڵم ئەویش دەنگت بداتێ. جوان و زەریف گوێت لێ بێ و هیچ خۆت ئەزیەت مەدە. ئاخ عیسمەت ئاخ. ئەگەر سەردەمی تۆ بوایە... نازانم دەبێ چیت لێ بکەن؟.... خۆ هەڵتگرتەوە بەڵام زیانت بە ئێمە گەیاند. بزنێکی گرێ مێگەلێك گرێ دەکا هاوڕێ، جوان گوێ بدەیە..."

بەبێ ئەوەی دەم لە خواردن بدا هەر بە جلوبەرگەکانییەوە چووە بن لێفەکەیەوە. تووڕە بوو. ماوەیەکی زۆر چاوی لە ئەستێرەکان بڕی و بیری لە عیسمەت پاشا و کارەقۆڕەکانی کردەوە.

سەری لەو کارانەی دەرنەدەچوو. ئاخری گەیشتە ئەوەی کە بنیادەم ئەگەر پیر بوو، هەر وای بەسەر دێ.

هەموان لە شیرن خەویدا بوون. ئاگری بەردەم کەپرەکان وردە وردە دادەمرکانەوەو دەکووژانەوە. لەو بەری هەوارگەکەوە، منداڵێکی ساوا بێ پسانەوە دەگریا و دایکەکەی بە خەواڵوویی و تووڕەییەوە لایەلایەی بۆ دەکرد.

کوێخا لەبەری گران بوو بچێتە لای گۆملکسیز ئۆغڵو. ئەی ئەگەر هەر وەخەبەر هات و دەستی کرد بە جنێودان و هەموو خەڵکەکەی راست کردەوە، خۆ کوێخا حەیای دەچێ و ئیدی لە نێو گوندییەکاندا سەری هەڵنایە. بەڵام چار نەبوو. هیچ رێیەکی دیکە نەبوو. دەبوو بچێ و لەبەری بپاڕێتەوە.

جارێکی دیکەش گوتی:"ئاخ عیسمەت، ئاخ"، لە قەرەوێڵەکەی هاتە خوارێ. داهاتەوە و لە سەتڵە ئاوەکەدا دەموچاوی شوشت. دوایی بەبیریدا هات دەستنوێژ بگرێ. دەسنوێژەکەی هەڵگرت و برێکی دوعا کرد. بەسپایی وبەبێ ئەوەی بێڵێ کەس گوێی لە دەنگی پێڵاوی بێ، خۆی گەیاندە کەپرەکەی گوملیکسیز ئۆغڵو. بەسەر سەرییەوە راوەستا. گوملیکسیز ئۆغڵو بالیفەکەی بە پنچکە گیایەکەوە نابوو و لێی خەوتبوو.

لە تەنیشتی هەڵترووشکا و دەستی لەسەر شانی گوملیکسیزئۆغڵو دانا. هەر دەستی وەشانی کەوت، گوملیکسیز ئۆغڵو راپەڕی و لەسەر جێیەکەی دانیشت و بە دەستەکوتە لە شتێك گەڕا. دیار بوو کە چەکەکەی دەگەڕا. ئەوە خووی سەردەمی یاغیبوونەکەی بوو. کوێخا تێی گەیشت. بە دەنگێکی نەرم گوتی:"منم براکەم. کوێخا سەفەر. ئەمنم هاتووم. بەرلەوەی دەست بە جنێودانێ بکەی، گوێ بدە قسەی من. لەوەی لەخەوی شیرنم کردی داوای لیبوردن دەکەم."

گوملیکسیز ئۆغڵو هێشتا لە بن بالیفەکەیەوە دەستی لە چەکەکەی دەگێڕا. کوێخا دەستەکانی گرت و گوتی:"کوڕە منم، من سەفەرم. خۆم لە ماڵێت هاویشتووە. گوێ بدەیە. شتێکی گرنگ قەوماوە. تۆخودا هەستە."

گوملیکسیز ئۆغڵو هەستا. دەستی لە نێو دەستەکانی ئەو هێنا دەرێ. بەخۆی هاتبۆوە. بە تووڕەییەوە پرسی:"

ـ سەفەر؟...

کوێخا بە ترسەوە گوتی:

ـ ئەمنم براله...

گوملیکسیز ئۆغڵو بڕێك مات بوو. جا پرسی:

ـ ئەوە بەو نیوەشەوە لێرە چ دەکەی؟

کوێخا دیسان دەستەکانی ئەوی گرتەوە:

ـ وای دانیێ کوڕتم کوشتووە و خۆم لە ماڵت هاویشتووە. دەرم مەکە. بەسەرمدا مەنەرێنە. ئەنگۆ بنەماڵەیەکی نەجیم و ڕەسەنن. ئەوەندەتان خەڵك کوشتووە هەر لە حیساب نایەن. ئەنگۆ بنەماڵەیەکی ئەوەندە ڕەسەنن کە تا ئێستا کەس پێی شك نایە یەکێکتان لە نوێندا مردبێتن. هەر ژنەکانتان بە گوللە نەمردوون. ئەمن باش دەزانم. دەزانم و لە بەرامبەر ڕەسەنبوونی بنەماڵەی " گوملیکسیز"دا سەری کڕنۆش دادەنوێنم. ئەنگۆ گورگی بنیادەمانن. وەك ئەو گورگانەی خۆ دەخەنە دانگەی مێگەلانەوە، خۆ بە تاقمێك خەڵکدا دەدەن و نێچیری خۆتان دەگرن و دەیبەن. ئەمنیش چونکە بۆرە خزمایەتییەکم لەگەڵ بنەماڵەی گوملیکسیز هەیە، شانازی دەکەم و خۆم بە پیاو دەزانم. هەربۆیەشە برالە، دەزانم نەریتی بنەماڵەتان وایە، تەنانەت دوژمنیش بێتە دەرگەتان ڕووی ناشکێنن. هەر کەس بچێتە دەرگای ماڵی گوملیکسیز دوژمنیش بێ، بە هەناسەساردی و دەستی بەتاڵ نارِوا. ئێستاش ئەمن، کوێخای گوندێکی گەورە و گران، سەرۆکی دەمیرقیرات، دوژمنەکەی عیسمەت پاشا، کوڕەکەی کوێخا خدر بەو نیوەشەوە هانام بۆتۆ هێناوە. وای دانیێ کوڕم کوشتووی و خۆم لە ماڵت هاویشتووە، ماڵی تۆش نا ماڵی گوملیکسیز ئۆغڵو."

دەستەکانی ئەوی بە سینگییەوە نا و گوشینی:

ـ ئەمن هاتوومە لات بۆوەی لە نێو خەڵکدا حەیام نەبەی و پشتم چۆڵ نەکەی. پشت و پەنای من تۆی. قەڵای من تۆی گوملیکسیز ئۆغڵو. تۆ نووری بنەماڵەکەی گوملیکسیزی. هەرکەس داوایەکی لەو بنەماڵەیە کردبێ، ناهومیدیان نەکردووە. ئەمنیش هاتووم پێت بڵێم پشتم بگری. پەنام بۆ هێناوی. گوندییەکان هەموو لای ئەویان گرتووە. ئەمن مەلی بێ پەڕ و باڵم. هاتووم بڵێم وەبن پەڕ و باڵی خۆتم دە... جا دەڵێی چی؟...

گوملیکسیز ئۆغڵو لەسەر جێی خۆی وشك ببوو. هیچی نەدەگوت، بێ دەنگ بوو.

ـ ئەتۆش هەرشتێکت لەمن بوێ لەسەر چاومی دادەنێم. دەی برالە، دەڵێی چی؟

بەسپایی شانی ڕاوەشاند:"ها؟ چۆن ناتوانی پشتی کابرایەك بگری کە لە نێو گوندێکدا بە تاقی تەنێ و بێ پشت و پەنا ماوەتەوە و هانای بۆ هێناوی؟ بنەماڵەی گوملیکسیز پشت و پەنای لێقەوماوان و ڕەتێنراوان و تیهەڵدراوان و، هەروەها خزم و کەسی خۆیان بوون. ئەتۆ ناتوانی دیسان وەجاغی ئەو بنەماڵەیە ڕوون کەیەوە؟..

گومليكسيز ئۆغلۆ قورس و قايم گوتی:"وايە، وايە... و بێ دەنگ بوو. جا لەسەری رۆیی:
- بنەماڵەی گومليكسيز ئێستاش پشت و پەنای لێقەوماوان و بێ پەسیوانن.
دیسان مات بۆوە. دواتر سەری هەڵێنا و دەستی پێ کردەوە:
- جا تۆ کە ئەمشەو هاتوویە دەرگای من و پەنات بۆ هێناوم و باش دەشزانی بنەماڵەی گومليكسيز چۆن بنەماڵەیەکن، دەشزانی بە دەستی بەتاڵ و بەناهومیدی لەو دەرگایە ناگەڕێیەوە، برۆ و خاترجەم لێی بنوو. بنەماڵەی گومليكسيز پشتیوانتن. ئەگەر تاشباش ئۆغلۆش پێش تۆ هاتبایەتە دەرکم، چونکە حەقێتی، بنەماڵەی گومليكسيز لەگەڵ ئەو دەکەوتن.
بەڵام ئێستا کە تۆ هاتووی و ئێمە ناتوانین بە دەستی بەتاڵ بتگێڕینەوە و تا ئێستاش شتی وامان نەکردووە. ئەوەی داوای کۆمەگی لێمان کردبێ ناهومیدمان نەکردووە. بۆیەش لەگەڵ ئەوەشدا تۆ ناحەقی، و مافی گوندییان دەخۆی و دەیاننێریتە کێڵگەی بێ حاسڵ و بەرهەم، برۆ جارێکی دی کاری وا نەکەیەوە.
کوێخا گوتی:
- نایکەمەوە، ئیدی نایکەمەوە. تۆبە، تۆبە، مەمنوونم. خودایە وەجاغی بنەماڵەی گومليكسيز هەرگیز کوێر نەبێتەوە. هەڵبەت تا پیاوی وەك تۆیان هەبێ کوێر نابێتەوە.
و هەستا.
گەڕایەوە ماڵێ. چۆوە سەر جێیەکەی و راکشا. بارێکی قورسی لەسەر شانی لاچوبوو.
ئێستا هەر "ئۆککەش داغ کوردو" مابوو بیدوێنێ. کابرایەکی لەسەرخۆ بوو. دین و ئیمانێکی باشی هەبوو. لە هەموو ئاواییدا هەر ئەو بوو سەری چووبا نوێژی نەدەچوو. بەرماڵی لەسەر ئاوێ دەگەڕا. هەموو ئاوات و ئارەزووی ئەوە بوو بچێتە حەجێ. هەر بۆیەش لەگەڵ ئەو پیرییەیدا پتر لە هەموو خەڵکی گوندی لۆکەی کۆ دەکردەوە. لەو پارەیەی وەسەریەکی دەنا، دینارێکی خەرج نەدەکرد و هیچی بۆ ژن و منداڵەکەی نەدەکڕی. ئەگەر ئەو قوماشە جاوەی لە ماڵەوە خۆیان دەیانچنی نەبوایە، رووت و قووت دەبوون. بەڵام زۆر لە مێژ ساڵ بوو ئەو پارەیەی بۆ حەج پێویست بوو هەر نەیدەگەیاندێ.
- ئەتۆ ئۆککەش داغ کوردو"ت پێ دەڵێن. تۆ پیاوچاکی. موسوڵمانی راستەقینەی. ماڵی کەست نەخواردووە. بە پاکی لە دایك بووی و بە پاکیش دەمری. تەنانەت بە گەنجێتیش دۆخینی حەرامت نە بۆ ئافرەت کردووەتەوەو نە بۆ ئاژەڵ. ئەو تەمەنەت تا ئێرە بە پاکی هێناوە، بە پاکییەوە ژیاوی. سبەی رۆژێ لە قیامەتێ، کە گەیشتییە دیوانی دادپەروەریی

خودای و کڕنۆشت برد، گوناحێکت نییە کە خودا لێت بپرسێتەوە. دەڵێ:"ئەی بەندەی خودا، تۆککەش داغ کوردو، ئەمن هیچ پرسیارێکم نییە لێتی بکەم. ئەوە کۆشکێکم لە بەهەشتێ بۆ ئامادە کردووی لە وێستگەکەی ئەدەنە رووناکترە. برۆ و لە کۆشکی خۆتا دانیشە و کەیفێ بکە و چێژ وەرگرە." جا ژنەکەشت دەنێرنە لات و چل دانە حۆریی جوانیشت دەنێرنە خزمەتی. حۆریی چ حۆری، هەموو کچی دەست لێنەدراو. چل کوڕە لووسکەشت دەدەنێ بۆ ئەوەی دەستەونەزەر لەبەردەمت راوەستن. ئاوی کەوسەریش وەك شەراب بە بەردەمتدا دەڕوا. هەتا چاو هەتەر دەکا باغ و بێستانە. هەموو لك و پۆیان لەبەر دەستی تۆیە. خۆیان میوە گەیوەکانیان دێننە بەر دەمت و چاوەڕێ دەبن بیانخۆی. شەو و رۆژ لە هەموو میوەکان، هەموو جۆرەکانی خواردن، هەنگوین و شیری مریشك دەخۆی. وەك خەڵکی ئەم دنیایەش گوو ناکەی. ئەو خواردنەی دەیخۆی وەك ئارەقە لە گیانتەوە دێتە دەرێ. ئەویش نەك وەك ئەو ئارەقەیەی لە کاتی لۆکە چنینەوەدا دەیکەی، وردە وردە بڵێی و نەڵێی ئارەقە دەکەی و ئارەقەی گیانت، جاروبار بۆنی میسك و عەتر دەدا و جاروبارەش بۆنی سوورەگوڵ و گوڵی نێرگز و هەندێ جاریش بۆنی پنگە و گەڵای سنۆبەر. جاروبارەش بۆنی گڵی باران لیدراو. ئەتۆ هەرکات حەزت لە هەر عەترێك بێ بۆنی ئەو عەترە دەدات. گۆشتی چەوری قاز و مراوی و سوێسکە، وەك هەنار، بەسوورەوەکراوی دێتە بەردەمت. هەر دەیخۆی و دەیخۆی. "ئیدریسی نەبی" بەبێ مقەست و بەبێ دوورینەوە لە هەوریشمی بێ خەوش، جلوبەرگی پڕ بە بەری خۆتت بۆ دەدوورێ. رەنگەکانی سۆمای چاو دەبەن. جلوبەرگەکانت وەك گوڵەکانی "ئۆزوون یایلا" دەبریسکێنەوە. هەموو رۆژێ دەیانگۆڕی. بەبێ ئەوەی خۆت ئاگات لێ بێ، چەندی بتەوێ جلوبەرگەکانت بگۆڕدرێن، لەناکاو دەبینی گۆڕاون.

"هەر نوێن و بانت بوێ، چیی مەل و پەلەوەری تووك نەرم هەن دێن و نەرمترین تووك و پەڕی خۆیانت لەبەردەم کۆشکەکەدا بۆ هەڵدەڕێژن هەموو بۆتۆ دەبنە نوێن و بان. هەربۆیەشە لەم دنیایەدا خەوتنی لەسەر عەرزێ وشك و رەق، خێرو پاداشتی هەیە. دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە هاوڕێ.

"ئەو خەڵکە دڵ کوێرە لەو شتانە تیناگەن. ئێمە ئەوە شەیتان کەری کردووین و بووینەتە دیلی نەفسی ئاژەڵیی خۆمان و لەو شتانە تێناگەین. بەڵام تۆ دەیزانی.

"لەوێ لە کۆشکەکەتدا هەوا نە ساردە و نەگەرم. فێنکە. وەك هەوای رۆژەکانی سەرەتای هاوین کە هەموو وڵات دەبێتە گولزار و خوێنی بنیادەم وەکوڵ دێ. فێنك و ساماڵ. هەربۆیەشە

خێرە، بنیادەم لەم دنیایە بە رووت و قووتی بگەڕێ بۆ ئەوەی جەستەی تاقەتی سەرمای توند و تاقەتبڕی هەبێ. کەس بەوە نازانێ. تۆ دەزانی. ئەوەیە هەموو خەلکە بێ ئاقڵەکەی ئەم گوندە کار بۆ دنیا دەکەن بەلام تۆ بۆ کۆشکەکەی خۆت لە بەهەشت تێدەکۆشی. تازە گاڵتەشت پێ دەکەن.

" راستە مەزراکەی کوڕی میرالای، وشك و بێ بەرهەمە. بەرهەمەکەی ناگاتە نیوەی مەزراکانی دیکە. ئەوە بە زیانی من و تاشباش و گوندییەکانی دیکەیە. کەلاکی دنیا چاوی دڵمانی کوێر کردووە. ئێمە بەشوێن مەزرای بەپیت و بەرەکەتی زۆرەوەین و تۆش بە شوێن کاری سەخت و داهاتی حەلاڵەوەی. تۆ پێت وایە کارکردن لە مەزرای پڕ پیت و بەرکەتدا و لۆکەهەلگرتنەوەی زۆر و وەرگرتنی پارە بە ئاسانی، دەبێتە هۆی ئەوەی لەو دنیا دیوارێکی کۆشکەکەت بڕووخێ. تۆ دەبێ پارەی چوونە حەجەکەت لەوانیتر بە زەحمەتتر کۆ بکەیەوە بۆ ئەوەی لە هەنتەشی خودادا لەوانیتر جیاواز بی. دەزانی ئەمن ئەو هەمووە هەوڵە بۆچی دەدەم؟ ئەمن دەڵێم لەو گوندەی ئێمەدا هەر یەك نەفەرمان هەیە نییەتی کردووە بچێتە حەجێ. ئەو کابرایە نابێ بچێتە کێڵگە و مەزرای پڕ پیت و بەرکەت و بەئاسانی پارەی وەگیر بکەوێ و ماڵی دنیا چاوە پاکەکانی ئەو کوێر بکاتەوە. ئەو کات ئەتۆ ئەو نیازپاکییەی منت لەبیر دەچێ و دەچی وەشوێن تاشباش ئۆغلو دەکەوی و لەوێ کۆشکەکەت وێران دەکەی و ئاوە کەوسەرەکەت دەکەیتە زەلکاو.

"ئەو دەمەی من دەمەویست پارە لە گوندییەکان کۆ بکەمەوە و تۆ نەتدامێ، دەزانی بۆچی قەرەوێڵەکەتم لێ نەستاندی؟ گوتم با لەسەر زەوی بنوو. دەزانی بۆچی دەستم بەسەر رزق و دەغلێ و دانەکەتدا گرت؟ گوتم با برسێتی بکێشی. ئەمن بۆ خەرج و موخاریجی خۆم مانگاکەتم فرۆشت، گوتم با ماڵی دنیا رێگەت لێ چەواشە نەکا. بۆخۆت باش دەزانی ئەمن لە رێگەی چاکە و خێردا چەندە دەستی تۆم گرتووە. بەلام تۆ سپلەی و پێ نازانی لەگەڵ ئەوەشدا کە ماڵی دنیات پێ هیچ نییە، بەلام تۆش بنیادەمی ئیدی.

"جا با ئامۆژگارییەکت بکەم. ئەتۆ چاو و دڵت تێرن، بەلام مێشکت کای تێدایە. ئەقڵت نییە. لە کتێبدا دەفەرموێ: نابێ بەرەنگاری خودا ببنەوە و کافر بن. خودا کێیە؟ تۆبە، تۆبە، ئەستەغفیروڵا... فەرمانڕەوایەکە هیچ کەس ناتوانێ سەرپێچیی بکا. ... نوێنەری ئەو لەسەر زەوی کێیە؟ حوکمەتەکەمان... دەمیرقیراتەکەمان... نوێنەرەکانی حوکمەت و دەمیرقیراتەکەمان لە گوندەکانا کێن؟ مەڵبەندار و "تۆفیق ئەفەنی"... نوێنەری مەڵبەندار و تۆفیق ئەفەنی لە گۆندەکان کێیە؟ کوێخاکەمان... کوێخاکەمان کێیە؟ من... دەی باشە بەو پێیە دژایەتیکردنی من یانی چی؟

هەر خۆت بلێ یانی چی؟ ئەمن نالێم. ئەو بەشەی دەبێ خۆت بیری لێ بکەیتەوە و بیزانی... دەبێ بیر بکەیتەوە و ئەو کۆشکە گەورەیەی ئەو هەمووە ساڵە بە رەنج و ئازار و کوێرەوەییەوە بە چنگ و ددان و بە برسێتی و چارەڕەشی پێکت هێناوە، بە فوویەك خاپووری نەکەی... جا چۆن دڵت دێ تێکی دەی هاوڕێ؟ حەیف نییە ئەو هەمووە زەحمەتەی تۆ کێشاوتە هاوڕێ؟ یانی تاشباش ئۆغڵوت پێ لەو کۆشکە گرنگترە کە لە بەهەشتێ هەتە هاوڕێ؟ ئەمن ئەوە دەڕۆم. تۆ راوەستە و بیر بکەوە. ئەوەندە بیر بکەوە تا بەیانی خەو بەچاوتا نەیە. تۆبە بکە لە گوناحەکانت و هەوڵ بدە خودا بڕوا بکا کە تۆ بە نەزانین لە رێگەی ئەو و لە سیراتولموستەقیم لات داوە. ئەوکۆشکە بە هەموو کەس ساز نابێ. کوا ئێستا پیاوی دڵپاك لە کوێ دەست دەکەوێ؟ خوا سەلامەتت بکا. خودات لەگەڵ بێ. سڵاو لە محەمەد و گیانە پاکەکەی."

خۆشحاڵ بوو. قسەی زۆر باش و کاریگەری بۆ ئۆککەش داغ کوردو کردبوو. ئۆککەش داغ کوردو هیچ وەڵامێکی نەدابۆوە و بەردەوام لە بن لێوانییەوە دوعای کردبوو. جاروبارەش گوتبووی:"خودایە تۆ رەحم پێ بکە و نەجاتم دە." هەر ئەوەندە.

ـ کوڕە هۆی "دوردومان"، ئەوە تۆ چ پیاوێکی؟ پیاو ناچار دەکەی بەو نیوە شەوە بێتەماڵت. دوای ئەوەی هەموو مەزراکان گیراونەتەوە تازە رادەپەڕن؟ساڵی دادێ بۆخۆتان بچن و مەزرا و کێڵگەی بگرن. گوندیتان تێن داون و وەشوێن خۆتان داون؟ ئەوە یانی چی؟ کوڕە، ئەگەرچوونە خوارێ و نەتانتوانی کێڵگەی بدۆزنەوە بۆ لۆکە رنینێ، چ وەڵامی گوندییەکان دەدەنەوە؟ کوڕە تۆ ئەرە سێ ساڵی رەبەقە ناتوانی قەرزەکانی عادیل ئەفەنی بدەیتەوە. گوێدرێژێك بۆ ئەو پیرە بابەت پێ ناکڕدرێ. ئەوە داینێ چوون و کێڵگەکەیەکتان پێ نەگیرا و لەو نێوەڕاستی چوکووراوایە رووت و قووت مانەوە، ئەمنیش ئیدی ناهێڵم بێنەوە نێو ئەو مەزرایەی خۆم گرتوومە. ئەوکات چ جوابی عادیل ئەفەنی دەدەیەوە دوردومان؟ چ جوابی گوندییەکان دەدەنەوە؟ ئەو کارانە مەکەن. بەزەییتان بەو گوندییە بەستەزمانە لێقەوماوانەدا بێ. ئاخری و ئاقیبەتێکی باشی نابێ بۆتان. جوان تێ بگەن. لە بەرامبەر یاسادا بە تاوانبار لەقەڵەم دەدرێن.

ـ درۆیان مەکە مامە. بەسە درۆ و دەلەسە. یاسا بۆ بە تاوانبارمان لە قەڵەم دەدا؟

ـ لەبەر ئەوەی ئەنگۆ فێلباز و گزیکارن. یاسا بڕگە بە بڕگە نووسیوێتی. چونکە تۆ کوێخا نی نازانی... بڕگەی یەکەم دەڵێ... با پێشت بڵێم بێ دەنگ بە. تۆ بۆت نییە گوندییەکان بخەڵەتێنی و تیژیان بکەی بۆ راپەڕین. لەو گوندەدا شتی زۆر سەیروسەمەرەت لەسەر دەڵێن. گۆیا تۆ گاڵتە بە ئایینی ئێمە دەکەی و رێگەی خراپەت گرتۆتە بەر. دەمت لێك نێ. ئەگەر

ئەو قسانەی جەندەرمەکان لەسەرت دەیڵێن بە گوندییەکانی بڵێم و لەقاوی بدەم، کات لە پێستی سەری داخنن... لەبیرتە ئەو مەسەلەی "کڵاوە گەرگەرییەکە؟"... تێگەیشتی؟... وایە تۆ زیت و زیرەکی، بەڵام ئەمنیش هەرچی حەزم لێ بێ لە دەستم دێ. شتت زۆر لەسەر بە بەڵگەوە. جەندەرمەکە پێی گوتم، ئەتۆ چۆن لە نێو خەڵکە گوێڕایەڵەکەماندا قسان دەکەی. چاوەڕێم، جا کە بۆقی ملتم گرت ئەو دەم دەزانی کێ پاشایە... حوکمەت هەموو شتێك دەزانێ و کەروێشك بە عارەبانەی دەگرێ. ئاگاداری ئاسنگەرەکانیشە کە سرت و خورتێکتان پێکەوە هەیە... ئەو کابرا نامۆیەش... وریای خۆت بە. هەر گوتم گوندیی خۆمە قەیناکا با دەنگێ نەکەم. با ئابڕووی گوندەکەمان نەچێ. بە کەسم نەگوت کە لەو گوندەی ئێمەدا پیاوێکی ئاوا مورتەد و لەدین وەرگەڕاوی لێیە. کوڕە، هێندە لا مەدە و بڕێك بگەڕێوە سەر ڕێی ڕاست. ناکرێ دژایەتیی میللەتێك بکەی. قوون بدە سەر دەرپێیەکەت. بەیانی بۆت نییە ڕەگەڵ تاشباشی بکەوی.

- گوێ بدەیە..ئەمساڵ ئەو خەڵکە لارێ مەکەن. گفتم داوە ساڵی دادێ یارمەتیتان دەدەم. کێڵگەی باش بۆ گوندەکەمان دەگرین. ئەمنیش لەو کوڕەی میرالای وەڕەز بوومە. کابرایەکی چەنەوڕی هیچ و پووچە. ئەوەندەشت لەسەر بەجواب دێم و دەڵێم کوڕێکی پاك و بێ خەوشە. دەشڵێم کاری بەو جۆرە شتانەوە نییە.

– بیرێکی لێ دەکەمەوە مامە. جارێ با ڕۆژ بێتەوە... ئیشەڵڵا خێری پێوەیە...

- کەیفی خۆتە کوڕم. ئەمن هەموو شتێکم پێ گوتی. هاندانی خەڵك بۆ سەرپێچی تاوانێکی گەورەیە. ئەگەر ئاقڵت هەبێ تێ دەگەی. سەلامەت بی. خودات لەگەڵ بێ.

"عوسمانۆك"ـی لە حاڵێکدا دی کە لەخەوێ هەستابوو و چاوەڕوانی بوو و چون کوێخا لێی نزیك بۆوە گوتی:

- فەرموو، بەخێر بێی. ماڵەکەمانت ئاوەدان کردەوە. لە ئێوارێوە چاوەڕێتین. چاوەڕێتم. ئەوە تازە نۆرەمان هاتووە؟ ئەدی بۆ لە پارە خەرکردنەوەیدا ناوم لە پێش هەمووانەوەیە.

- بەدڵی مەگرە عوسمانۆك. تۆ خۆمانەی. تۆ ئەوەی پوورمی. بۆیەش دەڵێم خۆمانەی. زووش دەگەڕێیەوە سەر ڕێی ڕاست.

لە تەنیشتییەوە لەسەر گوێی دۆشەگەکە دانیشت. عوسمانۆك گوتی:

- چیی قسەی کردووتە و ئەو هەمووە شتە بێتامەی بەسەر یەکتەوە ناون هەمووم بیست. حیزبەکەمان مەهێنە نێو ناوانەوە. کاروباری کوێخایەتی و حیزب لێك جوێن. کاری وا مەکە.

دەترسم ئەو کارانەت ببنە هۆی ئەوەی لە کاتی هەڵبژاردندا هەر هەمووان دەنگەکانیان بدەنە عیسمەت پاشا و حوکمەتەکەمان لە دەست بچێ. لای بەکرە شێت مەگرە.

ـ کوێخا هەستا و برێك لەولاترەوە دانیشت و گوتی:

ـ قسەکەتم قبوولە. واز لە بەکریش دێنم و ئەو قسانەش ناکەمەوە. بەڵام ئەتۆش بەڵێن بدە وەدوای تاشباش ناکەوی. بەڵێنی پیاوانە. گفتی من گفتە. لە پۆلاش قایمترە. دەی بڵێ یائەڵڵا. ئەتۆش بەڵێن بدە. ئەمساڵیش نوێنەری ئەنجوومەنی گوند هەر تۆی... ئەوەش دووەم بەڵێنمە بە تۆ. قەبووڵە؟...

ـ با بیرێکی لێ بکەمەوە....

ـ و ئەگەر تۆ بەڵێن بە من نەدەی. نوێنەرایەتی ئەنجوومەن و هاوڕێیەتیی حیزبیمان تێك دەچێ. هەروەها حیزبایەتی یانی ئەوەی سەرت لە پێناوی قسەی یەکێك لە هاوڕێیانتدا دابنێی. لەبیرتە سەرۆکی حیزبەکەمان چیی گوت؟ گوتی:"ئەوە یەکەمین مەرجی دەمیرقیراسییە." تێگەیشتی؟

عوسمانۆك لاقەکانی وەبن خۆی دا و گوتی:

ـ ئەگەر تۆ واز لە بەکرە شێتی بێنی بەڵێنت پێ دەدەم. بەڵام درۆیان نەکەی ها.

کوێخا گوتی:

ـ بەڵێنی ئێمە بەڵێنی پیاوانە هاوڕێ.

هەستا:" ئێمە سەرمان تێدا دەچێ ، بەڵام لەسەر قسەی خۆمان هەر سوور دەبین. چما شتی وا دەبێ؟ هەر ئەوەندەیە قسەیەك بکەین...."

وەخت بوو کوێر بێ بۆ خەو. ئەوەندەی قسە کردبوو قوڕگی دێشا. بەڵام نەیدەتوانی ئەمشەو بچێتەوە نێو جێوبانە گەرم و نەرمەکەی. زۆربەی گوندییەکان لە خەوێ هەستابوون و گوێیان دەدایە قسەکانی ئەو و کارەکانی ئەویان شەن و کەو دەکرد.

لە دڵەخۆیدا گوتی:"ئیشەڵڵا کەس گوێی لەو قسانەم نەبووبێ کە بە گوملیکسیز ئۆغلۆم گوتن. خۆ بیستبێتیان حەیام چووە. بەڵام ئێستا کە ئەوان لە خەوێ هەستاون و چاویان بەسەر کردەوە و هەڵسوکەوتی منەوەیە، دەبێ چاوترسێنێکیان بکەم."

ساتێك وێستا. سەیرێکی گوندییەکانی کرد کە لەسەر عەرزەکەوە راکشابوون. دیسان وەڕێ کەوتەوە.

ئەو جێوبانەی کوێخا بەسەرییەوە راوەستا، جێوبانی "کۆتولمیز عەلی" بـوو. خـۆی بەسـەردا نوشتاندەوە و هاواری کرد:

ـ هەستە حیزباب. سەر بە هەموو کون و کەلێنێکدا دەکـەی و خراپـەی مـن دەڵێـی؟ هـا؟ هەستە. دەبێ سزا بـدرێی. گـەوادی بـێ رەگـی. هەسـتە. هـەروەها دا ئـەو گوریسـەم بـدەنێ. گوریسێکم بدەیە بۆ ئەوەی کە دەستت دەبەستم زۆرت نەیەشێنێ. هەروەها هەستە.

دەستی ئەوی گرت و قیتی کردەوە.

"کۆتولمیز عەلی" لە بن لێوانەوە هێندێ شتی گوتن کەس نەیزانی چیی گوت.

ـ هەتیوە لەگەڵ تۆمە. ئەو گووکارییە چییە کردووتە؟... یاڵا وەرێ کەوە بـۆ پۆلیسـخانە. پێت وایە ئەو گوندە میراتی بابتە؟ ئەتۆ خۆت لەجێی کێ داناوە هەتیوە؟... بێ حەیای بێ چاو و روو. ئەوە دەتەوێ بەیانی وەشوێن تاشباش ئەفەنی بکەوی، "عەلی ئەفەنی پاشا"؟ بابـت کـە مرد تۆی دایە دەست من. کوێخای گوندێك بابی ئەو گوندەیە و هەر وەها یەکێکە لە پاشاکانی سەرکۆمار. ئەمن چیی پێم خۆش بێ دەتوانم پێتانی بکەم.

تا هێزی لەبەردا بوو شـەپلاخەیەکی لـێ راکێـشا. دەنگـی زللەکـەی وەك دەمانـچە هـات. عەلی دەستەکانی ئەوی گرت و نووزایەوە:

ـ تۆبە مامە، تۆبە. ئەمن لەگەڵیان نەبووم. هەر تێکەڵیشیان نەبووم.

ـ با ئەو کەسانەی پاداشـتی چـاکەکانی مـن دەدەنـەوە وەشـوێن ئـەو کـەون. ئـەو هـەمووە زەحمەتەی من بۆیانم کێشا، بەرۆکیان دەگرێ. مەحاڵە نەیگرێ. بەڵام نـاهێڵم تـۆ بـچی. لێیـان گەرێ با ئەوان برۆن و لە بیابانەکانی چوکووراوادا بێکار و برسی بکەونـەوە و سـەرگەردان بـن. کارم پێیان نییە. بەڵام تۆ بۆت نییە برۆی. عادیل ئەفـەنی قـەرزی تـۆ لـە مـن دەسـتێنێتەوە. باشە، جا ئەوجار بنوو. تۆ کارت بەسەر ئەو شتانەوە نەبێ کورم. خودا غەزەب لەوانە بگرێ کە منداڵی خەڵك بەلارێدا دەبەن. ئێوە تاوانتان نییە رۆڵەم. رۆڵـە بەسـتەزمانەکانی خـۆم. سبەی رۆژێ کاریان وەدەست نەکەوێ هەر منم بۆیان دەسووتێم. ئەوانەی بەدەهۆشیان بردوون، سمێڵیان بابڕ دەکەن و بە تەزبێحی کارەبایی زەردەوە گاڵتەیان پێ دەکەن.

ماندوو ببوو. بەبێ ئەوەی بچێتە جێیەکی دیکە، راستەورێ بەرەو نوێن و بانەکەی رۆیـشت و لەسەری تخێڵ بوو. سەری لەگێژەوە دەهات.

دەبوو دوای برە پشوودانێك، دیسان بچێ و سەر لـە یـەك بـە یـەکی ئـەوانی دیکـەش بـدا. خراپەکەی ئەوە بوو کە ئەوانی دیکە، ئەگەر سەریانت نەدابایـە دڵیـان دێـشا و لەبەرخۆیانـەوە دەیانگوت:" سەردانی فلان و فیسارەی کرد. لەبەر دەرگایماڵیان دانیشت و زمان چەوریی کرد

بەڵام ئێمەی بە بنیادەم حیساب نەکرد." بەخۆیاندا دەشکانەوە. ئێستا بەخەبەر هاتبوون و زۆربەیان چاوەڕێی هاتنی بوون.

دەبوو سەراسوێی هەمووان بکا. کەڕەی بەیانیش دەبوو بچێ عاشقە کەچەڵە بدۆزێتەوە. بەخۆی گوت:

" ئێستا کە نەخشەکەیم کێشاوە، ماندووش بم و بشمرم هەر دەبێ لێی بەردەوام بم. ئەگەر کارەکەت بە نیوەچڵی بێڵیتەوە، ئیتر هاوڕێ لە ژیاندا هیچت پێ جێبەجێ نابێ."

شەوگار شەق ببوو کە هەستا و دیسان کەوتەوە ڕێ. یەك بە یەك و لەگەڵ هەرکامەیان بە پێی وەزعی خۆی قسەی کرد و لێی پرسین. ئەوەندەی زمانی گەڕا و تین و تاقەتی هەبوو قسەی کرد. کاتێ کارەکەی تەواو بوو، دڵی خۆش بوو. دەیزانی ئەو تۆوەی بەشەو دایچاندووە بەیانی لەگەڵ تاوئەنگووتنێ چەکەرە دەکات و شین دەبێتەوە.

بەرەبەری بەیانی بوو کە ئاخری توانیی خۆی بگەیەنێتە ئاشقە کەچەڵە. هەر واشی دانابوو. ئاشقە کەچەڵە دوایین کەسی گوند بوو. هەر نەفەرێك مابوو کوێخا قسەی لەگەڵ نەکردبوو. ئەویش تاشباش ئۆغلو بوو. بەپێی نەخشەکەی دەبوو بچێتە لای ئەویش، بەڵام خۆپەرستی و کەڵکەڵەی شەیتانی ڕێی لێ ون کرد.

ئاشقە کەچەڵە شمەکی لەبەر کردبوو و پاڵی بە دارەکەی تەنیشت جێویانەکەیەوە دابوو و دانیشتبوو. کوێخا بەبێ ئەوەی تاقە یەك قسەش بکا، چوو و وەك خۆی پاڵی بە دارەکەی ڕووبەڕوویەوە دا و دانیشت و گوتی:

- ئای ی ی ش ش .. قورینگەکان....

ئاشقە کەچەڵەش گوتی:

- ئای ئ ی ی ش قورینگە سەر بە کڵاوەکان...

- شادی بەخشی ماڵی بابم. ئاشق گیان، ئەو دەمەی تۆ ساز لێ دەدەی بۆلبولەکان دێن و لەسەر سەرت هەڵدەنیشن... ئای ی ی ی ، قورینگەکان...

ئاشق ئەو قسەیەی لە هەموو شتێ پێ خۆشتر بوو:

- ئای ی ی، قورینگە سەر بەکڵاوەکان...

- ئەی ئەو کەسەی گوندەکەمان شانازیت پێوە دەکا و ئەو دەمەی تێی دەچریکێنی هەنگوینت لە لێوان دەتکێ و تەیری ئاسمان و دەعبای کێوی وەزمان دێنی و دڵی ڕەوەز

دەتوێنیتەوە. لەو بەیانییە خۆشەی خودای گەورەدا، چریکەت لەگەڵ کازیوە رادەبێ.:"ئای ی ی ی قورینگەکان...." هەروەها ئەی قورینگە سەر بەکڵاوەکان.

ئەمشەو زۆر راکەراکم بووە. زۆر ماندوو بوومە. کوڕەکەی کوێخا خدری خۆت، بەر لەوەی رۆژ بێتەوە هاتۆتە لای تۆ و دەیەوێ گوێی لە گۆرانییەکت بێ و ئاوپرژێنی دڵی بکەی. فکر و خەیاڵی ئاڵۆزن و خێڵی دوژمن دەوریان داوە. هەر دەڵێی لە سارای یەمەنێ بە تاقی تەنێ ماوەتەوە. سازەکەت بژەنە و گۆرانییەکی بۆ بڵێ با ببووژێتەوە و نامەردییەکانی دوژمنانی لەبیر بچێتەوە.

روخساری خەفەتبار و پڕ لە چرچ و لۆچی ئاشقە کەچەڵە کە بە ردێنێکی تەنك داپۆشرابوو، لەبەر تیشکەکەی کازیوە روون بۆوە.

بە ساڵا چوو بوو. نە بۆخۆی دەیزانی تەمەنی چەندە و نە هیچ کەسی دیکەش. لەوەتا دیتبوویان ئاوا بوو. چەند چڵە مووی ردێنە سپیە درێژەکەی بەردەوام بە بن چەنەیەوە دەلەرییەوە.

"سلاو لە هەتاوی درەوشاوە و باڵندەی ئاسمانێ."

"ساز"ەکەی دەرهێنا و بە هێمنی و بە دەستە لەرزۆکەکانی لاواندییەوە. ئەوجار دەستی کرد بە لێدلنی. لە هەوایەکەوە دەیگۆڕی بۆ هەوایەکی دیکە. سینگی بە سازەکەوە دەنا، خۆی قیت دەکردەوە و سەری بۆ رادەوەشاند، دوایی خۆی بۆ وێك دێنا و کۆ دەبۆوە و دیسان قیت دادەنیشتەوە و سەری بەرز دەکردەوە.

بە دەنگی سازەکە، ئەوانەی هێشتا لەخەودا بوون یان هەستابوون و دیسان خەوتبوونەوە، لەخەوێ هەستان. ئەو لقە دارانەی بە سەر سەری ئاشیقەوە بوون، بە شنەی بای بەیانی دەلەرینەوە.

لە پێشدا منداڵە وردکە هاتن. دوایی لە کەپرەکاندا دەنگە دەنگ هات. برێك دواتر دەنگە دەنگەکەش بڕایەوە. ئەوجار ژنەکانیش هاتن. لە دەوری ئاشقە کەچەڵە و کوێخا راوەستان. هەندێکیان دانیشتن و هەندێکیش بە پێوە مابوونەوە. لە حاڵێکدا کۆزیلکەیان بەستبوو و گوشاریان بۆ یەکتری دێنا، لە تەنیشتییەوە دانیشتن. پیاوەکانی و بەساڵاچووەکانیش هاتن و لەسەر خۆڵەکەوە هەڵترووشکان. لەو جەنگەیەدا کەرێك دەستی کرد بە زەڕاندن. هەر هەموویان دایانە قاقای پێکەنین.

بێدەنگییەکی قورس باڵی بەسەردا کێشابوون. هەمووان کپ و بێ دەنگ ببوون. لە بوومەلێڵی بەیانیدا و لەبەر شنە بای بەیانی، پۆل پۆل کۆ ببوونەوە و گوێیان دابووە سازەکەی ئاشق.

ئاشقە کەچەڵ لەوانە نەبوو هەر کات بیانەوێ جەزمە بیگرێ و تێی بچریکێنێ. بنە و بنەچەکی ئەو کەل ئاشق بوون. باپیرەی و بابی باپیری، مامەکانی و براکانی و هەر هەموو پیاوانی بنەماڵەکەی ئاشق بوون و بە هەر هەمووشیان دەگوتن ئاشقە کەچەڵ. رەچەڵەکی هەمووان دەگەیشتەوە قاراجا ئۆغلان و تەنانەت ئاشق یونسیش.*

لەو دەوروبەرانە، زۆر لە مێژ ساڵ بوو کەس نەبوو چ لە سەردەمی منداڵی یان لاوەتی یان بەساڵاچویی خۆی، هەروەها لەسەردەمی کچێنی یان نوێ بووکی یان منداڵبوونییەوە، بیرەوەرییەکی لە گۆرانییەکانی بنەماڵەی ئاشقە کەچەڵ لە بیر و زەینیدا نەبێ. هەر وەك لایەلایەی دایکیان، وەك قسەی شیرن و دڵدارانەیان و وە زەماوەند و جێژنەکانیان، لەبیریان بوو. گۆرانییەکانی ئاشقە کەچەڵەکانیشیان هەر ئاوا بەرورونی و لە نێو جەرگەی خەونەکانیانەوە دەهاتەوە بیر.

ئاشقە کەچەڵ هەر لێیدا و لێدل و دیسان قیت بۆوە. روخساری نوقمی شادی و خۆشی بوو. دەستی بە ردێنەکەیدا کە چەند چڵە موویەکی زیاتر پێوە نەبوو، هێنا:

**لەو بوولێڵەی بەیانییەدا**
**لەو گۆشەیەی ئەم دنیایە**
**لە قەراغی چوکووراوا**
**سڵاو لەوانەی هاتوون و لەو بن دارە کۆ بوونەوە**
**هەزار سڵاو لەو خونچەیەی دەمەو بەیانیان دەپشکوێ**
**لەو خاکەی رادەبێ لە خەو**
**لەو چڵە گیایەی کە شین دەبێ و**
**لەو بوونەوەرەی دەخوێنێ**
**لە رووناکایی ئەو ئاوەی بە گۆرانی گوتن دەڕوا...**
**ئای ی ی ی قورینگە سەر بەکڵاونەکان...**

---

*قاراجائۆغلان: بەناوبانگترین شاعیر و ئاشقی شیعری رەشۆکیانەی تورک. شاعیر بەکەفوکوڵی واقیعەکانی ژیانی ئەو خەڵکەی لەنێویاندا دەژیا.

** ئاشق یونس: گەورەترین و بە تواناترین شاعیری ئەدەبیاتی رەشۆکیانە و عیرفانیی تورکیە.

خەڵك تێكڕا پێكەنین و گوتیان:

ـ سڵاو لە ئاشقیش...

ـ لە بنە و بنەچەكەی ئاشقیش

ـ لە تەلی سازەكەشی

ـ ئای ی ی ی ئای ی ی ، ئای ی قورینگەكان...

ئاشقە كەچەڵە:

ـ لە هەر هەموو خۆشەویستان،

لە منداڵە مەلۆتكەكانیش سڵاو...

دیسان هەموویان پێكەینین:

ـ سڵاو...

ئاشق:

ـ لە قاراجا ئۆغلانی باپیرەم

لە باوە یونسم

لە باپیرەم دادال ئۆغلو**

سڵاو لە رۆژە خۆشەكانی رابردوو توركمانیش

خەڵكەكە گوتیان:

ـ لە قاراجا ئۆغلان، لە ئاشق یونس لە دادال ئۆغلو لە ئەورەحمانیش...

ئاشق بڕێك بێدەنگ بوو. ئەوە بەو مانایە بوو كە دەیەوێ گۆرانییەكی هەر كام لەو ئاشقانەی باسی كردوون بڵێتەوە:

ئای ی، ئیتر جێژن و خۆشی دەستی پێ دەكرد.

ئاشق دووپاتەی كردەوە:

ـ ئای ی/ قورینگە پۆپنەكییەكان...

---

** یەكێك لە شاعیرە گۆرانیبێژانەی لە چوكووراوا و چیاكانی تۆرووس و ئەنەدۆلی ناوەڕاست ژیاوە و شیعری حیماسی و ئەڤینداریی ناسك و جوانی وتووە.

جا دەستی پێ کرد:

لە پێشدا دەنگێکی کز و پیرانەی هەبوو بە چەند کۆخەیەکەوە. دوایی وەردە وردە بەهێزتر و بەسۆزتر بوو:

- جووتێ بولبول هاتن و لەسەر دڕکێك نیشتنەوە
سەریان سەوز و قاچیشیان سوور...
ئای ی ی ، قورینگە پڕپنەکییەکان..
ئای ی ی، رووناکییەکان.
لە ئەنگوستەچاوی شەودا، لەسەر دڵم
هەر جودایی ماوەتەوە و نەبوونی و مەرگ...
سێ خەمم هەن لێك جودا نین...
کە چوکووراوا جلی جێژنانەی دەپۆشێ...
خۆشی و ناخۆشیم هەرکام کێوێکن
ئای... کێوە پڕپنەکییەکان...
لە دڵی "قیر سمیر"دا ئاگرم کردەوە
بڵێسە دەدا و دووکەڵەکەی بەری ئاسمانێم لێ دەگرێ...
هەزار کێو کەوتووەتە بەینمان
یاخوا ببنە تۆزی بانان ئەو کێوانە...
ئای ی ی ... قورینگەکان... چیاکان...
لەقلەکێك بە ئاسمانەوە... لەقلەقێك
لاقەکانی چێوی خەنەیی
جا دنیا کە ئاخری مەرگە
لێکدابڕان بێ و رق با نەبێ خۆشەویستان.
سێ بەردی سوور لە سەر گۆڕەکەم دابنێن
بمکوژە و دەستەکانت بە خوێنم سوور بکە

با بلّێن دەستە سپیکەڵەکانی لە خەنە داون
پاپۆڕی پاشا لە دەریدا بادەواکانی هەڵداون
دەریاکان... دەریاکانی چوکووراوا.
سەوزایی خاك،
جوانیی باران
لە کوێی ئەی کۆلکەزێڕینە
سەوز و سپیی من.
دەنگێکی بلاوێن
دنیای درەوشاوە
ئەو کێوانەی لەبەر تیشکی دازیوەدا دەبریسکێنەوە
ئەی هەژاری کە وەك ملپێچ لە دەوری ئەستۆم هالاوی
لە چنگ تۆ من بۆ کوێ بڕۆم؟
ئاخ نەخۆشی، ئەی سیل و گڕوێ
ئەی دلّداری و تووڕە بوون و ئاشبوونەوەکان.
ئاخ... ئەڤینە سووتێنەرەکان.
ئیزراییل هاتووە و گیانی دەوێ
ئاخۆ توانام هەیە گیانم بدەم؟
لەسەر دیواری بەیانیان خۆر هەڵدێت.
ئێستا دە برای نهێنی پاریزم دەوێ.
بۆوەی ئەو ئاغایانە لە زەوییەکانیان بێنمە دەر...
ئاغاکان... ئای ی ی ئاغاکانی چوکووراوا...
هێزی داری گەورە بە لە لك پۆی دایە
لە بن خاك و لەسەر خاك...
ژان و ئازار و بەلاّ...

مەناڵێنە، گیانەکەی من، مەناڵێنە...
لەسەر هەموو لووتکەیەکڕا خۆرێك هەڵدێچ.
ئای ی ی... قورینگە پۆپنەکییەکان

هەنگەمەی شادی خۆشی هەموو وڵاتی تەنییەوە. ئیدی کەس لە قسەی ئاشق تێ نەدەگەیی. دەتگوت زەوی دەیەوێ شەق بەرێ.

لە ناکاو دەنگەدەنگەکە کپ بوو. ئاشق وەك هەمیشە بەو جۆرە سازەکەی بێ دەنگ دەکرد. هەر لێی دەدا و کە بە لووتکە دەگەیشت، لە پڕ دەستی لێ بەردەدا.

لەگەڵ ئەو بێدەنگییەدا، خۆریش لە ئاسۆ سەری وەدەرنا. خەڵکەکە چەند ساتێك لەسەر جێی خۆیان مانەوە. دەستەکانیانی ماندو و بێ هێز بەولاولایدا شۆڕ بوونەوە و سازەکەی لە باوەشییەوە خزییە خوارێ. هەمیشە هەر وا بوو، تەنانەت بە گەنجیش... ئاشق هەستا. خەڵکەکەش هەستان و بڵاوەیان کرد. روخساری هەرکەسە و شادییەکی پێوە بوو، هی واشبوو دێڕە گۆرانییەکی بەسەر زارەوە بوو...

کوێخا دەستی لەسەر شانی ئاشق دانا و گوتی:

ـ سڵاو لە گۆرانییە جوانەکان و لە هەوا خۆشەکانت. لەو دەنگە داوودییەت... هەروەها لە تەلی سازەکەشت، لە تەلی سازەکەشت... سڵاو لە برایەتی و رووی گەشت... سڵاو لە بنە و بنەچەکی پیرۆزی ئاشق هەزاران سڵاو...

ئاوڕی دایەوە و دیتی سێ کەس چاوەڕێی ئەون. چووە لایان و هەرای کرد:

ـ چ بوو؟ مام خەلیلتان نەدۆزییەوە؟

کە هەمووان بە سەرلەقاندن گوتیان نەخێر، دەستی پێ کرد:

ـ ئەوەیە ئیدی... ئەوەتا ئاوایە... کە گوندەکە شێوا، ئاوای لێ دێ...

کاتێ پیرەمێردەکان بەو تەمەنەوە و بەو پیری و پەککەوتەییەوە... لە ترسی ئەوەی نەکا گوندی بیانکوژن، وەکێوان دەکەون...

هەروەها لە کێو و دۆڵاندا سەر دەنێنەوە و تێدا دەچن... و کەس تەرمەکەشیان نادۆزێتەوە... تەنانەت ئێسك و پرووسکیشیان... ئیسقانە سپییەکانیشیان... تەرمەکەشیان لافاو دەیبا و مێش و مەگەزی کەسك دەیانخۆن... و هەروەها قەل و داڵ و دەعبایان...

کفن و دفن و پرسەیەکیشیان لە لایەن کەسوکارەکەیانەوە بە نەسیب نابێ... هەروەها هاوڕێیان، قورئانێکیشیان لەسەر ناخوێنرێ، ئاوایە ئەگەر گوندەکە نەشێوابا و هەروەها ئەگەر لەو گوندەدا کەس سەربزێویی نەکردبا و هەروەها ئەگەر سووکایەتی بە گەورەکان نەکرابایە، ئەو کابرایە بۆ رای دەکرد و ئاوارەی چۆڵ و کێوان دەبوو؟ ئای پیرەمێردە لێقەوماوەکە، ئای ی ی.. وەی ی یش.. پیرەمێردە نازدارەکە... پشت و پەنای هەموو کەس و دەرمانی هەموو دەردان... مامە خەلیلەکەی من، کە چەندەی لە بوون و نەبوونی سەر ئەو زەوییە دەزانی. ... ئای ی ی... خاکی رەش تۆشی قووت دا و رۆیشتی... ئەگەر تەرمەکەت بدۆزمەوە لەگەڵ خۆم دەیبەمەوە چوکووراوا... و لە گۆڕستانێکی گەورەدا دەینێژم.... کێلی گۆڕەکەشت دەدەم وەك هی پاریزگارەکانی بنووسن... دەیدەم بینووسن کە " ئێرە گۆڕی ئەو مام خەلیلەیە کە بشێوییەکانی گوند سەری خوارد، ئەلفاتحە." ئەی دەستەشکاو خۆم... ئای مام خەلیلەکەی من کە لە رێگەی لۆکە چنینەوە و لە چیاکانی چوکووراوادا سەرت نایەوە. لە یەمەن بە زیندوویی رزگارت بوو بەڵام لێرە تێدا چووی... ئاااای مام خەلیلەکەی من. ئەتۆ لای من لە بابیشم خۆشەویستتر و ئازیزتر بووی. تاقانە یادگاری بابم بووی بۆ من. ئەگەر ئەمن نەسووتێم و خۆڵ وەسەر نەکەم و نەگریم ئەدی کێ بگریێ؟ ئاخ بۆ دۆستە مێرخاسەکەی بابم. ئاخری تۆشیان کوشت.

دەنگی وا بەسۆز و خەمین ببوو کە ژن و کچەکان دایانە گریان. دوو تنۆك فرمێسك لە چاوەکانی کوێخادا قەتیس مابوون. دوایی ئەو دوو دڵۆپەیەش تکان و چۆڕانەوە سەر سمێڵەکانی. لەو نێوەدا دەنگی تاشباش بەرز بۆوە:

ـ یاڵڵا دەی ئامادە بن. ئەمن ئەوە دەڕۆم. هەرکەس لەگەڵم دێ، با بێ. هەر کەسیش نایە کەیفی خۆیەتی.

تاشباش چەند جارێکی دیکە ئەو قسانەی دووپاتە کردەوە.

کوێخا دەمودەست بێدەنگ بوو و گوێی هەڵخست. بێدەنگییەکی قورس باڵی بەسەریاندا کێشا. کوێخا رووی لە کەپرەکەی تاشباش کرد. دەستەکانی لە نێوقەدی نا و سەیری کرد. لەوێ کۆمەڵێك کە بۆی ساغ نەدەبۆوە چەند کەسن، جموجۆڵیان بوو. دوو گوێدرێژی بارکراو و چەند ژن و منداڵێکی دی. ئەوانیش سەیری لای کوێخایان کرد. کوێخا دەموچاوی خستە نێو لەپی دەستەکانییەوە و دەستی پێ کردەوە:

ـ ئاااای... ئای مامە خەلیلەکەم بریا مردبایەم و ئەو رۆژەم بەچاو نەدیبایە. سەیر کە مامە خەلیل، ئەتۆیان کوشت و خەریکن دەشرۆن. ئەتۆیان ئاوارە و سەرگەردانی چیا و چۆڵان کرد و ئێستاش دووبەرەکییان خستۆتە گوندەوە و دەڕۆن. سەیر کە مامە خەلیل، ئەوانەی بەسەری زیندوویت مامە مامەیان بوو بۆوەی لەگەڵیان بکەوی، ئێستا دەڕۆن و را دەکەن. دوژمنەکانی ئاوایی. چما ئەوانە بۆوە دەبن پێیان بڵێی دەر و دراوسێ و خزم و کەس و کار و برادەر؟ ئای خۆزگە زیندوو بایەی و لە کەلێنێکەوە چاوت لێیان بایە کە چیت لەگەڵ دەکەن. جا دۆست و دوژمنی خۆتت باش دەناسی... ئاااااای.... ئاااای...

پیرەمێردی لێقەوماو کە لە چۆڵ و دۆڵ و چیایان بێ کەس و کار سەرت نایەوە، بانگی کوڕەکەتت کرد نەهاتە ژوور سەرت. هاواری برات کرد کەس نەهات لە ئامیزت بگرێ... لە ئاویلکەدان و گیان دەرچووندا داوای چۆڕە ئاوێکت کرد و کەس نەبوو بتداتێ... دیارە ئەو دەمەی گیانی شیرنت دەردەچوو و بە چنجرووکان عەرزەکەت هەڵدەکۆڵی. خەلیل... خەلیل... خەلیل... خەلیل... مامەەەەە....

لەو جەنگەیەدا یەکێك هاتە لای و گوتی: بەکرە شێت و گزیرباشی لەو خوارەوە خەریکن دێن.

روخساری خەمبار و فرمێسکاوی کوێخا دەستبەجێ ئاسایی بۆوە. لە وردە هەنگاوان بەرەو کەپرەکەی خۆی چوو. برێك دواتر گزیر و بەکرە شێت لەبەردەم کوێخادا راوەستابوون و لە شەکەتییان هەناسەبڕکێیان بوو. کوێخا پرسی:

ـ دیارە ئیدی هیچ کێڵگەیەکی بەتاڵ نەماوە ها؟...

ـ لە سایەی سەری بەڕیزتەوە، تەنانەت قولانجێکیش چییە نەماوە خەڵکی نەچووبێتە ناوی. هەر مەزراکەی میرالای ماوە و چاوەڕێتانە. جگە لەوە تەنانەت قولانجێکیش مەزرای چۆڵ دەست ناکەوێ. ئەگینا چما دەستم هەڵدەگرت و دەهاتمەوە؟...

ـ لایەنگرەکانی تاشباش یاغی بوون. خەریکن دەڕۆن.

ـ با بڕۆن. ئەمساڵ کێڵگەکەی میرالای بەرێکی گرتووە هەر مەپرسە، بڕوات بێ زۆر لەوانی دیکە باشترە... قۆزاخەی پڕ بەچنگن...

کوێخا پیلی گرت و گوتی:

ـ گزیر باشی تۆ بڕ و جاڕ بکێشە کە ئەمساڵ مەزراکەی میرالای بەر و بووی لە هەموو مەزراکانی دیکە باشترە. مەزراکانی دیکە هەور بردوونی و بەریان نەگرتووە. هەموو ئامادە بن

سەرەوخوار دەچین. هەروەها ئەو بەرخەی لە مێگەل دادەبڕێ گورگ دەیخوا. ئێمە دڵمان نایە تەنانەت یەك نەفەریش چییە لێمان جوێ بێتەوە و بەتەنێ بڕوا. ئەتۆ بڕۆ و جاڕ بکێشە.

تاشباش ئۆغڵو، ئوکسوزدوران و "وەلی" و چەند کەسێکی دیکە لە هەوارگەکە دەرچووبوون و خەریك بوون لە بزنە ڕێیەکەوە ئاوەژوو دەبوونەوە. بەڵام ئەو ڕووداوەی مام خەلیل پشتی شکاندبوون و دوودڵی کردبوون. ئێستا کە یەکێك بزر ببوو و یان مردبوو، ئاخۆ بەجێ بوو ئەوان بڕۆن و لە گوندییەکان جوێ ببنەوە؟ ئاخۆ جنێویان بە دایك و خوشکیان نەدەدان؟ حەزیان لێ بوو لە گوندییەکان دانەبڕێن. بەڵام ئیتر وەڕێ کەوتبوون.

گزیر بە دەنگێکی گڕ و بەرز دەستی کرد بە جاڕ کێشان. گوندی بێ دەنگ بوون و دوایی لەپڕ زیاتر لەجاران بوو بە هەڵا و هەنگەمە و قریوە. ئێستا هەوارگە لە خۆشی و شادیدا شەپۆلی دەدا. ئیدی کەس مەرگی مام خەلیل و گریانە بەسۆزەکانی کوێخای لەبیر نەمابوو.

کوێخا نەیدەتوانی چاو لەو کۆمەڵە کەسە هەڵگرێ کە لە کوێرە ڕێیەکەوە ئاوەژوو دەبوونەوە. کەلێنێك دەکەوتە نەریتی کوێخایەتیی "کوێخا خدر"ـەوە. پیاوی باش، نەدەبوو یەکپارچەیی گوندییەکان تێك بدات یان ئیزن بە خەڵکی دیکە بدات کاری وا بکەن. گوندییەکان بێ تاوان بوون. ئەگەر فریویشیان خواردبایە و لاڕێش بووبان، هەر خەتای کوێخا بوو. هەر واش بوو.

بۆ ساتێك چاوی بە گوملیکسیز ئۆغڵو کەوت کە خەریك بوو باروبنەی دەپێچایەوە. لە ناکاو بە مێشکیدا هات "ئەو پیاوە گەورانەی سەرۆکایەتیی خەڵکیان لە ئەستۆیە، نابێ لووتبەرز بن. ئەتۆ دەبێ خۆت بێنییە ئاستی ئەوان بۆ ئەوەی خۆشیان بوێی و ڕیزت بگرن. ئەگینا لە ناخی دڵیاندا شێرێکی نووستوو هەیە و وەخەبەر دێ. هیچ کەس "نیو پووت" نییە. هەمووان پووتن. تەنانەت ئەو شوانەش کە خەریکی بزن لەوەڕاندنە خۆی پێ لە سەرۆکی دەمیرقیراتەکان گەورەترە. نابێ گاڵتە بە غیرەت و غرووریان بکەی."

بانگی هێشت:

ــ گوملیکسیز ئۆغڵو گیان، ئەتۆ نەجیمزادەترین پیاوی ئەو گوندەی. لە ئەوەی سەربازییەکانی. وەك ئێمەی گوندی ساویلکە نی. گوێ بدەیە. لە پێش چاوی ئەو گوندییانە بەتۆ دەڵێم. بە هەموو دنیا دەڵێم. ئەمن پێموایە ویژدانی تۆ ڕازی نابێ بەوەی تاقمێك لە هاونیشتمانییەکانی ئێمە لە گوندییەکان جوێ ببنەوە و لە دەشتەکانی چوکووراوادا سەرگەردان بن. ئەگەر وایە وەرە پێکەوە بچین و بیانگێڕینەوە و سەرکردەکەشیان مەمەد تاشباشی کوڕی یوسف و ئەنشەجای لە دایکبووی ١٩٥٤بگێڕینەوە. وەرە با بڕۆین براله.

پیلی گوملیکسیزی گرت و کێشای. بە غاردان وەشوێنیان کەوتن. کە گەیشتنێ پشوویان لێ بڕابوو و قسەیان پێ نەدەکرا. گوملیکسیز ئۆغلو بە دەست ئاماژەی بۆ کردن و گوتی:

ـ پەلە مەکەن. برێك ڕاوەستن با پشوویەکم بێتەوە بەر. قسەیەکم پێتانە. لەسەر عەرزەکە هەڵتڕووشکان. ئەوانی دیکە ڕاوەستابوون و سەیریان دەکردن و شاییان لە دڵی دەگەڕا. کە پشوویان هاتەوە بەر هەستان. کوێخا گوتی:

ـ تاشباش ئۆغلو، تاشباش ئۆغلو، لە دایکبووی ١٩٥٤، کارێکی باشت کرد ڕاوەستای. هەروەها ئێمە دوو قسەمان لەگەڵت هەیە.

تاشباش ئۆغلو سەیری چاوی نەکرد. پشتی تێ کردبوو و ڕاوەستابوو.

ـ کوڕە سەیری بکەن. هەر نایەوێ سەیریشمان بکا. خۆ ئەمن زگم بەخۆی ناسووتێ کە خەریکە بەدەستی خۆی قوڕ بەسەر خۆیدا دەکا. بەزەییم بەو مناڵە جوانانەی دا دێ لەگەڵ ئەو ژنە ژیر و بەناموسەی بەخوشکم بێ. دا ڕاوەستە بزانم. سەیری من کە تاشباش ئۆغلو. بە سۆنگەی ئەو دووبەرەکییەوە یەکێکمان لەدەست چوو. هەموو ئاگرمان تێ بەر بووە. مام خەلیلەکەمان ئاوارەی چیا و چۆڵان کرد. لەو ڕۆژی پرسەیەدا ڕۆیشتن و بەجێهێشتنی گوندییەکان کارێکی دروست نییە. ئاوڕێك بدەوە و جوان سەیرم بکە.

چونکە تاشباش ئۆغلو ئاوڕی نەدایەوە، کوێخا چووە پێشێ و پیلی گرت و بەرەو لای خۆی وەرسووڕاند. تاشباش ئۆغلو ئاگری لە چاوی دەباری کە سەیری کرد. کوێخا لە چاوەکانی ترسابوو و ڕووی لە گوملیکسیز ئۆغلو کرد و گوتی:

ـ پێی بڵێ، بڵێ ئەمن دۆستایەتیی لەگەڵ دەکەم. بۆخۆی کوێی پێ خۆشە با بچێ. بەڵام بۆی نییە ژن و مناڵەکەی ئاوارە و سەرلێ شێواو بکا. ئەمن وەك مام، هاوڕێ و کوێخای گوندی ناتوانم ئیزنی ئەوەی پێ بدەم. تێی بگەیەنە گوملیکسیز ئۆغلو گیان. هەروەها ئەو گوندییانەی ئێمە ئیزنی ئەوە نادەن و هەورەها لە چوکووراوا مەزرایەکی چۆڵ نەماوەتەوە. مەمەد تاشباشی لە دایکبووی ١٩٥٤ و کوڕی ئەنشەجا و یوسف ناتوانێ شتی وا بکا. بۆی نییە بڕوا و پەنا بەرێتە بەر گوندێکی دیکە و بۆشی نییە شەرەف و ئابڕووی ئێمە بە ئاوێ دا بدا و بە هەموو دنیا ڕابگەیەنێ کە گوندەکەی ئێمە دووبەرەکیی تێکەوتووە. هەروەها ئەو دووبەرەکییە بووە هۆی ئەوەی بەساڵاچووترین پیاوی گوندەکەمان ریش چەرمووەکەمان، سەری خۆی هەڵگرێ و بداتە کێوان و بمرێ و تێدا بچێ. هەروەها بشڵێ گوملیکسیزی خۆم. ئەو کابرایە شێت بووە و لە مێشکی داوە. ساڵی داهاتوو ئەمن وەشوێن ئەو دەکەوم. بەڵێن بێ. تەنانەت ئەگەر بیەوێ ئێمە وەك پاڵەی لۆکەچنینەوە بەرێتە دەم

دەریای سپیش و لەوێش بڵێ ئەوە دەریا نییە و مەزرای لۆکەیە، دیسانیش بە قسەی دەکەم و گوندییەکان هەڵدەگرم و وەشوێنی دەکەوم. بەڵام ئەمساڵ بۆی نییە یەکێتییەکەی گوندەکە تێک بدات. شێواندنی ئەو یەکپارچەییە چ مانای هەیە؟

گوملیکسیز ئۆغلۆ هات و قۆڵی لە قۆڵی تاشباش ئۆغلۆ کرد و گوتی:

ـ براله، مەمەد، ئەمساڵ گوندەکە مەشێوێنە. ئەمن ساڵانێك هەموو شتێکم شێواند. ئاخری چیم لێ هەڵگرتەوە. ئەوەی بەسەر من هات بەسەر دۆم و قەرەجیش نەهاتووە. نە ژنم ما، نە منداڵ و نە ماڵ و حاڵیش. بە حاڵی سەگ گیانم رزگار کرد. خەڵکی گوندەکانی دیکەش گاڵتەمان پێ دەکەن و دەڵێن: وەرن سەیریان بکەن. کاکە ساڵی داهاتوو ئەمنیش لەگەڵتم. خۆ دەزانی بەڵێنی من پیاوانەیە.

روخساری تاشباش وەك گەچ سپی هەڵگەڕابوو. دنیای لەبەر چاوی تاریك ببوو. تەزبێحە زەردەکەی لە گیرفانی خستەوە. چاوی لە چاوەکانی ئۆکسوز دوران بڕی کە لە تەنیشتییەوە راوەستابوو. ئۆکسوز سەری داخست. تاشباش ئۆغلۆش سەری بەردایەوە. کوێخا کە تێگەیشت ئیتر نابزوون، گوتی:

ـ ئەنگۆ لێرە راوەستن. گوندییەکانی دیکەش ئامادە بوون و ئێستا دێن. یان ئەگەر حەزتان لێیە وردە بچنە خوارێ.

چون دەیزانی گەڕانەوە بۆ ئەوان زۆر ئەستەمە و لەوانەیە قەبووڵیشی نەکەن. بەو جۆرە پێشی بەو هەستی بەخۆدا شکانەوەیەش دەگرت.

ـ دەبێ رابردوو لەبیر بکەین براله مەمەد، پیاو دەبێ وا بێ. ئەمن ئەتۆم زۆر خۆش دەوێ. ئەتۆ جوامێرترین و باوەڕپێکراوترین خەڵکی ئەو گوندەی. ئەتۆ بۆمن لە برای دایی و بابانیش نزیکتری. خۆزگە برایەکی دیکەی وەك تۆم بووبا. ئەو کات دنیام دەبوو.

گوملیکسیز ئۆغلۆ گوتی:

ـ کوڕە خۆ ئەمنیش تاشباش ئۆغلۆم لە گیانم خۆشتر دەوێ. جوامێر و ژیر و تێگەیشتووە. ئێستا هەر کەس لە جێی ئەو بوایە رانەدەوەستا و ملی رێیەی دەگرت و دەڕۆیی. ئەو ناڕوا چون زۆر ژیرە.پێشینیانمان گوتوویانە، دوژمنی ئاقڵ هەزار برادەری گەمژەی بەقوربان بێ.

دەنگەدەنگی هەوارگە دەهات. جموجۆڵ و هاوار و قریوەری خۆشی...

نیـوەی خـەڵکی گونـدی هـەر لـە ئێـستاوە بارگەوبنـەیان کـۆ کردبـۆوە و وەڕێ کـەوتبوون. بارەکانیان لە پشتی گوێدرێژ و ئەسپەکان و لە کۆڵی خۆیان شەتەك دابـوو و تاقمێکیـشیان بـە پەلە دەیانبەستن.

هەتا گەنجێکی پەڕپووت کە هەموو تەشك و داوێنی قوڕاوی بوو و دارێکی بەدەستەوە بـوو گەیشتێ ئەوان بێ پسانەوە قسەیان لەگەڵ تاشباش کرد بەڵام ئەو متەقیشی نـەهات. گەنجەکـە گەیشتێ و لە بەردەمیان راوەستا و گوتی:

- مانگاکانمان گەیاندە مەزراکـەی مـیرالای ئاغـا. بـڕۆین و لەوەڕگەیـەکی باشـە. ئەمـساڵ هەموو دابەستە دەبن.

کوێخا دەستێکی بە پشتی گەنجەکەدا هێنا و گوتی:

- عەمرت درێژ بێ رۆڵە.

جا لە ئامێزی گرت و لەسەری رۆیی:

- هەی بە قوربانی گوندیی ئاوا بم. هەر بڵێی "م" دەڵێ مانگا. کـوڕە لەگـەڵ خـەڵکی ئـاوا بچیتە جەحەندەمیش ناسووتێی. ئاگرەکەت وەك ئەوی حەزرەتی برایم بۆ دەکەنە گوڵستان.

تاشباش ئۆغلۆیان لەوێ بەجێ هێـشت و گەڕانـەوە هەوارگەکـە. کوێخـا سـواری گوێدرێـژە رەشەکەی بوو کە بـن کلکـی زامـار ببـوو و دەبریـسکایەوە. وەپـێش گوندییـەکان کـەوت. بـە تەنیشت تاشباش ئۆغلۆدا کە هێشتا لە جێی خۆی چەقیبوو و بیری دەکـردەوە، تیـژ تێپـەڕی و بەرەو چوکووراوا تیهەڵبوو.

برێك لە خوارترەوە، لە چوکووراوا تەپوتۆز هەستابوو. بۆنی تاڵی تۆزی لۆکەیان بەر لـووتی کەوت.

# ١٧

ئەو هەنارستانە دووركەوتەیە، بە داوێنی ئەو كێوانەوەوە و لەسەر چواررێیانێكە. خوارەوەی دەشتی چوكووراوایە كە گوڵەنێرگزی چاوزێڕین و بە پنگەی گوڵ مۆرەوە و بە دارە لیمۆ و پرتەقاڵەوە كە بۆن و بەرامەیان دنیا دادەگرێ و بە سپیایی لۆكە و بسكی زەرد و زێڕینی گوڵە گەنمەكانییەوە لە بەر هەتاو دەبریسكێتەوە. شەوانە كێڵگە و مەزراكانی لەبەر تیشكی تەراكتۆرەكان ئەستێرەبارانە، كامیۆن بە هارەهار پێیدا دەگەڕێ و گیادروو "دەڕاسە"كانیش باوەش باوەش گەنمەكان هەڵدەلوشن و باقە باقە فڕێی دەدەنەوە. كارگەی پڕ لە جموجۆڵی لێیە و شاری زۆر گەورە بە حەشیمەتێكی زۆرەوە كە وەك مێروو تێك دەئاڵێن... چوكووراوای تۆزاویو گەرم و نارەق ڕێژ و داپۆشراو بە هەورێكی سپی.

هەنارستانەكە زۆر كۆنە. دەڵێن هی سەردەمی كافرانە. بنەتاكانی* زۆر گەورە و ئەستوورن. زۆربەی دارەكان نیوەیان وشك بووە و نیوەكەی دیكەیان تەڕە. توێكڵە پیرەكانیان شەقارشەقارن. لك و پۆپەكانیان لار و وێرن. تەختی عەرزی هەنارستانەكە بە وردكە بەرد و چەوی درشت كە لافاو بە درێژایی ساڵان لەگەڵ خۆی هێناونی داپۆشراوە.

هەنارستانەكە لە لایەكەوە پشتی بە داوێنی چیاكانی تۆرووسەوەیە و زۆر پان و بەرین و هەراوە و ئەوسەری دیار نییە.

لە مانگی گوڵاندا هەر دەڵێ ئاسمان و زەوی و خاكی چوكووراوا لە خوارەوە و رووبارە پڕ لە ماسییەكان و شارەكان و شارۆچكەكان و گوندەكانی، روخسار و جلوبەرگی خەڵكەكەی و ئەسپ و عارەبانەی تۆزاوی و ترۆمبێل و كانییە قەوزە گرتووەكانی هەر هەمووی دەچنە سەر رەنگی گوڵە هەنار. پیاو پێی وا دەبێ دارستانەكەی تۆرووس لە خەرمانەیەكی رەنگی سووردا شەپۆل دەدا.

---

* بنەتا: بەشی بنەوەی درەخت. بەشە ئەستوورەكەی.

لە مانگی گوڵاندا ناتوانی بە تەنیشت هەنارستانێکی وێراندا تێپەڕی. شەپۆل دەدا. هەرچی مێشەنگوینی چیا و کوێستان و دەشتەکان و پێدەشتەکانە، بە پوورە و هێلانەیانەوە هاتوون و گوڵی هەنارستانیان داپۆشیوە. لەسەر هەر لکێك و بە هەر گوڵێکی سوورەوە کە بە لکە دارێکەوەیە، بە هەزاران مێشەنگوینی جۆراوجۆر و ڕەنگاورەنگ، بچووك و گەورە و شین و زەرد و بریقەدار و سووری بازنەبازنە پەلوپوز نەرم هەڵنیشتوون. هەر دەڵێی لکەدارەکە خۆی پوورەی مێشە. گوڵەکان نوقمی جموجۆڵ و جۆش و خرۆشێکی بێ سنوورن. وزەوزی مێشەکان، لە دوورەوە دەبیسترێ و کە دەچیتە نزیکتریان، دەنگەکان بەرزتر دەبنەوە و دەخرۆشێن و شەپۆل دەدەن.

ئێرە سەر چوارڕێیانەکەیە. بەڵام زۆر بێ ریبوارە. چوار ڕێیانێك کە دەچێتەوە سەر چوار کوێرە ڕێیە. چۆڵییەکەی ئەوێ، بە ڕەنگێکی سووری تۆخ و وزەوزی مێشەنگوین و بریقەی باڵی هەزاران مێش پڕ دەبێتەوە. جگە لەوە، زەوی وئاسمان چۆڵ و هۆڵە. وێرانی و چۆڵبوونەکەی هەنارستانەکەش ئەو بۆشایی و چۆڵییە چڕتر دەکاتەوە.

لێرەوە، زۆربەی ئەو کەسانەی دەچنە چوکووراوا یان لەوێڕا دەگەڕێنەوە بێرەدا رادەبرن. جاروبارەش لێرە پشوو دەدەن.

هەنارستانە وێرانەکە، ڕەشە ماری خەتەر و مەترسیداری لێیە. ئەگەر بڵێی لە بن هەر بەردێکی مارێك پاپۆکەی خواردووە درۆ نییە.

وەرزی گوڵان، وەرزی ژوانی ئاشقە و ماشقەیە. ماری ڕەش شێت و شەیدای گوڵی سوورە. تەنانەت خاکەکەش سوور دەچێتەوە.

هەموو وڵات نوقمی تیشکی خۆرەتاوە. وەك بڵێی لە خاك و هەنارستانەوە هەڵمی سوور هەستێ. لە بن دارێکی گەورەی هەنار کە نیوەی توێکڵەکەی قەڵشیبۆوە و کەوتبوو، لە تەنیشت بەردێکی سپی، مارێکی ڕەش هاتە دەرێ. وردە وردە، بە کلك بادان خوشییە سەر گیاو گژەکە. جار جارە سەری هەڵدێنا و سەیرێکی دەوروبەری دەکرد. مێشەکان وزەوزیان بوو. گوڵەکان عەترێکی تاڵیان دەپژاند. لە لای کانییە قەوزەگرتووەکەوە، بۆنی پنگە دەهات. ئەو هەورەی لە لای تۆرووسەوە دەهات، بچووك و سپی بوو.

مارەکە لە بەردێك چووە سەرێ. برێك مایەوە و دوایی هاتە خوارێ. دواتر خۆی لە دارە هەنارێك هاڵاند. کوشتن و ئەزیەتکردنی ڕەشە مار گوناحە. ماری ڕەش، ئەگەر پێی لەسەر کلکی دانەنێی کاری بە بنیادەم نییە.

لە دارەکە جوێ بووەوە و چۆوە نێو گژ و گیایەکە و لە چاوان ون بوو. ساتێك دواتر گەیشتە وشکەڵانەکە و ڕاوەستا. کلکی نوشتاندەوە و ویستی پاپۆکە بخوا بەڵام پاشگەز بۆوە و دیسان

وەڕێ کەوتــەوە. ویــستی بــەرەو گوڵێــك خــۆی بکێــشێ بــەڵام بــەلای دا تێپــەڕی. فیــشکاندی. چــەند باڵندەیەك بەسەر لقێکەوە نیشتبوونەوە. کە مارەکە بە بنیـدا تێپــەڕی لـە شـەققەی باڵیـان دا. دەنگـی فیشکاندنێك هات. مارەکە گەڕایەوە. لە بن چڵی گوڵێکی شین، مارێکی دیکە خزییە بـن بەردێکـەوە. ئــەوەیان درێــژتر و رەشــتر دەچــۆوە. لەوانەیــە دوو شــەقاویش دەبــوو. دوومارەکــە گەیــشتنە یــەك. هەردووکیان چوونە سەر بەردەکە. نیوەی خوارەوەیان تێك ئاڵاند. هەر ئاوا لە بەردەکە هاتنــە خــوارەوە و چوونە نێو گیا و گژەکانــەوە. کـە لـە نێـو گـژ وگیایەکانـەوە هاتنــەوە دەرێ، گەواڵـە هــەورە ســپییەکە گەیبووە سەر هەنارستانەکە و خەریك بوو تێدەپەڕی. ساتێك سیبەرێکی لە گوڵە سوورەکان کرد.

پێ چۆلەکە** هەر دەڵێی پێستەی خاکە. وەك تویژێکاڵێك بە خاکەوە دەنووسێ. باڵا ناکـا. مـارەکان کە جاروبارە دەخوشین، و جاروبـارەش رادەوەسـتان هاتنــە ســەر پێـچۆلەکەکان. لـەوێ راوەستان و ساتێك چـاوەڕێ مـان. دوایـی تــەواو تێکـاڵان و وا چــوون لەبــەر یەکــەوە دەتگـوت بوونەتە یەك و پێکەوە نووساون. کلکەکانیان لە هەژاویدا دەلەرزین.

ـ سوورایی گوڵە هەنار، سـەوزایی پێـچۆلەکەو شــینایی ئاسمــان و ســپیایی هەورەکــەش لــە عیشقا لەرزین.

پشووی سوار ببوو. چاوەکانی لێك دەنان و هەڵی دێنانەوە و ســەیری مارەکــانی دەکـرد کـە خەریکی جووتبوون بوون. ئەو کات تەمەنی لە حەڤدە ساڵ تێنەپەڕیبوو.

مارەکان لە چاوان ون بوون. ئۆخەیەکی هاتێ. هەر دەهاتنەوە پێش چاوی و ون دەبوونەوە.

مارەکان دڵیان لە مرۆڤیش دەچوو... مارێك دڵی چووبوە سەر کچێك و مـاوەی چـەند ساڵان کچە بۆ هەر لایەك دەچوو وەشوێنی دەکەوت. دەچووە نێو جێوبانەکەیەوە. تەنانەت بەبێ ئەوەی کچە بزانێ خوارەوەی جەستەی خۆی خوار دەکردەوە و گەمەی عیشقی لەگەڵ دەکرد... کچە هەموو جارێ کە مارەکەی لە ئامیزی خۆیدا دەدی، بە ترسەوە رادەچڵەکی. چیی نەدەما شێت بێ... بـەڵام وردە وردە خــووی پێــوە گـرت. ئیـدی هـاواری نـەدەکرد و دەرنەدەپەڕی. کە هەڵدەستا لە خەوێ، ئیدی مارەکە وردە وردە دەخزی و دوور دەکەوتەوە. رۆژێك لە رۆژان مارەکە نەیتوانی را بکات و براکانی کچەکە مارەکەیان کوشت. کـچەش ئەوەندەی بۆ گریا هەتا شێت بوو.

---

** پێچۆلەکە: گیایەکی ورد و نەرمە. باڵا ناکا و هەڵناستێ. هەر بە عەرزییەوە دەنووسێ. ئاژەڵ بە تایبەتی مەڕ زۆریان پێ خۆشە.

مارەکان جار بە جار بەجموجۆڵتر دەبوون. زیاتر تێکداڵان و لێك جوێ دەبوونەوە. یەکێکیان سەری لە دووی ئەویتر دەنا، دەیگرت و تێی دەهاڵا. دیسان یەکتریان بەر دەدا. گورجتر دەبوون. لە چاوتروکانێکدا ئەوسەر ئەوسەری هەنارستانەکەیان دەکرد و دەگەڕانەوە.

هەتا نیوەڕۆ داها هەر وایان کرد. سەریان وا لە دووی یەك دەنا دەتگوت باڵ دەگرن. تێکداڵانەوە و پێکەوە نووسنانەوە. شل بوونەوە و لەسەر عەرزەکە لێی تخێڵ بوون.

دوایی هاتنەوە ئەو شوێنەی بە پێچۆلەکە داپۆشرابوو. دیسان کلکیان ئالقە کردەوە و رووبەڕووی یەکتری سەریان هەڵێنا و تێکیان گرێ دا. نزیکەی نیو مەتر و لەوانەیە یەك مەتریش هەڵدەستان. تێکداڵانەوە و لێك دەبوونەوە. ئاگرەکەیان بەتینتر دەبوو و خۆیان هەڵدەستاندەوە و چیی نەمابوو لەسەر کلکیان راوەستن.

زاریان داپچڕیبوو و درۆشەکانیان هاتبووە دەرێ. چاویان وەك گۆمی خوێنی لێ هاتبوو و سەریشیان وەك ئاور داییسا. سوورایییەکەیان وردە وردە بەرەوخوار داکشا.

مێشەکان لەسەر گوڵە هەنارەکان کەوتبوون و هەڵا و هەنگەمەیان بوو. مەلە مێشخۆرەکان هاتن و رابردن. باڵندەیەکی شینی بریقەدار هات و لەسەر بەردێك نیشتەوە. سەری بەرەو مارەکان وەرسووڕاند کە هەر هەڵدەستان و دەکەوتنەوە. بە چاوێکی وردەوە سەیری کردن. دیارە هیچ لەو جموجۆڵەیان تێ نەگەیبوو بۆیە لە شەقەی باڵی دا و فڕی.

هەتا نزیك نیوەڕۆیە هەر وا هەستان و تێك هاڵانەوە.... کەوتنەوە و هەستانەوە.... خوشین و گەڕانەوە و تێك هاڵانەوە. دیارە جار و بارەش شلپ وە عەرزەکە دەکەوتن. نیوەی سەرەوەی جەستەیان وەك ئاگر سوور ببۆوە. وەك بڵێسە سەریان دێنا و تێك دەئاڵانەوە. وەك ئەو بڵێسانەی بەرز دەبوونەوە و کورت دەبوونەوە و بە شنە بایەك هەڵدەستن و دەنیشنەوە و گرفە دەکەن... وەك گوڵە هەنار. لەوانەشە هەر بۆیەش بێ کە مارەکان لە وەرزی گوڵە هەناردا لە هەنارستانەکاندا جووت دەبن. لەوانەیە ئەوە خۆ شاردنەوەیەکیش بێ.

ئاخری دەتگوت خەوتوون بۆیە ئەمجارەیان کە کەوتن، ئیدی هەڵنەستانەوە و هەر لەوێ لێی کەوتن و مانەوە. بەسپایی لەسەر یەکترییەوە دەجووڵان.

لە پێشدا یەکێکیان بە داهێزراوی خوشییە نێو گوڵەکانەوە. ئەوی دیکەش بە شوێنیدا. ئەو کات حەڤدە ساڵ دەبوو و نەدەبوو. زار و لێوی وشك ببوون. چاوەکانی بە سەرسووڕماوییەوە دەرپەڕیبوون. ملی درێژ کردبۆوە و هەتا لە چاوان ون نەببوون چاوی لێ نەتروکاندبوون.

ئەلیف شەکەت و ماندوو بوو، بێ هیوا بوو. لە سەر لووتکەی چیایەکی دوور دوورەوە دووکەڵێك هەڵدەستا. بەخۆی گوت:" مارەکان، مێشەکان، گورگەکان، باڵندەکان... هەموو مەخلوقات... خودا هیچ کامیانی تووشی ئەو چارەڕەشییە نەکردووە...."

بیرەوەرییەکی لە ناخیدا زیندوو بۆوە. چاوی هەڵێنا و دیتی عەلی کۆڵەکەی لە تەنیشت دایکەوە داناوەتە عەرزی و باڵی پێوە داوە و دانیشتووە. مرێمۆك لەو دیوی کۆڵەکەوە تارماییەکی بێ جووڵە بوو.

ئاوڕی دایەوە. منداڵەکان هێشتا وەدەر نەکەوتبوون. زۆری نەبرد ئەوانیش لە دوورەوە بە لارە لار دەهاتن. هەر هەنگاوێك دەڕۆیشتن و رادەوەستان. ئەلیف هەر جارێکی ئەوانی ئاوا دەدی، ئاوری بۆیان تێبەردەبوو. لە خەفەتان سەری لە گێژەوە دەهات. بە خۆی دەگوت:"ماندوو بوون. بەستەزمانانە مردن. بەخوای مانگێکی دیکەش نایەنەوە سەرخۆیان. ئەو پیاوە شێت و شوورە شەو و رۆژ راناوەستێ هەر دەڕوا. ئەوەتا رێی پێنج رۆژانی بە دوو رۆژ بڕیوە. ئەو منداڵانەی کوشت. بۆخۆشی وێران بووە. ئەو "عەلی"یە سەر بەقوڕە منداڵەکانی لێ کوشتم. خودا غەزەب لە دایکی و لە ئەسپەکەشی بگرێ... لە هەر هەموو شتێکی..."

دڵی ئاوی نەخواردەوە. چوو بۆ لای منداڵەکانی. هێندەمان نەماوە رۆڵە گیان... سەیر کەن ئەوەتا بابتان.

کە بە دەست ئاماژەی بۆ لای بابیان دەکرد، لە ناکاو دەستی سڕ بوو. دەستی بەربۆوە. خۆی لەسەر پێیان رانەگرت و کەوت. ئاخۆ ئەو هەورازەی لە پشت سەرییەوە دیار بوو چیای سلێمانلی نەبوو؟

"دەکرێ بە دوو رۆژان رێی پێنج رۆژە ببڕی بەڵام ناتوانی لە چیای سلێمانلی سەر کەوی. دەبێ بگەیتە هەنارستانە بەرەڵڵاکە.... مارەکان... مێشەکان..."

منداڵەکان لە تەنیشت دایکیانەوە دانیشتن. تواوبوونەوە. رەش رەش داگەڕابوون و چاوەکانیان وا دەرپەڕیبوو دەتگوت هەموو روخساریان بۆتە چاو.

ئەلیف ساتێك دواتر چاوەکانی هەڵێنابوون و دیسان سەیرێکی چیاکەی کردەوە. کێوەکە نوقمی مژ بوو و لووتکە بە ناخی هەور و ئاسماندا چووبوو. باشە ئەوە ساڵانی رابردوو چۆن توانیبوویان لەو کێوە سەر کەون؟ گوندییەکان کە لە لۆکەچنینەوە دەگەڕێنەوە، لێرە بەسەریاندا دەکەون هەموو نەخۆش و پەککەوتە و لەگەڵ خۆیان دەیانبەنەوە ئاوایی. ئاخۆ تەرمەکەی

مریمۆکیش دەبەنەوە؟ یان تەرمی ئەو لیقەوماوە هەر لێرە لە غەریبی بەجێ دەهێڵن؟ مریمۆك هەرگیز کەیفی بە تەنیایی و خەڵوەت نەهاتووە. لە غەریبی شێت دەبێ. ئێسك و پرووسکی دەزریکێنن. "ئەمن ئێسك و پرووسکەکەی هەڵدەگرم و لە توورەکەیەکی دەکەم و بە کۆڵمی دادەدەم و دەیبەمەوە. ناهێڵم لێرە بێکەس و تەنیا لەو چیا و چۆڵەدا بەجێمێنێ. "

سەیری دەوروبەری خۆی کرد. زەوییەکە بە وردکە بەرد و چەوی ئەو جۆگەیەی بە تەنیشتیاندا دەهات داپۆشرابوو. رەگی دارە گەزەکان بە لمەکەدا رۆچووبوو. بۆنی پنگە دەهات. بە لەبزێکی شیرن گوتی:

- رۆڵەکانی خۆم... منداڵەکانی خۆم...

پیلی حەسەنی گرت و هەڵیستاند. ئەو شووڵە بەلاڵووکانەی حەسەن لەکۆڵی خۆی نابوون، لە پنچکێك ئالقان و نەیتوانی هەستێ کەوتەوە. ئەلیف کە شووڵە بەلاڵووکەکانی لە پنچکەکە جوێ دەکردەوە گوتی:

ـ کورم ئەوانەت هەر فڕێ نەداون؟ ئێمە خۆمانمان لێ بۆتە بار، ئەوانە فڕێ دە. لە پشتی حەسەنی کردنەوە و فڕێی دان. حەسەن هیچی نەگوت، بەڵام چاوی لە چاوەکانی دایکی بڕی. ئەلیف رووی وەرگێڕا و گوتی:

- دەی وەڕێ کەون. هێندەی نەماوە... ئەوەتا بابتان لەوێیە.

وەڕێ کەوتن. حەسەن زوو زوو ئاوڕی لە دارە بەلاڵووکەکانی دەدایەوە و سەیرێکی دەکردن. هەنگاوێك دەڕۆیی و رادەوەستا و سەیرێکی دەکردنەوە و چاوێکی لە دایکیشی دەکردەوە.

ئەلیف دڵی پڕ بوو.... خۆزگە توانیبای لەبەردەمی منداڵەکانیشی بگری... گورج گەڕایەوە و دارەکانی بۆ هێنا... دەلینگیان هەڵکرد و لە ئاوەکە پەڕینەوە. کە لە ئاوەکە دەپەڕینەوە ئۆمەخان لاقی هەڵخلیسکا و کەوت. لەئاوەکەدا خووسا. ئەلیف دەستی گرت و هێنایە دەرێ.

کە گەیشتنە لای بارگەوبنەکە، عەلی چاوی هەڵێنا و دیتنی. نەیدەتوانی چاویشی بترووکێنێ. ئەلیف باقە دارەکەی بە عەرزی دادا و چوو دەستی مێردەکەی گرت. دەستەکانی عەلی سارد و سڕ بوون. زەندەقی چوو. هەمیشە لە دەستی سارد تۆقیبوو. حەسەن کە سەیری دارە بەلاڵووکەکانی دەکرد روخساری گەش ببۆوە. ئەلیف بە دەنگێکی خەمناك و ماندووەوە پرسی:

عەلی چۆنی؟

عەلی هیچی نەگوت.

ـ نەخۆشی؟

ـ نا.

ـ ئەی چتە؟

عەلی نەیزانی بلّیّ چی. نەیدەزانی چ بلّیّ. هەولّی دا شتێك بلّیّ.

لێوەکانی جوولاّندن بەلاّم کەس نەیدەزانی دەلّیّ چی.

ـ دایکم چۆنە؟

ـ نازانم... ئەمن نازانم... دیارە باشە... یان لەوانەشە... بچۆ سەیرێکی بکە... هەر بەڕاستی ئەو هەورازەی سلێمانلیم هەر لەبیریش نەبوو.

ئەلیف چووە لای مرێمۆك و دەستەکانی گرت. دەستی گەرم بوون.

ـ دایە چۆنی؟...

مرێمۆك چاوەکانی هەلّێنان. نیگایەکی سارد و سڕ و بۆش.

ـ باشی دایە گیان. باشی خاتوونەکەم؟... دایکە جوانەکەم، تۆ باشی.

عەلی لەو قسانەی ئەو تووڕە بوو. لە بۆلّەبۆلّەوە گوتی:

ـ دا وەرە نێرە بزانم.

ئەلیف دەسبەجیّ چوو. عەلی:

ـ ئەو هەورازەی سلێمانلی... ئای ی ی . ئەو هەورازە. کوڕە خۆ هەر ئاقلّم پێی نەشکابوو. هیچ، هیچ... کیّ دەتوانی لەوە سەر کەویّ؟ ئیدی لێرە ماینەوە. هاتین و هاتین هەتا لێرە چەقیین. مالّم وێران بوو. ئاخ رۆلّە چاو رەشەکانم..وەیش ش ش

مرێمۆك بە تووڕەییەوە گوتی:

ـ وەیش وەیش مندالّە باب شێتەکان. چما گەیشتووینەتە سلێمانلی؟ وەیش... مرێمۆك ئەوە دەمریّ، مەترسن. ناتوانیّ ئەو هەورازە ببڕیّ. ناتوانیّ نا. بەو قوونە خاوێنەوە ناگاتە بەیانی. دلّتان خۆش کەن. دلّتان خۆش کەن. ئەنگۆ کە مرێمۆکتان برد و لە نێوەڕاستی کۆنە گۆڕستان داتاننا.

ئەلیف خۆی قیت کردەوە. هەموو هێزی خۆی هاتەوە بەر و گوڕاندی:

ـ سەر دەکەوین. زۆر باشیش سەر دەکەوین.... چما هەتا ئێستا بە گەلیّ جاران وەك بالّندە بالّمان نەگرتووە و پییدا سەرنەکەوتووین؟... وەسەر کەوتووین و دیسانیش وەسەر دەکەوینەوە. ئەتۆ ماندووی عەلی، سبەینیّ دەبینی. ئیدی ئەو هەورازە لەبەر چاوت ئاوا رژد نابیّ.

عەلی گوێی لێ نەبوو و پەیتا پەیتا دەیگوت:

- وەیش منداڵەکانم، وەیش... وەیش منداڵەکانم کە لە سەرما و بەفر و زەمهەریری زستانیدا رووت و قووت دەبن. یاخوا کوێراییت دایە. عادیل ئەفەنی. ئاخوا جووقەوارت ببڕێ. هەی کافری کافر بابی بێ دین و ئیمان..

ئەلیف دیسانەکە گوڕاندی:

- وەسەر دەکەوین.

بۆکرکرنەوەی پووشکە چووە سەر لێواری ئاوەکە.

هەموو گیانی وەك ئاگر داییسا.

ـ وەسەر دەکەوین. با بەیانی دابێ. ئیشەڵڵا خێری پێوەیە. سبەی شەوێ لە کۆنە هەنارستانەکە دەیخەین. بە پووش و پەڵاش و ئاومالّکەکە خێرا ئاورەکەی کردەوە. هەر وا بە گورجیش چوو مەنجەڵ و ساوارەکە و شووشە رۆنەکە و خوێیەکەی هێنا و چوو مەنجەڵەکەی پڕ کرد لە ئاو و وەسەر ئاگرێی نا.

پیوازیشی هێنا. پیوازێکی گەورە و سوور. لەگەڵ ساوار زۆر بەتامە. دوای ئەوەی ساوارەکە کوڵی، رۆنەکەی بەسەردا کرد، سفرەکەی لەبەر دەمی عەلی راسخت. دەستی منداڵەکانیش گرت و هێنانییە سەر سفرەکە. دوایی چووە لای مرێمۆك و گوتی:"

هەستە دایە گیان.. پڵاوێکی چەور و خۆشم لیناوە. برسیتە. دوو رۆژە دەمت لە هیچ نەداوە یالڵا دەی هەستە بە قەرەواشت بم."

مرێمۆك تەنانەت چاویشی هەڵنەهێنا. لە کۆنە گۆڕستانەکە بەولایەوە ئیدی لەگەڵ عەلی و ئەلیف و لەگەڵ منداڵەکان و لەگەڵ هەموو دنیا ببووە دوژمن. تەنانەت دەنگی لە تەیری ئاسمانێش گۆڕیبوو. لەو رۆژەوە نە قسەی لەگەڵ هیچیان کردبوو نە زەوادی شکاندبوو.

پەیتاپەیتا قسەی لەگەڵ خۆ دەکرد:"بەئانقەست لەو کۆنە گۆڕستانەدا دایئام بۆوەی بمرم. نەیدەتوانی بە جۆرێکی دیکەم بکوژێ... ژن و منداڵەکەشی بۆ کوشتنی من لەگەڵی بوونە یەك."

لە دوای گۆڕستانەکەوە نەچووبۆوە کۆڵی عەلی. بە دارەکەیەوە هەوڵی دابوو وردە وردە و بە لارەوە بڕوا. دوایین جار کە وەعەرزی کەوتبوو ئیدی نەیتوانیبوو هەستێتەوە و لەخۆی چوبوو. عەلیش وەیزانیبوو مردووە. چیی دوعای دەیزانی کردبووی و ئەو کاتەی لە بیری ئەوەدا بوو ئاخۆ لە کوێ و چۆنی بنێژێ، مرێمۆك لە ناکاو چاوی هەڵێنابوونەوە و نیگا پڕ لە پرسیارەکانی تێوە بڕیبوو. ئەوجار ئیدی قیت ببۆوە و هەستابووە پێ.

عەلیش کە گێژ و وێژ بوو و ئاواتەکانی پووچەڵ ببوونەوە، تووڕە ببوو و دیتبووی چاری نییە، بەناچاری بەکۆڵی خۆی دادابوو و شەو و ڕۆژێکی تەواو بەبێ ئەوەی ئاوڕێك لە دواوەی بداتەوە ڕۆیبوو. بارگە و بنەکەش ئەلیف بەکۆڵی خۆی دادابوو و هێنابوونی.

عەلی دایکی هێنابووە بناری کێوەکە و داینابوو. کە چاوی بە هەورازە ڕژدەکە کەوتبوو، دەست و پێی سڕ ببوون و لە تووڕەیی و بیهیوایی، پشووی لێ بڕابوو. بەڵام بەبێ ئەوەی خۆی بداتە دەست ماندوویەتییەوە، دەسبەجێ گەڕابۆوە و بەبێ ئەوەی گوێ بداتە بەربوونەوەی لەتە گۆنییەکانی لاقی و بڕژانەوەی برینەکانی کە سەری جەرگیشی پێیانەوە دێشا، خۆی گەیاندبووە ئەلیف و کۆڵەکەی لێ وەرگرتبوو و هەر وا بەخێراییش گەڕابۆوە. دوای ئەوە بوو کە لێرە پاڵی بە بارگەوبنەکەیەوە دابوو و دانیشتبوو.

دوای ئەوەی گەیشتە بناری کێوەکە و بارەکەی لەسەر عەرزی دانا، زۆری پێچوو تا ئەلیف و منداڵەکانی گەیشتنێ.

ئەلیف لەبەری پاڕایەوە: دایکە گیان لەبرسان دەمری. تۆ خودا هەر یەك دوو پاروو بخۆ. پیوازێکی سوور سووریشم هێناوە دەڵێی هەنارە..."

کە دیتی گوێی ناداتێ و ناخوا، دایە گریان. عەلی کە مەنجەڵە ساوارەکەی لە پێش بوو پاروەکی بەدەستەوە بوو و چاوەڕێیان بوو. کە زانی مرێمۆك نایە و ئەلیفیش نایبڕێتەوە، وردە وردە تووڕە دەبوو. هەر ڕاوەستا و دانی بەخۆی داگرت. ئیدی بۆڵاندی:

ـ وەرە ئەلیف:

ئەلیف مرێمۆکی بەجێ هێشت و هات. دەستی بۆ لای خواردنەکەی نەدەچوو. عەلی و منداڵەکانیش وەك ئەو لە دەوری ساوارەکە کە هەڵمی لێ هەڵدەستا، بێ جووڵە دانیشتبوون. لە ناکاو ئەلیف گەش بۆوە. داهاتەوە و بە سرتە بە عەلیی گوت:

ـ ئێستا دەورییەکەی دێنم و ساوارەکە بەش دەکەم. بەشی ئەو لە دەورییەکی دەکەم و لەگەڵ نانێك لە پێشی دادەنێم. ئێستاش نەیخوا شەوێ هەر دەیخوا.

عەلی ددانی لەچیڕەوە بردن و گوتی:"دەیخوا، بەقوزەڵقۆرتی بێ."

ئەلیف نانەکەی بۆ برد و هاتەوە دەستی کرد بە خواردن. عەلی بە مستەکۆڵەیەك پیوازەکەی ورد کرد. ئەلیف لەتێکی لێ هەڵگرت و لەسەر خواردنەکەی مرێمۆکی دانا.

زۆریان برسی بوو. بەسەر خواردنەکە وەربوون.

حەسەن کە تێری خوارد گوتی:

- ئەمن هەر ماندووش نەبوومە.
بە مستەکۆڵە لە سینگی خۆی دەدا:
- قەت ماندوو نابم.. ئۆمەخان ماندوو بوو. دوو ئەوەندەی دیکەش دەتوانم بڕۆم.
ئۆمەخان گوتی:
ــ درۆزنــانی، زۆر زۆر درۆزنــی. هــەر لووشمــە لــووشمی بــوو و دەگریــا. ئــەوە کــێ بــوو دەیگوت:"دەمرم، دەمرم،... ناتوانم بەڕێیەدا بڕۆم، دەمرم."
ــ ئەوە تۆ بووی. ئەمن هیچ ماندوو نەبووم. ئەتۆ سەیری لاقەکانتت کرد و قیژاندت..
- دڕووی تێڕاچووبوو...
- ئەدی، دڕووی تێڕاچوبوو... هەر بەلادا دەهاتی. ئەمن قەت قەت ماندوو نابم.
ئەلیف گوتی:
- کوڕی من پاڵەوانە... چۆن ماندوو دەبێ...
عەلی سەیری کرد و بزەیەکی تاڵی هاتێ. ئۆمەخان گوتی:
- ئەدی... وەڵڵاهی وا ماندوو ببوو هۆڕ هۆڕ دەگریا.
ئەلیف لێی تووڕە بوو:
- بێدەنگ بە کچەتیوە.
عەلی گوتی:
- ئەلیف، برینی لاقەکان وەك برینی گوللە دەبرژێنەوە. لەتە گۆنییــەکان لــە ڕێگــا کــەوتن. هیچ لەو مەڵحەمەی دایکم سازی کرد ماوەتەوە؟
ئەلیف بە خۆشییەوە گوتی:
ــ ئا، ماوە... گۆنیمان نییە، بەڵام شتێکت بۆ دەدۆزمەوە لێیان ببەستی.
هەستا. چوو و مەڵحەمەکەی دۆزییەوە و هێنای. مەڵحەمەکــە لــە تــوێکڵی دارە کاژێکــدا بــوو. ســفرەکەی کــۆ کــردەوە. بارگــە و بنەکــەی کــردەوە و جێوبانەکــەی هێنــا و ڕایخــستن. مرێمۆکیشی هەڵگرت و لەسەر جێیەکەی درێژی کرد.
گوتی:
- دایە گیان، خواردنەکەتم لە تەنیشتت داناوە. بە پیوازێکی سوورەوە. هەر کاتێــك حــەزت لێ بوو بیخۆ.
مرێمــۆك لــە دڵەخۆیــدا گــوتی:"کــچێ ئــەتۆ فریــشتەی. ئــەو کــافرە تێکــی داوی و لاڕێــی کردووی."

ئەو دەمەی ئەلیف مەلحەمەکەی لە لاقەکانی عەلی هەڵدەسوی، عەلی لەبەر ژان هاواری دەکرد. ئەلیف مەڵحەمەکەی تیهەڵسوی و بە پەڕۆیەك بۆی بەست.

ئیدی هەواکەی وەك هەوای کوێستانێ سارد نەبوو. بۆیە پێویستیان بە ئاگر نەبوو. ئاگرەکەیان بە جێ هێشت و چوونە نێو جێوبانەکەیانەوە. منداڵەکانی لەوبەرەوبەری مرێمۆکەوە نوستن.

حەسەن هێشتا لە بن لێوانەوە دەیبۆڵاند:

ـ پیاو قەت ماندوو نابن. وا نییە؟ سەیری بابم بکە.. هیچ.. ئەمن هیچ ماندوو نەبووم... سڵاو....

مرێمۆك برێك راوەستا تا منداڵ نووستن. گوێی هەڵخست بزانێ عەلی و ئەلیفیش نووستوون یان نا؟ کە زانی سریوەی هیچ شتێ نایە، بەسپایی لە جێوبانەکەی هاتە دەرێ. سفرەکەی کردەوە. دەورییەکەی لە نێوەڕاستی دانا. لە تاریکییەکەدا بە دەستەکوتە پیوازەکەی دۆزییەوە لە سەر پلاوەکەی دانا. لەتێکی لێ کردەوە و لە پارووەکەی نا. پلاوەکە بەو پیوازەوە چەندە بەتام بوو....

***

ئەلیف پێش هەمووان هەستا. لە بوولێڵەکەدا روخساری عەلی جوان دیاتر نەبوو. چیی سەیری کرد شتێکی بۆ ساغ نەبۆوە. چوو و ئاگرەکەی کردەوە. هەواکەی فێنك بوو. سەرمای نەبوو. هەر بە پێی عادەت دەستی بەسەر ئاگرەوە راداشت.

خەریك بوو بیری دەکردەوە. بیری دەکردەوە و سەیری هەورازە رژدەکەی دەکرد. هەورازەکە رژد و لووس بوو. رەنگی گڵەسوورەی هەبوو. چین چینیش بوو. شوێن شوێن کەسك دەچۆوە و لە کەسکەوە مەیلەوشین دەبۆوە. رێگەکەی بزنە رێیەکی باریك بوو کە وەك هێڵێکی سپی دەسووڕاوە و دەچووە سەرێ و لەو سەرەوە، لەوانەشە لە نێوان شینایی ئاسماندا لە چاوان ون دەبوو.

کێوەکە لە بوولێڵی بەیانیدا تۆخ و رەش دەچۆوە. لەگەڵ تاوهەڵاتنەکە رەنگەکان دەرکەوتن و هەورازەکە یەکسەر درەوشایەوە.

مەحاڵ بوو. دەبوو هەر لێرە بمێننەوە. عەلی نەیدەتوانی بەو مرێمۆکەوە کە دەتگوت قورقوشمە، لەو چیایە وەسەر کەوێ. مرێمۆکیش خۆ نەیدەتوانی بەرێیەدا بڕوا. لەوانەبوو مردبێش. ئەلیف بەرەو جێوبانەکەی مرێمۆك غاری دا. لە دوورەوە کە دەورییە بەتاڵەکەی دی، گەڕایەوە:

"باڵندە بە هەڵفڕین و مار بە خوشینەکەی ناتوانێ لەو چیایە وەسەر کەوێ. بە تایبەتی ئەگەر ماندووش بێ، هەر ناتوانێ لێشی بچێتە پێشێ." نەیدەتوانی چاو لە کێوەکە بتروکێنێ.

لە بەردەم هەورازەکەدا بێ جووڵە راوەستابوو و پێی بە عەرزییەوە وشك ببوون:

"چار چییە؟ چ بکەین؟ ئاخۆ ئەگەر ئەو هەورازە نەدەبوو، ئەو هەمووە ئازار و کوێرەوەرییە و ئەو هەمووە رێیەی بە گیانکێشان هاتبوون، بەفیڕۆ نەدەچوو:"خودا غەززەبت لێ بگرێ هەورازەکە. ئەوە بۆ لەسەر رێگەمان قوت بوویەوە؟" رێگەکە چیی وای نەمابو و گەیشتبوونە دەرگای چوکووراوا. ئەو تەپۆیەی بە وزەوزەوە بە دەوری سەریدا دەسووڕایەوە مزگێنی نزیکبوونەوە لە چوکووراوای بۆ هێنابوو.

"کۆنە هەنارستانەکە هەناری لێ بوو. هەنجیری زەرد و گەیو. کەس دەستی پێیان رانەگەیشتبوو. ژەنگە سوورە زۆریان حەز لە هەنجیرە. کە بە تەنیشت هەنارستانەکەدا تێدەپەڕی... ئەرێ بەراست بڵێی مارەکان هەر مابن؟ ئاخۆ هێشتاش لە خۆشەویستییان تێکدالێن و دەکەونەوە سەر عەرزی؟

"دەبێ مەنسووری حەلاج بێ و دووعایەك بخوێنێ و فوویەکی لێ بکا. فوویەکی وا کە ئەو کێوە ببێتە تەپوتۆز و زەوییەکی رێك و چوکووراوا لە دوورەوە بە کێڵگە سپییەکانییەوە دەرکەوێ..."

بە پەنجەکانی دەستی کرد بە ژماردن. چاوەکانی لێك نان و بەبێ هیواییەکی قووڵەوە دەستەکانی بە لاتەنیشتیدا شۆڕ بوونەوە. لەوێ لەسەر بەردێك دانیشت. هەورازەکە لەبەر چاوی رەش چۆوەو گەورە بۆوە. "ئەو هەورازە بە کەس نابڕدرێ. دەبێ هەر لێرە وەمێنین و چاوەڕێی گەڕانەوەی گوندییەکان بین. یەك، دوو، سێ، چوار..." هێندەی نەماوە بۆ گەڕانەوەی گوندییەکان. دەبێ لێرە راوەستین و کە ئەوان گەڕانەوە لەگەڵیان بگەڕێینەوە ئاوایی. چارەیەکی دیکە نییە؟"

کە عەلیی لەبەردەمی خۆی دی، خەجلا. نەیزانی چ بکا. هەستا و بەزۆری بزەیەکی هێنایە سەر لێوی.

عەلیش چاوی لە هەورازەکە بڕیبوو. لووتکە بەرزەکەی نوقمی تەم و مژ دەبوو. چیی وای نەمابوو گەرمای پاییزی دڵەکە داگرێ.

ژن و مێردەکە ساتێك هەر وا راوەستان و چاویان لە لووتکە سەر بەتەمەکە بڕی. عەلی وردە وردە روخساری رەش داگەڕا. وەك ئەو منداڵانەی دێن بگرین، لێوەکانی هەڵقرچاند. لە بن لێوانەوە گوتی:

"ناتوانین لێی سەرکەوین. جا وەرە هەتا ئێرە بە هەزار کوێرەوەی خۆت بگەیەنە ئێرە... بە هەزار چارەڕەشی و کوێرەوەرییەوە وەرە و لێرە بمێنەوە... ئاخ".

ئەلیف لە ناکاو بەسەرخۆیدا زاڵ بوو. چاوە گەورەکانی کە زەق ببوونەوە بریسکانەوە و زۆر بە توندی گوتی:

ـ وەسەر دەکەوین. واش وەسەر دەکەوین هەر مەپرسە.... ئەوەی هاتووین زۆر لەوە سەختتر بووە.

عەلی هیچ هیوای نەمابوو. بەرەو ئاوەکە چوو. جوان دەموچاوی شوشت. کونی گوێچکەکانیشی شوشتن. نان خواردنی هەر لەبیریش نەمابوو.

لە دوورەوە مریەمۆك دی کە لە تەنیشت جێوبانەکەی کرووشمەی کردووە و دانیشتووە. منداڵەکانیش لە لای بوون و وەك ئەو هەڵکورمابوون و بێ جووڵە دانیشتبوون.

عەلی کوڵی گریانی هەستا:

"چۆنە ئەوانە لێرە بەجێ بێڵم و هەتا چوکووراوا را بکەم. لەوێ دەست بکەم بە لۆکە چنینەوە. هێندەی پێنج کەسان. بە شەو و رۆژ... تا دەمرم.."

ئەلیف کە هاتبووە لای، بە خۆشییەوە گوتی:

ـ ئەلیف، دەزانم چ بکەم. ئێوە لێرە بەجێ دێڵم و دەچم. ئێوە هەتا لۆکە رنینەوە تەواو دەبێ لێرە وەمێنن و چاوەڕێ بن. با لانیکەم ئەمن کار بکەم. یان ئەسپێك گوێدرێژێك لەو گوندییانە وەردەگرم و دێمەوە و ئێوەش دەبەم.

ئەلیف بە متمانەبەخۆییەوە گوتی:

ـ ئێمە وەسەر دەکەوین. سەیر کە دایکم هەستاوە. دیارە باشە. ئەو ساوار و پیوازەش کە شەوێ بۆم دانابوو خواردوویەتی. تۆ پیلێکی بگرە و ئەمنیش پیلەکەی دیکە....

عەلی هیوابڕاوانە سەری لەقاند و پرسی:

ـ شتی وا دەبێ؟

ئەلیف گوتی:

ـ بۆ نابێ. ئێستا ترخێنەکە لەسەر ئاورێ دادەگرن. دەیخۆین و وەڕێ دەکەوین. دوای ئەوەی دایکمان بردە سەرێ، دەگەڕێینەوە بارگەوبنەکەش دەبەین.

ـ ئەی منداڵەکان؟ ئەوانیش پشوویان لێ بڕاوە. سەیریان بکە. هەر ناجووڵێن.

ئەلیف گوتی:

ـ ئەوانیش ئەگەر نەتوانن وەسەر کەون، یەك یەك لە کۆڵمیان دەکەم و دەیانبەمە سەرێ.

عەلی دڕدۆنگ بوو. بە لەبزێکی نەرم گوتی:

- ئەلیف زۆر ئەستەمە. وا باشترە ئەنگۆ لێرە وەمێنن.

ئەلیف تووڕە بوو. قەت نەببوو ئاوا هەڵچێ. گوڕاندی و کێوەکان دەنگیان دایەوە:

- لەو چیا و چۆڵەدا، بە دوو منداڵ و پیرەژنێکەوە، لە نێو زاری گورگ و سەگەل و جەردە و پیاوکوژاندا چۆن وەمێنین؟ خۆ ئەگەر بارانێکیش داکا، لافاو هەر هەموومان ڕادەماڵێ.

عەلی تێدا ما. تاوەکە گەرمی کردبوو و ئەو خەریك بوو ئارەقەی دەکرد.

دەستی منداڵەکانی گرت و هێنانییە سەر سفرەکە. منداڵەکان دەتگوت خەواڵوون. لاقەکانیان تێك دەهاڵان و بەلادا دەهاتن.

ئەلیف دەورییەکەی پڕ کرد و لەگەڵ بڕێك نان بردی و لە پێش مرێمۆکێی دانا و گوت:

- سیریشم تێ کردووە. بیبەری سووریشم تێ کردووە. دیوتە دایە، ئاخری گەیشتینە چیای سلێمانلی. ئەودیوی ئەو چیایە چوکووراوایە. ئەگەر ئەوە بڕین...

مرێمۆك هەر نەشجووڵا. سەریشی هەڵنەهێنا کە سەیرێکی بکا.

ئەلیف لەگەڵ هەر کەوچکێکی لە شلەکەی دەدا، سەیرێکی مرێمۆکی دەکرد. مرێمۆك دەستی بۆ خواردنەکەی نەبردوو و هەڵمی لێ هەڵدەستا. دوایی مرێمۆك هەر وا بە سێرەی چاوان سەیری دەکردن، پڕی دایە دەورییەکە و هێنایە پێش خۆی و دەستی کرد بە خواردن.

ژن و مێردەکە دوای نان خواردنەکەیان، دەستیان کرد بە پێچانەوەی بارگەوبنەکەیان. گەرمایەکی بە تینتر لە گەرماکەی چوکووراوا دۆڵەکەی ئاخنی. مێشوولەی ورد ورد هورووژمیان کردە سەروچاویان. کە هەوا گەرم دادێ ئەو مێشوولانە پیاو وەڕەز دەکەن. دەچنە کونە لووتی بنیادەمیشەوە. وا خۆیان بە سەر و دەموچاوی بنیادەمەوە دەنووسێنن، هەر لێی نابنەوە.

سەر و دەموچاویان لەبەر مێشوولە دیارنەبوو. هەر دەستیان ڕادەوەشاندن.

عەلی گوتی:

- بڕۆ و لێی بپرسە، ئەگەر هەر کاممان دەستێکی بگرین ئاخۆ دەتوانێ هەستێ و لەگەڵمان بێ؟

ئەلیف چووە لای مرێمۆك و دانیشت و دەستەکانی خستە نێو دەستی خۆیەوە و گوتی:

- دەی باشە دایە گیان. ئیدی کاتی هاتووە. خۆت ئەو چیایە باش دەناسی. چیای سلێمانلییە. دەشزانی وەسەرکەوتن لەو چیایە چەندە ناخۆشە. کەس ناتوانێ لە کۆڵت بکا

و بتباتە سەریّ. عەلی دەستێکت دەگرێ و ئەمنیش دەستەکەی دیکەت... ئاوا دەتوانی لەگەڵمان بێی؟

مرێمۆك بەبێ ئەوەی وەڵامێك بداتەوە لە ناکاو ناڵەیەکی لێوە هات و کەوت. ئەلیف دەستی تێکەڵ هاتن:

ـ عەلی، عەلی، دایکت خەریکە دەمرێ. بگەیە و قومێ ئاو بێنە.

عەلی هاتە ژوور سەری دایکی کە لەسەر گازەرای پشت لێی کەوتبوو و هانکەهانکی بوو. رەنگی بە روخسارییەوە نەمابوو و دەستەکانی دەلەرزین.

ئەلیف دەستی راستەی مرێمۆکی بە دەستییەوە بوو و بە عەلیی دەگوت:

ـ دووعای لەسەر بخوێنە. دوعای لەسەر بخوێنە با بێ دوعا نەمرێ. دەی بخوێنە، بخوێنە خێراتر.

منداڵەکانیش بە هەڵەداوان هاتن. شەکەتیی خۆیانیان لەبیر چووبۆوە. عەلی دەستی کرد بە دوعا و نزایان. ئەلیف بە دەنگێکی ماندووەوە بە تۆمەخانی گوت:

ـ ئاو بێنە.

کچەکە بەرەو ئاوەکە رۆیی.

هەر ئاوەکەی هێنا، ئەلیف لیکی کوڵوانەکەی تەڕ کرد و وردە وردە بەدەموچاوی مرێمۆکیدا هیچنا. عەلی وەك بڵێی کاتی لە دەست دەچێ بە پەلەپەل و تەتەپەتە دوعاکانی تێکەڵ دەکردن و پەیتاپەیتا دەیخوێندنەوە. هەر دەیخوێندن و تەواو دەبوون. جاری وابوو وشەی دوعایەکی دە جاران دەگوتەوە.

مرێمۆك هێندەی پێ نەچوو چاوەکانی هەڵێنا و سەیری عەلیی کرد. عەلیی دیسان شەکەتی و ماندوویەتییەکەی گەڕایەوە نێو لەشی. دوعاکحان بەسەر لێوییەوە وشك بوون. کە نیگا تیژ و ئاگرینەکانی دایکیی دی، ئیمانی نەما. هەموو شتێکی لەبیر چۆوە و هەر لەوێ دانیشت.

مرێمۆك ناڵاندی:

ـ منداڵەکانم، رۆڵە گیان من ئەوە دەمرم... دەمرم.. چۆڕێ ئاوی فێنك.

عەلی بە تووڕەییەوە پێکەنی.

تۆمەخان بۆ ئاو هێنانێ بەرەو جۆگەکە رای کرد. عەلی کە هەموو دەرگاکانی لەسەر پێوە درابوو، لە تووڕەییان قامکە گەورەکەی دەستی خستە نێو زارییەوە و گەستی. ئەو گریانەی ئەوکی گرتبوو، خەریك بوو دەیخنکاند.

مریەمۆك كە ئاوەكەی خواردەوە قیت بۆوە و دانیشت. عەلی دایە پرمەی گریان. نەیدەتوانی بەسەر خۆیدا زاڵ بێ. کە دیتی خەریکە لەبەر چاوی ژن و منداڵەکەی ئابڕووی دەچێ، دەسرۆکەکەی لە زاری خۆی ئاخنی و هەستا و بە غاردان لەوێ دوور کەوتەوە. بەرەو خوارووی چەمەکە رۆیشت و چووە نێو دارە گەزەکانەوە. لەسەر دەم و لەسەر زیخ و لمەکە راکشا و هۆڕ هۆڕ گریا. تا دەگریا سووکتر دەبوو.

ئەلیف گوتی:

ـ دایەگیان شوکر باشی. زور ترسام...

مریەمۆك بزەیەکی هاتێ. بە ناخۆشییەوە لە دڵی خۆیدا گوتی:"ئەگەر بمرم، لە کۆڵتان دەبمەوە و خۆشم دەحەسێمەوە."

ئەلیف:

ـ ئێستا کوڕەکەت دێتەوە، ئەو دەستێکت دەگرێ و ئەمنیش دەستەکەی دیکەت...

مریەمۆك چاوە پڕلە مەکر و تەوس و تەشەرەکانی لێك ناو هەڵیهێنانەوە.

لە دڵی خۆیدا دەستی کرد بە قسەکردن:" برۆم و لەو هەورازە بمرم، ها؟ ئەویش لەنێوان ئەو جووتەدا، ئەمن لەوانە نیم کچم. ناتوانم وەسەر کەوم ژنی "عەلی"یە درێژ. ئەنگۆ شەو و رۆژ دەپاڕێنەوە ئەمن بمرم. لەبەر خودای دەپاڕێنەوە بمکوژێ. بۆوەی بمرم دەمبەنە چەقی کۆنە گۆڕستانێك و لەوێ دامدەنێن. ئێستاش دەتانەوێ بمبەنە سەر لووتکە سلێمانلی. ها؟ ئەمن ئیدی مردووم. گیانم دەبەردا نەماوە. شەقاوێك، هەر شەقاوێکیش چییە ناتوانم هەڵیهێنمەوە. لە کۆڵم کەن و بمبەن. پێتان رایە وەسەر دەکەوم، ها؟ وەسەر دەکەوم و لە نیوەڕێیە دەمرم. زگتان پێم دەسووتێ؟.

. ئەتۆ هێشتا وەك پۆڵا بەهێزی دایە گیان. لە ئێمە گەنجتری. ئەتۆ هەموو ئەو رێیەت وەك کچۆڵەیەکی پازدە ساڵانە بڕی....

ـ"لە خۆڕاییی شووتیم وەبن هەنگڵی مەدەن. لە جێی خۆم نابزووم. دەبێ لە کۆڵم بکەن و وەسەرم بخەن. مریەمۆك کەرێتیت کرد ئەوەندەش بە پێی خۆت هاتی. کوڕە بۆ بابی خۆم ئاقڵ بووم. وەڵڵا هێزم نییە هەستم. ئەنگۆش دەتانەوێ بمکێشن بە دووی خۆتاندا. ئەمن ئەگەر خودا یارمەتیم بدا، چما بەندەی ئەو دەتوانێ بمکوژێ؟.... لە خۆڕاییی زەحمەت مەکێشن.... ئەمن لەو کێوە ناچمە سەرێ بۆوەی خۆم بکوژم.... هەر ئێستا کە کەوتم ئەو "عەلی"یە درێژە، گەش گەش ببۆوە. ... پێیان وایە کەرم و نازانم. کە دوعاکەی دەکرد

روخساریم دی. چیی وای نەمابوو چەقەنە لێ بدا و سەمای بکا. پێی وایە چاوی من ئەو شتانە نابینێ. کە دیتی دێمەوە سەرخۆ...

دیسان چاوەکانی لێك نایەوە و خۆی گەوزاند. ئەمجارە ئەلیف دەستی تێکەڵ نەهاتن. تێگەیبوو. بە تووڕەییەوە گوتی:

- دایە، پێت خۆش بێ و پێت ناخۆش بێ پیلت دەگرین و لەو کێوە وەسەرت دەخەین. گوتم بەشکم کۆمەگیمان بکەی و خۆت بەسەر پێیانەوە راگری بۆوەی ئاسانتر وەسەر کەوین.

- خەریکە دەمرم. ئەوە دەمرم، ئاو.

ئەلیف لە بن لێوانەوە گوتی:

- دە بمرە دەی.

حەسەن:

- ئیشەڵلا دەمری.

ئۆمەخان کە بەسەرسووڕماوییەوە سەیری دەکردن بەرەو چەمەکە غاری دا و لە بن لێوانەوە گوتی:

- دە با بمرێ و بحەسێتەوە داماوە.

لە نێو دارە گەزەکانەوە پۆلە مەلێك هەڵفڕین، عەلی تێر گریا بوو و وەخۆ هاتبۆوە. هەستا. بەڵام دەتگوت لاقەکانی پێوە نین. پێشتر لانیکەم برژانەوەیەکی هەبوو. بەڵام ئێستا سڕ ببوون. هەر هەنگاوێکی هەڵدێنایەوە، سەری جەرگی ژانی دەکرد و ئەوەش زۆر خراتر بوو. خۆزگە لاقەکانی لەت و پەت بوایەن. ورد ورد بوایەن و لە تاوان وەك کێچ هەڵبەزیبایەوە...

خۆزگە.... خۆ لەو برژانەوەیە هەر خۆشتر بوو. ئەوەیان دەیکوشت. ئەوە چ بەڵایەك بوو بەسەری هات. ئەو نەهامەتییە چ بوو بەرۆکی گرت؟... لەو کاتەدا شتێکی بە بیریدا هات و هەرای کرد:

- ئەلیف دا وەرە بزانم.

ئەلیف هات.

- ئەمن باش نیم. کە پێم لەسەر عەرزی دادەنێم وەختە بڕشێمەوە. دڵم تێکەڵ دێ. دەڵێی چی بڕێك لۆکە لەو بالیفە دەربێنی لە دەوری لاقەکانمی هاڵێنم.

ئەلیف بەبێ ئەوەی قسەیەك بکا، بالیفەکەی هەڵگرت و لۆکەکانی بەتاڵ کرد و بۆ عەلیی هێنا. عەلی پەڕۆکانی لاقی کردنەوە و لۆکەکەی لە بن ئەوانەوە پێچا. لاقەکانی وەك گۆشت سوور ببوونەوە.

دوایی کۆنه پەڕۆکانی تێوەپێچا و هەستا. بەڵام دیسان هەر هەنگاوێکی دەینا، دڵی تێکەڵ دەهات. خۆی پێ نەگیرا. لەسەر بەردێك دانیشت و سەری نایە نێوان هەردوو لەپی دەستەکانی.

یانی دەبێ لێرە بمێنینەوە و چاوەڕێی ئەو گوندییە نامەردانە بین؟ ها؟ چۆنە ئەوان لێرە بەجێ بهێڵێ و وەڕێ کەوێ؟ ئەگەر لافاویش رایانماڵێ و درندە و جانەوەرانیش بیانخۆن و رێگریش پەلاماریان بدەن، لانیکەم دەتوانێ خۆی بە تەنیایی بگاتە لۆکە رنینەوەکە.

- ئەلیف من دەڕۆم.

ئەلیف:

- کوڕە شێت بووی؟ سەیری هەوا بکە. هێندەی نەماوە بارانەکەی داکا. لافاو دەمانبا. لافاو. وەرە پیلی دایکت بگرین و بەدووی خۆماندا رایکێشین.

عەلی سەیری ئاسمانێی کرد. گەواڵە هەورێکی مەیلەو رەش لە لای باکوورەوە دەهات.

هەرای کرد:

- خەریکە دەبارێ. دایە، دەبارێ؟ دەبێ لەو کێوە سەر کەوین دەنا لافاو دەمانبا. دەبێ خۆمان لەو خرە نەجات دەین.

ئەلیف سەرێکی بارەکەی گرت و عەلیش سەرەکەی دیکەی و بردیانە سەرووتر و لەسەر رەوەزێك دایاننا.

- ئێرە باشە. منداڵەکانیش هیچیان لێ نایە.

هەتاوەکەی هەر دەهات و گەرمتر دەبوو. خاکە رەنگاوڕەنگەکەی داوێنی کێوەکە کە پڕ بوو لە وردکەبەرد، وەك ئاسن سوور ببۆوە. دەست نەیدەوێرایە.

عەلی گوتی:

- دایە، ئەگەر بتوانم لە کۆڵمت بکەم و بتبەمە سەرێ...

مرێمۆك دیسان کرووشمەی کردبوو و خۆی گرمۆڵە کردبۆوە.

- منداڵەکانیش لای بارەکە بمێننەوە.

ئەلیف پیلی مرێمۆکێی گرت و هەڵیستاند. هەوڵی دا یەك دوو هەنگاو بیبا. مرێمۆك خۆی بەسەردا دا. دەتگوت ئێسك و پرووسکیت هاڕیوە. لاقەکانی بە دوویدا دەخشکان.

عەلی منداڵەکانی لە تەنیشت بارەکە دانا و گەڕایەوە و پیلی دایکی گرت و کێشایان.

هەورە رەشەکە هیوا و هێزی خستبووە دڵی "عەلی"یەوە. نیدی هەستی بە لاقەکانی تەدەکرد و دڵی تێکەڵ نەدەهات. ژانی ئەژنۆکانی لە تاقەتدا نەبوون. پاژنەکانیشی. بەڵام عەلی رازی بوو.

ئەگەر هەموو گیانیش گوللەئاژن ببوایە، باشتر بوو لەوەی سەری جەرگی بێشێ.

مرێمۆك وەك تەرمێك بەسەر شانیاندا شۆڕ ببۆوە و جار بە جار قورستر دەبوو.

لاقەکانی بەسەر عەرزەکەدا دەخشکان و دوو هێڵی خوار و خێچیان لە دواوە بەجێ دەهێشت.

ئەلیف پشووی سوار بوو، عەلی تا ماندووتر دەبوو و تا مرێمۆك قورستر دەبوو، خێراتر رێگەی دەبڕی. ئەوە عادەتی خۆی بوو. ئەویش چ عادەتێك.

ئێستا هەم ئەلیف و هەم مرێمۆکیشی بە دووی خۆیدا دەکێشا. ئەلیف وەخت بوو شان و پیلی بێتە دەرێ. پشووی خەریك بوو راوەستێ بەڵام دەنگی نەدەکرد. خۆ دەنگیشی کردبایە، عەلی گوێی پێ نەدەبزووت. چاوی دەرپەڕیبوون، پیاو لە چڕ و نێوچاوانی دەتۆقی. پێستی ملە درێژەکەی و روخسارە پڕ لە چرچ و لۆچەکەی وەك سیرمە لەبەر یەك کشابۆوە. تەنانەت سپێنەی چاوەکانیشی سپێنە نەبوون. سوور و مۆر ببۆوە. رەنگێکی سەیری هەبوو.

لە ناکاو مرێمۆك لە دەستی عەلی بەربۆوە. ئەلیفیش خۆی پێ نەگیرا و بەسەر یەکدا کەوتن. عەلیش بە لایەکدا کەوت. هانکەهانکی رۆژە رێیەك دەڕۆیی.

مرێمۆك بەر لە ئەلیف هەستایەوە و قیت بۆوە. دەستی ئەلیفی گرت و کێشای. عەلی بە چاوە سوورەکانییەوە سەیری کرد و لە دڵەخۆیدا گوتی:

- ئەرێ دە بمرە، دەی.

ددانی لە چیڕەوە بردن بۆوەی گوێی لێ نەبێ.

خۆر گەیبووە چەقی ئاسمانێ. قرچەقرچی بوو. عەلی لەو جەنگەیەدا سەیری ئەو هەورەی دەکرد لە دوورەوە دەرکەوتبوو و لە بن لێوییەوە دەیگوت:

ـ ئەو گەرمایە گەرمای بارانە.... هەڵێچۆقێنە خودایە، بیبرژێنە. دوایش باران و هەورەتریشقە و برووسکە... لافاوێك بێ و هەموو شتێك راماڵێ.

دارەکەی دەستی ئەلیف کەوتبووە لایەك. مرێمۆك بە دەستی خۆی دارەکەی نیشان دا.

ئەلیف بە خشکەخشك و بە ئەژنۆی لەرزۆکەوە چوو و هەڵیگرتەوە و دایە دەستی مرێمۆك.

مرێمۆك کە دارەکەی بەدەستەوە گرت، رووی لە لای سەرێ کرد، ماوەیەك سەیری هەورازەکەی کرد. تیرێژی خۆرەکە لەسەر خاکە بریقەدارەکە هەزار رەنگی دەنواند. هەر وەك چۆن لە جارەکانی چوکووراوادا شەپۆل دەدا.

"یالّلا گیانەکەم، وەرێ کەوە دەی. یالّەکە ببڕە با "عەلی"یە درێژ بەچاوی خۆی ببینێ. هەر ئەو پیاوەی لەوێوە کەوتووە و هانکەهانکێتی. هەر ئەو پیاوەی ئەمنی بردە چەقی کۆنە گۆڕستانەکە داینام بۆوەی بمرم. ئەژنۆکانم لە سەر سەرتان گەڕێم دەی یالّلا...

عەلی ئاوڕێکی دایەوە و سەیرێکی کرد. دایکی بە لارە لارەوە وەسەر دەکەوت. بەخۆی گوت:"هەر بەڕاستی دەتوانێ وەسەر کەوێ؟ کوڕە ئەو ژنە بەخوای لۆکەشی پێ دەڕنرێتووە."

خۆشییەك هەموو ناخی تەنییەوە. روخساری گەش بۆوە. تەنانەت بزەیەکیشی هاتێ.

چاوی لە چاوەکانی ئەلیف هەڵەنگوت. ئەلیف بە سەری ئاماژەی بۆ لای منداڵەکان کرد کە باسکیان لە باسکی یەك توند کردبوو و خەریك بوو وەسەر دەکەوتن. ژن و مێردە لە بن ئەو قرچەی گەرمایە دا چاوەڕێ مان تا پشوویەکیان هاتەوە بەر. ئیدی منداڵەکانیش گەیشتنێ. حەسەن لە بن باقە شووڵە گێلاسەکەدا نووشتابۆوە. عەلی کە دیتی ئیمانی نەما. گوڕاندی:

ـ توتکەسەگی سەگباب ئەو دارانە فڕێ دە بزانم. ئێمە خۆمانمان لێ بارە، ئەتۆش شوولکە گێلاست؟

شوولکە گێلاسی لە کۆڵی کردەوە و تا دەست دەگرێ فڕێی دان. حەسەن هیچی نەگوت. وستەی نەهات. ئۆمەخان دایە گریان. ئەلیف گوتی:

ـ دایکە خەریکە وەسەر دەکەوێ. لە ئێمەش باشتر هەڵدەکشێ. دەڵێی چی بگەڕێینەوە و بارگەوبنەکە دابەش بکەین و بیهێنین...

عەلی دوای فڕیدانی کۆڵەکەی کوڕەکەی، ئۆخەیەکی هاتێ. وەپێش ژنەکەی کەوت و بەرەو خوار بۆوە. چوونەخوار لە وەسەرکەوتنەکە دژوارتر بوو. هەردووکیان هەڵخلیسکان و کەوتنە سەر قوون. گەیشتنە بەردەم باروبنەکە. رەوەزەکە گڕی لێ دەبۆوە. نەیانتوانی لەسەری دانیشن. تینوویان بوو. لەو خوارەوە ئاوەکە دەتگوت زیوە دەخوشێ و دەڕوا. نەگەیشتنە ئاوەکە. بارگەوبنەکەیان کردە دووبەشەوە و بە کۆڵیان دادا. "عەلی"یەکەم جاری بوو بە بارێکی ئاوا سووکەوە بەرێیەدا بڕوا. ئیدی بۆوەی نەدەبوو راوەستن. هەورازەکەش وەکی بیریان لێ دەکردەوە ئەوەندەش دووردورێژ نەبوو.... سەیری دایکی کرد کە لەو سەرووەوە بە پشتی کۆماوەوە خۆی بەرەو سەر دەکێشا. منداڵەکانیش لە دواوەی. باقە شوولکەکە دیسان بە پشتی حەسەنەوە بوو. دیسان پیلیان لە پیلی یەکتری کردبوو و لە دوورەوە دەتگوت یەك کەسن.

ساتێك دواتر عەلی بە پەنایاندا تیژ تێپەڕی. حەسەن لە ترسی ئەوەی نەکا شوولکەکانی لێ بستێنێ، خۆی مات کرد. عەلی هەر نەشیدیتن. لاقی هەڵدەخلیسکا و بە لادا دەهات و دەکەوت و هەڵدەستاوە و دیسان هەر وا بە خێرایی تیهەڵدەبۆوە. کە لەسەر لوتکەی کێوەکە خۆی خستە بن دار بەرووەکەوە، خۆر لە ئاوابوون بوو. کزە بایەك هەڵی کردبوو و گیانی فێنك دەکردەوە.

ئارەقە چاوەکانی دەبرژاندەوە. بارەکەی لە کۆڵی داگرت و دەسبەجێ گەڕاوە. دیارەلە بیری نەچوو سەیرێکی گەواڵە هەورە رەشەکەش بکاتەوە کە لە لای باکوورەوە دەهات. برێك داگەڕا و تووشی ئەلیف بوو. ئەلیف گوتی:

ـ خێراتر برۆ. دایکت برێك لەولاوەترەوە کەوتووە و دەناڵێنێ. دیتم خەریك بوو بە چنگوڕکێ بەرەو سەر دەخوشی. سوورە لەسەر ئەوەی بۆخۆی بێ...

خەریك بوو پشووی راوەستێ. لەسەری رۆیی:

ـ خۆتی بگەیەنێ. پێرێژنە لاسارە. پێم گوت راوەستە تا عەلی دێ. ئەو لە داخان پتر خۆی توند کرد.

عەلی ئەوەندە کەوتبوو و هەستابۆوە ئەژنۆکانی شەلاڵی خوێن ببوون. دیسان بە کەوتن و هەستانەوە و دەست و پێی خویناوییەوە گەیشتە لای دایکی. مریەمۆك دیسانیش دەست و دەموچاوی خۆڵاوی ببوون. مژۆڵ و قژە خەنە لیدراوەکەی نوقمی خاك و خۆڵ بوو.

عەلی دەسبەجێ پڕی دایە و هەڵیستاند. لەبەردەمیا دانیشت و بەکۆڵی خۆی دادا و گورج بەرەو سەر رۆیی. برێك وەسەر کەوت و سەرسمێکی دا و شلپ وەعەرزی کەوت. برێکیش بەرەو خوارەوە خلۆر بۆوە. دەسبەجێ هەستایەوە. ئەمجارەیان ئیدی بیری لەوە نەکردەوە دایکی لەکۆڵ بکاتەوە. بن پیلی گرت و دارەکەی دایەوە دەستی:

ـ هێندەمان نەماوە دایە گیان. هێندەمان نەماوە. ئەوە بارانیش دەبارێ.

گەیشتنە منداڵەکان. کە بە تەنیشتیاندا تێپەڕین، منداڵەکان راوەستان و بە چاوە بۆشەکانیان سەیرێکیان کردن. دوایی حەسەن ئەو شوولکانەی وەبیر هاتنەوە کە بە کۆڵییەوە بوون. بۆ ئەوەی بابی نەیانبینێ خۆی مات کرد و هەولی دا خۆی لە پشت ئۆمەخانەوە بشارێتەوە. ئۆمەخان گوتی:

ـ مەترسێ ناتبینێ. بیر لە چارەڕەشیی خۆی دەکاتەوە.

کە دایك و کوڕە گەیشنە سەری، ڕۆژ خەریك بوو ئاوا دەبوو. لە برسێتییان دڵیان لە بوورەوە دەهات. دیتیان ئەلیف لە بن دارەبەنێ* ئاگرەکەی کردووەتەوە و خەریکی چێشت لینانە. بۆنە مزرەکەی دووکەڵەکە کەشەکەی پڕ کردبوو.

ئاسۆ سوور دەچۆوە و بەشێکیش لە دەشتی چوکووراواش کە لەو خوارەوە نوقمی تەم و مژ هەڵمی لێ هەڵدەستا.

ئەلیف پرسی:

ـ ڕۆژ ئاوا بوو و ئەنگۆش گەیشتنێ. ئەدی کوا منداڵەکان؟

ـ ئەوە دەگەنێ.

* دارە بەن: داری وەن. داری بنێشت. هێمن دەڵێ: وەك سیامەندێ لە چۆڵ و بەندەنێ... جەرگی لەت کردم پەلی دارەبەنێ...

# ١٨

شەو راشکابوو کە لە دوورەوە، لە لای باکوورەوە و لەوسەری دەشتەکەوە دەنگی هەورە تریشقەیەك بەرز بۆوە. بەدوایدا بریسکەی دا. بریسکەکە ئەوەندە دوور بوو کە تەنیا تروسکاییەکی کزی بینرا.

برێك دواتر کزەبایەکی سارد هەڵی کرد و بۆنی خاك و چێوە رزیو و بۆنی ئاوی لەگەڵ خۆی هێنا.

بای بارانی پەڵەی، وردە وردە بە تەوژمتر و ساردتر دەبوو. عەلی لەبەر ژان و ئازاری لاقەکانی و هەر هەموو ئازای ئەندامی، ئارا و قارای نەبوو و خەوی لێ نەدەکەوت. لە باشوورەوە یەك دوو ئەستێرە دەدرەوشانەوە و لە ژێر تریفەی ئەواندا دارەبەنەکەی سەر عەلی بە زەحمەت دەبینرا.

ئەستێرەکانی باشوور لە چاوان ون بوون. لك و پۆی دارەکەش تێکەڵاوی تاریکی بوو. ئیتر چاو ئاوی نەدەدی. تاریکەسەلاتێك بوو گوللە نەیدەبڕی.

ترس و شادییەك وێکڕا لە ناخی عەلیدا چەکەرەی کرد. ئەو بایە و ئەو تاریکییەی وەك عابایەکی رەش دنیای داپۆشیبوو، هەواڵی بارانێکی بە غوڕەمی پێ بوو. خۆ بەو نیوەشەوە کونە رێوییەکیش دەست ناکەوێ خۆیانی تێ پەستێون. ئەی چ بکەن؟ چار چییە؟

ژنەکەی راتڵەکاند و گوتی:

ـ ئەلیف!

ئەلیف رووی تێ کرد و گوتی: ها؟

ـ ئاگات لێیە چ بەرێوەیە؟

ئەلیف مات بوو.

ـ بەخوای بارانێك دادەکاتێ، وەك بڵێی ئاسمان دڕابێت. حەوتووەك، دە رۆژان لەسەر یەك خۆشی ناکاتەوە. خۆزگە برێك پتر رۆیبایەین و گەیشتبواینە چوکووراوا. دەگەیشتینێ و ئەو بارانەمان وێنەدەکەوت. ئەمن دەمزانی ئاخرییەکەی دێ... بەڵام...

ئەلیف لە جێوبانەکەی دەرپەڕییە دەرێ و گوتی:
- بۆ خاتری خوا، عەلی،ئەوەندە نوخشانەی خراپ لێ مەدە. خۆ ئەگەر ئەمجارەیان تەنانەت دوو رۆژیش بێ ئێمە هەموومان کۆخە رەشەی دەگرین و شتاقمان بە زیندوویی ناگەینە چوکووراوا. عەلی بەسە هێندە وا مەلێ.
عەلی:
- حەوتووەك... دە رۆژان... بارانی پەڵەی چوکووراوا زۆر سەختە.. دژوارە دژوارە دژوار... خودایە شوکر بۆ تۆ رزگاریمان بوو. ژنەکە... ئەمجارەیان ئەگەر دە رۆژ باران بباریێ جوان دەحەسێینەوە و لە خەڵکیش پتر لۆکە دەرنینەوە.
بای باران هەر دەهات و بە تەوژمتر دەبوو و لك و پۆی دارەبەنەکە قرچ و هۆڕی بوو. دەتگوت دەشکێتەوە. بایەکە لێفەکانی هەڵدەدایەوە. منداڵەکانیش بەبێ ئەوەی بزانن چ بووە، لە خەو راپەڕین. حەسەن سەری لەگێژەوە دەهات و ئۆمەخان دەگریا. ئەلیف گوتی:
- کچێ وس بە سەر بە هەش. ئێستا دەبێتە قیامەت. چ وەختی گریانە.
مرێمۆك لەگەڵ تەزووی بای بارانەکە هەستابوو و لە جێوبانەکەی هاتبووە دەرێ و لە بن دارەکە دانیشتبوو و مات ببوو.
هەورەتریشقە و برووسکە پەیتاپەیتا گرم و هۆڕیان بوو. گردەکەی بەرەوڕوویان و ئەو رێگەیەی دەچووە چوکووراوا و ئەو بەرداشەی برێك دووتر بوو، ساتێك نوقمی رووناکی دەبوون و دیسان لە تاریکییەکەدا ون دەبۆوە.
عەلی لە جێوبانەکەی نەهاتبووە دەرێ. هەر وا لەسەر گازی پشت لێی راکشابوو. لەگەڵ هەر هەورەگرمەیەکدا رادەچڵەکی، سەیری رووناکبوونەوەی سەر دارەکەی دەکرد و لە نێو بیر و فکرە ئاڵۆزەکانی خۆیدا دەتلایەوە. بە حەیاتی خۆی هیچ دارێکی نەدیبوو ئاوا نوقمی نوور بێ.
ئەلیف نەیدەزانی دەبێ چ کاز خەجلاّ بوو و لە داخان هانکەهانکی بوو. جار و بار دەهاتە ژوور سەری عەلی رادەوەستا:
- کوڕە عەلی، عەلی، ئاوا نابێ دەست لە سەردەستان دانێین و هیچ نەکەین. ئەوە خەریکە دەگاتێ. ئەوە دەگاتێ... عەلی، عەلی ئەوە بۆ وات لێ هاتووە؟...
پەیتا پەیتا دەهاتە سەر عەلی. دەستی بە ئەژنۆیدا دەکێشا و لە تاریکاییەکەدا قژی خۆی دەرنییەوە و دەیناڵاند و دەیگوت:
- ئای خودایە گیان، ئەو نەهامەتییە چ بوو تووشت کردین؟ خودایە، ئیدی ئەوە چ بوو؟...
بە دەوری خۆیدا خولایەوە. پەلە قاژەیەکی کرد و ئاخری هات و خۆی بەسەر عەلی دادا:

ـ کوڕە هەستە لەسەرت گەڕێم شتێك بکە. کارێك بکە. ئەوە خەریکە دێ. ئەوە دەگاتێ. شتی وام قەت نەدیوە.

برووسکەکە هەموو وڵاتی رووناك کردەوە. ئەو تۆفانەی لە داوێنی چیاکە و لە کوێرە رێیەکەوە هەڵێکردبوو، خۆڵ و خاکەکەی بە هەموو تووڕەییەوە هەڵدەستاند و گێژی دەدا و بەسەر دنیا تاریکەکەیدا دەکرد.

عەلی دەیگوت:

ـ کارت پێی نەبێ ژنەکە. لێی گەڕێ با دە رۆژ داکاتە باران، پازدە رۆژ، بیست رۆژ ببارێ و هەموو چوکووراوا وەسەر ئاو کەوێ. وەرە لای من. وەرە بن لێفەکە، هیچی لەگەڵ ناکرێ.

ئەلیف تووڕەتر بوو:

ـ کوڕە ماڵوێرانی بێ فکر. چما نایبینی؟ لافاو هەموومان دەبا. ئەویش رێك ئەو کاتەی گەیشتووینە چوکووراوا.... باران، باران... خەریکە بەڵا دەبارێ...

ئاسمان خەریك بوو دەقەڵشییەوە. دەنگی قرم و هۆڕەکەی گوێی کەڕ دەکرد.

دەنگە دوورەکان، لە پشتەوەی چیاکەی تەنیشتیانەوە، لە لووتکەی کێوەکەوە دەهاتە پێشێ و بەر دارەبەنەکە دەکەوت و بەسەریاندا دەڕژا.

ـ هەستە راکەین. خۆمان بگەیەنینە ئەشکەوتێك، کاژێرێك، گوندێك. کونێك پەیدا کەین و خۆی تێدا مات کەین.

عەلی بە ماندوویەتییەوە بزەی دەهاتێ و بە دەنگێکی خەمساردانەوە دەیگوت:

ـ ژنەکە ئەوە شێت بووی؟ دوو هەنگاو هەڵێنینەوە دەمانگاتێ. هەر لە جێی خۆت دانیشە.

ئەلیف هەر وا لە ئەژنۆی خۆی رادەکێشا و هەوڵی دەدا:

ـ وەی، وەی ، وەی رۆ، چارەڕەش خۆم، بۆ کوێ بچم، بۆ کوێ، بەو سەرە بەڵا لیدراوەوە بۆ کوێ بڕۆم؟ وەی رۆ عەلی هەستە. لانیکەم خێوەتێك لەسەر ئەو منداڵانە هەڵ دە. هەستە. ئەو جەواڵەی لە بنتە، با لە لك و پۆی دارەکەی ببەستین و بیکەینە خێوەتێك. ئاگرێکیش با بکەینەوە. لانیکەم با ئەو داماوانە لە سەرمان رەق هەڵنەیەن.

ـ ئەوە شێت بووی ژنەکە؟ چما تۆ شێتی، لە بەرامبەر ئەو بارانەدا کە بەرێوەیە، بارانێکی ئاوا بە غوڕەم، چت پێ دەکرێ... ئای ئای هەی باوکەڕۆ... زەوی و ئاسمانی تەنیوە و بەرێوەیە. لە تۆفانەکەی نوحیش گەورەترە. دە رۆژ، پازدە رۆژ... هەرچی لۆکەیە لە عەرزیی دەکا... ئەوەندەش قورس دەبێ هەر مەپرسە.... دەبێ گوێدرێژێك بۆ دایکی خۆم بکرم، ددانی نەکەوتبێ. گوێدرێژێکی قوبرسیی وەك غەڵفی چنار. گویدیژێکی وەك ئەسپی عەرەبی. کورتانێکیشی بۆ بە دوورین دەدەم وەك ئەسپی ئاغا

تورکمانەکان. دەیدەمە وەستا جەمالی قەدیرلی بیدرووێ. هەی ی ی باوکە گیان... هەی ی ی .. با وا بباریێ دەر و دەشت و ئەشکەوتەکان هەموو پڕ بن لە ئاو. هەموو ولاّت ببێتە دەریا. ئەتۆ خەمت نەبیێ. ئێمە خۆ کەرسەك نین بە بارانێك بتوێینەوە و بتولێینەوە. خۆ کەرسەك نینە ژنەکە. گلّمتك نینە ئەلیف، کەرسەك بی خراپە...

ئەلیف کە لەبەر تیشکی برووسکەکەدا دیتی روخساری گەشە و بە شادی و خەمساردییەوە پیێ دەکەنیێ، هەلّچوو و گوڕاندی:

ـ کوڕە کافر، بیێ دین، قاتلّی منداڵەکانی من، قاتلّی دایکت، قاتلّی ئەسپەکەمان.

بە غاردان لیّی دوور کەوتەوە و لە تاریکییەکەدا ون بوو. ماوەیەك دواتر بە هانکەهانك بە باوەشێك چرپی و پووش و پەلاّشەوە گەڕایەوە.

دار و چرپییەکانی لە تەنیشت جێوبانەکەوە دانا. لە لایەکەوە کۆی دەکردنەوە و لەسەر یەکی دادەنان و لە لایەکی دیکەشەوە لە ئەژنۆی خۆی رادەکێشا.

لە جەواڵەکەدا بە شوێن شقارتەکەیدا گەڕا و دۆزییەوە و ئاگرەکەی کردەوە و دیسان لە تاریکاییەکەدا ون بۆوە و بە باوەشێك پووشکەی دیکەوە گەڕایەوە.

بن دارەبەنەکە روون بۆوە. منداڵەکان باوەشیان بە یەکتریدا کردبوو و هەلّدەلەرزین. مرێمۆك لە پشت سەریانەوە دانیشتبوو و پەیتاپەیتا خۆی رادەژاند. ئەلیف کە لە تووڕەییان شێت ببوو، لە ناکاو هەتا هێزی بوو پڕی دایە جەواڵەکەی بن عەلی و کێشای. بە دەستییەوە نەهات و بەراوپشت وە عەرزی کەوت.

بە بێهێزییەوە هەستایەوە و دەستی کرد بە پاڕانەوە:

ـ لەسەر سەرت گەڕێم. لە دەورت گەڕێم عەلی هەستە، هەستە با خێوەتێکی پیێ هەلّدەین.

عەلی گوێشی پیّی نەدەبزووت. بزەی دەهاتیێ و لە بن تیشکی ئاگرەکەدا ردێنە خۆلاوییەکەی بیێ جوولّە دیار بوو.

برووسکەیەکی دیکە ئاسمانی داگرت و تاریکاییەکەی دادڕی. جارێکی دیکەش هەموو دەشتەکەی چوکووراوا نوقمی رووناکایی بوو. ئاسمان هەر دەیگرماند و رووناك دەبۆوە.

ئەو جارەیان رێك لەسەر سەری ئەوان و وەك بلّیّی برووسکەکەی لەسەر چلووکی دارەکە دا. ئیتر دلّۆپەی درشت و گەرم و قورسی بارانەکە بە تلّپە تلّپ دایکرد.

ئەلیف وا قیژاندی کە دەتگوت دەیخنکێنن:

ـ عەلی ی ی ی .. عەلی... جەواڵەکەم دەیە.... ماڵت وێران کردم. منداڵەکانت کوشت.

عەلی بەردا و جەواڵ و و زەمبیل و تەنەکە و نوێن و بان و وردەواڵەکەی لە بن دارەکە کۆ کردنەوە.

بارانەکە توند تر بوو. ئەلیف دەمودەست خوسا. ئاگرەکە خەریك بوو دەکوژایەوە. عەلی لێفەکەی بەسەر خۆیدا کێشا و لە جێوبانەکەیدا خۆی گرمۆڵە کرد. هەم دڵی خۆش بوو و هەمیش لەبەر ژان و ئازاری جەستەی جینگڵی دەدا.

ـ یاخودا بمری عەلی. یاخودا کۆستت کەویٚ. ئەوەی تۆ دەیکەی کافری خوێنمژیش نایکەن. لە حەفتاودوو میللەتدا یەکێکی وەك تۆ پەیدا نابیٚ. دایە، دایە هەستە با جەواڵەکەی بن ئەو کەلاکە دەربێنین. ئەمن قەوەم پێی ناشکیٚ دایە.

عەلی بە تووڕەییەوە لە جێوبانەکەی هاتە دەریٚ و گوتی:

ـ باشە ژنەکە، باشە. ئەوە بە قسەم کردی خۆ کوێر نی؟ چادر لە بن بارانێکی ئاوادا چیی پیٚ دەکریٚ؟ دەڵێی قەتت باران نەدیوە.

ئاگرەکە هەر بڵێسەیەکی لیٚ مابۆوە و ئێستا نا دەمێکی دی دەکوژایەوە. لەگەڵ هەر دڵۆپەیەکی بارانەکەدا چزەیەکی لیٚ هەڵدەستا.

مرێمۆك هەستا و قولینچکی جەواڵەکەی گرت. ئەلیفیش لکەکەی دیکەی گرت. لەسەر ئاگرەکەیان راگرت. ئەلیف داهاتەوە و بە دەستێکی ئاگرەکەی تێك وەردا و چەند پووشکەیەکی خستە سەری. ئاگرەکە خۆش بۆوە.

بارانەکە بە گرمەگرم و برووسکەوە وەك دەریایەکی رەش لە ئاسمانەوە داگەڕابوو. لە چاوترووکانێکدا ئاوی باران لووزەوی بەست. عەلی دیسان بۆڵاندی:

ـ دەی باشە ژنەکە، چۆنی تۆ بفەرمووی. ژنەتیوە شێتە، دەبیٚ دارێك وەبەر نێوەڕاستەکەی بدەی. ئەمن ناتوانم لەو دارە وەسەر کەوم... بەخوای لاقم پیٚ ڕاناوەستیٚ.... ئەستوور بووە... خۆ پەت و گوریسیشمان پیٚ نییە بیبەستین...

ئەلیف قولینچکی جەواڵەکەی دایە دەستی:

ـ پەتیش هەیە. هەموو شتێکمان پێیە. بۆخۆشم لە دارەکە وەسەر دەکەوم. بە نەقەنەق لە دارەکە سەر کەوت و سەری پەتەکەی لە لقێك بەست:

ـ دا نێوەڕاستی جەواڵەکەم بدەنیٚ. ڕێك نێوەڕاستەکەی ها...

گرتی و لە پەتەکەی بەست و هاتە خواریٚ.

ئەو پەتانەی ساڵی پێشوو بە چوار قولینچکی جەواڵەکەیانەوە بەستبوو هەر پێوەی مابوو. قولینچکێکی لە دارکە و گوێیەکەی دیکەی لە دەوەنێك بەست.

ـ عەلی، دیرەکێك وەبەر ئێرە بدە و لە عەرزەکەی بچەقێنە. خێرا بە خێرا..

عەلی هەر وا ڕاوەستابوو و خەیاڵ هەڵیگرتبوو. دەتگوت خەونووچکە دەیباتەوە. ئەلیف هەر هەڵدەخولا:

- کوڕە دیرەکێك..

ئۆقرەی نەبوو. هیوای بە عەلی نەبوو. دارێکی نیوەسووتی لە ئاگرەکە دەرینا بڕێك لەولاترەوە بە بەردێك دایکوتا.

خوڕەی بارانەکە دەتگوت تاڤگەیەکی گەورەیە. وەك گۆزەی سەروبن هەڵدەڕژا.

ئەلیف قولینچکێکی دیکەشی کێشا و لەو دیرەکەی بەست.

بنە گوێنییەکی دی و قولینچکەکەی دیکەشی لەوێ گرێ دا.

- دایە، دایە، لەوێ ڕامەوەستە، بچۆ بن خێوەتەکە.

منداڵەکانیشی هەستاند و هێنانی و لە تەنیشت ئاگرەکەی دانان.

مرێمۆك نەهاتە بن خێوەتەکە و لە بارانەکەدا بەرەو تاریکاییەکە ڕۆیی.

- دایە ئەوە بۆ کوێ؟ مەڕۆ دایە...

بە شوێنیدا غاری دا وپیلی گرت و ڕایکێشا. مرێمۆك پیلی ڕاوەشاند و لە چنگی دەریهێنا و دیسانەوە بەرەو بارانەکە و تاریکاییەکە ڕۆیی. ئەلیفیش بە شوێنیدا ڕۆیی. مرێمۆك هەم دەڕۆیشت و هەمیش لەسەر عەرزەکە بە شوێن شتێکدا دەگەڕا.

ئەلیف زانیی لە چی دەگەڕێ. ئەویش وەك مرێمۆك دەستی کرد بە پووشکە کۆکردنەوە.

کە هەر کامەیان بە باوەشێك پووشکەوە گەڕانەوە بن دارەکە، دیتیان عەلی هەر وا لە جێی خۆی پێی بە عەرزییەوە ڕەق بووە و ڕاوەستاوە. منداڵەکانیشیان دی کە لە سەرمان هەڵدەلەرزین.

ئەلیف پووشکەکانی خاوێن دەکردنەوە و یەك بە یەك دەیهاویشتنە سەر ئاگرەکە و فووی لێ دەکردن و مرێمۆکیش یارمەتیی دەدا. هێندەیان فوو لێ کرد تا ئاگرەکە بڕێك گەشایەوە و نەیانهێشت بکوژێتەوە.

ئەلیف کە دیتی ئاو وەك جۆگەلە بە دارەکەدا دێتە خوارێ، باروبنەکەی هێنایە بن خێوەتەکە. لێفە نیوە تەڕبووەکەی بەسەر شانی منداڵەکانی دادا.

ئاگرەکە پووشکەکانی دەخوارد و گەورەتر دەبۆوە. کە ئەلیف چوو لە تەنیشت ئاگرەکەوە دانیشت، عەلیش هات و لە تەنیشتی هەڵتووتەکا. ئاو بە نێوچاوان و دەموچاو و ردێنیدا وەك جۆگەلە شۆڕابەی بەستبوو. ئەو هێشتا وەك شێتان پێ دەکەنی. ئەلیف لەو حاڵەتەی ترسا. بە نیگاکانی ویستی شتێك لە مرێمۆك بپرسێ، مرێمۆك بە هەندی وەرنەگرت. ڕوانینەکەی هیچی تێدا نەبوو.

عەلی خۆی دایە سەر ئانیشکی و لەسەر ئەو عەرزە کە ئاو بەسەریدا لووزەوی بەستبوو، لێی راکشا.

رێژنەکەی سامناك دایکرد. گژەبایەك لەگەڵی بەسەر ئاگرەکەدا هات و کوژاندییەوە و بە دوای ئەودا یەك بە یەك پەتەکانی جەواڵەکە پسان. عەلی بۆڵاندی.

ـ نەمگوت:... خێوەت و ئاگر چاری ئەو بارانە ناکەن؟ ئەو بارانە کۆشك و تەلاران دەرووخێنی. ئاخر نەمگوت، بارانی پەڵەی چوکووراوا زۆر بە تەوژمە؟ شقارتەکە لە جێیەك دابنێ تەڕ نەبێ. یان بیدە بەمن. یان شووشە بەتاڵەکە بێنە. شووشەی بەتاڵمان هەیە؟... سەیری بکە نێوی وشك بێ.

ئەلیف گەڕا و شووشەکەی دۆزییەوە و دایە عەلی:

ـ شقارتەکان لە باخەڵم دان. دەستت بێنە و هەڵیانگرە.

عەلی دەستی برد. کە دەستی گەیشتە نێوان مەمکە گەرمەکانی، مچوڕکێکی خۆش و بەچێژ لە گیانی گەڕا. شتێك وەك خۆشەویستی و شادی و عیشق لە ناخیدا هەڵیسا. وەك هەڵمێکی نیوەگەرم.

سەری شووشەکەی کردەوە و شقارتەکانی تێ کرد. قالبە شقارتەیەکیشی لوولە کرد و خستییە ناوییەوە و سەرەکەی داخستەوە.

ئەلیف گوتی: لە خۆڕا وات کرد. وەبیرم هاتەوە هەر لەساڵی رابردووەوە لە شووشە بچووکەکەدا شەمچەمان ماوە.

ـ دەی باشتر. خۆ ئەوانە هەر خووسابوون.

بارانەکە توندتر بوو. ئیدی ئێستا لە تاریکی و تەنایی و بێ کەسیدا... لە هیچ کوێوە ترووسکایی هیوا و یارمەتییەك نەبوو. عەلی لە پێشدا منداڵەکانی لە باوەش کرد. لێفەکەی لەسەر لابردن و بەسەر خۆی دادا و بەسەریاندا نووشتایەوە. دوایی مریەمۆکیشی کێشایە لای خۆی. ئەلیفیش هات و خۆی بە مریەمۆکەوە نووساند. چەندی بارانەکە بە تەوژمتر دەبوو ئەوان پتر خۆیان بە یەکترییەوە دەنووساند. دەتگوت دەیانەوە بچنە ناو یەکەوە.

هەناسەیان دەموچاوی یەکتری گەرم دەکردەوە. لە پێشدا دەنگی شەقەی ددانی منداڵەکان هات. لە باوەشی بابیاندا وا هەڵدەلەرزین دەتگوت دەیانەوێ بفڕن بەڵام وستەیان نەدەهات. ئەلیفیش شەقەی ددانی دەهات. عەلی ددانی لەسەر یەکتری دانابوون بۆوەی کەسیان گوێی لە دەنگی شەقەی ددانی ئەو نەبێ. مریەمۆك هەڵدەلەرزی. ئەلیف وردە وردە خۆی پێوە دەنووساند. دەست و دەموچاوی مریەمۆك وەك سەهۆڵ وابوو. ئەلیف کە دەیدی ئەو وەك مێژۆکە دەلەرزێ زۆر دەترسا.

چەندی توانییان جەواڵ و لێفەکەیان زیاتر لەخۆیانەوە دەپێچا. هەموو باروبنەکەشیان لە دەوری خۆیانەوە کۆ دەکردەوە. ئەوە رۆژ بوایە و یەکێك ئاوا دیتبانی پێی وانەدەبوو پێنج کەسن. هەر پێنجیان ببوونە یەك کەس و هەڵدەلەرزین، چەناگەشیان وێکرا دەتگوت میزانت کردوون.

بۆنی ترشاو و شێی جەستەی مرۆڤ، لووتیانی دەبرژاندەوە. بەقەدرایی موویەك لە گیانیان نەمابوو نەخووسابێ. تەنانەت بن هەنگڵیشیان خووسابوو.

کەس متەقی لێوەنەدەهات. ئەگەر ویستباشیان قسەیەکیش بکەن شەویلکەیان نەدەکرایەوە.

بەرەبەری بەیانی بوو کە بارانەکە شل بۆوە.

لەگەڵ کازیوەی بەیانی، ئەلیف کە دەست و پێی سڕ ببوون، خەوی لێکەوتبوو، زۆری هەوڵ دا خۆی لەوانیتر جویێ بکاتەوە و هەستێ. نەیدەتوانی دەست و پێی ببزێوێ و خۆی لەوان جویێ بکاتەوە. تەنانەت شەویلکەشی نەدەبزووت کە وەك سەرەتا ددانەکانی شەقەیان بێ. شەویلکەی ساتێك جووڵا و راوەستایەوە. ئاخری توانیی خۆی لەوان جویێ بکاتەوە و لەسەر عەرزەکە درێژ بێ. دواتر هەستا.

عەلیش لێفەکەی لەسەر خۆی لادا و هەستا. منداڵەکانیشی هەستاند. مرێمۆك کروسمەی کردبوو و چنگێکی لێ هاتبۆوە و جووڵەی لێ بڕابوو. هیچ نەدەبزووت.

عەلی کە هەستابوو، پشتی راست نەدەبۆوە. چاوەکانی بچووك ببوونەوە. هێمنییەکی ناخۆش لە ناخیدا بوو. منداڵەکان بەسەر پێوە خەونووچکە دەیبردنەوەو بەلادا دەهاتن. حەسەن دەستی راستی خۆی پێ نەدەکرایەوە.

لە باکوورەوە ئاسمان برێك روون بۆوە. وردە وردە روونتر دەبۆوە و ئاسمانی ساماڵ و جوان درەوشاوە لە بن هەورەکانەوە دەردەکەوت. تیرێژی خۆری چوکووراوا پاناوکێکی بەرینی داگرت.

ئاو لە سەر و دەموچاو و لە دارەکەوە چۆڕاوگەی بەستبوو. لافاو شیو و دۆڵەکانی داگرتبوو و بە خوڕ دەڕۆیی.

عەلی پشت کۆماوەکەی قیت کردەوە و وەك شێتان دەستی کرد بە غاردان. ئەلیف دەستی لە نێوقەدی نابوو و سەیری دەکرد.

هەموو زەرد زەرد هەڵگەڕابوون وەك خەزەڵ. جلوبەرگەکانیان بە لەشیانەوە نووسابوو و قووڵی و بەرزیی بەشیان دەرکەوتبوو. ئەلیف جار نەجارێك بە شەرمەوە دەستی بە قولکەی سینگییەوە دەگرت.

عەلی بە غاردان هاتەوە و منداڵەکانیشی لەگەڵ خۆی خستە غاردان:

ـ راکەن، غار بدەن، دوای باران دەبێ غار بدەی.. ئەدی... دەبێ خوێنتان گەرم بێتەوە. نەخۆش... نەخۆش.... نەخۆش دەکەون و دەمرن..... ئەدی...

ئەلیفیش کەوتبووە شوێنیان و رای دەکرد. جاروبارە تەریق دەبۆوە و رادەوەستا و دیسان رای دەکردەوە.

مرێمۆك سەری هەڵێنا. لۆیەکی قوراویی جەواڵەکە بەسەریەوە مابۆوە. کە دیتی ئەلیف و منداڵەکان لەگەڵ عەلی غارغارێنیانە و دەخولێنەوە، قوراوی و بە قۆنە قۆن کە هیچ لە بنیادەمان نەدەچوون، هەوڵی دا دەستەکانی بکاتەوە و لاقەکانی ببزێوێ، بەڵام نەیتوانی. ئەلیف کە دیتی، لێی چووە پێش و پیلی گرت و هەڵیستاندە سەر پێی. بەڵام ئەو خۆی پێ نەگیرا و دیسانەکە کەوتەوە. ئەلیف دیسانیش هەڵیستاندەوە. ئەو جارەیان ئیدی نەکەوتەوە و چەند هەنگاوێك رۆیی و راوەستا. دوایی رووی کردە چوکووراوا و چاوی لە شوێنێکی ئەوێ بڕی و ماوەیەك ئاوا مایەوە.

جلوبەرگی ئەویش خووسابوون و بە گیانییەوە نووسابوو. هەر دەتگوت مەلێکی پەڕ و باڵ شکاوە. باڵندەیەکی خووساوی پەڕ وباڵ هەڵوەریو کە باڵەکانی بە گیانییەوە نووسابێتن و سەری بردبێتە بن باڵەکانییەوە.

داهاتەوە و دارەکەی هەڵگرتەوە و خۆی دایە سەری. چەند هەنگاوێکی دیکەشی هەڵگرت و سەیرێکی ئەوانی کرد کە هەروا غاریان دەدا.

عەلی کە دیتی دایکی بەرەو چوکووراوا وەڕێکەوتووە، دەستی ئەلیفی گرت و گوتی:

ـ چار نەبوو. بە لای مێشەڵانەکەدا هاتباین دوو رۆژی دیکەی دەخایاند جا دەگەیشتینە کێلگەکە. سەیرکە ئاشەکە لێرەوە دیارە.

هەورەکان رەویبوونەوە. ئاسمان ساو و ساماڵ ببوو و خۆر دەدرەوشایەوە و وردە وردە زەویی گەرم دەکردەوە و هەڵمێکی خەست و قورس لە عەرزەکە هەڵدەستا. هێندەی پێنەچوو زەوی و زاری چوکووراوا لە تەم و مژدا نوقم بوون. ئەلیف خەریکی پێچانەوەی باروبنەکە بوو.

ـ هەموو خووساون.... شتێك نییە قوراوی نەبووبێ. ئاردەکە، ساوارەکە، نوێنەکان...

ئەلیف کە هەروا بۆڵەبۆڵی بوو، عەلی لە تەنیشتییەوە راوەستابوو و دەستی بۆ هیچ شتێ نەدەبرد و سەیری دەکرد:

ـ ئەو بارانە لێی ناکاتەوە. بە رۆژ خۆشی دەکاتەوە و شەوێ دەست پێ دەکاتەوە. ئەو بارانە جوان و بە تەوژم و بە غوورڕەمەی من، بارانی چل شەوەیە. بیبارێنە خودایە گیان، بیبارێنە با دنیا تەڕ و گەش بێتەوە. دار و شینکە و ئاژەڵەکانیش خودا خودایانە. بیبارێنە خودایە گیان، لافاو بنێرە...

ئەلیف دەستی شوك بوون. چاوی زەق بوونەوە. هێشتاش دەلەرزی و ددانەکانی شەقەیان دەهات:

ـ ئەیەڕۆ عەلی، ئەوە تێك چووی؟ شێت بووی؟

ــ بیبارێنــە، بیبارێنــە بــا هــەموو دنیــا شــین داگــەڕێ و چــیی لۆکەیــە بــەقوڕدا بــچێ.
کە دیتی ئەلیف وازی لە کۆکردنەوەی کەلوپەلەکان هێناوە خۆی دەستی کرد بە پێچانەوەیان:

ـ کوڕە دایکم زۆر ئاقڵە. هەموو شتێك دەزانێ. بڕێك لاسارە. خۆزگە ئەو خووەی نەبوایە، بۆوە دەبوو تاجی لەسەر بکەی و بە چوکوورواوایدا بگێڕی. نابێ ڕاوەستین. دەبێ پەنا و پەسیوێك بدۆزینــەوە. ئەگــەر هەر ئێستا وەڕێ کەوین، پێش نیوەڕۆیە دەگەینە چوکوور و گوندییەکان دەدۆزینــەوە. ئــەوان دیــسان لــە کێلگەکەی میرالای دان. وا نییە؟ دەتوانن بچنە جێی دیکە.

ئەلیف:

ـ ناوەڵا، ناتوانن...

بۆ لەکۆڵ کردنی ئەو بارەی پێچابوویەوە هەڵترووشکا. بەکۆڵی خۆی دادا و ویستی هەستێ. بەڵام چیی لەخۆی نووسا نەیتوانی. ئەلیف یارمەتیی دا. کۆڵەکە دیسان نەبزووت. عەلی ملی درێژ بووەوە و هەموو گیانی لەبەر یەك کشایەوە. جلوبەرگەکانی هەڵمیان لێ هەڵدەستا. دیسان قەوەی دایە خۆی. بارەکە وەك بەرداسن و قورقوشمی لێ هاتبوو.

بارەکەی بەر دا و هەستا و دەستی کرد بە خولانەوە. هیچ ڕێیەکی پێ شك نەهات. دیسان هاتەوە و لەبەردەم بارەکە هەڵترووشکایەوە و دیسان بە هەموو هێزی خۆیەوە ویستی بەرزی بکاتەوە. دەستی لە قەدی ئاڵاند، ئەوجار دەستی دادایە سەر عەرزەکە. چیی کرد و کراندی نەیتوانی بیبزوێنێ. هەستاو بە ناچار چەپڵەیەکی لێدل و گوتی:

ـ ئاخ خ خ... ئاخ خ...

دیتی ئەلیف خەریکی کردنەوەی بارەکەیەی. خۆی تیهەڵنەقورتاند.

مرێمۆك زۆر دوور کەوتبۆوە و لە شیوەکە ئاوەژوو ببوو. حەسەن بە بۆڵەبۆڵ گوتی:

ـ لە برسان مردم... مردم...

عەلی بەسەریدا نەڕاند:

ـ بمرە، چاوت دەرێ، لە هۆوێ لە نیزك ئاشەکە رادەوەستین و شتێك دەخۆین.

ئەلیف بارەکەی کردە دوو بەشەوە و پێچانییەوە. عەلی چاوەکانی درەوشانەوە. بوخچەکەی دیکەی بە خێرایی تێکەوە پێچا.

لە پێشدا ئەلیف بارەکەی لە کۆڵی نا و دواییش عەلی. حەسەن هەوڵی دەدا باقە شووڵە بەلاڵووکەکەی هەڵگرێ بەڵام قەوەی پێی نەدەشکا. گەڕایەوە و سەیرێکی دایکی کرد. دایکی، بە کۆڵەکەی پشتییەوە، چووە لای و بۆی لەسەر شانی دانا و گوتی:

ـ دەی، وەپێشم کەوە.
عەلیش کۆڵەکەی لەکۆڵی نا و دوای ئەوەی یەك دووجاران لەخۆی نووسا هەستایە پێ. خەریك بوو بزەی دەهاتێ:
ـ پیاو تا لێی نەقەومێ خودا فریای ناکەوێ... بەڵام کە لێی قەوما وای بەفریا دێ هەر مەپرسە. دیتت ئەو بارانەی چۆن نازڵ کرد؟
هەورە زیوینەکانی دی کە دیسان لە باکوورەوە تێك دەچرژانەوە. ئەی ئەی، کورە دیسان دێ...
ئەلیف لە پێشەوە و حەسەن بە دوایدا و ئۆمەخانیش لە دواوەتر و لە دوای هەمووشیانەوەعەلی، دەرۆیشتن. برێکی پێچوو عەلی وەپێشیان کەوت. هەتا گویزینگان لە قوڕێ رۆدەچوو. خۆر گەییووە نێوەندی ئاسمانێ و وردە وردە جلەکانی وشك دەکردنەوە. ئیدی هەڵنەدەلەرزین و هاتبوونەوە سەرخۆ. ئەو باڵندانەی لەسەر کوێرەرێیەکە هەڵنیشتبوون هەڵدەفڕین و زەردەقۆڕە و مارمێلکەکان کە لەسەر بەردەکانی دەم رێگا خەوتبوون، لەبەر گەرمای خۆرەکە خۆیان هەڵخستبوو. پەپووی رەنگاورەنگ بە رێیەکەدا دەهاتنە خوارێ و بە دیتنی ئەوان لە شەقەی باڵیان دەدا و دەفڕینەوە.
دیسان مێشولە وردەکە هاتنەوەو سەر و چاو و کونە لوت و زار و گوێچکەیانی داپۆشی.
کە لە شیوەکە چوونە خوارێ، سێ دارە توویان تێپەڕاند و جا توانییان بگەنە مرێمۆك. دوایی هەمووان پێکەوە رۆیشتن.
لە ناکاو لە نێو دەوەنەکانەوە پیرەمێردێك هاتە دەرێ. ئەویش باران خووساندبووی. جلوبەرگەکانی بە لەشیەوە نووسابوون و هەموو گیانی قوڕاوی بوو. لە دەم رێیەکە راوەستا و چاوەڕێیان بوو. کە باش لێی نزیك بوونەوە ناسییانەوە: مام خەلیل بوو. چاوەکانی کە لە چاوی منداڵان دەچوون پڕ بوون لە ترس و ئازار و بە سەرکزییەوە سەیری عەلیی کرد. مرێمۆك وەك قەتی کابرایەکی وا نەناسیبێ، ماوەیەك لێی ورد بۆوەو بە نەفرەت و بیزارییەوە رووی لێ وەرگێڕا و بەجێی هێشت. ئەلیفیش رووی لێ وەرگێڕا.
حەسەن نقورچکێکی لە ئۆمەخان دا و بە دەنگێکی کز گوتی:
ـ بابم دەیکوژێ. دەیخنکێنێ.
ئۆمەخان تاقەتی قسەکردنی نەبوو. وەڵامی نەدایەوە.
عەلیش کە بە بەردەمیدا تێپەڕی بە سەرسووڕماوی و تووڕەییەوە ماوەیەك لێی روانی و رووی لێ وەرگێڕا وەك بیەوێ تف بکاتەوە. مام خەلیل ئەو چاوەڕوانییەی لە عەلی نەبوو. پێی بە عەرزییەوە وشك بوو. هەر لە جێی خۆی بە بێتاقەتییەوە لەسەر عەرزەکە دانیشت هەتا لە چاوان ون بوون، چاوی لێ نەترووکاندن. دوایی بە تووڕەیی و بە جنێودانەوە هەستا و وەشوێنیان

کەوت. چیی نەبرد گەیشتە سەریان. دە دوازدە هەنگاویان پتر لێ دوور نەبوو، بەڵام مام خەلیل نەیدەتوانی بچێتە پێشتر و ڕەگەڵیان بکەوێ. عەلی جار و بارە ئاوڕێکی دەدایەوە و سەیرێکی دەکرد بۆوەی بزانێ بە دوایاندا دێ یان نا. هەرچی رق و قینی و بیزاریشی هەبوو لە روخسار و نیگاکانیدا دیار بوو.

عەلی تووڕە بوو. دەبوو چ بەو پیرەمێردە بڵێ کە وەدوویان کەوتووە؟ هەستی کرد دایکی چاوەڕێیە و دەیەوێ بزانێ ئەو چ لەو کافرە دەکا؟ "پیری مردەڵۆخە، خۆ تۆ کارەکەی خۆتت کرد، ئیدی بۆ لەکۆڵمان نابییەوە؟ خودا زەلیل و داماوت بکا."

دوایی زگی پێی سووتا و بەخۆی گوت:" خودا دەزانێ ئەو داماوە چیی لێ قەوماوە وا لە گوندییەکان دابڕاوە."

لە لایەکەوە لاساریی لەبڕان نەهاتووی مرێمۆك بوو و لە لایەکیشەوە لێقەوماوی و داماوییەکەی مام خەلیل.

مام خەلیلیش لەبەر خۆیەوە دەیبۆڵاند:"ئەمن لە سۆنگەی تۆوە ئاوارەی دەشت و کێوان بووم. لەو دێیە دا هەر من بووم لەسەر تۆ بەربینگم بە کوێخا گرت و لە روویدا ڕاوەستامەوە. ئێستاش تۆ ئاوڕێکم لێ نادەیتەوە؟ زۆر باشە، باشە، هەتیوە گەمژەکەی بلە کەچەڵ، ئەو هەمووە رۆژە لەو چیایانەدا چاوەڕێ تۆ مامەوە بۆوەی بمگەیەی و پشتم بگری. ئێستاش چاویشم لێ ناکەی؟ باشە."

وردە وردە هیوابڕاو دەبوو و نەیدەزانی چ بکا؟ دوای ئەوە ئیدی هیچ کوێیەکی نەبوو رووی تێ بکا و کەسیشی نەبوو هانای بۆ بەرێ. ئەگەر توانیبای وازی لەوانیش دێنا و سەری خۆی هەڵدەگرت و ئەوەندە دەڕۆیی کەس ناوونیشانی نەزانێ. بەڵام ئاخ لەبەر پیری. ئاخ لەو پیرییە، پیری هیچی لەگەڵ ناکرێ....

دەیویست بگەڕێتەوە، بەڵام لاقەکانی بەبێ ئەوەی خۆی بیەوێ بە دووی ئەواندا دەکشا. نەدەکرا لابدا و بە ڕێیەکی دیکەدا بڕوا. ئاخی پڕ بوو لە ئازار و کوێرەوەری. کە گەیشتنە خوارووی ئاشەکە، لە نیوەڕۆ لای دابوو.

کۆڵەکانیان داگرت. جێوبانەکان و گۆنییەکان، ساوار و ئاردە خووساوەکە و هەرچی پێیان بوو لەسەر دەوەنەکان و لەبەر خۆرەکە هەڵیانخستن. قالبە سابوونێکیشیان پێ بوو. ئەلیف لەسەر بەردێکی دانا.

جلوبەرگەکانی برێك وشك ببوونەوە و بە بەریانەوە گنج گنج و لۆچ ببوون. قوڕی داوودەلینگیان وشك ببۆوە و هێندێکی هەڵوەریبوو.

ئەلیف بەو شقارتەیەی لە شووشەکەی دەرینابوو، دەسبەجێ ئاگرێکی کردەوە. ساوارەکەی وەسەر ئاگرەکە نا. نانیان پێ نەمابوو. برێکی لەو ئاردەی خووسابوو و ببووە هەویر هەڵگرت و دەستی کرد بە شێلانی. مریمۆك پەیتاپەیتا ئاماژەی پێ دەکرد. دەیویست شتێکی بڵێ و بۆی نەدەهات. لە تەنیشت هەویرەکەوە دانیشتبوو و هەر جینگڵی دەدا. ئەگەر ئاردە تەڕەکە وشك بووبایەتەوە، ئیدی بۆوەی نەدەبوو بیکەیەوە هەویر. ئەلیف تێگەیشت. ئاردەکەیان کۆ کردەوە.

دوای کۆ کردنەوەی ئاردەکە، مریمۆك پاڵی بە دارەچنارەکەوە دا و چاوەکانی لێك نان. کە زانیی ئەلیف بە تەمای نانکردنە، چووە لای. سێ کوچکەیەکیان لەدەوری ئاگرەکە ساز کرد و تەنەکەیەکیان لەسەر دانا. ئەلیف ئەنگوتکەکانی بە لەپی دەستی پان دەکردنەوە و لەسەر تەنەکەکەی دادەنان و مریمۆك وەرگێڕ و داگێڕی دەکردن و بۆ ئەوەی باشتر سوور ببنەوە، هەڵیدەگرتن و لەسەر ئاگرەکەی رادەگرتن.

یەکەم نان، حەسەن رفاندی. دووەم دانەشیان عەلی و سیهەم نانیشیان دایە ئۆمەخان.

مام خەلیل برێك لەولاوەترەوە دانیشتبوو و سەری بەردابۆوە و جار و بار لە بنەوە سەیرێکی دەکردن. نانەکەیان کرد و لەسەر گژ و گیایەکە هەڵیانخست.

لەو مابەینەدا ئەلیف ساوارەکەی لەسەر ئاگرەکە هەڵگرتبوو و بۆ ئاوکێش کردنی لە قەراغەوە دایناببوو. بە چیلکەیەك هێندەی سەری پەنجەیەکی رۆن لە شووشەکە دەرینا و لە تاوەکەی کرد. کە رۆنەکە وەقرچەقرچ کەوت ئیدی بە سەر ساوارەکەی داکرد. بۆنی رۆنەکە بە ولاتێ وەربوو و ئەوان زیاتر هەستیان بە برسێتییەکەیان کرد.

مەنجەڵەکەیان لەسەر جێیەکی وشك دانا و لە دەوری کۆ بوونەوە. عەلی گوتی:

ـ ئەلیف پیوازێکیش بێنە.

ئەلیف هەستا و لە نێو ئەو پیوازانەی لەسەر تاتە بەردێك هەڵیخستبوون، یەکێکیانی هەڵگرت و دایە عەلی. عەلی لیزانانە مستێکی لێ راکێشا و وردی کرد. جا چونکێ نانی تیریان پێ نەبوو*، ناچار بوون بە کەوچکان بیخۆن. کەوچکیشیان بۆ هەمووان پێ نەبوو. هیچ ماڵێك ئەوەندەی کەوچك

---

* نازانم بۆچی دەڵێ نانیان پێ نەبوو. لە حاڵێکدا لە پەرەگرافی سەرەوە باسی نان کردن دەکا. خۆ لەوانەیە ئەوەیان نانی تیری نەبێ کە کردوویانە خۆ لانیکەم کولێرەیە. بەهەر حاڵ نانە و دەکرێ بە چێشتەوە بیخۆی...

نەبوو بەشی هەموو ئەندامەکانی ماڵەکە بکا. ئەوانیش هەر سێ کەوچکیان هەبوو. هەر سێکیشیان کۆن ببوون. سەروگوێیان شکا بوو و دەسکەکانیشیان سووتابوون.

مرێمۆك بە کەوچکێکیان دەیخوارد و حەسەن و ئۆمەخانیش بە کەوچکێك و عەلی و ئەلیفیش بە یەکێکیان.

عەلی کەوچکێکی ساوار هەڵدەگرت و دوایی کەوچکەکەی دەدایەوە ئەلیف. لەو نێوەدا بڵێی و نەڵێی سەیرێکی مام خەلیلیشی هەر دەکرد کە لەولاترەوە دانیشتبوو.

کە ئەو سەیری دەکرد ئەوانی دیکەش لەخۆڕاوە ئاوڕیان دەدایەوە سەری.

کە لەسەر سفرە دانیشتبوون و پێکەوە نانیان دەخوارد، ئەگەر دوژمنی بابە کوشتەشیان هاتبایەتە لایان، دەبوو بیهێننە سەر سفرەکەیان. روخساری عەلی هەر دەهات و گرژتر دەبۆوە. ئەو پارووەی لە زاری دەنا، بۆی قووت نەدەچوو، کەوچکەکەی ماوەیەك لە دەستیدا رادەگرت و لەبیری دەچۆوە بیداتەوە ئەلیف.

ئیدی وای لیهات نەیتوانی کەوچکەکە لە ئەلیف وەرگرێتەوە و لێی کەوتە نێو مەنجەڵە ساوارەکەوە. چەند چرکەیەك هەمووان بێ دەنگ بوون. حەسەن کە کەوچکەکەی خۆی بەرەو چێشتەکەی بردبوو، هەر وا دەستی مایەوە. مرێمۆکیش نەیتوانی کەوچکەکەی بەرێتە پێشێ.

عەلی سەیرێکی چاوی دایکی و ئەلیفی کرد و دواییش ئاوڕێکی لە مام خەلیل دایەوە... جارێکی دیکەش چاوی لە چاوی دایکی بڕییەوە...

ماوەیەك نەیتوانی چاو لە چاوی دایکی بترووکێنێ. چاوەکانی مرێمۆك جار بە جار نەرمتر دەبوونەوە. ئیدی ئەو رق و قینەی جارانی تێدا بەدی نەدەکرا. چاوەکانی ئەلیفیش دەتگوت دەڵێن:"ئەمن کارم بەسەرتانەوە نییە. کەیفی خۆتە. چۆنی پێت خۆشە وا بکە.

عەلی بە لەبزێکی نەرم و بەسۆزەوە و شەرمێونانە هەرای کرد:

ـ هۆی مام خەلیل، ئەوە بۆ لەوێ دانیشتووی. وەرە پاروەوە نانێکمان لەگەڵ بخۆ. وەرە مام خەلیل. وەرە با بۆت بگێڕمەوە چمان بەسەر هاتووە.

مام خەلیل دەستی لەسەر عەرزەکە دادا و هەستایە پێ. وردە وردە هات و لەسەر سفرەکە دانیشت. بزەیەکی تاڵ بە چاوە شینە وردەکانییەوە بوو.... شەرمن و تۆقیو...

عەلی کەوچکەکەی کە کەوتبووە مەنجەڵەکەوە هەڵگرتەوە و دایە دەستی. مام خەلیل بەبێ مەیلی لەتێ نانی لە زاری نا و کەوچکێکی ساوار بەسەردا کرد... هێشتاش بە پارێزەوە سەیری دەوروپشتی خۆی دەکرد.

عەلی بە بزەوە، لەتێکی لە پیوازەکەی پێش خۆی لێکردەوە و داییێ. مام خەلیل بە دەستی لەرزۆکەوە و بە منەتبارانە کەوچکەکەی دایەوە عەلی. ئەو ترسەی لە نیگای دا بوو، بۆوە بە شادی و خۆشی. دوایی عەلی کەوچکەکەی دایەوە ئەلیف. ئەلیفیش دواتر دایەوە مام خەلیل و بەو جۆرە کەوچکەکە دەستاودەستی کرد.

مریەمۆك سەیری هیچ کەس و هیچ کوێی نەدەکرد. چاوەکانی خۆی دەبڕییە کەوچەك و مەنجەڵەکە. دیار بوو پێی ناخۆشە.

کە لەخواردنێ بوونەوە، مام خەلیل پیلی عەلیی گرت و بردییە بن دارە تووە گەورەکە و دەستی پێ کرد:

ـ دیسان چوونەوە مەزراکەی میرالای. لەو گوندەدا جگە لە من کەس جوابەجەنگێی ئەو سەفەرە کافرەی نەکرد*. ئەو هەتیوەی تاشباشە گرێش کە زانیی کارەکە وای لێ هاتووە، خۆی کردەوە خزمی سەقەر. هەر من بەرەنگاری بوومەوە. خەریك بوو منیش بکوژن. بە حاڵی سەگ گیانی خۆمم لێ دەرباز کردن. هەمووان دەستیان دایە دەستی یەك و ئامبازم بوون. شوکری خودای شەو بوو و توانیم خۆم نەجات دەم. ئاسمان پڕ بوو لە ئەستێرە. یاخوا ئەستێرەی ئەو سەفەرە بکوژێتەوە. چاوەڕێی تۆ بووم بگەیەی. سێ رۆژە لەو چیا و چۆڵەوانییە کەلێن و قوژبن نەما بەشوێنمدا نەگەڕێن. خۆم حەشار دا و نەیانتوانی بمدۆزنەوە. ئاخری توانیم گیانی شیرینم نەجات بدەم رۆڵە گیان. کوڕەکەی برایەکەی خۆم. ئەگەر تۆش بدۆزنەوە لە دارت دەدەن. دەڵێن ئەتۆ ئەو راپەڕینە گەورەیەت لە دژی حوکمەت وەڕێ خستووە. ئەو سەفەرە تووك لێکراوە وا دەڵێ.

عەلی بزەیەکی هاتێ و بە گومانەوە پرسی:

ـ دەی باشە، یانی ئاوا؟ کەس لە گوندییەکان جوێ نەبۆوە و نەڕۆیی؟ کەس نەچووە مەزرایەکی دیکە؟

ـ هەر من لێیان جوێ بوومەوە، هەر من... هەر من بەرەنگاری بوومەوە. سەت خۆزگە ئەمنیش وەك ئەوان گەنج بوایەم... ئاخ... بریا وەك ئەوان دەست و پێم هێزی بوایە... بە خودا ئەو سەفەرەم بە گۆڕی بابیدا دەڕیاند. ئێستاش دەتوانم. وەڵڵاهی جنێوی وام دا بە ئێسك و پرووسکی خلەی بابی، سەفەر هەر گوێی خۆی ئاخنی و بۆی دەرچوو. هەر من بووم گوتم:"کوڕە خودا هەڵناگرێ مافی ئەو گوندییانە مەخۆ هاوڕێ. ئەوان مەنێرە کێڵگەی بێ حاسلات و بەرهەم." شەوێکیان چوومە ژوور

---

*جوابەجەنگێ: قسەلە قسەداکردنەوە. بە تایبەتی کاتێ چووکە قسە لە قسەی گەورەتر لەخۆیدا دەکاتەوە و قسەی دەشکێنێ، پێی دەڵێن جوابەجەنگێی کرد.... واتە قسە بەشەڕدان...

سەری. گوتم ئەو کافرە دەخنکێنم با لەکۆڵ ئەو خەڵکەی بکەمەوە. پڕم بە قورگیدا کرد جا وەرە و ڕێکی بگوشە، زۆر زۆرم ڕێك گوشی... لەبن دەستمدا وەك مار جینگڵی دەدا و خەریك بوو دەمرد. بەڵام ئاخ پیری و هەزار شوورەیی. قەوەم پێی نەشکا بیخنکێنم و بیکوژم. ئەگەر تۆم لەگەڵ بوایە ئەو کافرە تەواو دەبوو. وا بوو نەمرد و گوندییە بێ ناموسەکانیش لەبری ئەوەی لای من بگرن، لەسەر ئەویان کردەوە. ئێستا لەو گوندەدا هەر من لایەنگری تۆ و هاوڕێی گیانی بە گیانیی تۆم... لەوان دابڕام. گوتم:"ئەنگۆ بڕۆن وەشوێن ئەو سەیە بکەون و لێی دامەبڕێن." گوتم:"ئەمن لەو چیا و چۆڵە چاوەڕێی "عەلی"یەکەی خۆم دەبم...." ئەرێ وەڵڵا ئاوا... خۆ تێگەیشتی دەمەوێ چ بڵێم."

لە خوارەوە و لە بن دارە بەرزەکانی دەم ڕێگەکەوە، سەربانی بە تەنەکە داپۆشراوی کەپرەکانی مەزراکەی میرالای لە بن تیشکی دوای باراندا دەبریسکانەوە. عەلی دیسان لە پێکەنینەوە گوتی: بەیانی، ئەگەر باران نەبارێ، دەچین و دەگەینە گوندییەکان و دەست پێ دەکەین.

مام خەلیل بە سەرسووڕماوییەوە پرسی:

ـ ئەتۆش دەتەوێ بچیتەوە گەڵ گوندییەکانی خۆمان؟ ناتوانی بچیتە مەزرایەکی دیکە؟ هەر دەبێ لەگەڵ ئەوان بی؟ چ چاوەڕوانییەکت لەو بەرازانە هەیە؟

عەلی بە نەرمی و بەسۆزەوە گوتی:

ـ ئاخر مام خەلیل، دوای ئەوە ئیدی کامە گوند وەخۆمان دەکا؟

مام خەلیل پێدا گرانە و یاغییانە گوتی:

ـ ئەمن ناچم. ناچمەوە لای ئەو گوندییە بێ ناموسانە. ئەمن خۆم بە پیاو دەزانم. ئەو وڵاتە پیاوی تێدا نەماوە. پێم وابوو تۆش پیاوی. هیوام نەما. ئەوە چ گوندێکە ئێمەی ناوێ و وەخۆیان ناکا؟ لەسەر سەریانمان دا دەنێن. دەڵێن ئەوانە پیاون. لە رووی کوێخاکەیاندا ڕاوەستاونەتەوە. ئەدی ڕۆڵە...

ـ ئیشەڵڵا ساڵی داهاتووش هەر وا دەکەینەوە.

مام خەلیل خەیاڵ پڵاوی دەکرد... ئەو هەمووە ڕۆژە چاوەڕێی عەلی بوو بۆ ئەوەی ئەو قسانەی پێ بڵێ. دڵنیا بوو عەلیش وا بیر دەکاتەوە و وەك ئەو پاشەملێ جنێو بە گوندییەکان دەدا. جا پێکەوە دادەگەڕێن و دەچنە کێڵگەیەکی بەپیت وبەرەکەت، کە هەر چڵێکی سەت قۆزاخەی پێوە بێ و، جا هەر کۆ دەکەنەوە و کۆی دەکەنەوە. باخەڵیان پڕ دەکەن لە پارە و ئەو دەمەی دەگەڕێنەوە ئاوایی هەموو خەڵکەکە سەریان سووڕ دەمێنێ و دەڵێن:"کوڕە وەرنە

سەیری فیڵ و تەڵەکەی ئەو پیرە خەلیلە، دیارە رای کرد، بەڵام هەم خۆی رزگار کرد و هەم "عەلی"یە درێژیش." ئەو کاتە پانتۆڵێکی رەش و پشتوێنێکی مەخمەری گوڵداری بۆخۆی دەکڕی. دە لیرەشی دەدایە کوڕەکەی. جا سینگی دەردەپەڕاند و بە نێو دیدا دەگەڕا.

لە دڵەخۆیدا دەستی کرد بە جنێودان بە عەلی. ماسوولکەکانی دەموچاوی لەبەر یەك کشابوونەوە و چاوی دەرپەڕیبوون:" هەر گووی سەگ بە ئێسك و پرووسکی بابت... هەی بە گۆڕی ئەو بلە سوالکەرە... ئەو گوندییانە هەر هەموویان نامەردن... دڵۆپێکی خوێنی پیاوەتی لە دەماری هیچیاندا نەماوە."

هەر دەهات و سەرسوورماوتر و تووڕەتر دەبوو. بە هانکەهانك و نیخەنیخ، پەیتاپەیتا دەیپرسی:

ـ هەر بەراستی عەلی؟. بە راستتە دەتەوێ بچییەوە لای گوندییەکانی خۆمان؟

کە عەلی بە سەر دەیگوت بەڵێ، ئیدی شێت دەبوو:

ـ شتی وا نەڵێی؟ نا بابە، چۆن شتی وا دەبێ! کوڕە سەفەر فایلی بۆ ساز کردووی، حوکمەت و جەندەرمەی لێ ئاگادار کردۆتەوە. وەزعی تۆ لەمنیش شپڕێوترە. خودا بتپارێزێ. پێیان وایە تۆش لەگەڵ منی. جا چۆن دەچی و خۆت دەدەیە دەستی وی؟ گوتوویەتی هەتیوەکەی بلە دزی پیاوکوژ، بە ئانقەست لەگەڵ ئێمە نەهات و لای دا، بۆوەی بچێتەوە چوکووراوا تاڵان بکا. گوتوویە عەلی یاغی بووە و بە ئانقەست ئەسپەکەی خۆی کوشتووە بۆوەی بەجێ بمێنێ و بچێ و یاغی بێ. هەموو گوندییەکانی لە دژی من و تۆ گرتووە بە شایەت. خودا روحمان پێ بکا. ئەتۆ یان پازدە ساڵت زیندان بۆ دەبڕنەوە یان لە دارت دەدەن. وەرە و بە قسەم بکە و مەچۆوە لایان. ئەمن لە لە یورەییەر Yuregir کێڵگەیەکی بە پیت و پڕ حاسڵاتم بۆ دیوێتەوە کە تەنانەت منداڵەکانیش دەتوانن رۆژێ سەت کیلۆ لۆکە کۆ بکەنەوە... کوڕە خۆ مەزراکەی میرالای ئێستا لۆکەی هەر لێ نەماوە. هەموویان چنیوەتەوە. لە ترسی ئەوەی نەکا تۆ بەو قەڵافەتە درێژەتەوە بگەیەی و هەمووی کۆ بکەیتەوە، هەر بە یەك رۆژ هەموویان تێکەوە پێچاوەتەوە. قۆزاخەیەکیش چییە نەیانهێشتۆتەوە. ئەدی، ئەوە مانگ و نیوێکە، تەنانەت دوو مانگە ئەوان خەریکن. بەڵام لۆکەی یورەییەر درەنگ دەپشکوێ. وەرە و بە قسەم بکە با بچینە ئەوێ.

عەلی دەستی لەسەر شانی دانا:

ـ مامە، خەمت نەبێ. سالّی دادێ دەچینە لای یورەییەر و دەلیایەک* لۆکە کۆ دەکەینەوە. مەترسە ئەوان ناتوانن هیچمان لێ بکەن.

مام خەلیل هەرچی بە بیری دا هات دەکاری هێنا و گوتی:

ـ گوێ بدەیە، پیاوی پیاوان. کوڕەکەی برایمەکەی خۆم. ئەگەر لەگەڵ من بێیە مەزرای یورەییەر و کێڵگەکەی یاسین ئاغا، ئەمن هەرچی خۆم کۆی دەکەمەوە دەیدەمە تۆ. ئەمن ئەسپەکەم لێ کوشتی. گوێدرێژێکی پەل ئەستوور بۆ دایکت دەکڕی. ئەوە باشترین ڕێگەیە.

چاوەکانی زیتەیان هات. ئەوە ڕێگەیەکی باش بوو:

ـ ئەتۆ پێت وایە من ئیتر پیر بوومە؟ ئەمن زۆر زیاتر لە گەنجێکی پازدە ساڵان، تەنانەت لە تۆ و ئەلیفیش پتر لۆکە کۆ دەکەمەوە. ئێمە پیاوی کۆنین. مێش و مەگەزی چوکووراوا خوێنی ئەنگۆیان مژیوە و هەڵیانچۆڕاندووە. ئەنگۆ کوا هێزی شان و باهۆتان. ئەمە ڕەگ و دەمارمان بەهێزن. وەرە با بچینە یورەییەر و، جا سەیری مامە خەلیلت بکە و سەرت لێی سوور بمێنێ. جا وەرە و دەوڵەمەند بە. جوانوو ئەسپێك بۆ دایکت بکڕە. جوانوویەکی سێ ساڵانە با هەموو گوندییەکان و ئەو سەفەرە کافرەش لە داخان بتەقن...

بە هیواوە چاوی لە چاوەکانی بڕی. پێی وابوو ئەنگاوتوویە و عەلی لەگەڵی دەچێ.

عەلی دەستی بەسەر شانیدا هێنا و دەستی لە ئەستۆی کرد و گوتی:

ـ خوات لێ ڕازی بێ مامە خەلیل، لێت ڕادەبینم. ئیشەڵڵا بۆ ساڵێکی دی.

مام خەلیل کە گوێی لەو وەڵامە بوو، سەیرێکی دەوروپشتی خۆی کرد. ویستی شتێك بڵێ بەڵام نەیتوانی.

هەتا ئێوارێ متەقی لێوە نەهات. بە تووڕەییەوە لە بن دارێك دانیشت و نوقمی خەیاڵاتی خۆی بوو. سەری لێ قورس ببوو، هەر بەولا و بەملایدا شۆڕ دەبۆوە.

کە ویستیان بنوون، جێوبانەکانیان لەسەر عەرزەکە ڕاخست و جەواڵەکەیان وە مام خەلیل دا.

بەیانی کە هەستان دیتیان جەواڵەکە قەد کراوە و مام خەلیل دیار نییە.

ئەلیف جەواڵەکەی هەڵگرت و هێنای و خەریکی پێچانەوەی باروبنەکەی بوو.

---

*دەلیایەك: دەریایەك. پیرەمێرد و پیرێژنانی کورد لە گوندەکان، کە دەیانەوێ باسی زۆربوونی شتێك بکەن، بە دەریای دەچوێنن و دەریاکەش دەکەنە دەلیا. لەبری ئەوەی بڵێن دەریایەك، دەڵێن: دەلیایەك.

کاتێ ئەو هەروا خەریك بوو، مرێمۆك هاتە لای. ئەلیف تێی گەیشت. دەستی هەڵگرت. مرێمۆك پێشتر ئاگرەکەی کردبۆوە. ئەلیف دڵی خۆش بوو. مەنجەڵەکەی لە ئاوی بەر ئاشەکە پڕ کرد و هێنای و لەسەر ئاگرەکەی دانا و پرسیی:

ـ خەنەشت دەوێ دایە؟...

مرێمۆك لە باخەڵی خۆی کیسەیەکی هێنادەرێ و دایە دەستی. ئەلیف:

ـ لەچکە کەسکەکەشتم وشك کردۆتەوە دایە.

مرێمۆك چاوەکانی گەشانەوە.

هەموو جارێ کە دەگەیشتنە چوکووراوا مرێمۆك جوان و زەریف سەری خۆی دەشوشت و خەنەی لێ دەدا. لەچکە کەسکەکەی لەسەری دەکرد و خۆی دەڕازاندەوە. مرێمۆك لە توورەکەیەکی دیکە جووتێ گوارەی دەرێنا و دایە ئەلیف. گوارەکان بڕێك ڕەش هەڵگەڕابوون.

ئەلیف گوتی:

ـ ئێستا تیف تیفەیان دەدەم.

وابوو بەرەو ئاگرەکە ڕۆیشت و بڕێکی خۆڵەمێش هەڵگرت و دەستی کرد بە خاوێنکردنەوەیان و گوارەکان خستە بریقەبریق.

کاتێ ئەلیف خەریکی گوارەکان بوو، لەو لاوەترەوە مرێمۆکیش خەریکی گێلگەلە و مووروەکانی دەرینابوو و داوە تێکالاوەکانیانی لێك دەکردەوە و مت و مووڕووە شین و سوور و کەسکەکانی پێوە دەکردنەوە. ئەوانەی وەك سەردەمی کچێنی خۆش دەویستن. زۆر جوان بوون. بەڵام ئێستا مت و مووڕووی ئاوا دەست نەدەکەوت. هەروا کە دەستی پێدا دێنان، لە ملی کردن. دەیویست ئاوێنەیەك لە ئەلیف وەرگرێ بەڵام پەژیوان بۆوە. دەترسا. هەر بەراست، ئەرێ قەڵافەتی چۆن بوو؟

چاوەڕێ مان، تا ئاوەکە گەرم بوو. لەو ماوەیەدا ئەلیف گوارەکانی جوان تیف تیفە دابوو و هێنانی و لە گوێی مرێمۆکی کردن.

ئاوەکەشی لەسەر ئاگرەکە هەڵگرت و هێنای و لە تەنیشت بەردەکەی دانا. پیلی مرێمۆکیشی گرت و بردی لەسەر بەردەکەی دانا. سەری بەرەو لای پێشەوە خوار کردەوە و دەستی کرد بە شوشتنی. بۆی شوشت و وشکی کردەوە. سەری مرێمۆك تەواو تەنك ببوو. نەرم ببوو.

دەبوو دوای شوشتنەکە خەنەی لێ بدا. هەمووساڵێ ئەوەی دەکرد. بەڵام ئەمساڵ مرێمۆك کە داوای خەنەی کردبوو، دوایی پاشگەز بۆوە. ئەلیف دەمودەست زانیی بۆ خەنەی ناوێ. مرێمۆك دەیویست ئەمساڵ گەنجتر و سادەتر و جوانتر بنوێنێ. ئەگەر ئێستا خەنەی لێ دابایە، بەو هەمووە پەڕۆ پاڵەی سەرییەوە قەڵافەتێکی ناشیرنی دەبوو.

جوانییەکەی خەنە سێ ڕۆژان دوای خەنە لێدلنەکە دەردەکەوت. چما دەکرا سێ ڕۆژان ڕاوەستێ؟ ئیدی شتێکی وای نەمابوو بگەنە گوندییەکان.

ئەلیف لە شوشتنی سەری مریەمۆکدا تێگەیشت کە ئەو هەر سەر و مل ناگرێ**. هەر دەتگوت سەری بە لەشییەوە نییە و بەولاولایدا شۆڕ دەبۆوە.

منداڵەکان برێك لەولاترەوە دانیشتبوون و نەدەبزووتن. مریەمۆك کە چاوی بە حەسەن کەوت زانیی ئەو هەتیوە خەریکە لە بنەوە سەیری دەکا و گاڵتەی پێ دەکا. بە بۆڵەبۆڵ گوتی:"هەتیوەکافرە، هەر دەبێ بزۆزییەکەی خۆی بکا."

منداڵەکان هەر نەدەبزووتن. دیار نەبوو بیر دەکەنەوە یان وەنەوز دەدەن. عەلییش لەولاوەترەوە ڕاوەستابوو و سەیری خۆجوانکردنی دایکیی دەکرد. دڵی خۆش بوو بەوەی دایکی هێشتاش ساغ و سەلامەتە. بەخۆی دەگوت:"ئەمساڵیش؟ دوای ئەو هەمووە نەهامەتییەی بەسەری هاتووە، دیسانیش؟... ئەگەر ڕوخساریشی ئەوەندە پڕ نەبووبا لە چرچ و لۆچ..."

لەگەڵ ئەو هەمووە ماندوویەتی و ژان و ئازار و برژانەوەیەی دەست و لاقی، دیسانیش شەپۆلێکی خۆشی لە ناخییەوە هەڵدەقوڵی و هەڵدەچوو:

"ئەو مریەمۆکە بۆ قسان ناکا؟ لە پاش کۆنە گۆڕستانەکەوە بۆ هەر ورتەیەکیشی لێوە نەهاتووە؟ یانی لەمەودوا هەر وا قسان ناکا؟ هەر بەراستی مام خەلیل بۆ کوێ ڕایکردووە؟"

ئەگەرئەو فکر و خەیاڵانە نەدەبوون، جوان جوان دڵی دەحەسایەوە.

کێڵگەکە دیار بوو و کوێرەوەرییەکانیش تەواو ببوون. بارانیش هەر دەباری:"ئەوەتا مەزراکە لەوێیە. شتێکی وامان نەماوە بگەینێ."

"بە لەچکەی کەسکەوە، گوارەی بریقەدار و مت و موور بە ملەوە و بازنەی شووشە لە مەچەکدا... لەچاو ساڵانی پێشوو هیچ نەگۆڕاوە. هەر ئەوەندەیە سەر و مل ناگرێ. چاوەکانیشی کز و شەکەتن. بەڵام هەر چاوی بە لۆکە بکەوێتەوە، دەگەشێتەوە و چاوەکانی زیت دەبنەوە..."

مریەمۆك هەر لەخۆجوانکردنەکەی بۆوە، هەستا. دارەکەی هەڵگرت و ڕووی لە مەزراکە کرد. لە پێشیانەوە پاڵەی لۆکەچن لە مەزرایەکدا دەبینران. ترۆمبێل و کامیۆن بە جادەیەکدا ڕادەبردن.

---

** سەروملی ناگرێ: واتە سەری بەسەر ملییەوە پێ ڕاناوەستێ. بۆ کاتی ماندوویی و شەکەتی و شلبوونەوەی جەستە، دەیڵێن.

رێك لەسەر سەریانەوە، هاشوهووشێك لە ئاسمان هەستا. سەیریان کرد و چەند فڕۆکە جێتێکیان بینی کە بەرەو ئاناوارزا دەخوشین و دەڕۆیین. لە چاوتروکانێکا لە چاوان ون بوون. مرێمۆك کەوتە رێ. ئەوانی دیکەش بارگەوبنەکەیان کۆ کردەوە و بە دوایدا وەڕێ کەوتن.

بەرەبەری عەسرێ بوو گەیشتنە گوندییەکانی خۆیان کە لەو مەزرایەدا خەریکی لۆکەچنینەوەی بوون.

بۆنی تۆزی لۆکە و تەپوتۆز هەستابوو. بۆنی تیژی زەلکاویش لە کێلگە برنجەکەی ئەوبەریانەوە دەهات. عەلی لە پێشیانەوە بوو. بەرەو ئەو کەپرانە چوو کە لە نێوەڕاستی کێلگەکە بە لك و پۆ و پووشکەی داران ساز کرابوون و لە پێشیانەوە کۆگای لۆکە هەڵدرابۆوە. پاڵە برێك لەولاترەوە کاریان دەکرد. دیتیانن کە گەیشتنێ، بۆیە دەستیان هەڵگرتبوو و راوەستابوون.

عەلی کۆڵەکەی لە پشتی کردەوە و داینا و هات پاڵی وە دیرەکی یەکێك لە کەپرەکان دا و دانیشت. کە مەزراکەی بینی وشك و بێ بەرهەمە و هەمووی گیا و گژە و تەنانەت قۆزاخە لۆکەیەکیش لە پووشە وشکەکانیدا نابینرێ، تۆزە خۆشییەکی لە دڵیدا نەما و ئاگری تیبەربوو. چاوەکانی لێك نان.

مرێمۆکیش هات و لە تەنیشت کۆگا لۆکەیەك دانیشت. ئەویش دیتبووی کێڵگەکە لۆکەی نییە. حسەن برێك لەو لاترەوە بە باقە شوولکەکەی پشتییەوە پێی بە عەرزییەوە وشك ببوو. ئۆمەخانیش لە پێشییەوە راوەستابوو. ئەلیف هات و لە تەنیشت مێردەکەیەوە دانیشت. چڵە لۆکەیەکی بە دەستەوە گرتبوو و وردی دەکرد. گوندییەکان یەك یەك دەستیان لە کار هەڵگرتبوو و دەهاتن. هەرکامیان چاویان پێیان دەکەوت، واقی وڕ دەما. خۆیان پێ نەدەگیرا. ورتەیەکیان هەر لێوە دەهات و دەیانویست شتێك بڵێن، تفی زاریانیان قووت دەدا و تەنانەت نەیاندەتوانی ماندوونەبوونیشیان لێ بکەن. هەر بە چاوی زەق زەقیانەوە و بەسەرسووڕماوییەوە دەمانەوە.

وردە وردە هەر هاتن و کۆ بوونەوە و دەوریان گرتن. کەس مەتەقی لێوە نەدەهات. هەندێکیان هەر بەپێوە راوەستابوون و جووڵەیان نەدەکرد و کەسیش قسەی نەدەکرد...

لێرە هەر نەشباریبوو. پریشکاندبووی و تێپەڕیبوو.

تاشباش ئۆغلو کە وەدوا کەوتبوو، دڕی بە حەشیمەتەکە دا، کە دیتنی راچڵەکی و پێی بە عەرزییەوە رەق بوو. دەتگوت لە شتێك سڵەمیوەتەوە چاوەکانی لە گلێنەیدا دەخولانەوە. وزەی باڵی مێشیش دەبیسترا. تاشباش ئۆغلو ئیدی نەیدەتوانی هەنگاوێکیش هەڵگرێ. چاوەکانی پڕ ببوون لە فرمێسك. شتێك قورگی رێك دەگوشی.

لە خۆڕا چووە پێشترەوە. لە تەنیشت "عەلی"یەوە ڕاوەستا. ئەوجار هەر لەوێش دانیشت. دەستی هێنا و دەستی عەلیی گرت. لاواندییەوە. هەر وا دەستی بەسەر دەستەکانیدا دێنا و نەیدەزانی بڵێ چی.

چەندجارێك تفەکەی قووت دایەوە و نەیدەتوانی هیچ بڵێ:

ـ بەخ خێ..ر ر بەخێر بێن. برا ا ا لە. ئەوە، ئەوە بۆخۆت دەیبینی. هیچ پێت ناخۆش نەبێ. ئێمەی هێناوەتە مەزرایەك خودا بە نەسیبی کافرانیشی نەکا. ئێمەش لە تۆ باشتر نینە... ئەدی... ئەدی.. ئەوە دەیبینی... سەت خۆزگە بە پار. خەمت نەبێ. دەسەلات چییە. ئەوە بووە ئیدی. مەزرای لەوە خراپتر هەر نییە. هەر هەمووی گژ و گیایە. بە دە چلێشی قۆزاخەیەکی پێوە نییە. ئەدی، ئەدی، خۆ دەیبینی. هیچ، هیچ، هیچ خەمت نەبێ..... هەر لە سێ چوار ڕۆژی یەکەمدا سێ لەسەر چواری مەزراکەمان دووریەوە.... کوا لۆکەی؟... هیچمان دەست نەکەوت... بەخێر... بەخێر... هاتن... هەر ئەوەندە... هەر ئەوەندە... ئەوەندە و هیچ.

دەنگی دەلەرزی. کوڵی گریانی هەستابوو.

ـ خەم .... خەم مەخۆ... کارە و کراوە... دەی باشە... دەی...

لەوە پتر قسەی پێ نەکرا. نەیدەتوانی چاو لە عەلی و مرێمۆك و ئەلیف و منداڵەکان بترووکێنێ. ئەوانی دیکەش وەك ئەو بوون. ئەوانە چییان بەسەر هاتبوو...

هەر وا کە دەستی عەلیی دادەماڵی، و قسەیەکی لە زاری نەدەهاتە دەرێ. بێدەنگییەکی بێسنوور بوو. کەس ئەو بێدەنگییەی پێ نەدەشکێنرا. بێدەنگییەکی قورس و خەست کە هەر دەهات و قووڵتر دەبۆوە.

مرێمۆك بە تووڕەییەوە، دەستی کرد بە مست لە عەرز کوتان. کە قۆزاخە پشکووتووەکەی تەنیشت خۆی دی، کەوتەوە بیر خاڵخاڵۆکەکە. دڵی داخورپا. ئەوە چ برسکەیەکی لێ هات ئەو قۆزاخەیە. بە شوێن خاڵخاڵۆکەکەدا گەڕا. لە لکی لەچکە سپییەکەی گرێ دابوو و ئەویشی لە بن پشتوێنەکەی نابوو. دەریکێشا. گرێیەکەی کردەوە. خاڵخاڵۆکەکەی دی کە هەر لەوێ دایە. بەڵام مردبوو. وشك هەڵاتبوو. هەڵیگرت و بە هێمنی لەسەر گوڵەکەی دانا.

بەخۆی گوت:"بنوو، چارەڕەشەکەی خۆم، بێکەسەکەی خۆم... هەر لێرە بنوو".

ئیدی سەری هەڵێنا. ماوەیەك چاوەکانی بەو گوندییە بێدەنگانەدا گێڕا کە لە دەوریان کۆ ببوونەوە. دەستی ڕاستەی بە توندی چەند جارێك بە عەرزەکەدا کێشا و گوتی:

ـ ئاخری گەیشتینێ... خۆ ئاخرییەکەی گەیشتینێ...



ڕۆمانی ئەودیوی کوێستان، یەکێکە لە بەرهەمە بە نرخەکانی یەشار کەمال. نووسەر لەو ڕۆمانەدا بە وردی پەردەی لەسەر لایەنە دەروونی و نهێنییەکانی ناخی مرۆڤ هەڵداوەتەوە. بە خوێندنەوەی ئەو ڕۆمانە جوان و زەریف ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێ کە وەچەی ئادەمیزاد چۆن دەست دەکات بە دروستکردنی پیرۆزایەتییەکان و چۆناوچۆن پیرۆزایەتی بە شتەکان و کەسەکان دەبەخشێت و دواتریش هەر کەسە و لەبەر خۆیەوە چیرۆکێکی خەیاڵیی لەبارەیانەوە هەڵدەبەستێت و بەرجۆ و موعجیزەیەکیان بۆ ساز دەکات. ئەو ڕۆمانە جیا لە زۆربەی ڕۆمانەکانی دیکەی یەشار کەمال، ڕۆمانێکی تەواو فەلسەفییە و ئاوڕی لە مەسەلەی "پەرستن" داوەتەوە. یاشار کەمال لە ئاوێنەی ژیانی خەڵکە ساویلکەکەی گوندی "یالاك"دا دەچێنێتەوە بنج و بناوانی مێژووی ژیانی ئادەمیزاد و خەون و خەیاڵ و ئارەزووەکانیانەوە...

وەزارەتی ڕوشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتی
ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی
MUKIRYANI ESTABLISHMENT
FOR RESEARCH & PUBLICATION
www.mukiryani.com

چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری